


- ناوی کتێب : ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم .
- کۆکردنەوەی : ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد .
- رشتە : کۆمەڵە رووداوی واقعی .
- پیتچن : سەیران ئەمین ، شنۆ غەنی .
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە : عادل شاسواری .
- بەرگی : یەکەم و دووەم و سێیەم ..
- چاپی : چوارەم .
- تیراژ : ٣٠٠٠ دانە .
- ژمارەی سپاردن : ( ٦٠ ) بۆ بەرگی یەکەم و ( ٢١٠) بۆ بەرگی دووەم و (٨٣٨) بۆ بەرگی سێیەمی وەزارەتی رۆشنبیری . ( ٢٠٠٤ - ٢٠٠٧ )



- awat_asrinakan@yhoo.com

# پێشەکی

ناوەڕۆکی هۆکاری دروستبوونی مرۆڤ پەرستشی خوای پەروەردگارە، ناوەڕۆکی پەرستشیش دڵسۆزیە " بەهای ئەمیش لەوەوە دێت ، ئیش لەسەر بەنرخترین ئەندامی مرۆڤ دەکات کە دڵە " بۆ ئەمرۆ دڵسۆزی دروستنابێ تامرۆ موسڵمان نەبێت " چونکە بەپێی پێوانەی خوای گەورە داوەری ئاینەکانی تر هەڵگیراوەتەوە تەنها ئاینێك کاری پێبکرێت ئیسلامە "، ناوەڕۆکی موسڵمانبونیش هەڵگرتنی ئیسلامە، جەوهەری ئیسلامیش عەقیدەیە، جەوهەری عەقیدەش یەکخواناسیە " سەنگینی تای تەرازووی یەکتاناسیش لەوەوەیە گەر مرۆڤ لەم کێشانەیەدا بەسەرکەوتوویی دەرچوو، بەنیعمەتی رەزامەندی خوا دەگات " نمایشگای تاقیکردنەوەی یەکخواناسیش مامەڵەکردنە، جەوهەری مامەڵەش راستگۆییە، راستگۆیش یەکێکە لە پایە گرنگەکانی رەوشت، جەوهەری خوڕەوشت ڕەحمەتە، دەریشناکەوێت کەسێك بوو بێتە رەحمەت بۆ دەوروبەری هەتا پەیوەندی دروست نەبێت، جەوهەری پەیوەندیش گونجانە، گونجان و پێکەوەهەڵکردن شارستانیەت بونیاد دەنێت، جەوهەری شارستانیەتیش هاوسەنگیە " بەو مانایەی ماف و ئەرك وەك یەك بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگەدا دابەشبکرێت، تاك نەبێتە قوربانی گشت، گشت نەبێتە کۆیلەی تاك، تخوبی ئازادیەکان نەبەزێنرێت، هاوسەنگی لە کۆی هاوکێشەکاندا لەبەرچاو بگیرێت " هاوسەنگیش پێویستی بە یاسایە، جەهەری یاساش دادپەروەریە، دادگەریش بەکردەوەنەبێ دەرناکەوێت، جەوهەری کردەوەش خۆپارێزیە، مرۆڤیش خۆپارێزنابێ هەتا دڵسۆز نەبێت، دڵسۆزیش نابێ هەتا هۆکارێکی بەدەستەوەنەبێ، بڕوابون بە خوای گەورە مرۆڤ بەرەو پەرستشی هانئەدات لەپێناو بەدەستهێنانی پاداشتی زیاتردا مرۆڤ هۆکاری دەستدەکەوێت تا دڵسۆزی بنوێنێ، سەرچاوەی دڵسۆزیش لە ناواخنی پەرستشدایە، کەپەرستشیش هۆکاری دروستبونی مرۆڤە، ......هتد ئەم بازنەیە لەناوخۆیدا بەردەوام خۆی دروست دەکاتەوە .

ئەو مرۆڤەشی دەکەوێتە دەرەوەی ئەم بازنەیە ، دەکەوێتە سنوری سەرەڕۆییەوە ، زۆرجار سەرەنجامی سەرەڕۆیی و سەرچڵی ئەسرین و ئەسەفە .. ئەسرینەکان چیرۆکی سەرچڵیەکانی مرۆڤ دەگێڕنەوە ، بەسەرهات و سەرگوزشتەکانی رابردوویی پڕ لە

پەشیمانی و پڕ لە ئەفسوس یاداشت دەكەن .. خەم خۆری ئەم ئەسرینانەش زۆرن بەلاَم كەمیان وەك كۆكەرەوەی ئەم كتێبە دلَسۆزانە گولَەوەچنی خەمەكان دەكات و نان و پیاز بەبەسەرهاتەكانەوە ناخوات و بۆ وروژاندن بازار گەرم ناكات بەلَكو پەیامێكی خاوێن و مەبەستێكی پاكی لەگێڕانەوەیان هەیە .. ئەسرینرێژی لەپێناو پەشیمان بوونەوەدایە .. نیشاندانی زام بۆ سارێژكردنە .. لێرەو لەوێ كرشەیان لێ جەم دەكات و خەرمان لۆغەیان لێ بەرهەم دێنێت .. شەن و كەویان دەكات و چەندین جار لە بێژنگیان دەدات تا خەرمانێكی بەبەرەكەت و پڕ بەرهەمی لێببێتە بەر ، لەبەر ئەوەی ببێتە چراوگی رونكردنەوەی رێی رێبواران و موسافیرانی رێگای حەقیقەت .

لەشەوانی قەدر و لە بلَندگۆی مزگەوت و رادیۆ و لەتریبۆنی یادەكانەوە چەندین جار ئەم بەسەرهاتانەمان بیستون ، بەلاَم بۆ مانەوەیان لە درایفی یاد و بۆ هەمیشە نیشاندانی سەرەنجامی رێی هەلَدێر گردو كۆكردنیان كارێكی باش و جێی ستاییشە .. چون پەند و حیكمەتی زۆر لە نێو بوخچەیاندایە .. بۆ دلَێك پەند وەربگرێت ئەمانە پەندێكن دلَ ئەگرن .. بۆیە پیرۆزبایی و دەستخۆشی ئەكەم لەئامادەكار و كۆكەرەوەی ئەسرینەكان و وەك پەیوەست نییە تەنها بەئەسرینەوە و هەندێ جار پەلی هاویشتووە بۆ گوزشتەگەلێك كە بەرهەمی فەرەح و خۆشین و لەخانەی فرمێسك رشتن نین و لەلایەن خوێنەرانیشیەوە لێی وەرگیراوە هیوادارم بەهەمان شێوەش تەنها پەیوەست نەبێت بە سەددەی رابرووە و ئەسرینەكانی سەددەی بیست و یەكیش كۆبكاتەوە و ئەم زنجیرەیە درێژە پێبدات .. بەئومێدی خامۆشبونی دەریایەك لە ئەسرین و گۆڕینی بە خەرمانێك پڕ لە نور .. بە هیوای ئەوەی ئەم كتێبە ببێتە هەتوان بۆ زامی ئسكۆكان ، بۆ رۆشنكردنەوەی رێگای لاوان و تازەپێگەیشتوان كەلەهەموان زیاتر پێویستیان پێیەتی .. خوای گەورەش پشتیوانی هەمو لایەك بێت و سەركەوتنیش هەر لەوەوەیە .

عادل شاسواری

٢٠٠٦/١١/١٥

سلێمانی

# سەرەتا

لەقۆناغی دواناوەندیدا بووین مامۆستایەکی دڵسۆزو بەڕێزمان وتی " ژیانی ئێمە هەمووی چیرۆکە.. ڕووداوە..بەسەرهاتە .. هەندێکجار کارەساتە، ئەم ڕووداو و بەسەرهاتانە پڕن لەخۆشی و ناخۆشی و وانەی سەرکەوتن ، هەوڵدان ، کوڕی چاك ، قوتابی ژیر دەتوانێت بیانخاتە سەر ڕووی کاغەزی مێژوو، لەدواڕۆژدا سوودبەخش دەبن ئەم وتەیەی مامۆستا لەوکاتو ساتانەدا سادەبوو بەلامانەوە. بەلام دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵ و دوای بینینی چەند دەستەو تاقم و ڕژێمێك ، دوای چەشتنی چەندین تاڵ و سوێری کەوا ئەمڕۆ ڕۆڵەکانی کورد بەتایبەبەتی لەسنوری شارەکەماندا چەندین چیرۆك و بەسەرهات دەماودەم دەگێردرێتەوە لەبەهێزو بێهێز لەدڵتەزێن و سادە .. هەموویان سەرچاوەی ڕاستییان هەیەو ڕوویانداوە .. گەر ڕوویان نەدابێت دروستکردنی واسادەو سانا نییە پاشان وانەیەکی گرنگ بۆ نەوەکانیشمان پێشکەشدەکات بەمشێوەیە ڕووداوەکە ، بەسەرهاتەکە ، چیرۆکەکە لەفەوتانو تیاچون ڕزگاری دەبێت . ڕەنگە ئەمڕۆ بیستبێتمان و سادەبێت زۆر کاری خۆی نەکات ، بەلام ڕۆژێك دادێت ئەو کەسانە لەگێڕانەوەیدا لێیان تێکەڵ ببێ! یان لەبیریان بچێتەوە یان ڕەنگە کەسێکی تر بیکاتە موڵکی خۆی و بەناوی ترەوە بلاوی بکاتەوە ئێمەش تەنیا پەشیمانیمان بۆ بمێنێتەوە ، کوردیش دەڵێت :" هەردەم کردە پەشیمان بیت باشترە لەنەکردە پەشیمان " بەو هیوایەی هەرکەسێك لەناستی خۆیەوە ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانە بخاتە سەر ڕووی کاغەز یان ئەگەر لێرەو لەوێ لەسەر ڕووی گۆڤارو ڕۆژنامەکان کۆیان بکاتەوەو بیانخاتە نێو بەرگێکی قەشەنگەوەو بیانکاتە میوانی کتێبخانەکان لەکۆتایدا بەهیوای ڕەزامەندی خوای گەورەو پاشان سودمەند بوونی هەموولایەك . شادیتان ئاواتمە. خەندەتان خەلاتمە.

**ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد**

خوێندکاری کۆلیژی پەروەردە / کەرکوك

*گەنجێک لەبازنەی مردندا*

# تلیاکییەک ڕاستییەکان دەدرکێنێت

## (لەفایلەکانی دادگای تاوانەکانی میسرەوە)

ئا: وەجیە ئەبو زیکرا

و: بێستون ژاڵەیی

تلیاک ئەم وشەیە لەناخەوە ئەتلەرزێنێت ، تلیاک ئامێری ترسناکی کوشتنی هێمنانەی کۆمەڵـە، تلیـاک و سـرکەرەکان پـەلاماری بـەنرخترین توێـژی کۆمـەڵ دەدەن کـە گەنجەکانن‌و دەیانکەن بەزوخاڵ، تلیاک ترسناکە تا ئەو ڕادەیەیی کە هەر بەخـەیاڵ بیر لەنەتەوەیەك بکەنەوە کەگەنجەکانی لەدەریای ئالودەبوونـدا غـەرقبوون، لەو وڵاتانـەدا کە کێشەی تلیاك هەیە هەروا گەنجەو لەتەمەنی گوڵدا هەڵەوەرێت، لاو بـەدوای تلیاکدا نەگەڕاوە بـەڵکو تلیـاك دەرگای پێگرتـووەو تکـای کێـشان لێـدەکات، هێمـای تلیاکفرۆشـە زاڵم‌و دڕندەکان ئەوەیە: جارێك تاقیبکەوەو بکـەوە نێـو بۆسـەی سڕکرەوە، تلیـاك هـۆی خۆکوشتنی هێمنانەو لەسەرخۆی گەنجێکە کەدەیەوێت بژی.

تلیاك : هـۆی ئـابوری زۆر وڵاتـی داتەپانـدووە کۆمـەڵێکی ئاڵۆشـاوی بێدەربەسـت و بێدەسـەڵاتی دروسـتکردووە، مافیاکـانی مـادە سـڕکەرەکان لـەزۆر شـوێنی ئـەم دنیایـەدا بەویستی خۆیان گەمە بە( ئاین و ڕەوشت و ڕامیاری و ئادابی گـەلان) دەکـەن . دەکوژن دەبڕن دەسوتێنن.

بەڵێ.. ئەمانە گشتییان وە ئەوەش کە لێرەدا پێشکەشدەکرێت بەشێکە لەچیرۆکێکی کتێبێکی نوسەری میسری ( وەجیـە ئـەبو زیکـرا ) لەوکتێبـەدا کەلەفایلـەکانی (دادگـای تاوانەکانی قاهیرە) وە ئامادەکراوە، زۆربەی تلیاك کێشەکان بـەدەمی‌خۆیان بەسـەرهاتی پڕلەناسـۆری خۆیـان بۆنـەو گێڕاوەتـەوە، لەناویانـدا ئـەم گەنجـەی کـە لەئێـستاوە خـۆی

قسەدەکات و باسی حاڵی خۆیدەگێڕێتەوە، ئامادەکاری فایلەکە لەبەرئەوەی گەنجەو ڕازینەبووە ناوی بهێنرێت بەمشێوەیە باس لەحاڵ و دەردیسەرییەکانی خۆی دەکات :

( نازانم لە کوێوەوە دەست پێبکەم، هەمیشە حەزدەکەم بگەڕێمەوە بۆ ئەو حاڵەی کەملی ڕێم بەرەو هەڵدێرگرتەبەر، قەت ناتوانم ئەو ڕۆژەم لەبیربچێت هەرچەندە ڕەنگە هەشت ساڵ زۆربێت کەبەسەریدا تێپەڕیکردووە کەوەك دوێنێ لەبەرچاوم ڕوونە.)

ئەو شەوە نەمدەزانی هیرۆیین چییە و واتای چی و چەندە ترسناکەو مرۆڤ بەرەو کوێ دەبات ، ئەو ڕۆژە هیچم لەسەر ئەو بۆدرە نەفرەتاوییە نەدەزانی ئەو ڕۆژەی بۆتان باسدەکەم بۆ گەشت و گەڕان و چوبوومە شاری ئەستەمبوڵ ، لەیەکێك لەئوتێلە کەشخەکانی ئەو شارە بەڕەونەق و جوانە دابووم ، شەوێکیان درەنگ کچێکی تورکی دەم بەپێکەنین هاتەلام ، ئەو تۆزە هاڕاوەیەی دایە دەستم ، داوایلێکردم تۆزەکە بۆنبکەم و هەڵیبژم .. هەربەو ڕووخۆشییەوە پێیوتم : " ئێستا وەك پەپولەت لێدەکەم ، پەپولە!! "

هەرگیز هەستم بەمەترسی ئەو کارە نەکرد کەدەستم دابوێ تۆزەکەم لێوەرگرت و چی پێوتم ئاوامکرد نازانم بووم بە پەپولە یان گوێدرێژ یا چیتر.. دواتر کیسەیەکی دایە دەستم کەبڕێك لەو تۆزەی تێدابوو پێشی وتم:هەرکاتێك بتەوێت دەتوانیت بەکاریبهێنیت ئالەوێوەوە کارەساتەکە دەستی پێکرد ڕێك ئا لەو ساتەوە من کەوتمە سەر ڕێگەی دۆڕان و دواتریش تیاچوون..ئەو هاڕاوە دۆزەخییەی تەسلیم کردم و نەمدەتوانی بەربەرەکانییان بکەم ؛ بەڵام من بۆئەوەی ئێوە بمناسن واچاکە کەمێك باسی ژیانی ڕابردووی خۆمتان بۆبکەم .

من کوڕی خێزانێکی دەستکورتی میسریم ، باوکم جوتیارێکی ئاسایی پارێزگای (مەنوفییە)یە حەوت خوشکو براین خوای گەورە باوکێکی پێ کەرەم کردبووین کەلەبەخشندەیدا وێنەی کەم بوو .

هەروەها دایکێکیشی دابووینێ کەسۆزو ڕەحمی سنووری نەبوو . بەڵێ سۆزو ڕەحمی بێسنوور بوو . بۆیە ئێمە حەوت ئەندام لەژێر چەتری سۆزو خۆشەویستیدا دەژیاین، هیچ گێرەو کێشەیەکمان نەبوو ، هەژاری نەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێککەوتبووین، ئەویش زۆر دڵڕەق نەبوو لەگەڵماندا.. تووشی هیچ کارەساتێکی ئاوەهای نەکردین ئەوەندەی پارە و پول بوێت کە پێمان هەڵنەسوڕێت بەرهەمی ئەم چەتری

خۆشەویستیەی خێزانەکەمان، برا گەورەکەمان کە ئەفسەری پۆلیسە و من کەپێشوازیکاری کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی میسریم و پزیشکێك کەبرا بچوکمانەو چوار ئافرەتی پاك و خواناسی تریش کەخوشکمانن ئەو و باقی خێزانەکەمانیان پێکدەهێنا.

براگەورەکەمان کەئەفسەری پۆلیسە نوێژەکانی تەواو بە بەملکەچییەوە ئەنجام دەدا هەروەهاش قورئانی دەخوێند من بەهەموو مانایەکی گەورە ئەوم کردبووە براگەورەو سەرمەشقی خۆم ڕێزی دەگرم و خۆشم دەویێت هەیبەتی لەدڵمدا هەیە کاتێك ئەو ژنی هێنا، حەزم لەخوشکی خێزانی کردو خوازبێنیم کردو خێزانم کچی ماڵێکی چاکبوو، باوکی مەلابوو یەکێك بوو لەزانا دیارەکانی ئاینی ئیسلام لە (ئەزهەری شەریف) خوێندبووی، من زۆر بەهاوسەرە دڵدارو خواناس و دیندارەکەم دڵخۆش بووم، بەختیاربووم.

باوکی خێزانم ماڵی هاوسەری بۆ رازاندینەوە، بەڵام چ رازاندنەوەیەك منیش ئەوپەڕی ئارەزوم ئەوەبوو هەرچی پارەم هەیە بییدەمە کەلوپەلی بەنرخی ناوماڵ و هەمووپایتەختەکانی ئەم دنیایە بگەڕێم و دیاری لێوە بۆ ئەم هاوسەرە دڵپاك ودیندارەم بهێنمەوە، ئیتر بوینە خاوەنماڵێکی جوان کەبەکۆشکی فریشتکان دەچوو بەختیاریەکەشمان بەهاتنەدنیای یەکەم منداڵمان گەورەتربوو .. بەدوای ئەوەدا تەشریفهێنانی یەکەم کچم ئەوەندەی تر ماڵەکەی کرد بە چراخان نازانم بۆ ئەوەندە ئەو کچەم خۆشدەویست بەڵام ئاخ ئەمەی بوتان باسدەکەم گشتی لەپێش چاوپێکەوتنەکەی ئەستەمبوڵەوە بوو ئیتر ئەو ساڵانە لەشادمانییەکی گەورەدا دەژیاین ئەوەشم بۆ نەوتن کەلەوساڵانەدا توانیم کە (هەزارەها جونەیە) پاشەکەوت بکەم و لە بانقەکانی قاهیرەدا دایبنێم . بڕێکی باش لەو پارەیەم بۆ ئاهەنگی ژنهێنانی کوڕە بچکۆلەکەم بەخەیاڵ تەرخانکردبوو ، ئای چ خێزانێکی بۆ هەڵدەبژێرم،ئینجا بۆ کچە شیرینەکەم چ گەنجێکی بە ڕەوشتو جوان داوایدەکات و منیش دەمەوێت هەڵیبژێرێت ئۆخەی لەخۆشی ئەو خەوە بەهەشتییانەی کەمن و خێزانمی تیا دەژیاین ئەم خەونانەش خۆشەویستی و بەختەوەری خێزانیان گەورەو فراوان و زیاتر دەکردین بەڵام ئەمەش گشتی پێش شەوە رەشەکەی ئەستەمبوڵ بوون .

دوای ئەوەی بڕێکم لە ژەهرە هاڕاوە سپییەکە خوارد هەستم ئەما ئەمزانی بەقسەی کچە تورکییەکە پەپولەم یان چیم لەخەو هەستام هەستم هەستێکی تۆقێنەرم هەبوو

هەستم بەتەمبەڵی دەکرد. زۆر هیلاك بووم دەمویست تا مردن بخەوم بەڵام ژوانم هەبوو دەبوو بەزووی ئامادەی کاتی هەڵفرینی ئەو فڕۆکەیەبم کەلەپێشوازیکاران و کارمەندی بووم نازانم بۆچی لەوێدا دەستم بردەوە بۆ هاراوە مەلعونەکەو بڕێکی تریشم لێ هەڵمژی ئێستا تا نوکی پێم هەست بە پەشیمانی دەکەم بۆ لەپەنجەرەی ئوتێلەکەوە تادەستم دەگات فڕێم نەدا؟ ئاخ ئەگەر ئەوەم بکردایە ئەو هەموو بەدبەختیەم بەسەردانەئەهات ، بەڵام شەیتان ئێجگار مەلعونە وایلێکردم کەهاراوەکەی‌مابووم خستمە ناو جانتاکەمەوە و لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە ؛ بۆ رۆژی دووەم کەبەئاگا هاتمەو بەدبەختی من تەواو نەبوو هەستمکرد زۆر پێویستم بەبڕێکی تر لە "هیرۆین" هەکە هەیە بۆیە لێم وەرگرت هەتا ئەو بڕەی کچە تورکەکە پێیدابووم تەواو بوو، لەوکاتانەدا ئەم بیست ئەو هاراوەیەیی منی گیرۆدەکردووە یان (کۆکاینە) یان (هیرۆینە).

دوای رۆژێك دەستم نەکەوت ، هەستمکرد ئێشێکی زۆر قورس خەریکە تێکم دەشکێنیت، هەستم بەدڵتەنگی و گیرانیش دەکرد هەستێکی سەیریشم بۆ خۆم کوشت، بەپەلەپەل خۆم گەیاندە ئەو کۆمپانیا فڕۆکەوانییەی کەکارم تیا دەکرد خۆممگرت و توانیم ناوم لەدەستەی ئەو فڕۆکەیەدا بنوسم کەبۆ ئەستەمبوڵ دەچوو ، لە ئەستەمبوڵ کچەکەم نەدۆزییەوە بەڵام پەیداکردنی هاراوەکە لەوێ کارێکی گران نەبوو، ئەمجارە زۆر زۆرم لێوەرگرت هەستمکرد لەشم زۆر پێویستی پێیەتی لەرێگەی گەرانەوەدا فڕۆکەکە بەشانی هەورەکاندا ئاسمانی تەیدەکرد، یەکێك لەسەرنشینەکانی بانگیدەکردم، دەنگیم دەبییست بەڵام نەمدەتوانی رووی تێبکەم بزانم چی دەڵێت لەوکاتەدا بەرێکەوت فەرماندەی فڕۆکەکە دای بەلامدا و زۆر سەیری دەکرد ئینجا پرسی: تۆ تلیاکیت؟!

وەڵامم دایەوە تلیاکی چی پرسیاری چیم لێدەکەیت.

ئەویش وتی : مادە سڕکەرەکانت بەکارنەهێناوە؟

زۆر بەتوندی ئەوەم رەتکردەوە وتم: کاکی فەرماندە کەمێك نەخۆشم شەوی رابردوو نەخەوتووم چونکە گەدەم زۆر ژانیکردووە.

فەرماندەی فڕۆکەکە لەوێدا بڕوای پێکردم دواینەوە لەخەوێکی قوڵدا رۆچووم کاتێك بەئاگا هاتمەوە گەیشتبووینە سەر زەوی فڕۆکەخانەی قاهیرە.. خۆم گرت و دابەزیم .. بەڵام هێشتا قسەکانی فەرماندەی فڕۆکەکە لە مێشکمدا دەزرنگایەوە،( ئەوە تۆ تلیاکیت، ئەوە تۆ تلیاکیت ) رێك لەو ساتەوەختەوە کەوتم ئەو هەستە ترسناك

و تۆقێنەرە سەرتاپای گیانی داگرتم کەمن لەنێو بازنەی ترسناکی ئالودەبوندام ( ئیدمام) داوای مۆڵەتی ( پێنج رۆژ) پشوم لەکۆمپانیاکە کرد و ئەو مۆڵەتم وەرگرت و گەڕامەوە ماڵەوە.. رۆژی یەکەمم بەخەو تەواوکرد، کە هەستام سەیرمکرد کچە بچکۆلانەکەم لە پاڵدایە لەو کاتەدا هەستمکرد کەمن بەختەوەری ئەو دەدزم و من جێی شانازی ئەو نیم ئەو هەستانەم کوشتمیان بەتوڕەی هەستامەوەو باقی (سەمەکە)م کەپێم مابوو لەپەنجەرەکەوە فڕێمدا بڕیارمدا ئیتر هەرگیز ئەو ژەهرە بەکارنەهێنم کچەبچکۆلە جگەرگۆشەکەمم لەباوەشگرتەوەو بەرووی خێزانە بەرێزەکەمدا پێکەنیمەوە.. گاڵتەم لەگەڵ کوڕەکەم کرد و بڕیارمدا بڕۆمەوە بۆ کۆمپانیاو شوێنی کارەکەم .

بەڵام ئەمە گشتی چەند ساتێك و ئازار سەری لێشێواندم وەك شێت چوومە سەر جادەکەو بۆ ئەو هاڕاوە ژەهراوییە دەگەڕام .. کەپێش کەمێك لەپێناوی بەختیاریدا بۆ خێزانەکەم لەپەنجەرەکەوە فڕێمدا بوو.. من تازە توش بووم ، هاڕاوەکەم نەدۆزییەوە، گەڕامەوە ماڵ جلەکانم لەبەرکردووو خۆم کرد بەخانێکی نزیك بینای تەلەفزیۆندا کەلەو پێش بیستبووم لەو خانەدا هەموو جۆرە ژەهرێك هەیە لە گوزەرێکی ئەو خانە چۆڵو لاڕێیەدا گەیشتمە پیاوێك بێئەوەی پرسیاری لێبکەم لێی پرسیم : ها چیت دەوێت؟

وتم: (هیرۆین)، زۆر سادەبوو بڵێم هیرۆین زۆر سەیریکردم، سەیری رووی کردم سەیری چاوی کردم ، بەسەرسوڕمانەوە وتی : (ئۆی ! تۆ تەواو تلیاکیت).

بێدەنگ بووم ، هەرچی پارەم پێبوو دامێ، بڕێك لە ژەهرەکەی بۆ هێنام و بێدەربەستانە گەڕایەوە منیش گەڕامەوە ماڵەوە، لەژەهرەکەم بەکارهێناو ئازارەکەم ڕەوییەوە.

بۆیەکەم جار شتێك لەماڵدا روویدا زۆر هیلاکی کردم ئەویش ئەوەبوو کەخێزانم زۆر بەگومانەوە تێیدەڕوانیم ، ئینجا وتی: ( هیچ شتێك لەماڵدا نەماوە خەرجیمان دەوێت) من هیچ پارەو پولێکم پێنەبوو تەنیا ئەو چەکە نەبێت کەلەبانکدا بۆ کچەکەم دامنابوو، بەپەلە خۆم گەیاندە بانك و چەکەکەم کردە پارە پێداویستیم بۆماڵ هێنایەوەو توانیم ژەمێك لە هیرۆینەکەی خۆشمی پێپەیدا بکەم.

رۆژێك لەگەشتێك دەگەڕامەوە، خێزانم دەموچاوی دنیایەك پرسیاری لێدەڕژاو لێی پرسیم: کوا ئادابەکانی جارانت؟ کوادیارییەکانت؟

پرسیارەکەی زۆر واتای هەبوو ، لەوکاتەشدا زەنگی دەرگاش لێدرا ، بەڵام چیم بینی: دیمەنێکی لەو ترسناکترو جەرگبڕتر ، براکەم _ کەئەفسەری پۆلیس بوو _ بەپەلە هاتە ژورێ لەگەڵ هاتنە ژورەوەیدا رووی تێکردم و پرسی: سەیارەکەت داوەتە کەس؟

وتم : نا، نەخێر .

وتی : چاك بیربکەرەوە.

وتم: بۆ؟

وتی : پۆلیسی ( لێکۆڵینەوە) ژمارەی سەیارەکەتی لەکاتی چاودێریکردن ی باندێکی تلیاکیدا گرتووەو لە راپۆرتەکەشیاندا هاتووە کە: ( خاوەنی سەیارەکە هیرۆینی کڕیوە)، جا ژان سەری تێکردم، هیچم لەبیر نەما بیرمکردەوە سەیارەکەم بە هاوڕێیەکم داوە، بەڵام گومانم هەبوو لەوەی کەئەویش تلیاکی بێت وەك خۆم .

خێزانەکەم دوبارە بەگومانەوە بۆی روانیم ، وتی : من وادەزانم تەمێی هاوڕێکەت بکەیت بۆئەوەی بچێتە نەخۆشخانەیەك بۆچارەسەر .

رۆژێك هەروا بەئاسایی بەرەو ئەو فڕۆکەیە دەچووم کەلە پێشوازیکارانی بووم ، فەرماندەی فڕۆکەکەم لێ هاتەپێشەوەو داوایلێکردم کەسواری فڕۆکەکە نەبم ، ئەمەش توشی سەرسوڕمانێکی گەورەی کردم هەرلەوێدا کاپیتان پێی وتم:" گومانی لەوەهەیە کە تلیاکی بم ئەمەش مەترسی هەیە بۆ سەر ژیانی سەرنشینانی فڕۆکەکە، هەوڵمدا کەبەرووی فەرماندەدا هەڵشاخێم و ئەو بڕیارەی لێ قبوڵنەکەم، بەڵام ئەو پێی وتم : کەنارەزایی دەربڕین لە بەرژەوەندی مندا نییەو مەسەلە هەرئەوەیە کەکاپیتانی فڕۆکەکە فەرمانیداوە کەلەگەڵێدا گەشت نەکەم ئەوەش کەڕوویداوەلێم بۆکەسی ناگێڕێتەوە".

کاتێك لەلای فڕۆکەکەوە بۆ فڕۆکەخانە گەڕامەوە زۆر کەس پرسیاری لەهۆی بەشدارینەکردنم لەگەشتەکەدا لێدەکردم ، منیش بە نەخۆشی پینەم کرد .

دوای ئەم ڕوداوە ئیتر زۆر کەشتی فڕۆکەوانی تێپەڕین ڕێی نەئەدا توخنی بکەوم تا رۆژێکیان لێپرسراوی کۆمپانیای فڕۆکەوانییەکە داوایلێکردم دەست لەکاربکێشمەوە.

لەسەرەتادا ویستم نارەزایی بەرامبەر ئەم داوایەش دەربڕم، بەلام خۆم لەبەردەم هەڵبژاردنێکی سەختەدا بینییەوە ، ئەویش لێکۆڵینەوە بوو لەسەر تاوانبارکردنم ، بەوەی کەبەحاڵێکی بێهۆش و خراپەوە بەهۆی تلیاککێشانەوە سواری فرۆکە بووم.

لەدوایدا بەزۆر دەستم لەکارکێشایەوەو لەکۆمپانیای فرۆکەوانییەکە هاتمە دەرێ ، لەگەڵ هاتنەدەرەوەمدا لەدەروازەی فرۆکەخانەکەدا هەستێکی نامۆی رووی تێکردم ئەوا ماڵەکەم بەتەواوی رووخا ، یا خەریکە دەروخێ بەسەر خۆم و خێزانەکەمدا، ئەویش بەهۆی دەست لەکارکێشانەوەم لەکۆمپانیاکەدا ، هەروەها بەهۆی ئەو ئابڕووچونە لەنکییە گەورەیەوە کەلەناو هاوکارەکانم و خێزانەکەمدا تووشم بوون هەستم بە بێدەربەستی دەکرد ، سەیارەکەم لێخوڕییەوە بەرەو لای بازرگانە خۆشەویستەکەم کەوتمە رێ، برێك هیرۆینم لێکڕی ، چوومەوە ماڵ ، کچە بچکۆلەکەم باوەشی پیا کردم دەستی بەرزکردەوە بۆئەوەی کەلە باوەشی بگرم ..بەلام هێشتا من سارد و سڕو بێدەربەست بووم ، جگەرگۆشە شیرینەکەمم بەجێهێشت من شتێکم نەبوو ناوی هەست بێت !! تلیاك ئەویشی سڕکردبوو چوومە ژوورەکەم .. کچەکەم لەدوامەوە دەگریا ، ئاخر ئەو کچێکی بچکۆلانەی ناسکی ( ٥ )ساڵان بوو ، من شایانی ئەوە نەبووم باوکی ئەوبم .

دەرگای ژوورەکەم لەناوەوە بە کلیل قفڵ دا .. لەژەهرە سپیەکەم خوارد .. خێزانەکەم دای لەدەرگای ژوورەکە.. هەرچۆنێك بوو توانیم هەستم دەرگا بکەمەوە ..هاتە ژوورێ رووی تێکردم بەدوودڵیەوە لێی پرسیم : بۆ زوو گەڕایتەوە ؟

وتم : ئێستا نامەوێت هیچ پرسیارێکم لێبکەیت . !

خێزانم بەبەزەییەکەوە پێیوتم : بۆ نامۆژگاریم نابیستی بڕۆ بۆ لای پزیشکێك باچارەت بکات، ئەوەش بزانە من لە شانتا دەوەستم تا شیفات بۆ دێت .. بە تووڕەییەوە وتم : لەچیچارەم بکات ؟ خێزانم وتی : لەتلیاك کێشان و تلیاکی بوون؟!

ئەم گرنگی پێدانەی خێزانم رقی هەستاندم ، وام هەست دەکرد جێی بەزەییم .. نەمدەویست کەس بەوە بزانێت .. بومە درندەیەك لەنێوان ماڵا هەموو شتێك بشکێنم .. کورو کچەکەم دەگریان چۆن گریانێك خێزانەکەشم بەوپەڕی خەم و ئازارەوە سەیری دەکردم .. چوومە دەرەوە سواری سەیارەکەم بووم ، چوومە چایخانەیەك ، سەیری رێبوارەکانم دەکرد و نەم ئەبینین لەچایخانەکە .. چایچیەکەچای بەدوای چادا بۆ بانگ

دەکردم بەچێژێکی زۆرەوە قومم لە چاییەکە ئەدا و لەحاڵەتێکی پڕ لەرۆچوون و بێهۆشی دا بووم !!

بەڵام لەو کاتەدا هیچ هەستم بەپەشیمانی نەدەکرد ( تلیاك واتە بێهەستی واتە بێدەربەستی). چەند کاتژمێرێك سوڕامەوە، نازانم کەم بوون ئەوکاتانە یان زۆر.. گەڕامەوە ماڵ .. هیچ حەزم بەگەڕانەوە بۆ ماڵ نەبوو.. بەڵام ژەهرە شیرینەکەی لای من لە ماڵەوە بوو ، منیش هەستم دەکرد زۆرم پێویست پێیەتی .. بەڵێ کەدەرگای ماڵەوەم کردەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرم بینی ، بینیم خێزانەکەم و براگەورەکەم ، کەئەفسەری پۆلیسە و برا بچوکەکەشم کەپزیشك بوو هەموو لەهۆڵی پێشوازی ماڵەکەماندا بوون .. هەوڵم دا بەخێرهاتنی دووبراکەم بکەم .. لەگەڵیان دانیشم ، لەسەرەتادا بێدەنگیەکی قوڵ و بەسام باڵی بەسەر ئەوناوەدا کێشا .. برا ئەفسەرەکەم ئەم بێدەنگیەی شڵەقاند و رووی تێکردم : "خێزانت جیابوونەوەی دەوێت" سەیری خێزانم کرد ئەو سەری داخست . . براکەی ترم کەپزیشکە هاتە قسە و داوای لێکردم لەگەڵیا بڕۆم بۆ ئەونەخۆشخانەیەی کەکاری تیادەکات تالەوێ بخرێمەژێرچاودێریەکی تەواوە وەو چارەشم بەبەلاش دەکرێت .. برا پزیشکەکەشم ئەوەشی وت: خێزانت ئەهێنم بۆ نەخۆشخانە بالەگەڵتا بێت .. هەردوومنداڵەکەش دەنێرین بۆ ماڵی براگەورەکەمان .. دوایش بەساغ و سەلامەتی دەگەڕێیتەوە بۆ ناو ماڵو سەرئیشەکەت .. پێشنیارەکەیانم رەت کردەوە .. ئەوەشم رەت کردەوە کەبەتلیاکی بوون تاوانباریان دەکردم .. خێزانیشم بەدەم گریانەوە قسەی خۆی دەکرد .. وتی : " من ئامادەم کەهەموو قوربانیەك بدەم لەپێناوی چارەسەر کردندا.. "

من هەموویان بەوە تاوان بارکرد کەشێتن داوام لەبراکانم کرد کەلەماڵەکەم بچنە دەرەوە .. لەکاتێکدا کەئەوان بەتوڕەییەوە ماڵەکەیان بەجێهێشت ، خێزانم پێیوتن :" نا .. ئەوئاگای لەخۆی نیە .. نازانێ چی ئەڵێ .. مەڕۆن ئەوپێوستی پێتانە . "

بەڵام من هەر دەرم کردن ..

هیچ شتێکم بەدەستەوە نەما بۆ ماڵ سەرفی بکەم.. کار گەیشتە ئەوەی کەلو پەلی نێوماڵم ئەدزی و ئەم فرۆشت و هاراوە ژەهاوییەکەم پێدەکڕی.. رۆژ لەدوای رۆژ لەشم پێویستی بە ژەهری زیاتر هەبوو.. تەواو ئالودەیی رووی تێکردبووم، چەندین جار خێزانم هەوڵی دەدا کەکەل و پەلی نێومالْ نەفرۆشم بەڵام نەیدەتوانی، پێش کەل و

پەلی نێومالْ سەیارەکەمم فرۆشت ، پێش ئەویش هەموو پارەکانم لەبانك کێشایەوە و تەواوم کردن .. تا دوا هەولْ سوودی نەبوو لەکۆتاییدا خێزانم بەناچاری دەستی هەردوو منالەکەی گرت و لەمالْ دەرچوو!!

نەمزانی بۆ کوێ رۆیشت.. قەت بەلاشمەوە گرنگ نەبوو ، هەروەك هیچ بیرم لەدوو منالەکەشم نەدەکردەوە.. تەنها و بەدبەخت لەومالە چۆلەدا مامەوە، بەدوای دەرچوونی خێزانەکەشم دا هیچ لەمالْدا بۆ فرۆشتن نەمایەوە.. من زۆر پێویستیم بەپارەهەبوو بۆ ئەوەی ئەو ژەهرە بکڕم کەکرم ئاسا لەشی دەخواردم.. دووڕێم لەبەردەما بوو.. یا بازرگانی کردنی تلیاك یا سوالْ کردن .. بەلام لەبەر ئاسانی رێگەی سوالم هەلْبژارد .. لەرۆژی یەکەمی سوالکردنەکەمدا لەبەردەم دوکانێکی ساردەمەنی فرۆشتندا روومکردە سەیارەیەك ژن و پیاوێکی تێدا بوو .. دەستم بەرەو ناوسەیارەکەو بۆ لایان درێژ کرد .. زۆر جێی بەزەیی بووم .. پیاوەکە سەرنجی دام .. زۆر سەیری کردم دوایی داوای لێکردم دوور کەومەوە .. کەوتەوە بیرم پیاوەکە هاوڕێیەکی کۆمپانیای فرۆکەوانیم بوو .. ئەویش خێزانەکەی بوو .. تەواو هەست و هۆشم وابوو کەئەو هاوڕێیەم ناسیمی گەڕامەوە بۆ مالە چۆلەکەم .. بەتەنیا دانیشتم ئەو رۆژە یەکەم جار بوو لە دوای ئەوەی کەهیرۆیینم ناسی گریام .. !! بەلێ گریام !! گریام و دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر دەبوو بڕیارێك بدەم .. بەلێ دەبووبڕیارێك بدەم .

وەك وتم ئەو گریانە بەجۆش‌و خرۆش‌و بەکولەم سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەژیانم‌و سەرەتای بڕیارێکی نوێ! خوای پەروەردگار خستبویە دلمەوە کە ئاوایە: بڕیارمدا واز لە "تلیاك" بێنم، بەلێ لەو ساتانەدا بڕیارمدا، بەلام چۆن؟ لەخۆمم ئەپرسی چۆن؟! بێئیرادەو بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت دابەزیم بۆ لای دەرگاوانی شوقەکان داوای (١٠) جونەیهم لێکرد، ئەوە یەکەم جار بو لەژیانمدا داوای قەرز لەو دەرگاوانە بکەم.. ئای کە چەند پارەم دابووێ لەومو پێش، ئەوەی داوام کرد پێی بەخشیم.. چومە گەراجی (گیزە)و پرسیاری ئەو سەیارانەم کرد کە بۆ (وادی جەدید) ئەچوون.

شوێنی خۆم لەسەیارەیەکدا گرت‌و بەرەو ئەم نادیارە تازەیەی ژیانم بەڕێ کەوتم.

وادی جەدید: ناوچەیەکی دابڕاوە لەمیسر وام بیستبوو کە بەتەواوەتی لەتلیاك‌و مادە سڕکەرەکان پاکە.. ئەو ناوچەیەم لەسەر ئەو قسەیەی (گارقی کوڕی زیاد) هەلْبژاردبوو کە ئەلێ:

(دوژمنتـان لەپێـشەو دەریاشـتان لەدوایـە، واتـە هـیچ رێگەیـەکتان بـۆ راکـردن لەسەرکەوتن نیە)

بەبرسێتی لەسەیارەکە دابەزیم (غەریب.. زۆر تینوی ژەهرە سپیەکە بوم، نـە هاورێم هەیەو نەپارەم پێیەو نەکەسیش ئەناسم نەئەشزانم بۆچی ئەگەڕێم؟! یەکراست خوانایە دڵمەوەو چوومە مزگەوت، نوێژ خوێنەکانی ئەوێ زۆر بەوردی سەیریان ئەکردم، من لای ئـەوان زۆر نـامۆ بـوم، گـەنجێکم لێهاتـە پێـشەوەو لێـی پرسـیم: کـە نـاوم چییە؟ بۆچی چومەتە لای ئـەوان؟ لەوەڵامـدا پـێم وت: لەقـەرەباڵغی (قـاهیرە) بێزاربـوم‌و هـاتوم لێـرە ئیشێك بکەم.

گەنجەکە: لەقاهیرە چیت ئەکرد؟

وتم: هیچ.. ئیشێکی وام نەکرد.. بەڵام پێش قـاهیرە بـە (کشتوکاڵ کردنـەوە) خـەریك بووم)،

بۆیە ئەوەم وت، چونکە ئەمزانی خەڵکی ئەوێ پێویـستیان بـەجوتیارو کشتیارە.. مـن هەر بەڕاستی سـەرم لەکشتوکاڵ دەرئەچوو.. ئـەویش ئـەو کاتـەی کـە بـاوکم نـەمردبوو بەرەحمەتی خوا نەچوو بوو.. نەشچووبومەو قاهیرە بـۆ خوێنـدن‌و ئـیش کـردن. لـەماڵی خوادا لە (وادی جەدید) ئەو گەنجەم بینی! بەڵێ دەبێت دوپاتی بکەمەوە! لـەماڵی خـوادا لە (وادی جەدید) ئەم گەنجەم بینی، لـەماڵێ خـوادا لـە (وادی جەدیـد) گەیـشتمە یەکـەم هیـوام، لـەماڵی خـوادا لـە (وادی جەدیـد) زۆر گریـام، بەپەشـیمانیو تەوبـەوە گریـام.. گەنجەکە پێشنیاری بـۆ کـردم کـە لەکێڵگەکـەی ئـەودا کـار بکـەم.. چونکە ئـەو دەرچوی کۆلیـژی (کـشتوکاڵی زانکـۆی ئەصـویتە) و ئیـشی حکـومی ناکـات تاقـەتی لەشـاری قـەرەباڵغیش نیـەو هاتۆتـە (وادی جەدیـد) پارێزگـاری ئـەم پارێزگایـەش (٢٠) (فـەددان) زەوی دابویـە، کـە ئـەمیش چـاکی کردبـوو (کـشتوکاڵ‌و زەرعـاتی) تیـا ئـەکرد.. ئـەمیش پێویستی بەیارمەتیدەر هەبوو، گەنجە پرسیاری کرد:

کە بەچەند کار دەکەی؟

وتم: بەکەلامی خوا

گەنجەکـە هـیچ تێنەگەیـشت.. بۆیـە وتم: هیـچم لـەتۆ ناوێـت.. ئـەوە نـەبێت کـە (قورئانێکم بدەیتێ کە تیایدا بخوێنم‌و شوێنێکم بدەیتێ کە تیایـدا بحەوێمـەوەو تۆزێك خـواردنێکیش پێـی بـژیم)، گەنجـە کـە قـسەکانمی پـێ سـەیر بـوو.. بۆیـە یەکـسەر

بەداواکارییەکانم رازی بوو، لەکێلگەی ئەم گەنجەدا بومە خاوەنی ژورێكو قورئانێكو کۆمەڵێك داریش کە پێویستیان بەچاودێر هەیە.. ئەگینا ئەمرن.

بەسەر ئەمەش گشتی‌یەوە: ئایا ئەتوانم بێژەهەرەکە بژیم؟

لەرۆژی یەکەمدا دوای ئەوەی گەنجەکە رۆیشت.. دەرگاکەم لەسەر خۆم داخست.

هەر کە دەرگام داخست دەرگای هەموو زیندانەکانی ناوم بەرووی ئازارا کرایەوە.. ئازارەکان هەموو لەشمی هێنایە لەرزە.. بومە بەندی هاوارەکانم.. لەشی خۆمم بەنینۆکەکانم ونجڕ ونجڕ ئەکرد.. ئازارەکان یەکسات وازیان لێنەهێنام، تا داوای کۆمەكو یارمەتی لەخوای خۆم بکەم.. چەند ساتێك لەنێوان ململانێی یەکەمی ئازارەکانم کە لاشە لاوازەکەمی ئەگوشیو ململانێی دووەمدا تێپەڕی لەو ساتانەشدا توانیم قورئانەکەی بەردەمم بکەمەوە ئایەتەکانیم ئەخوێندوە هەر کە ئێشەکەم زیادی بکردایە دەنگم لەقورئان خوێندنەکەدا بەرزتر ئەکردەوە.. بەدڵ داوام لەخوا ئەکرد رزگارم کات.. فرمێسکەکانم بەسەر روومەتما دانەبارىو ئەکەوتنە سەر قورئانەکە.. وام هەست ئەکرد لاشەم مەیدانی شەڕێکی درندانەیە کە هەرگیز دوایی نایە.. وام هەست ئەکرد گیانی بەرگری کردنم ئەروخێو خۆی لەبەر ئازارەکانما ناگرێت هەر کە ئەو هەستەم بکردایە دەنگم لەخوێندنی ئایەتەکانی خودا بەرز ئەکردەوە.. قەت نازانم ئەو شەڕە چەندی خایاند (سەعاتێك.. دوان .. سیان رۆژێ چەند رۆژێ..) تا لەو حاڵەدا خەوێکی قوڵ بردمیەوە.

لەخەو هەستام! وامزانی لەگەشتێکی دوور گەڕاومەتەوە.. گەشتێکی ترسناك بەقوڵایی زەویدا.. لەو خەونانەدا دێوی نامۆو غەریبم دی!! زۆر گەورە بوون!! چاویان دا دڕاو ناشیرین.. هەر یەکەو چەند سەرێکیان هەبوو.. ئەم لەشکرە دێوە هەموویان لەخەونەکەما پەلاماریان ئەدام، کەس لەژوورەکەمدانەبوو پەنجەرەکەم کردەوە.. زەویم بینی! داری سەوزم بینی! تۆزێك لەپەنجەرەکەدا وەستام!

هەوڵمدا هەوایەکی پاك هەڵمژم! سییەکانم قەت یارمەتیان نەدام.. هەستم بەتینویەتی ئەکرد، بەڵام ئەمویست روبارێك بەتەواوەتی بخۆمەوە.. شوشەیەکم بینی ئاوی تێدا بوو سەرم پێوە نا زۆرم لێخواردەوە!! خۆمدا بەسەر جێگاکەما.. دوای چەند ساتێك ئارەقێکی زۆرم کرد هەموو ئەو ئاوەی خواردبومەوە لەلەشم دەرچوو.. جارێکی تر گەڕامەوە لای ئاوەکەو دەمم پێوەنا.. هەروەك لەپێشبڕکێدا بم لەناوو ئارەق کردندا..

دوای سەعاتێك گەنجی خاوەن کێلگە هات، سینیەکی پێبوو بەرچایی بەسەرەوە بوو کە لەبەری دارەکانی کێلگەکە ئامادەکرابو.

(پەرداغێك شیر، چەند هێلکەیەك، دوو جۆر پەنیر، تۆزێك هەنگوین) گەنجەکە ئاگاداری کردمەوە کە (تا)یەکی زۆرم هەبووە.. ئەمە سێ رۆژە لەژورەوەمو دکتۆرێکم لەشانەومیەو لەو ماوەیەدا ئارەقێکی زۆرم کردووە.. هەتا دکتۆر (نوژدار - پزیشك)ە کە ترساوە کە وشك ببمەوەو بۆیە ئاوێکی (مەعدەنی) داوەمتێ تا ئاو لەلەشما بمێنێتەوەو بەو خێراییە تۆقێنەرە نەبێتە ئارەق، سوپاسی گەنجەکەم کردو هەوڵمدا شتێك لەوە بخۆم کە هێنابوی، بەڵام نەمتوانی! پرسیارم لێکرد: کەی ئیشەکەم دەست پێبکەم؟

وتی: تا چاك نەبیتەوە کارت پێناکەم!

وتم: بۆ ئەوەندە گرنگیم پێئەدەیت؟

وتی: گەنجێك کە داوای قورئانو وتەی خوا بکات لەپاداشتی ئیش کردنیا ئەوە هەموو خزمەتێکی شایستەیە.. وتیشی هەر کات چاکبوویتەوە ئەوە ئەتوانی ئیش بکەی گەنجەکە ماوەیەکی تر لام دانیشتو نەیویست شەرمەزارم بکات هەستاو چووە دەرەوە.. سینیەکەی لا جێهێشتمو تکای لێکردم کە شتێك بخۆم.. چونکە کەسێ کە تای لێهاتبێ پێویستی بەخواردنە.

دوای چەند ساتێك شەڕە سەختەکە لەنێوان بەرگری لەشم لەپێویستی بۆ ژەهرە نەفرینە کەو ئەو ئازارانەی کە ئەو ژەهرە دروستی ئەکرد دەستی پێکردەوە.

چارم نەبوو لەوە زیاتر بگەڕێمەوە بۆ لای (وتەکانی خوا) بەدەنگی بەرز خوێندم هەرچەندە ئازارەکە زیادی ئەکرد، داوام لەخوای بەرەحم ئەکرد کە ئەم ئازارە سەختەم لەکۆڵبکاتەوە.

لەقورئان خوێندنەکەمدا گەیشتمە ئەم ئایەتانە زۆریان لەسەر وەستام! تۆخەی ئەوە خوایەو ئەفەرموێ (**وأوحى ربك الى النحل أن اتخذي من الجبال بيوتاً و من الشجر ومما يعرشون، ثم كلى من كل الثمرات فاسلكى سبل ربك ذللاً يخرج من بطونها شراب مختلف الوانه فيه شِفاء للناس إن في ذلك لآية لقوم يتفكرون**)[1] ئەڵلا زۆر لەسەر ئەم ئایەتە

(1) سورەتی النحل ـ ئایەتی ٦٩.

وەستام.. دوای خوێندنەوەیان لەگەڵ ئازارەکانمدا ڕانەهاتم، چومە لای ئەو جامە هەنگوینەی کە لەپێشمابوو زۆرم لەدەرونم کرد لێی بخۆم هەموو هەنگوینەکەم خوارد.. دوای ئەوە تۆزێك هەستم بەهەندێك ئارامی کرد.. ناویشم خواردەوە.. گەڕامەوە لای قورئانەکە.. چەند سەعاتێك خوێندنەوە! تا گەنجە خاوەن کێلگەکە هاتەوە.. سینیەکی پڕ خواردنی بەدەستەوە بوو (مریشکێکی برژاو ــ سەوزەی ئامادەکراو ــ چەند جۆر میوە..) بەڵێ زۆر تورە بوو کە بینی هێشتا بەرچاییەکەم نەخواردووە.. پێم وت: تکات لێدەکەم لەجیاتی ئەم هەمووە جامێك هەنگوینم بۆ بێنە.. جا دوای چاکبوونەوەم هەرچیم بدەیتێ ئەیخۆم)

(والله انزل من السماء ماءً فاحيا به الأرض بعد موتها إن في ذلك لآية لقوم يسمعون، وإن لكم في الانعام لعبرة نسقيكم مما في بطونه من بين فرث و دمٍ لبناً خالصاً سائغاً للشاربين)[٢]

ئایەتەکانی خوایەو لەم تەنیای‌و بەدبەختیەدا.. تاریکاریەکانی ناخ‌و دەوروبەر و ژوورەکەمیان ڕۆشن کردومەتەوە.. بەڵێ .. کە داوام لەگەنجەکە کرد: لەجیاتی ئەم هەموو خواردنە جامێك هەنگوینم بۆ بێنە!

گەنجەکە لەبەر ڕۆشنایی‌و شیرینی ئایەتەکانی خوادا ئەویش وتی: بەسەرچاو بۆت ئەهێنم برێکیش لەخواردنی (شاژنەکەشیانت) بۆ تێنەکەم.. بەڵام برێك لەو میوەیە بخۆ.

بۆ ئەوەی دڵی ئەو گەنجە خواناسە میهرەبانە نەیەشێنم بەزۆر هەندێك میوەم خوارد!

ئەگەر لەبەر ئەو گەنجە بڕوادارە چاکە نەبوایە.. ئەمویست بڕشێمەوە، گەنجە کە داوای لێکردم لەژوورەکە بچمە دەرێ‌و هەندێك بەناو باغ‌و دارەکاندا بگەڕێم.. ئەمە گشتی شەڕەکە لەناخمدا بەردەوامە.. هەناسەکانم کپ ئەکرد، تا کەس هاواری بەیەکدا هەڵشاخانی هێزەکانی ناوەوەم نەبیستێ. بۆ ڕازی بون‌و وەرگرتنی داخوازییەکەی ئەو چومەدەر، بەڵام بەهیلاکی گەڕامەوە ژوورەکەم.

گەنجە بەبڕێکی زۆر لە (هەنگوینە) وە گەڕایەوەو بۆی دانام‌و گەڕایەوەو ڕۆیشت.. دەستم کردە خواردنی، بەئاسانی بۆم ناخورا.. بەڵام ئەوەی (شاژنەکە) هەرچۆنێك بێت

[٢] سورەتی النحل ـ ئایەتی ٦٦.

خواردم دوایی هەستم کرد خەوم دێت.. زۆر بەنوستن ئاسودە بوم! چونکە ئەو لەشەڕە سەختەکەی ناخم داینەبڕیم.. خەوتم.

ئەمجارەش نازانم چەندەم کات لەگەڵ ئەو (کابوسانە)دا گوزەراند.. کە یەك بەدوایەکدا ئەهاتنە سەرم، هەستم کرد هاڕاوە نەفرەتاویەکەی (تلیاك) وەکو شەیتان بەنێوخوێنی مرۆڤدا ئەگەڕێ‌و دەرچونی زەحمەت‌و گرانە، بەلام راستیەك ئاسۆیەکی روون زۆر دڵخۆشی کردم ئەویش ئەوەبوو: کە بڕیارمدا ئەگەر بشمرم یا خۆشم بکوژم جارێکی تر نەگەڕێمەوە سەری!! شتێکی تریش دڵخۆشی ئەکردم: کچە شیرینەکەم.. ئا.. ئەو هەر ئەمڕۆ.. تەنیا ئەمڕۆ کچەکەم کەوتەوە بیر لەمڕۆژا بیری کچەکەم هانی ئەدام کە بەرگەی هەموو ئازارێك بگرم.. کوڕە نازدارەکەشم بیرکەوتەوە.. خێزانە بەڕێزو دیندارەکەشم.. برا گەورەم.. برا بچکۆلەکەم.. ئەو هەموو هەوڵ‌و کۆششەم بیرکەوتەوە کە لەوێ کە لەدێ کۆنەکەی خۆمانەوە تا ئەو کاتەی کە فڕۆکەوانەکە دەری کردم دابووم.. لەم کاتانەدا سەیرم کرد خاوەن کیلگە جامێکی پڕ لە (هەنگوین) ی بۆ داناوم.. ئاوم خواردەوەو چوومە دەر.

کە چومە دەرێ لەجۆگە ئاوەکە دەستنوێژم گرت‌و گەڕامەوە ژووری.. دەستم کرد بەنوێژکردن، بەلام نوێژی کەی (بەیانی - نیوەڕۆ - عەسر) نەمئەزانی چەند رکات نوێژی لەدوایەکم لەسوپاس‌و سەنای پەروەردەکار کرد.. نازانم ژمارەی رکاتەکان چەند بوون، بەلام ئاوم خواردەوە، دەستم کردە قورئان تا شەوم بەسەراهات نوێژی (شێوان‌و خەوتنانم) بەجێ هێنا دانیشتمەوە بۆ (قورئان خوێندن) لەوێدا توشی ئاقیکارییە گرانەکە بومەوەو ئێش‌و ئازار لەشی داتەنیم بەجۆرێك کە قەت لەوەوپێش ئێش‌و ئازاری وام بەخۆمەوە نەبینی بوو ئارەزوویەکی ئاگراویم هەبوو بۆ ئەوەی بەدەنگێکی بەرز بگریم‌و هاوار بکەم چوومە ناو شەڕی شاردنەوەی هاوارەکانمەوە کە شەڕێکی زۆر گرانە.. بەلام دەستم نەهێنایە رێگەی فرمێسکەکانم.. لەبەر سەختی ئێشەکەم وازم لەقورئان خوێندن هێنا.. گریام‌و زۆر گریام.. دەریایەکم لەفرمێسك رشت.. نەفرینێکی بێشومارم لەشەیتانەکەی ناخم کرد!

داوام لێنەکرد لەشم بەجێبهێڵێت لەوێدا ئارامیەك روی تێکردم‌و خەوگرتمی‌و خەوتم.

ئەم ململانێیەی من لەگەڵ خۆمدا (١٥) پازدە رۆژی رێکی پێچوو دوای ئەوە ئێشەکانم

کەم ئەبۆوەو کەمتریش ئارەقم ئەکردەوەو فرمێشکەکانیشم وەستان، داوام لەخاوەن کێڵگە میهرەبانەکە کرد بمخاتە سەر ئیش‌و ئەویش رازی بوو.

بەیانی زوو هەڵسام.. نوێژی بەیانیم ئەکردو هەنگوینم ئەخواردو قورئانم ئەخوێند تا خۆر هەڵئەهات.. ئیتر ئەچوومە ناو کێڵگەکە.. ئاوم ئەداو خاکم ئەمدیو ئەو دیو ئەکردو جۆگە ئاوم هەڵئەگرت.. هەر کات هەستم بەهیلاکی بکردایە ئەگەڕامەوە ژوورەکەم‌و ئەنووستم.. لەسەرەتاوە زۆر ئەخەوتم، بەڵام وردە وردە خەو کەمی کرد.. دوای چەند مانگێك تەواو هەستم وابو کە شەیتانەکە لەشی جێهێشتووم.. الحمد لله.

چۆن شوکرانەژمێری ئەم هەموو نیعمەتانەی خوا بم، ئەو کات لەگەڵ خاوەن کێڵگەکە دانیشتم تا بەسەرهاتی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، بەڵام تەواو توشی سەرسوڕمان هاتم کە خاوەن کارو کێڵگەکە پێی وتم کە لەڕێگەی ئەو دکتۆرەوە کە هێناویەتی یەدیارم زانیویەتی من (تلیاکیم) و بۆ نەجات شیفا هاتومەتە ئێرە، دوای شەش مانگ هاوڕێ خاوەن کێڵگەکەم بردمی بۆ لای (پارێزگای وادی جەدید) کە ئەو (١٠) فەددان زەوی بەشانی کێڵگەکەی خۆیەوە بۆ وەرگرتم لەپارێزگارو دایمێ.

خاوەن کێڵگە گەنجەکەش (١٠٠٠) هەزار جونەیهی دامێ تا پرۆژە تازەکەم دەست پێبکەم‌و پێی وتم: ئەمە کرێی ئەو ماوەیەیە کە لەگەڵ ئەوا ئیشم کردووە.

ساڵێك لەسەر کارکردنم لەکێڵگەکەی خۆمدا تێپەڕی تەواو چاکبوومەوە بومە خاوەنی ماڵێکی بێخێزان‌و زەوی‌و پارەیەکی زۆریش.

گەڕامەوە بۆ (قاهیرە) بەدوا خێزانەکەما، شەیتانەکەم لێدورکەوتبۆوەو بیرم لەچارەنوسی خێزانەکەم ئەکردەوە.. بیرم لەکوڕەکەم، کچەکەم، لەهەموو شتێ ئەکردەوە.. هەزار خەیاڵم بەمێشکا هات: ئێستا هاوسەرەکەم تەڵاقی وەرگرتووەو شوی بەپیاوێکی تر کردووە، ئەم خەیاڵانە تۆقاندمیان‌و زۆر ئەترسام کە ببنە راستی (واقع) و بمگەڕێننەوە بۆ دنیای (بۆگەن‌و گەنیو دنیای موخەدەرات‌و تلیاك).

بەڵام دوبارە لەدڵی خۆمدا وتم: گەر واش بێت دەستی کوڕو کچەکەم ئەگرم‌و ئەیانبەمە ئەم شوێنە پاکە.. ئەی سەرەتا پێم ئەوتن کە خێزانم زۆر بەڕێزو بڕوادار بوو.. ئەو بەدرێژایی ئەو ماوەیەی دیار ئەمانم لەباوەڕی بەهێزو پتەویەوە لەدەسەڵاتی خوا دڵنیابوو کە چاکئەبمەوەو ئەگەڕێمەوە.

لەو ماوەیەشدا لەماڵی باوکی‌و لەگەڵ باوکە بڕوادارو خواناسەکەیدا ژیابوو.

ئای!! ئای لەشیرینی ئەو ساتانەی کە لەگەڵ کەس‌وکارما بەیەکتر شادبوومەوە، لەکاتی گەڕانەوەی خێزانیماندا بۆ کێڵگەکە خێزانم لێی پرسیم: چی شیفای دایت؟!

وتم: قورئان.. کەلامی خوا.. کتێبی خوا!

وتی: ماشائەڵڵا لەکتێبی خوا!

هەروەها خواردنی هەنگوین‌و ئاوی سازگار کە هەموو شتێکی زیندوو لەئاو دروست بووە.

بەڵێ ئازیزان! ئەمانە گشتی رووداوو قسەی گەنجێکن کە لەشەڕێکی سەخت‌و دەستەو یەخەدا جۆکی بە (هیرۆین ـ تلیاك) داداوە کە چەکی ئەم گەنجە لەو شەڕەدا (قورئان‌و خواردنی هەنگوین بوو پاشان هاوکاری موسوڵمانی دڵسۆزی خاوەن کێڵگەکە بەڵێ پەروەردەگار ئەفەرموێ (**فيه شيفاء للناس**).

هەروەها عەزیمەتێکی بەهێزو بڕیارێکیش کە گەڕانەوەی تیا نەبێت، ئێستاش ئەگەر یەکێك رێگەی بکەوێتە پارێزگای (وادی جەدید)ی وڵاتی میسر کێڵگەیەکی گەورە ئەبینێ کە پڕە لەباغ‌و باغات‌و داری بەردار، لەناویا دوو منداڵی کوڕوکچ بەوپەڕی بەختیارییەوە هەڵئەپەڕن‌و وازی ئەکەن، هەروەها ئافرەتێکی جوان‌و باڵاپۆشی دیندار کە چاودێری ئەم خێزانە ئەکاو گەنجێکی ئەسمەری ریشنیش کە بەدڵگەرمی‌و بەهێزی‌و تەندروستی‌و بەختەوەرییەوە کار ئەکا.. دەی ئێوەش ئازیزان هەریەك لەلای خۆتانەوە دوعای خێر بۆ ئەم خێزانە بکەن‌و ئاواتی بەختەوەری‌و کامەرانی تاسەریان بۆ بخوازن.

بەڕاستی ئەم خێزانە هەموو چاکەیەکیان شایستەیە.. چونکە هەریەکێك لەئەندامەکانی چونە شەڕێکی سەختەوەو بەسەرکەوتوویی لێی هاتنە دەرێ.. هیواش بۆ ئەو خوشك‌و برایانەی کە بڕوادارن.. بەدڵ‌و بەکوڵ بەدێڕی ئەم روداوە واقعیە بکەنە سەرمەشقی ژیانیان.. چونکە ژیان کەوتنە.. ئازا ئەو کەسەیە بەئازایەتیەوە هەستێتەوە.. کۆڵنەدەرو چالاك بێت.. ئیرادەو عەزم‌و بڕوای بەهێزبێت.

ملدان بۆ گوناهو تاوان زۆر ئاسانەو دەبیتە بەندی، بەڵام دورکەوتنەوە لێی، دوای هەستکردن زۆر بەگران دەرباز دەبیت لێی، جا بۆیە داواکارم لەهەموو بەڕێزێك ئاگاداری زەلکاوی بۆگەناوی چوار دەوری خۆی بێت، دوا ئامۆژگاریم لەهەموشیان گرنگترە! (پشت بەستن بەپەیام‌و بەرنامەکەی خوا (**واعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا**).

لەکۆتایی داوا لەهەر کەسێکی رۆڵەی موسوڵمانی ئەم کوردستانە دەکەم کە ئالودە بووە بەخواردنی هەر شتێکی وەك (مەی، جگەرە، تلیاك یا نەخۆشی لاشەیی) روو بکاتە قورئانو بەرنامەی ئیسلامو لەباتی خواردنی شتە حەرامەکان هەنگوینو شتە پاکەکان بخوات تا خوای گەورەو شیفای سەرجەم نەخۆشیەکانی بدات.

# ئیمامی مالکـو منداڵێک

منداڵ: ئەو بونەوەرە هەستیارە پاكو بێگەردە غەم ڕەوێنەیە کە ئاوێنـەی ئاسا دەدوێ، ڕۆژێك ئیمامی مالیك لە منداڵێك نزیك دەبێتەوە کە لەناوخۆڵدا یـاری بـە خـۆڵ دەکـات جارێك دەگری و جارێك پێدەکەنێت. لەگەڵ نەفسی خۆی دەدوێت ئیمام:

- بۆچی سـەلامی لێبکـەم؟ .. نـا بـا سـەلامی لێبکـەم چـونکە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) سـلاوی لـە منـدالان کـردووە. لـە منداڵەکـە نزیـك بـۆوەو وتـی: (**السـلام عليكم**)، منداڵەکەش وتی: **وعليكم السلام ورحمة الله و بركات**، ئیمامی مالیك.

ئیمام سەری سوڕما وتی: چۆن دەزانیت من ئیمامی مالیکم؟ منـداڵ وتـی: دەزانم.

ئیمام وتی: دیارە تۆ زۆر زیتەڵو زیرەکیت! پرسیارێکت ئاراستە دەکـەم!، منـداڵ وتـی: بفەرموو: ئیمام وتی: ئایا جیاوازی نەفسو عەقڵ چییە؟

منداڵ وتی: نەفس نەیهێشت سەلام بکەیت، بـەلام عـەقڵ قەناعـەتی پێکـردی و زانیـت سوننەتە سەلام کردن، کەواتە هەرچی بەگوێی نەفس بکات خەسارەومەنـد دەبێت.

ئیمام وتی: ئەی بۆ یاری بەخۆڵ دەکەیت؟

منداڵەکە وتی: چونکە لەم خۆڵە بووینو بۆ ئەم خۆڵەش دەگەڕێینەوە!...

ئیمام وتی: بۆچی دەگریتو بۆچی پێدەکەنیت؟

منداڵ وتی: دەترسم خوای گەورە بمانخاتە ئاگری جەهەنەم لەبەر گوناهەکانمان کە بـیر لە دڵو دەرونی بەپێزو خۆش بەختی خوای گەورە دەکەمەوە شاددەبم.

ئیمام وتی: خۆ تۆ منداڵیت و پاكو بێگەردی بۆچی دەترسی؟

منداڵ وتی: چاوم لێیـە دایکـم ئـاگر دەکاتـەوە بـەداری گەورەو پاشـان بـە چیلکەو داری بچووك ئاگرەکە خـۆش دەکات و بەتـەواوی دەگرێـت. منـیش دەترسـم بـە ئێمـە ئـاگری دۆزەخ گەرم بکرێتو بێچوی وەك ئێمەمانانی پێبسوتێنن.

# ڕۆحی ئاسودە

لەخزمەت مامۆستایەکی بەڕێزدا بووم (....) چەند ڕۆژێك بوو بە سەفەر چووبووە سەردانی دێیەك لە دێهاتەکانی شاربازێڕی سەخت، گوندی (دێری) نزیك مەروێ.

کورتەی سەردانەکەی بە مشێوەیە دواو.. بەیانی ڕێکەوتین بەرەو دێی ((....)) کاکی برا چوار دانە سەعات بەسەیارەی خۆشڕەو ڕۆیشتین گۆجو ئیفلیج بووین لەو سەیارەیەدا.. کاتێك گەیشتینە ناو دێ لەسەیارەکە دابەزین و هەوایەکی پاکمان هەڵمژی.. دوور لە دوکەڵ و هەرا هەرای پاس و سەیارەو شتی تر لەدڵی خۆمدا وتم : ((بۆیە خەلکی لادێ لەهەموو ڕوویەکەوە لە خەلکی شار ئاسودەترن)) نوێژی نیوەڕۆ خوێنرا... پاش نوێژ لەگەڵ ڕیش سپیەکدا کە بە تەمەنترین پیاوی ئەو گوندە بوو کەوتینە گفتوگۆ کردن، ناڕەحەتی ڕێگام بۆ باسکرد، کەچی مامە حاجی ڕیش سپی زەردە خەنەیەکی نەرمی کردو وتی : ((ئای مامۆستا گیان جا ئەوە چییە بەڕێزت باسی دەکەیت.. ڕۆژانێك بوو لەم دێیەی خۆمانەوە تا شاری سلیمانی بەکاروانی و بەکۆمەڵ و بار ڕۆیشتوین بەپێ.. بە هاوین و بە زستان.. هیچ هەستمان بە ماندویی نەدەکرد.. زۆر بەکامەرانی دەگەڕاینەوە، سوێندت لەسەرم نیە ساڵێکیان بەفرێکی زۆر باری بوو، لەگەڵ کاروانی کوتینە ڕێ بەرەو شار، لە ڕێگە لەکاروانی دابڕام.. بەفرە بەسەرە هەڵیگرتم[1] یا الله یا الله بەهەر شێوەیەك بوو خۆم گرتەوە.. کاتێك خۆمبینییەوە و چەند هەنگاوێك ڕۆیشتم زۆرم هەست بە سەرما دەکرد خەریك بوو ڕەق دەبوومەوە.. بەڵام بە هەڵەداوان و ڕاکردن بەرەو شار ملی ڕێگەم گرتەبەر بەو ڕچەی کە هاوڕێکانم شکاندبوویان کاتێ سەیر دەکەم چ ببینم تاکێك لە پێلاوەکانم لە پێما نەماوە.. نەتوانام هەبوو بگەڕێم بۆی.. نەشم ئەزانی لە کوێیا لەپێم داماڵراوە خۆم پێوە ماندوو نەکرد

[1] بەفرە بەسەرە: بەفر زۆر دەبارێت لێیدەکات بە سایەقە –ئاسمانی بێهەور- دەیبەستێت چویتە سەری دەخلیسکێ بەو بەفرە خزە لوسە بەستراوە دەڵێن (بەفرە بەسەرە).

بەسەر سەهۆڵو بەفرو زوقمادا کەوتمە ڕاکردن، تا کاروانەکەم دۆزییەوە، کاتێك چاوك کردن پڕ بەزارم هاوارم لێکردن.. وەستان تا گەیشتمەوە پێیان.. ئەوانیش نەیانزانی بوو کە دابڕاوم.. چونکە من پاشکۆی کاروانییەکە بووم. دەستمان کردە ڕۆشتن بەناو ئەو بەفرەدا ناو بەناو دەبووە هەورێکی تەماوی (مژە کوێرە) بەتەوزاوی یەکترمان نابینی.. بەو شێوەیە گەیشتینە ناوشار. منیش وتم: مامە حاجی گیان سوپاس بۆ خوا ئێستا زانستو زانیاری گەشەی کردووەو پەرەی سەندووە مرۆڤەکان کەوتونەتە ئاسودەیی).

مامە حاجی وتی: ڕاستە مامۆستا گیان زانستو زانیاری بۆ خزمەتی مرۆڤەکانە بەڵام جاری وەها هەیە ئەو زانستو زانیارییە مرۆڤەکان بەرەو داڕزانو تەمبەڵی نارەحەتی دەبەن تاوای لێهاتووە مرۆڤەکان قڕدەکەن بەو زانستە.. لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانیدا..

وتم بەشی ئەوەش زانست بەخۆشی دەگوزەرێت.

مامە حاجی وتی: مامۆستا گیان ساڵانی زوو هەموو لاشەمان لە هیلاکیو ماندویەتیو چەرمەسەریو تێکۆشاندا بوو بەڵام زەمیرو ویژدان و ڕۆحو ئیمانمان لە ئیسراحەتدا بوو، لەهەموو ڕوویەکەوە.. بەڵام ئەمڕۆ داهاتوش لاشەمان لە ئیسراحەتدایە.. ساردوو گەرمی ناچێژیو ئاسودەیە بەڵام لە ناخەوە.. لەبیرو باوەڕو دڵو ڕۆحی ئیمانییەوە لە گەورەترین ماندوبوونو هیلاکیدا دەژین ئەمە بێجگە لە چەندین سوکایەتیو دزیو درۆزنی کە بەرامبەر خاکو ئاوو گەنجەکانمان دەکرێت.. لەوەڵامیدا وتم: زۆر ڕاستە خاوەن هەستو زیرەکان گەر خوێندەواریش نەبن بەنوری ئیمانەکەیان تارکییەکان دەبینن

# دەرگای ڕەحمەتی خوا والآیە

مـاڵێكی هـەژار دراوسـێمان بـوون هـەزاری خۆشـە بـەڵام بتوانیـت بەرگـەی تاقیكردنـەوەكانی بگریت.. نـەدۆڕێت.. كۆڵنـەودەیت.. لـە سۆزو چاودێری خـوا بێبـەش نـەبیت.. ئـەم ماڵـە هـەژارە زۆر شـوكرو سـابیرو خۆڕاگربـوون.. ئـەوا ئـەمڕۆ جـەژنی قوربانە.. هەندێك لە پیاوانی گەڕەك كۆبونەوە.. ماڵ بـەماڵ دەگـەڕان.. لەدوایـدا وتیـان: ناچینە ماڵی كاك (...) گوناحن.. دەستكورتن.. ئێستا نقوڵیان نەكرپوە.. بەبینینی ئێمە ڕەنگە شەرم بیانگرێت خۆیان بەڕوو زەردبزانن...

بەڵێ لەو كۆمەڵە پیاوە كـەس لـە دەرگای نـەدان.. لـە كۆتایـدا یـەك دوو حـاجی پێیان نا بەجەرگی خۆیانـداو لـە دەرگایـان دا بـەڵام هـەر لـە دەرگـاوە جەژنـە پیرۆزەیـان لێكردن‌و نەچوونە ژوورێ.. ئەگەر چی كـاك (....) زۆر بەگـەرمی بـەخێرهاتنی كـردن، بەڵام پاش قسەو باس گەڕانە دوواوە.

دوا نیـوەڕۆی یەكـەم ڕۆژی جـەژنی قوربانـدا لـەو گەڕەكـەدا گۆشـتێكی زۆر بەخشرایەوە.. ماڵ بەماڵ دەگەڕا.. ماڵەكان بەشە گۆشتی خۆیـان بـۆ چـووە مـاڵ، بـاجی (....) كـە كابـانی ماڵـە هـەزاری كـاك (....) بـوو ئاگـاداری ئـەم قوربـانی‌و گۆشـت دابەشـكردنە بـوو، چـاوەڕوانی گۆشـت بـوو ئێـستا.. نـا .. ئێـستا لـە دەرگـا دەدرێـت بەخۆشـحاڵییەوە دەرگـا دەكرێتـەوە و گۆشـت دێتـە ژوورێ كـەس بـە ئەنـدازەی ئـەوان پێویستیان بە گۆشت نەبوو.. چونكە بـۆنی لـە ماڵیانـدا دەمێـك ڕۆژ بـوو تـەرە بووبوو.. بەلام مەخابن ئەو ماڵە لە یاد كران.. چۆن كەس نەچوو بۆ ماڵیان، پێیان ناخۆش بوو.. بەمەش ئەوەندەی تر دڵیان نـاخۆش بـوو.. بـاجی (....) كە چـووە ژوورێ بـەدڵتەنگی‌و بێزارییەوە بەدەم بۆڵە بۆڵەوە چەند قسەیەكی كرد.

کاك (....) وتی: ئافرەت ئەوەچیيە ئەو بۆڵە بۆڵە.. بۆچی بێتاقەتی.. هیچ ڕوویداوە.. باجی (....) وتی: پیاوەکە ئەوەندەی من ئاگادارم هەرچی دەوڵەمەندو ئاسیاو هەبوو گۆشتی قوربانی بۆچوو.. بەڵام ئێمەی هەژار کەس لامان لێنانکاتەوە.

کاك (....) وتی: ئافرەت تۆ وادەزانیت هەر دەوڵەمەند خاوەن گۆشتی ناردن‌و سەغاوەتن کوا ئێمە هەژارین.. سوپاس بۆ خوا لە چیمان کەمە؟.. لەقاپی خواو ڕەحمەتی خوا نائومێدمەبە!.. باجی (....) وتی: پیاوەکە إنشاوالله نائومێد نابم بەڵام هۆش ڕۆڵی خۆی دەبینێ.. ئەوەتا هیچمان بۆ نەهاتووە.. تەنها لە دەرگای ئێمە نەدراوە.. دە سەبرکە بزانە وایە..) کاك (....) ئافرەت گەر نسیبی ئێمە لەو گۆشتە قوربانیەدا هەبێت هەر بۆمان دەنێرن گەرواش نەبوو ئەوا بە نەخواردنی هیچ تەمەن کورت نابین.. گوێ مەدەرێ دەرگای ڕەحمی خوا زۆر والایە؟!..

چەند خولەکێکی باش تێپەڕی کاتێکیان زانی لەسەر دیواری ماڵی دراوسێیەکیانەوە پشیلەیەکی گەورە بازی دایە سەر دیواری ئەوان هات هات عەلاگەیەکی ڕەشی بەدەمەوە بوو خستیە حەوشەکەی ماڵی کاك (....) و باجی (....)و لێیدا ڕۆیشت.

کاك (....): ئافرەت لە ڕەحمو سۆزی خواری گەورە نائومێد مەبە، دڵنیام خوای گەورە بەو پشیلە هەژارەدا بەشی خۆمانی بۆ ناردوین.. کە گەرەك بیریان چووبووبێتەوە. بزانە وایە یان نا..

باجی (....) بە خێرایی چوو عەلاگەکەی هانی کە سەیریان کرد قسەی مێردەکەی دەرچوو کە بەشێك گۆشتی نەرمەی جوان بوو. لە ئەنجامدا کاك (....) وتی: گەر مرۆڤەکان هەژارو بێنەوا و کەم تواناکانیان بیر بچێتەوە ئەوا خوای گەورە لەبەندەکانی ئاگادارەو هاوکارییان دەکات.

# ببەخشن

کاك (....) پیاوێکی زۆر گرفتارو نارەحەت بوو بە نەخۆشی.. تابلێی پارەداریش بوو. چاری نەمابوو بە دەست نەخۆشییەوە.. ڕۆژێکیان لەسەر داوای پزیشکەکانی شار خۆی گەیاندە پایتەختی وڵات (بەغداد) بۆ چارەسەر.

دکتۆرەکان دوای پشکنینیو تاقیکردنەوە بۆیان دەرکەوت کاك (....) تەمەن ٤٥ ساڵ بۆرییەكو زمانەیەکی (صمامە) دڵی سست بونو بەرەو وەستان دەچێت.. دەبێت (نەشتەر گەری) گەورەی بۆ ئەنجام بدرێت ئەم نەشتەر گەرییەش دوو بەختی دەبێت. بۆیە دکتۆرەکان بڕیاریاندا، دوای هەفتەیەك بگەڕێتەوەو پارەو پێداویستی خۆی بهێنێتو بەڵکو ئەمە خوایە سەربگرێت. کاك (....) زۆر بەدڵتەنگیو پەژارەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە... بەدەمو چاوێکی ترشو تاڵو ڕوویەکی گرژەوە...

ئەندامانی خێزان گەورەو بچوك بەخێرهاتنەوەیان کرد، بە هەواڵی نەخۆشیەکەی بێتاقەت بوون، بەڵام زیاد لە پێویست دڵخۆشیان دایەوەو کارەکەیان لەلا ئاسان کرد..

ئەمیش لەناخەوە لەماڵو منداڵ زۆر نائومێد بوو.. نەیدەزانی چۆن ئەم دنیا ڕووناکەی لێتاریك بووە.. چۆن دەستی بچێتە خۆی کارێك بکات..

دایکی منداڵەکانی وتی : ((..پیاوەکە غیرەتت بێ دنیا واگران نییە.. غەموو پەژارەی کەست نەبێت.. خوا گەورەیە.. کێ دەڵێت دکتۆرەکان ڕاست دەکەن.. ئەوەی باسی دەکەیت زۆر ئاسانەو لەتۆیان گران کردووە، پیاوەکە غیرەت بەرە بەر خۆت خوای گەورە دەرگایەك دادەخاو هەزار دەرگای ڕەحمەت دەکاتەوە.. خەفەتی ناوێت!!..))

نانی نیوەڕۆ خورا.. هەرکەسەو هەستان بەلای کاری خۆیانەوە.. کاك (....) لەگەڵ (....)ی هاوسەری چونە ژوورێکی تایبەتو هەموو کاروبارەکانی ژیانی تەمەنی بۆ خێزانە خۆشەویستەکەی باس کردو بەجوانی وەسیەتی بۆ نووسی.. خێزانەکەشی -

ئافرەتەکە – کارەکانی زۆر بەسادەیی دەدی. نزیك عەسر بوو ئافرەت ووتی : پیاوەکە دەمانەوێت بۆ ئێواریٚ ((شفتەی گۆشت)) بخۆین هەستە لە بازاڕ تۆزێك پێویستی ((شفتە))مان لەگەڵ سەوزەو پێویستی بۆ بهێنەرەوە.. کاك ((....)) زۆر هەستی بەماندووی دەکرد.. بەلاّم زۆری لەخۆی کرد بەرەو بازاڕ کەوتەڕێ.. لەڕێگە ئەو چیرۆکەی بیر کەوتەوە کە ئەمە کورتەکەیەتی :

دوو پاسەوان بەفرمانی حوکمڕانی شار کابرایەکیان لەماڵەوە دەرهانی کەبیبەن بۆ لەسێدارە دان.. کاتێك دووریان خستەوە لەماڵ ژنەکەی ڕایکردو بە هەڵە داوان خۆی گەیاندە مێردەکەیو بەپاسەوانەکانی ووت :

((توخوا کاکی براینە پەلە مەکەن با قسەیەك هەیە بەمێردەکەمی بڵێم)) دوو پاسەوانەکەش بەزەییان پیاهاتەوەو وتیان ؛((بفەرموون)) بواریان دان..

ژنەکەش وتی : پیاوەکە دڵنیام تۆ بۆ شار دەبەن بەلاّم بەقوربانت بم لەولاوە کەهاتیتەوە ((کلو کلتور))ت بیر نەچێت بۆ چاوم.. بۆم بهێنەرەوە.)) پیاوەکەش وتی : وەی وەی من بۆ لەسێدارەدان دەبەنو خاتوونیش لە سەر بەزمی خۆیەتی. ناو بەناو لەم جۆرە خەیالاّنە بە بیرمدا گوزەریان دەکرد.. گەیشتمە بازاڕ. دەمێك ساڵ بوو لەلای کوڕێکی برادەرم کە (قەساب) بوو گۆشتم دەکڕی بوو بوومە ((معمیل))ی کام گۆشتە باشبو ئەوەی دەدامیٚ.. چوومە دوکانەکەیو قەدەریٚ دانیشتم.. داوای چەند کیلۆ گۆشتێکم کرد کاك (....)ی برادەرم بە سنگێکی فراوانەوە وتی : بەسەر چاو... - سەفەرەکەی بەغدادم بۆ گێڕایەوە، لەو کاتەدا برادەرەکەم گۆشتی دەکێشا چاوم لێبوو ئافرتێکی پیری بەسالاّ چوو لەوناوە دەسوڕایەوە لەم بەردوکانی تەماتە فرۆش بڕێك تەماتەی ڕزیوو لەو بەردوکانەی پیازو سەوزە فرۆشەش بڕێك شتە ترشاو گەنیوو ڕزیوی کۆدەکردەوەو لەولاوە بڕێك قەراغە کولێرەو لەتە سەمونی دەکردە ناو تورەکە گوێنیەکی بچوکەوەو ناو بەناو عەبا ڕەشە کاڵەوە بووەکەشی ڕادەکێشایەوە بەسەر سەریدا نەبا بادابکەوێتە خواریٚ.... گەیشتەلای ((حاوی))یەك کەدانرا بوو بۆ خۆڵو خاشاكو پاشماوەی دوکانەکان.. خۆی کرد بەناویدا.. منیش هەر سەیری دەکەم... دیمەنەکە زۆر کاری تێکرد بووم.. پاش کەمێك هاتە دەریٚ لە ((حاویەکە)) تورەکە گوێنیەکەی نیوە کرد بوو.. هاتە بەر دەم دوکانی قەسابەکە هەندێك پەراسوو ئێسقانو

ورده چەوری‌و چەق‌و لوو شتی فرێدراوی کۆکردەوە خستیبە ناو تورەکەکەوە. ویستی بڕوات بەناستەم بانگم کرد :

خوشکی باش بەیارمەتیت مەڕۆ، - ئافرەتەکە هەڵوێستەیەکی کرد – وەرە پێشەوە بزانم چەند کارێکم پێتە.. ئافرەتەکەش زۆر بەکزی‌و لاوازی هاتە پێش ووتی : فەرموو کاکی برا.. بزانم فەرمانت بە چیە؟

وتم : دەمێکە تەماشای تۆ دەکەم.. ئەو شتە ڕزیوو پیسانەت بۆ چیە؟

-تا ئەو کاتە وامدەزانی بۆ ((بەر خۆلەو مانگاو شتی تری کۆ دەکاتەوە)) بەلام کەهاتە لای قەسابەکە بۆچوونەکەم گۆڕا..

کاکی قەساب وتی : ئەم ئافرەتە ئەوە کارێتی بۆ کەسیش قسە ناکات... زۆر هەژار دیارە... ئافرەتەکە وتی : واز بێنە با هەر خۆم بزانم دەرمانی دەردی من بەتۆ ناکرێت ویستی بڕوات.. بەلام من منێك دەردە دار... دڵم نەرم بۆتەوەو ڕەنگە چەند ڕۆژێکی تر زیاتر نەژیم لەم دونیایەدا... با ئەم غەمەش بزانم... خوایە گیان هەر من گرفتار نیم... ئافرەتەکەم بەزۆر لەسەر کورسییەك دانیشاند.. زۆرم بۆ هانی کەلە ژیانی خۆی بدوێ‌و لە ئازارەکەی ئاشنابم. ئافرەتەکەش کەزانی زۆر تامەزرۆم بۆ بیستنی ڕاستییەکە، کەوتە بیر کردنەوەو پاشان چاوەکانی بڕییە سوچێکی بەرزی بن میچی دوکانەکە.. بەدەنگێکی نەرم‌و نەوی کەوتە قسەکردن ((براکەم.. زۆر دەمێکە باوکی منداڵەکانم بەر ڕەحمەتی خوا چوەو نەماوە.. دەست کورتم یەك دوو منداڵی بچوکم کەوتووە بەسەردا سەرباقی ئەوەش دانەیەکیان نەخۆشی ناو جێگەیە.. کارو کاسپی نازانم.. ماوەیەك باش بووین.. بەلام ئێستا باری گوزەرانمان زۆر خراپ بووە ڕۆژانە دێمە بازاڕ بۆ کۆکردنەوەی ئەم شتانە – دەمی تورەکەکەی کردەوەو سەیری کرد – دەرۆمە ماڵەوە بۆ منداڵەکانمی دەکەمە شۆربا ئەو لەتە کولێرەو قەراغە سەمونانەی تێدەوڵێ‌و دەیخۆین، لەخوا بەزیاد بێت توا خوا بەس نییە منیش هەم بۆ ئەم منداڵانە...))

لەو کاتەدا ئەو فەرموودە شیرینەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)م بیر کەوتەوە کە دەفەرموێت : ئەو کەسەی یارمەتی‌و کۆمەکی یا ئەرکی بەخێو کردنی منداڵی بێباوك (هەتیو) دەخاتە ئەستۆی خۆی من‌و ئەو لەقیامەتدا وەك ئەم دوو پەنجەیە بەیەکەوەین بە پەنجەی گەورەو شایەتومان ئاماژەی کرد.))

منیش لەدڵی خۆمدا وتم : فرسەتە با ئەم کردەوەیە بکەم پێش ئەوەی بمرم...

... خوشکی بەڕێزم من دەناسیت؟ کەمێك لێم ورد بۆوەو وتی نەخێر...

نەوەڵلا قەت نەمدیوی وتم : ئەی ئەم دوکانی قەسابە دەزانیت؟ دەیناسیت؟ پاش کەمێك سەرنج دان وتی : نەوەڵلا بۆچی کاکی برا.. ئەم پرسیارانە دەکەیت؟ ویستی بڕوات... نەمهێشت، دام نیشاندەوە و تم : لەم ڕۆوە تا لەژیاندا دەمێنیت لە مانگێکدا چەندەتان پێویستە لە گۆشت ئالەم دووکانە دەیبەیت بۆ خۆتو منداڵت، چۆنت حەزلێیە بەو شێوەیەلەسەر حسابی من کەوام وت چاوە پڕ غەمەکانی تێبڕیمو وتی جا بەڕاستە؟

وتم حەدم نییە گاڵتە بەکەس بکەم نەخوازەڵلا بەڕێزت ،

لەخۆشیاندا چاوەکانی پڕ بوون لە ئاوو فرمێسك لەچاوەکانیدا قەتیسم ما.. پاشان درێـژەم بەقسەکانم دا.. دەست بێنە ئەمەش بڕی ((١٠٠٠)) هەزار دینار ــسویسری- هەرئێستا بڕۆ بۆ خۆتو ماڵو منداڵت هەر چیتان پێویستە بیکڕە.. تاماویت لەم دوکانەش بڕێك پارمەتیت بۆ دادەنێم مانگانە وەریبگرە.. هەر چییەکت ویست لەم پیاوە وەیبگرە.. من حسابی لەگەڵدا دەکەمو بۆی دەگێڕمەوە..))

کاك (....) خێرا ((٣)) کیلۆ گۆشتی جوانی بۆ بکێشە با لەگەڵ خۆی بیبات..

کاك (....) ئەمەش ناو نیشانی ئێستامە گەرچی نەناس نیم ئەگەر نەمام .. لەماڵەوە پارەو پێویستی ئەم ژنە هەزارە وەربگرە وەك مانگانەیەك بۆی.. کاکی قەساب سەیرێکی کردمو زەردە خەنەیەکی کامەرانی کردو وتی : کاك(....) کەی ئێمە ئەوەمان لەنێوانماندایە. ئافرەتە هەزارەکە دوای وەرگرتنی گۆشتەکەو پارەکەی ڕۆیشتە دەرەوە لە دوکانەکە، چاوم لێبوو هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو چەند قسەیەکی کرد کەلە هیچیان نەگەیشتمو پشتی تێکردینو ڕۆیشت.. لەگەڵ دور کەوتنەوەی ئافرەتە هەزارەکە.. یەك موچڕکە لەبەری پێمی دا لەتەوقی سەرم دەرچوو هەستم بە ئارەقێکی سارد کرد پاش کەمێك باری لەشم سوك بوو.. هەناسەم کرایەوە.. تەنگەشەم نەما.. لێدانی دڵم زیادی کرد.. وەك دوو کەس قۆڵم بگرن زۆربە ئاسانی هەستامە سەرپێ لەسەر کورسیەکە.. ئەو خۆشیەم کاکی قەسابیش هەستی پێکرد لەڕوخسارمدا دەدرەوشایەوە.. وتی :

کاك (....) ڕووت زۆر گەشایەوە چی ڕوویدا؟؟

وتم نازانم.. خۆشم نازانم.. باری لەشم زۆر سوك بوو.. لەو كەسەی یەكەمجار ناچم لەناخەوە. پارەی كەرەسەكانم هەمووی دایە دەستی ویستم بەرەو ماڵ هەنگاو بنێم بگەڕێمەوە بەیەك دوو عەلاگەوە. بەڵام كاك(....)ی قەساب وتی: كاك (....)دڵنیابە دوعاو نزای ئەو ژنە هەژارە گیرا بوو خوای گەورە شیفای دایت.

لە ڕۆیشتنی ڕێگادا وام هەست دەكرد بارێكی قورسم لەسەر شان لاچووە.. زۆر گورج و گۆڵ گوزەرم دەكرد.

گەیشتمە بەر دەرگا.. لەدەرگام دا.. كاتێك كچە گەورەكەم دەرگای لێكردمەوە بەسەر سورمانەوە وتی : ئای باوكە ئەوە چییە كەڕەنگو ڕوخسارت گەش و جوانەكەڕۆیشتی بۆ بازاڕ وانە بویت چی ڕویداوە. زۆر جار دكتۆرەكان بۆ وورە بەرزی نەخۆشەكان ئەم ڕستەیە بە كاردەهێنن تانەخۆشەكە لەناخەوە هەست بەشیفا بكات. بەڵام ئەمەی من خۆم جوان هەستم بەشیفا دەكرد ڕاستی دەكرد.

((كچی شیرینم نازانم ئەمە تەنها خوا خۆی دەزانێت)). نانیان ئامادەكرد زۆر زیاد لە جاران ئارەزووی خواردنم دەكرد.. چێژێكی تایبەتی هەبوو لەلام ئەو شەوە بەئاسودەی نووستم.. زۆر جیاواز لەشەوەكانی ڕابردوو جار جارەش ئەهات بەدڵمدا : ئەمە كۆتایی ژیانمە.. بۆیە بەو شێوەیەم بەسەر هاتووە. پاش تەواو بوونی ئەو ماوەیەی كاكی دكتۆر بۆیان دانابووم چەند ڕۆژێك بوو، بەرەو پایتەخت —بەغداد— گەڕامەوە.

((چوومە ژووری سڵاوم لەكاكی دكتۆر كرد.. پاش پشكنینی و لێورد بونەوەم بەسەر سامییەوە وتی : كاكی بەڕێز تۆ ئەو كەسەی لای من ڕۆیشتی وانەبویت.. تۆ چویتە لای چ دكتۆرێك كێ كاری بۆ كردووی؟؟ تۆ تەندروستیت زۆر باش بووە .

بە زەردە خەنەیەكی پڕ بڕواو هیمەتێكی بەرزەوە وتم : ((كاكی دكتۆر (....) بڕوا بفەرموو نەچوومەتە لای هیچ دكتۆرێك بۆ چارەسەر بەدەر لەبەڕێزت.. دەتوانیت جوان ورد ببیتەوە.. بەڵام من ئەم ماوەی چەند ڕۆژە هەست بەباشی و بەرەو تەندروستی باش دەكەم. هۆكەشی وەك بۆی دەچم لەبەر خاتری خوا بەزەیم هاتەوە بەكەسانی كەم دەست و بێتواناو لانەوازدا، خوای گەورەش بەزەی هاتەوە بەمندا ( **من لايرحم الناس لايرحم الله**) كاكی دكتۆر وتی : بەسە.. بەسە.. لە خوا بەزیاد بێت

چارەیەکت کراوە هیچ دکتۆرێك لەجیهاندا ناتوانێت چاری وەهات بکات.. دیارە کارەکەت زۆر گەورە بووە بۆیە بەم شێوەیەشفات بۆ هاتووە.
بەرێزان لەم چیرۆکەدا :

١-پەندی زۆر جوانی تێدایە لە هەموشی گەورەتر چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا بین.

٢-بەزەی هاتنەوە بەکەم تواناو هەژاراندا.

٣-نائومێد نەبوون لەرەحمەتو بەرەکەتی خوای بەبەزەی.

تێبینی: لەساڵە گرانیەکانی دوای ڕاپەڕین و لەئەنجامی ( گەمارۆی ئابوری ) لەسەر عێراق و ( گەمارۆی عێراق)یش لەسەر کوردستان هەژاری زۆر بلاوبوەوە سوپاس بۆ خوا ( بعد عسر یسری).

# دایە گیان دەپێبڵێ!

چەندساڵێك بەر لە ئێستا، ساڵەکانی گرانی بوو لە سلێمانی، لە عێراق دا لە هەمووناوچەیەك، ساڵی ١٩٩٤ بوو خەڵکی بێزار بوو لە ژیان، ئەو پارەیەی دەستی دەکەوت لە کاسبیدا بەشی بژێوی ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی ناکرد.. نارەحەتی بوو خەڵکی بەدەست گرانی/ بێکاری/ هەژاری/بێنەوایی و چەندین شتیترەوە دە ینالآند. ئەوکەسەی پارەداریش بوو کەوتبوو.. من بەشبەحاڵی خۆم نارەحەت دەژیام لە شارۆچکەی (سەیدسادق) کە سەربەشاری سلێمانی بوو.. پڕ بوو لە ماڵی ئاوارە و کەم دەست و لانەواز ... ڕۆژێ لەگەڵ خێزانەکەم کەوتینە گفت و گۆ کە نانی بەیانی خورابوو.. دایکی منداڵان وتی: پیاوەکە چی بخۆین بۆ نیوەڕۆ .. هیچ شك نابەم لە ماڵدا.. منداڵەکانیش کە برسیان بوو وەك خۆمان ئارام گرنین.. بەڕێزان کابانی ماڵ ئەو پیشەیانە کە سفرەی ئەو ژەمە کۆکرایەوە غەمی ژەمی داهاتویەتی.. وتم ئافرەت خەمت نەبێت خواگەورەیە ((٣)) دیناری ئاسن شك دەبەم دەچمە بازاڕ بزانم چی دەکات بۆ پێخۆر.. خەرجی دەکەم بۆتان .. پاشان خوا دەرگای والآ تری لە لایە . بەڵکو کارێکیشم دەستگر ببێت !

دایکی منداڵەکانە وتی: جا سێ دینار بەشی چی دەکات بە تەمای چیپێبکڕیت سکمان تێربکات؟

ڕاستی دەکرد .. بەڵام گوێم لە قسەی نەگرت.. نەزانن بۆ؟ چونکە چار نەبوو ئەی چیدەکەیت؟ لەدەرگای ماڵهاتمە دەرەوە وردە وردە کەوتمە ڕێگەی بازاڕ.. ئەو ساڵەش پەیکەرێکیان لە گەچ بۆ ئەو دوو خوشكو برا قوتابیە دروستکرد بوو کە لە ڕێگەی چوونیان بۆ قوتابخانە ڕەق بوو بونەوە بەهۆی سەرماو سۆڵەوە). لەبەردەم ئەو پەیکەرەوە تێپەریم.. موچوڕکەیەکم پیا هات ئەو ساتە ناخۆشەم بیر کەوتەوە کەئەم دوو دڵپڕ لە هیوایە چۆن گیانیان سپاردووە.

رووم لەبازاڕ کرد تا بەو هیوایەی کارێکم دەستگیر ببێت.. کە چوومە بازاڕ هیچی وەها نەبوو پارەی تیا بێت. سێ دینارەکەم دایە دەسکێك سڵق و بەرەو ماڵ گەڕامەوە.. بەرێزان ئەم گرانیە تاقیکردنەوەیەك بوو، زۆر لە خەڵکی ماڵوێران بوو بە پارەو سەروەت و سامانەکەی جەهەنەمی بۆ خۆی کڕی، زۆر لەخەڵکیش لەم بارە گرانەدا ئاسودەیی و خۆشیان دەست کەوت، بەهەشتی سەرتاسەرییان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد. چەندە لەم ساڵە گرانیانە بدوێین کەمەو تەواو نابێت.

لەرێگەی گەڕانەوەمدا بەقەراغ جادەکەدا گوزەرم دەکرد ژنێك و منداڵێك لەدوامەوە دەنگیان دەهات گوێم لێبوو منداڵەکە دەیوت : دایە گیان دەپێی بڵێ.. دەتوخوا پێی بڵێ.. ئەگینا دەگریم.. دەگریم..

دایکیشی دەیوت : ڕۆڵە گیان.. نایناسم.. چی پێبڵێم.. چۆن شتی وادەبێت..

منداڵەکە دەستی بەگریان کرد.. گریا.. زۆر گریا.. هەردەهاتن بەدوامدا.. هەراسان بووم.. بێتاقەت بووم ئاوڕم دایەوە بەلای ژنەکەدا وتم : خوشکی باش ئەو منداڵە بۆ دەگری.. گوناهی چییە؟ بۆ لێیدەدەیت؟ ژنەکەش وتی :

((من لێیدەدەم.. من دەیگرێنم.. گوناهی منە یا گوناهی تۆ.. تۆ دەیگرێنی!؟ دەنگی بەرز کردەوە کەوای وت وەستام جوان سەرنجم دا.. لێی ورد بومەوە نەدەیناسم نەدەمناسن.. باشە خۆ لێم نەداوە. لەناخەوە منداڵم زۆر خۆشدەویست.. ئەیبۆ دەگریت ڕۆڵە.. چی ڕویداوە؟!.

ڕوم کردە ژنەکە، وتم : خوشکی باش بۆ گوناهی منە.. ئایا هیچ ئازارێکم پێگەیاندووە تا بەهۆی منەوە دەگری و فرمێسکی چاوی دەبارێتە خواری؟.

ژنەکە وتی : بەڵێ! واچەند ڕۆژێکە نەنانمان خواردووە نەچایی.. ئێستا هاتمە ناو بازاڕ هیچ شتێکم دەست نەکەوت بۆ منداڵەکانم.. منداڵەکەشم برسیەتی چاوی بەو سڵقەی دەستی تۆ کەوتووە دەگری بۆی حەزی لێیەتی.. هەرچیش دەکەم نیمە بۆی بکرم!!

منیش وتم : جا خوشکی باش ئەوە کێشەی خۆتانە.. من تەنها (٣) سێ دینارم شك دەبردلە ماڵی دنیادا.. کاریشم دەستنەکەوت.. ناچار دام بەو دەسکە سڵقە بۆ منداڵەکانم.. ئێستا ئەوانیش چاوەڕوانی دەستی منن.. ئەی بیدەم بەتۆ.. چی بۆ ماڵ و منداڵەکانم بەرمەوە!! ئەوانیش برسیانە.. منیش زۆر هەژارم.. بڵێم چی لەگەڵت..

خوا هاوکاریت بکات!! تا ئەو کاتە منداڵەکە هەر دەگریا، ژنەکە وتی: کاکە گیان.. بەس نییەماڵو منداڵ، تۆیان هەیت کارو کاسپیان بۆ دەکەیت من کەسو کاریشم نییە سەر وەسێتی منداڵەکانم بکات.. لە هەموو لایەکەوە لانەوازم. گەر یارمەتیمان بدەیت خێرت دەگا..)) لەناخەوە حەزم دەکرد بیان دەمێ بەڵام لەلایەکی ترەوە غەمی منداڵەکانی خۆشم بوو بۆیە وتم : خوشکی بەڕێز ئەمە بۆماڵی تۆ بێت ئەی ماڵی خۆمان.. لێمدا ڕۆیشم بەجێم هێشتن چەند هەنگاوێك.. منداڵەکە زۆر گریا..هاواری کرد دایکی ئامۆژگاری دەکرد: ڕۆڵە گیان بڵێم چی ئەویش بۆ ماڵی خۆی دەوێت.. ئەوانیش برسیانە لەناخەوە بیرم گۆڕا.. لە دڵێکی پاکەوە بەزەیم زۆر بەو منداڵە برسیو هەژاریو بێباوکەدا هاتەوە.. خوایەگیان لەبەرخاتری تۆ دەیان دەمێ.. هەر ئەوەنییە لەبرساندا دەمرین.. خوایەگیانە ئەمەش لەرێگەی تۆدا بەزایە ناچێت..

خێرا وەستام.. لەنگەرم گرت.. ژ ئەو منداڵە کەش لەجێگەی خۆیان وەستان.. بەڵام حەزم بەدەستپێشخەری کرد.. گەڕامەوە بۆلای ژنەکە وتم:

"خوشکی ئازیزم ئەم دەسکە سڵقە بۆخۆتو منداڵەکانت.. لەڕاهی خوادا.. منیش منداڵەکانم خواڕەحمیان پێبکات" دەستم درێژ کردو دامەدەست منداڵەکە.. منداڵەکە توند گوشی بەسنگییەوە.. هەردوو ڕوومەتە تەڕەکانی سڕێ.. لەخۆشیاندا دەستی کردە پێکەنینی.. دایکیشی ڕووی گەشایەوە.. ووتی: کاکەگیان مادام تۆ وات کرد.. منیش نیوەی دەبەخشمە منداڵەکانی تۆ بەڵام قبوڵم نەکرد.. دامە دەستیانو ڕۆیشتم ژنەکەش بەدەنگێکی شەرمنو نەرم وتی: "کاکە گیان ئێمە ناتوانین پاداشتت بدەینەوە، خوای گەورە پاداشتت بداتەوە، بۆتبکاتە توێشووی قیامەتت.. گەردنمان ئازاکە.. سەرفرازبیت خوات لەگەڵ.."

لەم جۆرە قسانە بەردەوام بوو.. من دوورکەوتمەوە.. ڕاستەقسەکان سادەبوون بەڵام لەناخەوە هەستم بەخۆشییەك دەکرد تا ئەوساتە چێژی لەو جۆرە خۆشییەم نەکردبوو.. زۆر ئاسودەبووم.. گەیشتمەوەماڵ.. دەستەکانم بەتاڵ بوو.. هەر دوای سڵاو لێکردنیان کەوتمە، یاریو قسەی خۆش.. کارێکی وام کرد.. کەس بیری نەبوو بڵێ: ئەرێ بابە چیت بۆ هانیوینەتەوە! با بیخۆین؟

دایکی منداڵەکان بەخێرهاتنەوەی کردم، بەڵام لەڕووخساریداو لەقسەکانیدا چەندین پرسیار دەخوێنرایەوە.. گوێم پێنەدا.. باش بوو شتێکی ئامادەکردبوو خواردمان.. سوپاس بۆ خوا دوای نوێژو حەسانەوە خێزانەکەم وتی:

" باشە (....) ئێوارە چی بخۆین؟!"

وتم: خوا گەورەیە دەرگای ڕزقی خوا والآیە.. خەمت نەبێت!.

وتی: ڕاست دەکەیت بەڵام.. نەم هێشت تەواوی بکات.

وتم: نان و چایی بۆ خراپە، باثازاری مەعیدەمان نەگات زۆرباشە خواردنی..

وتی: ئاخر نەگبەت.. شەکر نییە لەکوێ چایی دەخۆیتەوە.. پاشان سوتەمەنیشمان والە کزیدایە!

وتم: ئافرەت جاکەی ئەوە کێشەیە.. بەخورماوە دەیخۆین..

وتی: (....) زۆرجار لەشۆڕشی فەرەنسادا بەرگوێم کەوتووە کە خەڵکی شار ئارد نەبوو بیکەن بەنان.. دەچوونە بەردەمی کۆشکی پاشای فەرەنساو داوای نانیان کرد، پاشاش بەفیزێکەوە وتی: باشە گەرنان نییە بیخۆن ئەی بۆ کێك ناخۆن!

بەڵام من شەکرو خورمام نەبێت چیبکەم بەپێخۆری چایی..!

ئیتر لەو ڕۆژەوە چالە بەرنامەدا کوژایەوە.. ئەمەش لەبەر هەژاری کات تێپەڕی بەهەرچی ڕەزالەتێك بوو شتێکمان دەرخواردی منداڵەکانمان دا... لەگەڵ خێزانم پێمان وابوو: گەرنان هەبوو دەخۆین.. گەرنەشبوو ئارام دەگرین.. بەڕۆژو دەبین. دوای ئەوە چوینە ناو پێخەفەوە بۆ خەوو حەسانە بە دایکی منداڵەکانم وت: ئافرەت جوان گوێم بۆشل بکە، ئەو ٢ سێدینارەی بەیانی لەگیرفانمدا زرنگەی دەهات دامە دەسکێك سلق.. هەر هەموو ڕوداوەکەم بۆ گێڕایەوە بەجوانی..

ئەویش وتی: خۆزگەم بەخۆت کەتوانیوتە ئەو خێرە گەورەیە دەستخۆت بخەیت.. سوپاس بۆ خوا هیوادارم خوای گەورە لێتی قبوڵ کردبێت!..

سەرم کردە سەر سەرینی بەهێمنی چاوم چووە خەو.. لەقوڵایی خەودا بووم خەونێکی زۆر سەر سوڕهێنەرم دی ڕەنگە بڕوانەکەن؟!بەڵام حەز ئەکەم ئێوەش بزانن.. لەگەڵمان بن! دەشتێکی چۆڵ کاتێکم زانی پڕ بوو لەخەڵك ڕۆژ بەرزبووەو هەڵات.. خەڵکی هاواریان لێبەرزبۆوە.. دەگریان هەریەکەو بەلایەکا ڕایان دەکرد.. پرسیم ئەوە چیە؟ وتیان ئەتزانیوە چیبووە.. ئەی بۆ هاتووی؟؟ وتم بۆ؟! وتیان قیامەت

هەستاوە.. ئێستا تەرازوو دادەنرێت حەقو حسابی دنیامان لەگەڵ دەكەن. هەركەسێكم سەیر دەكرد دەموچاوی چرچو لۆچ بوو رەش داگەڕاو. هەناسە بڕكێیان پێكەوتبوو.. هەر زەلام بوو بانگ دەكرایە پێش زۆر دیمەنێكی ترسناك بوو.. كاتێكم زانی گوێم لەناوی خۆم بوو.. بانگرامە پێش!.. ناوی خۆم وتەوە.. وتەوە.. كاتێكم زانی تەرازوویەكی گەورە هاتەبەردەمم وتیان سەیركە، ئەم لایەیان چاكەو باشەی دنیای تیایە، ئەو لایەی تریان كردەوەی خراپو دوور لەخوای تێدایە.. چاوە ڕوانكە بزانە چی دەبینی!.

وردە وردە لای چاكەو باشەم بەرزبۆوە خراپەكان زۆر بوون تەرازووەكە لاسەنگ بوو وتیان: تا ئێستا ئەنجامت خراپە.. دوعای خێركە.. بەلام لەوكاتەداو لەتاو نارەحەتی بیری هیچم نەمابوو تەنها خەفەت و گریان نەبێت.. بەلام ئازیزان بیری ئەوكاتە زێڕینانەم كەوتبۆوە كە بەفیڕۆم دابوون كەدەمتوانی كاری چاكە بكەم بەلام نەمكردبوون، .. نەمتوانی بوو خوا لەخۆم ڕازیبكەم.. خێرو چاكەی زۆر ئەنجامبدەم.. خۆشەویستان ویستم هەنگاو بەرەو ڕێگەی دۆزەخ بنێم بانگیان كردم: جارێ ماوتە وەرە سەیركە..

كاتێكم زانی لەئاسمانی عەرشەوە یەك یەك نەرم نەرم وردەوردە گەلا سلق دابارینەو ناو تەرازووەكەم لای خێرو چاكەم قورسو بوو تادەهات زۆر دەبوو وایلێهات یەكسان بوو خەریك بوو بڵێم بەسە.. بەسە.. بەلام هەر هاتە خوار.. هەرهاتە خوار سوپاس بۆ تۆ خوایە ئەوەندە هاتە ناو تای تەرازووی چاكەمەوە كێشەكەی قورس بوو.. لەخۆشیاندا وتم: ئەوەچییە؟ دەنگێك لەنزیكمەوە وتی: ئەوە ئەو خێرە بوو كەئەنجامت دا.. سەیری پاداشتی كە خوا چەند بەرەحمە.. بەدەنگی بەرز وتم: سبحان الله .. الله اكبر ڕاچڵەكیم لەخەو خەبەرم بۆوەكە سەیرمكرد نیوەشەوە.. ماڵو منداڵ.. تەنانەت خەڵكی هەموو لەگەڵ درەختی ماڵەكانیش نوقمی خەون سەیری كاتژمێرم كرد.. "هەستم بەلەرزینی خۆم دەكرد.. سەرسام بووم.. هەرچی لاشەمە شەلالی ئارەق بوو. وتم: ( سوپاس بۆ تۆ خوایەگیان.. خۆت خاوەنی بەزەییت.. ) ڕاستیان ووتووە مرۆڤی وەها هەیە هەموو قورئانی بۆ بخوێنە لەگەڵ ژیان نامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و پیاو چاكاندا كاری لێناكات بەلام تەنها خەوێك دەیخاتە دنیای

**فراوانی ڕەحمەتی خواوە و بۆ خوا کاردەکات.. کاری لێدەکات.. بەڵێ سەرم نایەوە سەر سەرینیو نەم زانی کەی چاوم چووەوە خەو.. إن الله لا یضیع اجرا المحسنین.**

# کوا ویژدان؟!

لەڕۆژگاری ئەمرۆژدا خەڵك هەندێك كەرەسەو پێویستی بەپارەو نرخی خۆی ناكڕێ! كەدەپرسین بۆچی؟ دەڵێن: ئەو پارەیە – بۆ نمونە (١٠٠) سەد دینارە پارچەیەك قوماش دەكات.. چەند ڕۆژێكی تر بەو پارەیە دووپارچەی تر دەكڕێت.. ڕاستیش دەكەن چونكە "دراوی وڵات" خەریكە نرخ پەیدا دەكات.. وا نارەحەتی و ناخۆشی لەوڵاتدا كۆچ دەكاتو ساڵی ٢٠٠٢ بەو دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەكانی ١٩١٤ – ١٩١٨ كە گرانیو ناهەمواریو بێئومێدی باڵی بەسەر كوردستانماندا كێشابوو..

لە كەشكۆڵە پڕ بابەتەكەی باپیرم.. مەلا ئەحمەدی مەلا محمدی صد باری.. دەكەینەوەو یەكێك لەبابەتەكانی دەكەینە میوانی ئەم چەند چیرۆكە:

لەدێیەك میوانی ماڵێك بووم.. ساڵ گرانی بوو.. زۆر لەخەڵكی لەبرسانا مردبوون.. ماڵ نەبوو(٣-٤) كەسی نەمردبێت.. دێهاتیواهەبوو كەسی نەمابوو.. سوپای عوسمانلی هەموو پیاوانی گەنجی بەتواناى بردبوو بۆ "عەسكەری".

عەمارو خەزێنەو پشتیر گەڕابوون.. گەنمو جۆو پێویستیان بردبوو نەخۆشی دەردەگا بلاوبۆوە لەلادێكاندا.. ڕەشەوڵاخو حەیواناتی گۆشتی لەناوبردبوو نارد.. ناگر.. خوێ بوبونە دەرمانێ كەس دەستی ناكەوت.

خەڵكی زۆر بەسەختی دەژیان.. بەچاوی خۆم ئافرەتی مناڵە بەرم دەیووە لاشەی مندالە جگەر گۆشەكەی باوەشی كە مردووە لەبرسانا خواردوویەتی.. گۆشتی مردارەوە بوو دەخورا... كەئەمەش ئەوەندەی تر مەرگی زیندوانی نزیك دەكردەوە.. نارەحەتی باڵی ڕەشی بەسەرخەڵكیدا بتەواوی والا كردبوو.. كەس تەرمی كەس بۆ ناشاردرایەوە.. فریاناكەوتی.. هێزو توانا نەمابووا هەر كۆڵانو كوچەو سەر تەنورێكت دەدی" تەرم، كەوتبوو – لەڕووداوی هەڵەبجەی ١٩٨٨ دەچوو _ ئێوارە كەی لەماڵی پیاوێكی ناسیاوم میوان بوو.. دانیشتبوین هەروا باسی دنیاكەمان دەكرد، ئەو ساڵانە هۆی ڕاگەیاندن كەمبوو دەتوانم بڵێم هەرنەش بوو.. دوو ئافرەتی تازە پێگەیشتوو لە

تەمەنی ((١٧ – ٢٣)) ساڵ دەبوون هاتن لەدەرگایماڵەکەیان دابەزمانێکی پڕشەرمو ترسەوە وتیان: " کەسمان نەماوە، خاوەن ماڵ، تەنها ئەم دووانەمان دەرچووین خێرتان دەگات پڕ ئەو "مەنجەڵە مسە" خواردنمان بدەنێو، مەنجەڵە مسەکەش" بۆخۆتان هەڵگرن.."

لەو ساڵانەدا مەنجەڵی مسی بچووك کە ((٣)) لیتر ئاوی دەگرت – بەنرخو بەقیمەمەت بوو.. ئەم دووکچەش هەرئەوەیان شك بردبوو لەشتی باشو ئەنتیکە لە ماڵەکە داهانی بویانو ڕوویان کردبووە ئەو دێهاتانە، بەمەبەستی سەعاتێك درەنگتر بمرن.. یان هیچ نەبێت کەسێکی بەتوانا بیان گرێتەخۆ.. سانەمە خوایە لەمەرگ ڕزگاریام ببێت، بەڵام بێسوود بوو چونکە ئەو خواردنەکەم بوو کەس بەشی کەس نادا "نەفسی .. نەفسی" بوو..ڕەنگە بڕوانەکەن ساڵیش زۆر سەخت بوو سەرماو سۆڵە بڕستی لەخەڵکە کە بڕیبوو، بوو بووە هۆی لاوازیو ڕەق بوونەوەی خەڵکی..

بەڕێزان کەئەم بابەتە دێتەوە بەبیرمدا ساڵی ئاوارەبوونی ١٩٩١ و گرانیەکەی ((١٩٩٢ – ١٩٩٦))م دێتەوە یاد ئەمەش لەپێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژیادا گرانیەکی بێوێنە بوو یەك کیلۆ ئاردی ئاسایی (٢٥) دینار بوو جگە لە شتێتر کەدەست هەموو کەس ناکەوت... خاوەن ماڵ وتی: خوشکان ئێمە ئەوەندە خواردنمان نییە کەبەشی ئێوەی لێدەین.. ڕەنگە ئێمەش وەك ئێوە لەتاو برسێتی سەرگەردان ببین کەس خۆمان ناگرێت.. لەبەر ئەوە بڕۆن بەڵکو ماڵێکی تربتان گرنەخۆ.. یان بەشتان بدەن)).

دووکچەکە زۆر پارانەوە زۆر لالانەوە ناوجەرگی منیان دەچوزاندەوە.. بەڵام بێسوود بوو.. ناچار ڕۆیشتن پێم نابەجەرگی خۆمداو وتم: باشە کاك (....) بۆ خواردنیان نادەنێ.. گوناحن.. پاشان خواردنیش هەیە؟ کاك (....) وتی: جا بۆ بیاندەینێ.. ئەم شەو لەبرساناو لەبێهێزیو لەسەرماندا ڕەق دەبنەوە.. گەرماینو نەمردین بەیانی دەچین مەنجەڵەکەش دەهێنین بۆخۆمان.. لەم قسانە زۆر نیگەران بوو ویستم ئەو ماڵە بەجێ بهێڵم.. بەڵام ڕوولەکوێ بکەم منیش لەسەرماندا ڕەق دەبمەوە.. ((لەو ڕۆژگارانەدا پاروویەك نان گرنگتر بوو لەنرخی مرۆڤێك، ویژدانیش نەمابوو لەسەرمانا ئەویش ڕەقبو بۆوە..)) ئەو شەوە تێپەڕی.. بەیانی زووبوو چوومە دەرەوە.. دوورکەوتمەوە لەماڵەکە بۆ کاری سەرئاو سەیرم کرد لەسەر تەنورێکی بچوو ك لەنزیك ماڵەکەبوو هەردوو کچەکە باوەشیان کردووە بەیەکدا.. وام زانی لەخەوێکی

قوڵدان.. بانگم کردن. بەڵام وەڵام نەبوو دووبارەم کردەوە.. بەڵام بۆم دەرکەوت کە لەبرسانداو لەسەرماندا هەردووکیان گیانیان سپاردوو.. ((مەنجەڵە مسەکە))ش لەولاوە کەوتبوو ((ماڵو سەروەتو سامان دادی نەدان)) هەناسەیەکی قوڵی ساردم هەڵکێشا.. بەڵام چی دەکەی لەدەست نەبووونی.. لەدەست هەژاریو ڕوتی زەبونی.. بێویژدانی...))

بەکۆمەڵێ خەفەتەوە چوومە ژورەوە، بۆ خاوەن ماڵەکە (خانەخوێکەم) باس کرد.. ئەویش خێرا وتی: ئادەی (....) کە خێزانی بوو بچۆ ئەو مەنجەڵە بهێنە کەپێیان بووە بایەکێکیتر هەڵێنە گرێتەوە.. دادە(....) وتی: مامۆستا نەمان ووت بەیانی دەبینە خاوەنی مەنجەڵەکە))لەداخانا نانی بەیانم نەخوارد.. ئەو ماڵەم بەجێهێشتو دوورکەوتمەوە لەو دێیە... بەڵام خوێنەرانی بەڕێز، مرۆڤەکان زۆر بوون.. بەکارەساتێك یان بەرووداوێکی کەم وێنە کەم دەبنەوە.. بەڵام خۆشە لەتوانای خۆتا هەر چی دەتوانی بیکەیت کردەوەی باش.. لەکۆتایدا دەڵێم: تەنگانە بەری کورتە.. لەدوای هەمو سەرکەوتنێ دابەزینی هەیە.. چاکی بۆ ئەو مرۆڤانەی کردەوەی خێرو چاکە ئەنجام دەدات.

# حەیا و شەرم

سەردەم سەردەمی عوسمانیەکان بوو.. لە ناو شاردا وەك بنكەی ئاسایشی ئێستا شەوانە (جەندرمە) كەوەك پۆلیسی ئێستا وابوون دەردەچوون بۆ پاراستنی هێمنیو ئاسایشی ناو شار.. ساڵ ١٩١٣ بوو، شەو شەوی زستان بوو..

سەرۆكی جەندرمەكان لەگەڵ چەند جەندرمەیەكی تر بەناو شاردا دەگەڕان تاڵە نزیكەوە سەردانیبنكە ئاسایشیەكان بكەن.. كات نیوە شەو بوو بەلای ماڵێكدا تێپەڕین گوێیان لە دەنگی ئافرەتێك دەبێت كەلایلایە بۆ منداڵەكەی دەكات.. قەدەرێك گوێدەگرن زۆر دەنگەكەیان بەلاوە غەریب دەبێت بۆیە سەرۆكی جەندرمەكان دەڵێ :

((بەیانی ئەم ئافرەتەم بۆ بهێننە بارەگا))

بۆ بەیانی ئافرەتەكە دەهێنن لە بەردەم سەرۆكی جەندرمەكاندا ڕادەوەستێت دەپرسێت لە ئافرەتەكە :

مێردەكەت چ كارەیە؟

ئافرەت : نەماوە.

- چەند منداڵت هەیە؟
- تەنها یەك منداڵو زۆریشم خۆش دەوێت.

سەرۆك : گوێمان لە دەنگت بوو دوێشەو.. لایلایەكی زۆر خۆشت دەوت -بەزەردە خەنەیەكەوە- ئافرەتەكە سەری داخست.. بێدەنگ بوو.

سەرۆك : دەزانیت بۆچی بانگمان كردویت؟

ئافرەت : نەخێر..

سەرۆك : ئەمانەوێت گوێمان لەو دەنگە خۆشەت بێت بۆ جارێكی تر.

ئافرەت : ناتوانم!

سەرۆك : ناتوانیت بێفەرمانی من بكەیت!.

ئافرەت : ناتوانم!.

سەرۆك : پارەیەكی باشت دەدەمێ دوو (٢) لیرە.

ئافرەت : ناتوانم!.

سەرۆك : بۆت دەکەمە سێ (٣) لیرە.

ئافرەت : ناتوانم!.

سەرۆك : کەللە ڕەقیم لەگەڵ مەکە بۆت دەکەمە شەش (٦) لیرە. نزیکەی شەش هەزاری ئێستا دەبوو.

ئافرەت : قوربان ڕووم نایەت.. شەرم لە بەڕێزتو کەسانی تر دەکەم.. حەیا دەکەم لەخزمەت بەڕێزتان دەنگ هەڵبڕم!.

سەرۆك : فەیناکە دەتوانیت بچیتە ئەودیو ئەو پەردەیەوە کە دەیبینیت.. لەوێ ئێمەت لێوە دیار نییە بۆمان بڵێ، ..باشە.

ئافرەت : ئاخر هەر شەرم دەکەم!.

سەرۆك : ئادەی کوڕان ئەو پەردەیەی بۆ بگێڕن.. بفەرموو بچۆرە ئەودیو ئەو پەردەیەوە. ئافرەت لە دیار نەبوونی ئەوان‌و پارەکەشی لەلا کەم نەبوو! بە شەرمێکەوە چووە ئەو دیو پەردەکەوە.. پەردەکە هەڵواسرا بوو بەتەواوی نەگەیشتبووە زەوی، هەردوو قاچی ئافرەتەکە تانزیك ئەژنۆکانی دیار بوون. دەستی پێکرد.. یەك دوو بەندی زۆر خۆشی بۆ هەموویان وت.. لەم کاتەدا سەرۆك ئاماژەی بەپیاوەکانی داو، وتی: " سەیری قاچەکانی بکەن" کە هەموو سەرنجیاندا ((تك تك.. زەنگۆڵ زەنگۆڵ)) ئارەق دەچۆڕایە ناو پاتەکانی کەلە پێدا بوو.. ئافرەتەکە هاتەوە ئەم دیو پەردەکە بۆلای سەرۆك‌و هاوڕێکانی بەدەسە سڕەکەی کە هەموو دەم‌و چاوی زەنگۆڵە ئارەق بوو بە جوانی سڕی‌و لاشەی تائەو کاتەش دەلەرزی.. پاش کەمێك حەسانەوە.. پارەکەی وەرگرت‌و گەڕایەوە ماڵ....

برادەرەکانی سەرۆك لەم کردارە زۆر سەرسام بوون.. دەیان ویست بپرسن.. بەڵام زاتیان نەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی، بەیانیەکەی لە هەمان کاتدا لەدەرگا درا.. سەرۆك فەرمانی کرد بیکەنەوە، کە دەروازەیان کردەوە.. تەماشایان کرد ئافرەتەکەی دوێنێیە.. هاتۆتەوە.

سەرۆك : فەرموو بزانم بۆچی هاتووی؟

ئافرەت : وەك دوێنێ تۆزێك لایلایەی ترتان بۆ دەڵێم!.

سەرۆك : فەرموو..

ئافرەت : چەندەم بۆ حساب دەکەیت!؟

سەرۆك : چەندەت دەوێت؟

ئافرەت : (٦) شەش لیرە!

سەرۆك : زۆرە    ئافرەت : (٣) سێ لیرە

سەرۆك : زۆرە    ئافرەت : (٢) دوو لیرە

سەرۆك : زۆرە   ئافرەت : بەخۆڕایی

سەرۆك : نامانەوێت گوێمان لەدەنگت بێت!

ئافرەت : بەسەر سوڕمانەوە، بۆچی.. خۆ دەنگم زۆر خۆشە!..

سەرۆك : وتم نامانەوێت! بەرەقی‌و نیمچە توڕە بوونەوە.

ئافرەت : هەر حەز دەکەم بۆتان بڵێم!.

سەرۆك : بفەرموو

پاش تەواو بوونی ئافرەتەکە ڕۆیشت، ئەمڕۆ بەپێچەوانەی دوێنێوە بوو.. نە هەواڵی پەردەی پرسی‌و نە ئارەق زەنگۆڵ زەنگۆڵ ڕووی گرت.. نە لاشەی لەرزی‌و نەحەیاشی لەپیاوەکان کرد.

بەم شێوەیە چەند ڕۆژێك ئەهات‌و بەدەستی بەتاڵ ئەگەڕایەوە. پاش سێ جار سەرۆك وتی : ((ئیتر بێیتەوە بەم ناوەدا قاچەکانت دەشکێنم.. بڕۆ نەیەیتەوە)). تووڕە بوو.. ئافرەت لەو ناوە نەما هاوڕێکانی زۆر ئەم ڕوداوەیان بەلاوە سەیر بوو لێیان پرسی : قوربان تۆ یەکەم جار پارەیەکی یەکجار زۆرت دایە ئەو ئافرەتە کەچی ئێستا بەخۆڕایش لایلایە دەڵێت تۆ ناتەوێت.. پاشان دەریشی دەکەیت.

سەرۆك : بە پێکەنینەوە ((من دەنگی ئەو ئافرەتەم بەلاوە خۆش نەبوو.. تەنها ویستم حەیاکەی شەرمەکەی بزانم.. دڵنیابن حەیاو شەرم‌و شکۆی نەما!))

وتیان : چۆن؟! سەرۆك : یەکەم ڕۆژ سەرنجتاندا ئارەقی حەیاو شەرم زەنگۆڵ زەنگۆڵ چۆن ئەتکایە ناو پێڵاوەکانی.. بەڵام ڕۆژەکانی تر وانەما... سەرنجتان دا؟؟ وانەما!؟ وتیان : بەڵێ بینیمان.. وابوو؟! سەرۆك : بەپێکەنینەوە مرۆڤەکان ئەوەندەیان زەحمەتە تا حەیاو شەرم‌و شکۆیان ئەتکێت.. چاوتان لێیە ئێستا چەند بەئاسانی دێتە ژووری.. حەیا قەترەیەك ئاوە کەتکا.. ئەتکێت‌و تەواو.

بەڕێزان : زۆر وریای خوشك‌و دایکمان.. خۆمان.. کەس‌و ئاسیاومان ببین. گورگە برسیەکان حەیاو ناموس ئەتکێنن، بەناوی گەورەو باق‌و بریقەوە بەناوی نان پەیدا کردنەوە.. وریای حەیاو ناموس بین.

برایان حەیاو شکۆی کەس مەبەن.. تاکەسیش حەیاو شەرمو شکۆی ئێوە نەبات..
دەغیلە ئامان حەیاو ناموسو شەرەفو شکۆی خۆتان خۆش بوێت.. لە هەر جێگەیەکن.
گەر شتی وەها، هاتە پێش بەرگری لێبکەو هاوکاری نەکەیت.
((کەشکۆڵی مەلا ئەحمەد))

# لەسایەو سێبەری باوەڕدا...

تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو لە بەردەم دوو ئافرەتو پیاوێکدا!.

دوای تێپەڕ بوونی چەند ساڵێك بەسەر ئەو ڕوداوە لە ساڵی ١٩٩٥ ڕوویدا بوو هاتەوە یادم بیکەمە یاد نامەیەك بۆ ئەو خوێنەرە بەڕێزانە.

ساڵی ١٩٩٢ تا ئەمڕۆ کە ساڵی ١٩٩٦ گرانیو نارەحەتی باڵی کێشاوە بەسەر هەموو شارو وڵاتدا خاوەنی قەمەرەیەکی لادا بووم، لەناو شاردا کاسپی ((کرێ))م پێدەکرد.. زۆر داغانو شڕۆڵە بوو هەرچیم هەبوو تیام خەرج کردبوو، ئەوەی پێم پەیدا دەکرد بەشی ئەوەندەی دەکرد کەتیایدا خەرج بکەم، سەری ئەڕۆیو لاشەی ئەلەرزی، کار هاتە ئەوەی تایەشی پێوە نەمایەوە، چەند تایەیەکم لەیەکتر هەڵکێشا بوو.. ڕۆژێکیان بەخێزانەکەم وت : ئافرەت ناچارم کاروکاسپی بەو لادا شڕە نەکەم.. بزانم کارێکی تر نادۆزمەوە؟! ئەویش لەسەر خۆ وتی : بۆچی بێزار بوویت لێی؟!

وتم : ئەگەر بێزار ببم ناحەقمە تا ئەملای چاك دەکەم ئەولای تا ئەولای چاك دەکەم لایەکی تری خراپ دەبێت خەریکە شێت دەبم وا (تایە)شی پێوە نەماوە.. بەبێ ((تایە))ش خستنە سەر چوار بلۆكو وەستانی باشترین چارە سەرە.

خێزانەکەم خوا سەر بەرزی دنیاو قیامەتی بکات زۆر دڵسۆزی نواند وتی : پیاوەکە سەری بێرزقو ڕۆزی لە ژێر خاکدایە.. خوای گەورە دەرگایەك دادەخاتو هەزار دەرگای خێرو بەرەکەت دەکاتەوە.. ئارامت ببێت))

وتم : جا مەبەستت چییە ئافرەت؟

وتی : بووەستە!، ڕۆیشت بۆ ژوورێکی تر تۆزێکی پێچوو پاش چەند خولەکێك هاتەوە..

وتی : بگرە ئەمەم شك دەبرد لەدارەی دنیادا.. ئاڵتوونەکانمە.. جوانترین یادگاری منو تۆیە بیبە بیفرۆشە.. بەپارەکەی چەندەی کرد لە (تایە) پێبکڕەو تا ئەوەش تەواو دەبێت خوا دەروازەیەکی تر دەکاتەوە!

بەڕاستی سەلماندی هاوسەرمە.. خەمخۆرمە.. لە یەکەم ڕۆژەوە بەڵێنی هاوسەریمان دابوو بەڵام بەکردەوە سەلماندی.. بۆیە منیش لەیەکەم ڕۆژەوە خۆم بۆ خۆشیو ماڵو منداڵ یەکلایی کردبۆوە.

بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە ئاڵتونەکانی دامێ.. بردم بۆ بازاڕ چومە لای زەرەنگەر، فرۆشتم تەنها ((٤)) هەزاری گرتەوە.. خوانەیبڕێ.

پارەم خستە ناو (داشبڵی) سەیارەکەو بەسەرو دڵی خۆشەوە بەرەو بازاڕی تایە فرۆشەکان ڕۆیشتم.. لەپڕ ئەفەرێکی ((عەبا)) بەسەر دەستی لێراگرتم.. هات بەبیرمدا ئەو ((داخلی))یە بەرم ئەوسا بچم تایەکان بکڕم.. وەستام ئافرەتێك بوو بەدەنگێکی نەرمو شەرمن وتی : برا داخلی دەکەیت؟

منیش لەو پەڕی دڵخۆشیدا وتم : بەڵێ فەرموو سەرکەوە، ئافرەتەکە سەرکەوت ڕۆیشتین ڕۆیشتین.. چەند کۆڵانێکمان بڕی.. تا گەیشتینە دەرگای ماڵ هیچ قسەی نەکرد.. کاتێك ویستی دابەزێ خۆم ئامادە کردبۆ پارە.. کەچی وتی :

((کاکە فەرموو بەڕێزت دابەزە تۆزێ کارم پێتە!؟)) سەیارەکەم کوژاندەوەو بەردێکم بۆ تایە شڕەکانی دانا.. نێ نەوەکو تلۆر ببێتەوە.. ملم گرت بە لارەوە وتی : وەرە ژوورێ..باشە ناچار هەر ملم نا.. لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا چەندین خەیاڵو ڕووداو بە مێشکمدا تێپەڕی.. لەوانە وتم : ((ڕەنگە فەردە ئارد یا جلو شتی هەبێ بەمن باری بکات یان.. یان..)) بەڵام کاتێ دەرگای حەوشەی کردەوەو چووینە حەوشەکەوە دەرگای ژوری کردەوە.. تەنها دوو منداڵی ڕووتی داماوم لەژێر بەتانیەکی بۆری[1] تەنکدا بینی... ژوورەکە ئەت گوت سەلاجەیە.. ماڵ ڕوتو قوت.. بەبینینی ئەم دیمەنە.. چەندین خەیاڵاتی تر بەمێشکمدا گوزەری کرد، ئافرەتەکە وتی:

کاکە تا ئەم حاڵەم هانیوە هەر کارم بۆ کردون بەهەزار کوێرەوەریو دەردی سەریو ناخۆشی ژیاندومن ئەم ماڵانەی بەرو دراوسێ ماڵیان ئاوەدان بێت هاوکاریان کردووم.. ئەم دوو منداڵە باوکیان نەماوە.. تا هێزم تیابووە هەوڵم داوە کەپارووە نانی

---

[1] بەتانی بۆر: ئەو بەتانیەبوو کە (تەحالوف) دەیبەخشیە دانیشتوانی ئاوارە لە کوردستاندا ساڵانی ١٩٩٢ زۆر تەنكو سوکەڵە بوو.. لە بازاڕدا نرخی هەرزان بوو.

حەلالاو زولالم دەرخوارد داون.. زۆر غەمیانم خواردووە.. بەلام.. بەلام ئەمرۆ ڕوم لەتۆناوە بۆ پارووە نانێك.. چونکە ماوەی ((٤)) ڕۆژ دەبێت بەبرسێتی ڕامکێشاوە لەگەڵیاندا.. دەنگی گۆڕاو پچڕ پچڕ بوو، گریان قورگی گرت بەلام بەردەوام بوو لەقسەکردندا.. لەم ڕۆوە بڕیارم داوە پارووە نانی حەرامیان دەرخوارد بدەم تا بتوانین بژین.. چیبکەم ناچارم.. یا ئەوەتا لەناویان بمرم بە هەرچی ڕێگەیەك بووە.. دەغیرەتی پیاوەتیت بجوڵێت. کەوای وت موچڕکەیەك بە شێوەی تەزوویەك لە نوکی پەنجەی قاچمەوە تێپەڕی لە تەوقی سەرمەوە دەرچوو.. هەموو گیانم سەر نارەقی شەرمەزاری گەڕا.. " خوایە گیان من بۆچی هاتم.. ئێستا توشی چی بووم.. ڕەنگ لەسەر ڕەنگ دەگۆڕا.. پلەی گەرمی دەمو چاوم بەرز بۆوە.. گەر ئاوێنەیەك بەرامبەرم ببوایە لە چەوەندەری سوور دەچووم.. ئاهو ناڵەی ئەو ژنەو ناڵەباری باری ئابوری خۆمو جوڵەی بڕواو پشت بەستن بە خوای گەورە هەمووی وەك هەرەس دەهاتن بەسەرمدا کاسبوم.. گوێکان کپ بوون.. گەر من کارێکی ناشەرعیو دوور لەخواو بەرنامەکەی ئەنجام بدەم جێگەکەم کوێ دەبێت؟

ئەی ئەم ئافرەتە بەوە کۆتایی بە ئەندێشەو زامەکانی دێت.. ئەی ئەو منداڵانە لە پاشەڕۆژدا ئومێدی چیان لێدەکرێت.. کەی من مرۆڤم ئەتوانم هاوکاریان بکەم.. بەلام بەچی.. خوایە گیان هاوکاریم بکە.. لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی گەورەدام تۆ بڵێی ئەمە خەو نەبێت؟! .. " ناو بەناو ئافرەتەکەش دەیوت : بواری دەرچوونت نییە بیر لە چی ئەکەیتەوە دەی بۆ ناجوڵێیت.. بۆ چەقیویت.. خێراکە..

((ئاخر بەرێزان لەو کاتانەی کارێك یان هەر شتێکی حەرام ڕوت تێدەکات لەو کاتەدا پلەی باوەڕت دەپێورێت.. نەك لەکاتی ئاسودەییدا))

بۆیە کەمێك بیرم کردەوە لەو کاتەشدا تا دەهات هەستم بەترپەی دڵم دەکرد لەزیاد بوندا بوو.. وەخت بوو دڵم لە لێدان بکەوێت..مێشکم بتەقێت.. خوایە گیان خوانە خواست گەر من کاری نابەجێم کرد، لەدوای من ئەم ئافرەتە زیاتر بەر دەوام دەبێت لەو بەردەوامییەدا منیش بەشدارم هەمان گوناهم بۆ دەنوسرێت.. خوای گەورە زۆر شتم لەبەر خاتری تۆ کردووە دەروازی دەرباز بوونم بۆ والاکەیت.. توشی خراپە نەبم.. نازانی چیبکەم باشە.. چ ڕێگەیەك هەڵبژێرم..

وەك بروسكەيەك.. يەك خەيالّی خۆش بەبیرمدا گوزەری کرد، ڕووم گەشايەوە.. زەردە کەوتە سەر لێوانم ئافرەتەکەش وتی : ئافەرم.. خەریکە خۆت یەکلایی دەکەیتەوە.. فەرموو . وتم : خوشکی باش.. تۆ وتت ئەمە یەکەم کارە کە بەحەرامی دەیگریتە بەر؟!
وتی : خوشكو براو حەرامو حەلاڵ بۆ من مەهێنەرەوە کات درەنگە.. ژیان.. نان گرنگن.
وتم : ئەی خوشکی بەرێزم ڕاستە.. نان .. ژیان.. زۆر گرنگن بەلام ژیانی کۆتایی وەستانی بەردەم خوای گەورە.. ئەی ئەو کاتانەی کە بۆ خوا خۆت ماندوو کردووە.. ئەمانە وەلامیان چییە؟ ئەی ئیمان.. لێپرسینەوە.. ئەی ئێمە خۆمان تەسلیم خوای گەورە نەکردووە.. ئەی ئێمەخۆمان بە شوێنکەوتەی قورئان نازانین.. ئەو ئایەتە پیرۆزە لەمێشکمدا گوزەری دەکردو دەنگی دەدایەوە ((لَو أنْزَلْنا هذا القُرآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأيْتَهُ خاشِعاً مُتصدِعاً مِنْ خَشْيَةِ الله..)).
چاری نەبوو.. بواری هیچی نەدام.. باری قسەکانم بۆ گۆڕی وتم :
خوشکی بڕوادار ئارام بگرە.. خوا کۆمەکت دەکات.. دلنیابە من خاوەن ژنو ماڵم ناتوانم خیانەت لە خێزانەکەم بکەم.. خوا ڕوو ڕەشم دەکات.. ئەگەر ڕێگە چارەیەکت بۆ بدۆزمەوە بە قسەی برا بچوکت ئەکەیت.. خەندەیەکم بەزۆر هانی بەسەر لێوەکانم.. دوور کەوتمەوە دەنگم بەرز کردەوە.." بەقسەم دەکەیت.. توخوا بەڵێم بۆ بکە."
ئەویش وتی : فەرموو بزانم! وردە وردە بەدەم قسەکردنەوە هاتمە دەرەوە لە ژوورەکەو لە حەوشەکەدا بە دلێکی سافو بەرۆحێکی پاكو ئاسودەوە وتم :
" خاوەنی ئەو لادا شەرم کەسواری بویت لەرێگە.. ویستم تایەی بۆ بکڕم بەلام پارەم نەبوو ناچار ئالتونی ژنەکەم فرۆشت پێش ئەوەی تۆ سوارکەم لە بازاڕ دام بە((٤)) هەزار دینار.. لێم خۆش دەبیت گەر بیبەخشمە تۆو تۆش بیکەیتە ((مەسرەف)) خەرجی بۆ منداڵەکانت بۆ خۆشت.. تا ئەمەش تەواو دەبێت خوا گەورەیە."
ئافرەتەکە وتی : ئای کە بەخشندەیت.. خۆزگەم بەو ڕۆحەپاکەت جا بەڕاستیتە..
وتم : خوشکی ئازیزم تۆ گوڵێکی منداڵەکانت خونچەن بۆ گەشەی ئێوە ئامادەم بەڕاستیمە.. لەبەر خوا ئێستا دەچم بۆت دەهێنم لەناو سەیارەکەدایە.. لەماوەیەکی زۆر کەمدا خۆم گەیاندە سەیارەکەم بە پەلە دەستم کرد بەناو داشبڵی لادا کەداو لەناو عەلاگەیەکدا بوو دەرم هانیو چوومە ئەو دیوودەرگای حەوشەکە وتم : خوشکی

نازیز.. ئەمە بری ((٤)) هەزار دینارە وەك بۆم باسکردیت پارەی ئاڵتونی خێزانەکەمەو بۆ (تایەم) دانا بوو بەڵام وا بەنسیبی تۆ بوو توخوا بەحەڵاڵی بۆ تۆو گەردنیشم ئازاکە.. تۆش گەردنت خۆشو ئازا بێت.. لێم بگرە.. دەستم دەلەرزی بە عەلاگە پارەکەوەو خوای گەورە لێمان قبول بفەرمووێت.. خەرجی بکە بۆ ئەو بێباوکانەو بۆ خۆت..

ئافرەتەکە چاوەکانی فرمێسکی تیا قەتیسم مابوو.. ئیتر نازانم لە خۆشیا بوو یا لەشەرما یان لە ڕووزەردیدا.. دامە دەستی تا ئەو کاتەش زۆر ئاسوودە بووم.. لەناخەوە زۆر کامەران بووم. بەخێرای خوا حافیزەم لە ئافرەتەکە کردوو ڕۆیشتم.. گوێم لەدەنگی پێوەدانی دەرگای ماڵەکە بوو.. بەرەو ماڵەوە.. بەگیرفانی بەتاڵەوە.. بەڕازی بوونو ئاسوودەیی.. دەروونەوە کەوتمەوە ڕێگا.. ناوبەناو شەیتان بەمێشکمدا گوزەری دەکرد.. دەیوت :

- چوار هەزار دینار پارەی هەمووو ئاڵتون!
- چوار هەزار دینار بەدەم خۆشە.. بەچی پەیدا دەکرێت؟
- چوار هەزار دینار چۆن وەڵامی خێزانت دەدەیتەوە؟
- چوار هەزار دینار ئەی بۆ نیوەیت نەدایە.. نیوەکەی تری بۆ خۆت؟
- با هەر قسەی بکردایە.. بەجێت بهێشتایەو فەرامۆشت بکردایە.
- بۆ هاوکاریت نەکرد لە کارەکەدا..

بەڵام ئەوەی ناخی ئاسودەو شادمان کردبووم.. ڕازی بوونی ویژدانو خوای گەورەو پاکێتیم بۆ ئەو بەرنامەیەی کە خۆم بە شوێن کەوتەی دەزانی.. سوپاس بۆ خوا.. بەس نییە ئەو پارەیەش هەبووشەیتان نەفرەتت لێبێت.. سوپاس بۆ تۆ خوایە کە تووشی من بوو ئەو ئافرەتە داماوە.. بەس نییە توشی کەسێکی نالەبار نەبوو.. گەیشتمەوە ماڵەوە.. لە دەرگام دا پاش کەمێك خێزانەکەم دەرگای کردەوە بەگەرمی بەخێر هاتنەوەی کردم.. خوا ڕووی سپی بکات.. بەو بەخێرهاتنەوەیە ماندوێتیم دەرچووم، ویستی پرسیار بکات.. بەڵام چووم دەستو دەمو چاوم شتو دەستنوێژێکی پاکم هەلگرت.. پەرداخێك ئاوی بۆ هێنام.. پاش حەسانەوە ((٢)) ڕکات نوێژم خوێند.. پاش کەمێك خێزانەکەم وتی :

(.....) ئاڵتونەکەت فرۆشت؟ بەدوو دڵیەوە وتم : بەڵێ..

: چەندەی کرد؟

: چوار هەزار دینار
: ئەی تایەو پێویستست لێکڕی؟ ((ئیتر قسەکانم پچر پچر بوو))
نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە.. خوایە گیان فریان بکەویت چی وەڵام بدەمەوە..
وەڵامێك هات بەزارمدا هەرگیز شتی وام نەوتوبو:

-ئافرەت برا دەرێکم ئاموشۆو سەردانی شاری بەغداد دەکات، پارەکەم دابەو.. کە لەگەڵ ڕۆشتنیو هاتنەوەیدا جوتێکی باش تایەم بۆ بێنێت ((سوپاس بۆ خوا، چونکە جێگەی متمانە بووین لەلای یەکتر ((قەناعەت))ی کرد بەوتەکەمو وتی:

((زۆر باشە خێری پێوەبێت.. ڕەنگە لەوێ هەرزان تریش بێت؟

بەڵێ بە دڵنیاییەوە... ئیتر ئەمە چەسپا لەلای.. چەند ڕۆژێك تێپەڕی سەیارە بەرەو خراپی دەڕۆیشت وام لێهات بەتەواوی بێزار بووم لێی.. کەئەهاتمەوە ماڵەوە خێزانەکەم دەیوت : چی بوو تایەکان نەگەیشتن..

منیش بەمەلولی دەم وت :

ئافرەت خۆ چونی بەغداد هەروا گاڵتە نییە هەر کاتێ هانی یەکسەر دەیخەمە ژێریو دەیبەستم..

لەخوا بەزیاد بێت بناغەیەکی بەهێز ئێمەی لەسەر پێك هاتبوین لە ئاستی یەکتر بۆ یەکتر دەتواینەوە بەم چەشنە کارم دەکرد.. لە بەر باری خوادا ئارامم گرت.. گەرچی ناو بەناو لە ناخەوە بێزار دەبووم.. بەڵام بڕیارم دا بە هەر شێوەیەك بێت نەبەزم بۆیە هات بەبیرمدا کەبچمە لای تایە فرۆشێك بەقەرز دوو جووت بکڕمو لەبەرەوە بەشێوەی بەش بەش ~~قیسط~~ پارەکەی بدەمەوە.. ئەمەیان باش بوو چونکە چەندە لەبەر سەیارەکەم ئەوەندەش لەبەر متمانەی خێزانەکەم.. چونکە زۆر یەکترمان خۆش دەویستو یەکترمان لامەبەست بوو.

-نیوەڕۆیەکیان گەڕامەوە ماڵ خێزانەکەم دەرگای لێکردمەوە وتی : (.....) مژدە مژدە ((بەڕوویەکی خۆشەوەو دەمی پڕلە پێکەنین بوو))

((ئەو پیاوەی برادەرت تایەکانی بۆ هانیویت.. وەرە بزانە باشن؟))
وەك لەبانێکی بەرز بکەومە خوارێ سەرسام بووم بۆیە بەدەست خۆم نەبوو وتم :
کچێ ئافرەت تایەی چیو شتی چی؟! پیاوی چی تۆ تەواویت.. تێکنەچویت؟!

بەڵام وازی نەهانیو ڕایکێشام بۆلای تایەکان.. کە چوومە پێشەوە بۆلای تایەکان قسەکەی ڕاستو دروست بوو.. جوان سەیرم کردو واقم وڕما خوایە گیان.. ئەمە خەوە.. یا ڕاستیە.. پاش کەمێك خێزانەکەم وتی : ئەوە چییە (.......)بۆ وا واقت وڕما بۆ ڕەنگت تێکچوو چی ڕویداوە.. قسە بکە.. بۆ ئاشکرای ناکەیت (....) دەقسە بکە.. لە یەکەم جار زیاتر سەرسام بووم.. چەندین بیرو بۆچوون گوزەریان کرد بە بیرمدا.. لە ناخەوە بەخۆم وت :

-تۆ بڵێیت ئەو ژنەی کەمن پارەم داوەتێ بەزەیی بەمندا هاتبێتەوەو چووبێت تایەکانی بۆ کڕیبم؟!.. نەو بڕوا ناکەم!

یان خوای گەورە لێیقبوڵ نەکردوم وەك ((معجیزەیەك)) دابێتیەوە بەڕوومدا خوایە گیان ئەمە خەوە.. خەیاڵە.. ڕاستیە.. ئەمە چیە؟!

لە ڕاتەکاندنی چاکەتەکەم بەئاگا هاتمەوە.. خێزانەکەم کە تائەو کاتە ئاگاداری هیچ نەبوو وتی : پیاوەکە بۆ وات بەسەر هات.. ئەی خۆت نەتگوت برادەرێکم تایەم لەشاری بەغدادەوە بۆ دێنێ.. ئەی ئەوەتا نایبینی بۆی هانیویت.. دەقسە بکە دڵم تەقی! نەمهێشت هەنگاو بنێ کەبەنیازی ئاو هێنان بوو وتم : دانیشە باڕاستی ڕووداوەکەت بۆ بگێڕمەوە..

خێزانی بێئاگا لە بەسەر هاتەکە وتی : دەبا بچینە ژووریو کەمێك ئاو بخۆرەوە حاڵت باش نییە.. خوایە گیان ڕەحم بەمن بکەیت.. ـیچی بەسەر نەهاتبێ..

وتم : نەو هیچم بەسەر نەهاتووە.. ئاویش ناخۆمەوە.. دانیشە.. ڕاستە قسەم بۆ ئەو دەکرد بەڵام هەردوو چاوم لە تایەکان بڕیبوو.. تاتەواو بونیش هەر بە خەوم دەزانی!.

لە نوکەوە تا گەیشتم بەماڵەوەو ئەمڕۆش هەر هەموویم بۆ گێڕایەوە.. وەك دەڵێن : لەسیرەوە تا پیازێ.. پاش تەواو بوونی ڕووداوەکە ئینجا خێزانەکەم حەپەساو سەرسام بوو.. بەزۆر زەردە خەنەیەکم خستە سەر لێوم ووتم : ((ئاو دەخۆیتەوە بۆت بێنم ئافرەت؟))

وتی : ئاوی چیو شتی چی.. پیاوەکە خێرێکی زۆر چاکت کردووە.. ئەی باشە ئەم تایانە لەکوێوە پەیدا بوون، تۆ بڵێیت معجیزە نەبێت؟! بەڵام.. ئا بیرم نەبوو پیاوەکەی ئەم تایانەی هانی پارچەیەك کاغەزی داومەتێ، وتی : لە دوای خوێندنەوەی بێت بۆلام — ئەدرەس- ناونیشانی تیا نووسیوە.

کاغەزەکەم وەرگرتو دەستم کرد بەخوێندنەوەی.. ئای خوێندەواری چەند نیعمەتێکی خۆشو گەورەیت.. ئێستا تامو چێژی خوێندەواریم زانی.. کە خۆم دەتوانم بە چاوو بیرو هۆشم بڕوا بە کاغەزێك بکەم.. گەر یەکێکی تر بۆی بخوێندمایەتەوە بڕوام ناکرد..

وتم : (...) خۆشەویستم ئەمە ناو نیشانی ئەم پیاوەی تیایە کەتایەکانی بۆ هانیووم دەڵێ : پەیوەندیم پێوە بکەو کارێکی گرنگم پێتە...... خوایە گیان خێربێت!.

پشووم نەدا خێرا تایەکانم خستە سندووقی لاداوە بەرەو دووکانی کابرا بەهەڵتەك هەڵتەك کەوتمە ڕێگا.. دەستم کردەوە بەبیر کردنەوە :

- باشە ئەم پیاوە ماڵی ئێمەی چۆن دۆزییەوە؟
- ئەی پەیوەندی بۆ پێوە بکەم؟
- خوایە گیان خێر بێتو چاکەو باشەی لە دوابێت، خوایە گیان کەیفی خۆتە.. پارێزراو بەو هەوڵو ماندوو بوونم بەخۆڕایی نەڕوات..

گەشتمە بازاڕ لە گەراجێك ((لادا))کەم دانا.. بەو ناونیشانەی لامبو دوکانم دۆزییەوە، کەسەیرم کرد چی ببینم!!

ئەمە نوسینگەیەکی گەورەیە.. لە دەرگای نوسینگە کەم دا.. پیاوێکی قەڵەوی بە هەیبەت دەمو چاو ڕونو پاك فەرمووی لێکردم کە لەو دیوو مێزێکی گەورەوە دانیشتبوو لەگەڵ یەکەم هەنگاوم بۆ ژوورەوە خێرا لەبەرم هەستا بەخێراییو بەگەرمی هات بەپیرمەوە.. بەخێر هاتنی کردم.. زۆر زۆری ڕێز لێگرتم.. نەمئەزانی داماوێکی وەکو من لەبەردەم ئەم کەسە خاوەن دەسەڵاتە (مادی)یەدا بۆ ئەوەندە بەهەیبەتو شکۆم.. بەڵام لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت.. کە (بیرو باوەڕو کردەوەی پاكو بۆ خوا ژیانو هەوڵدان بۆ ئاسودەیی مرۆڤ گەیاندومیەتییە ئەو پلەیە))

دوای چاكو چۆنیو هەواڵپرسی سەری بردە دەرەوە لە جامخانەی نوسینگەکەیەوەو بانگی (ساردیو چاو ئاوی)کرد.. ئێستا دانەنیشتبۆوە بابەتەکانی داواکار گەیشتە جێگە..

وتی : کاکە گیان ڕوداوی ئەو ڕۆژەتم بۆ وەگێڕە.. پاشان منیش ڕوداوی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە، کەچۆن خوای گەورە لەسەر دەستی تۆدا پارمەتی ئەو خێزانە هەزارەی داوە ئەمەش بە هۆی خۆڕاگریو دەستو داوێن پاکی تۆوە هاتە بەر.. ئەوسا باسی

ئاسودەی خۆشت بۆ دەکەم.. بەس توخوا دەست نەنێیت بەڕوومەوە. نامزانی مەسەلە چیە وتم : کاکە گیان من بۆ خوا کردوومە لەبەرئەوە لەلای کەس باسم نەکردووە تا ئەمڕۆش.. خێزانەکەم –خاوەن ئاڵتون- نەیزانی بوو کەپارەم داوەتە ئەو خێزانە هەژارە.. کەخێزانەکەم نزیکترین و خۆشەویسترین کەسمە لەسەر زەوی..

ناچاری کردم.. ڕووداوەکان زۆر بە وردیو لەسەر خۆ، یەکە یەکەو هەنگاو بە هەنگاو بگێڕمەوە چاوەکانی فرمێسکی شادی قەتیسم مابوو تیایاندا دەبریسکایەوە. منیش بەدەم چایی خواردنەوەوە.. هەناسەیەکم هەڵکێشاو وتم : خۆزگە تۆ نەتزانیایە با ئەو خێرەم بەر دەوامبوایە..

ئەویش لەسەر مێزەکەی دەستە سرێکی کاغەزی دەرهێناو چاوەکانی سڕیو وتی : کاکە گیان.. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت : ((إنما المؤمنون إخوه))

وتم : باشە چۆن ئەم تایانەت گەیاندە ماڵی منو چۆن بەم ڕووداوەت زانی ئەمە تەنها خوای گەورەو ئەو ئافرەتەو خۆشم دەزانین.. کەسی تر نایزانێتو ئاگادار نەبووە، بەڵام پیاوی باش وتی : بەڕێز ئەو کاتەی تۆ گەڕایتەوە بۆ ((پارەکە لەناو سەیارەکە)) من لەو دیو دەرگای ماڵی خۆمانەوە خۆم داشاردبوو ئاگاداری هەموو قسەو باسێك بووم.. وەکاتێکیش دەرچوویت زۆر سەرسام بووم بەو هەڵوێستە ئیمانیو مرۆڤایەتیەت.. زۆرم حەز کرد بتناسم.. بۆیە بەسەیارەکەی خۆم دوورو نزیك دوات کەوتم.. تاگەیشتیتە ماڵەوە.. دڵنیا بووم ئەوە ماڵەکەتانە گەڕامەوە.

وتم : ئەی بۆ هاوکاری ئەو ئافرەتە هەژارەتان ناکرد بەسیفەتی دراوسێیەتیو هەژاری.. پیاوەکەش (....) وتی : زۆرمان هاوکاری کرد.. هەموو جارێ دەبووە دڵۆپێك ئاو.. تاخۆی ڕۆژێکیان وتی : خوا دەروی لێکردومەتەوە ئیتر پارەمەتیم مەدەن.. بەڵام ڕاستی نەکرد هەر نەفسی بەرز بوو.

قومێکم لە چای بەردەمم داو بە هێمنی دامنایەوە.. پیاوە وتی : پاش چەند ڕۆژێ سەفەرم کرد بۆ شاری بەغداد.. لە دوکانی پیاوێکی زۆر ڕێکوپێك کەئەویش خاوەن نوسینگەیەو بازرگانێکی بەتوانایە دانیشتبووم. پیاوێکی بە تەمەن هاتە ژورەوەو داوای ((یارمەتی)) کرد.. ئەویش –برادەرەکەی بەغدادم- دەستی نەنا بەڕویەوە وتی ((وردەم پێ نیە)) کابرای بەتەمەنیش وتی : هەرچیت پێبێت بۆت ورد دەکەمەوە.. ئەو ساڵانە پارەی تەبع (تەزویر) لە ئارادا بوو ((دیار بوو کابرا سوالکەر بوو)) کابراش (٢٥٠)

# یادگاری لاوێتی

دەمێك ساڵ بوو باوکم ئالۆدەی ((شەرابو مەی)) خواردنەوە بـوو وەك خویـەك هەردوو براکانیشمی فێرکرد بوون کە لە تەمەندا لەمن گەورە تر بوون.

دایکم مێـزی زۆر بـەجوانی بـۆ دەڕازاندنـەوە.. خزمـەتی باشـی دەکـردن.. گـەر شەوێك وەك پێویست کاریان بۆ نەکات ئەوا دایکم ڕوو بەڕووی هەڕەشەو قسەی ناخۆشی باوکم دەبۆوە یان بەکارتی ((تەڵاق دان)) ئاگادار دەکرایەوە..

لەگەڕەکدا زۆر جار سەر زەنشت دەکراین.. دەنگمان دەڕۆیشتە دەرێ لەماڵ.. منـیش بـەو کردارەی ماڵەوەمان زۆر دڵگران دەبووم.. چەندین جار هەوڵمدا بوو.. بێخود بوو.. دایکم زۆر منی خۆشدەویست بە پێچەوانەی باوکمەوە... براکانیـشم خۆشیان دەویـستم بـەڵام کەباسی حەرامو حەڵاڵی ڕزقو ڕۆژیم لەلا دەکردن تووڕە دەبوون.. زۆر جار باوکم بە خوا پەرستی من سەرسام دەبوو کە گەنجمو بـۆ خـوا دەڕیـمو بـە فرمـانی کـار دەکـەمو وەك ئەوان نیم لەکارو کردەوەدا جوان لـە یادمـە شـەوێك زۆرم بـۆ براگەورەکـەم هـانی کـەواز بهێنێ وتم :

((کاکە (....) دەزانیـت ئـەم ئـارەق خواردنەوەیـە چـەند خراپـە لـەڕوی مـادی.. مەعنـەوی.. مرۆڤایـەتی.. ئیـسلامەتی بـەوە خێـرت دەگـات دوور کـەوەرەوە لێـی ئەمـە ڕاگردنە لەواقع.. ئەمە چارە سازی زامەکانتان نییە.)) بەڵام وتەکانم کارتێکەر نەبوو لـە ئاخیان.. سادە بـوو.. بۆیـە دەیـان وت : دینـی خـۆت بـۆ خـۆت دینـی خـۆمـان بـۆ خـۆمـان بێسود بوو زۆر ئامۆژگایم دەکردن..

لـەیادم نەچـێت مـن بـچوکترین ئەنـدام بـووم لەبـەر ئـەوە هەنـدێك ئـەرمیان دەنوانـد بەرامبـەرم.. قوتـابی قۆنـاغی دواناوەنـدی بـوم جـار جـارەش چـاوم لـە دەسـتی باوکمەوە بوو بۆ خەرجی قوتابخانەو پێداویستیو شتی تر.. خوا دایکم ڕوو سپی بکـات.. زۆر جـار بـەنهێنی باوکمـەوە دەسـت گـیرۆی دەکـردم. شـەوێکی زسـتان زۆر سـارد بـوو بـەفرێکی بـاش شـەوی ڕابـردوو بـاریبوو ئەمـشەویش سـاردییەکەی بێئەنـدازە بـوو.. لـە پەنجەرەکـەوە سـەیری دەرەوەم ئـەکرد.. بـەفر وردە وردە.. کـەلو کـەلو سـپیو بێگـەرد

دەبونە میوانی سەر زەوی.. ئای.. ئای کەجوانن! لە دەمە دەمی خەوتندا بوو چوومە ژوورەکەی باوکم‌و براکانم.. ئەوان سەر گەرمی ئارەق‌و دور لەخوا ژیان بوون.. تەسجیلیان کردبۆوە..( ئەحمەد شەماڵ ) ئەوەندەی تر دووری خستبونەوە. بە دەنگێکی نەرم‌و نەوی بانگی باوکم کرد : بابە.. بابە گیان.. حەز ئەکەم ئاگات لێم بێت! باوکم کە بتڵە ئارەقەکە لەسەر مێزەکە دانا بوو ئاوڕێکی بەلای مندا دایەوەو وتی : ها.. شەو شێت.. چیە.. خەوت دیوە؟ یان ئێمە دەخوێنەوەو تۆی گرتوە!.. بێزارمان مەکە.. دەڵێی چی؟.

وتم : بابە گیان ببورە وا لەم کاتە ناشایستەیەدا هاتمە ژوورێ.. حەزم ئەکرد کاتێکی تر بووایە بەڵام کەی تۆ کاتت بۆ پیاچوونەوەو گرفتەکانی ئێمە تەرخان کردووە.. ناچارم کاتت لێبگرم بڵێم : ئەگەر ماڵەکەمان ئاگری تێبەر بێت بسوتێت تۆ چی دەکەیت.. هاوارو ڕاکە ڕاك بۆ بەرو دراوسێ..

*کەچی براگەورەکەم دەنگی بەرز کردەوە وتی : نا بابە.. وازی لێبێنە کەماڵەکە سووتا.. ئەمیشی تێدەخەین‌و ئەجاتمان دەبێت..

باوکم وتی : ڕۆڵە لاچۆ.. وازمان لێبێنە.. ئاگری چی‌و شتی چی، هەستم بەشەق پارچە پارچەت دەکەم.. خۆتم پێبە گوشت مەدە؟!

براکەی ترم تائەو کاتە پەرداخەکەی هیچی تیا نەمابوو وتی : ئێمە سەر گەرم دەکەین یان شەڕ دەکەین.. دەبا هەر بڵێ.. کاکم دەیەوێت ئێمە دوور خاتەوە لە شەراب.. بەڵام ناتوانێت.. ناشیەوێت هاومێزو هاودەرمان بێت. دەوازی لێبێنن..

وتم : ڕاست دەکەن.. بەڵام دەبێت یا من بم ئەمشەو یا ئێوە..

باوکم هەڵیدایە : ئەی لە کوڕی باش هەڕەشەمان لێدەکات.. هەتیو هەستم پارچە پارچەت دەکەم.. تاتوانی پڕ بەدەمی یەك تفی لێکردم.. ئەوە یەکەم جار بوو لەژیانیدا باوکم کاری وا بکات..

براکانیشم واقیان وڕما.. بەڵام بەوەشەوە نەوەستا دەریکردمە دەری دەرێ..

وتم : بابە.. پێم ناخۆشە بەڵام با قسەکانم یادگاری بێت لەلات.. بەڵام بێسود بوو هەر پاڵێنا.. پاڵێنا تا دەرگای دەرێ کاتێکم زانی بەر چاوم لێڵ بوو.. بەر چاوم زیاتر لێڵ بوو.. تاریك تاریك بوو.. ناو دەمم تامی سوێری پێگەیشت.. بەدەما کەوتم.. بە ئاستەم گوێم لێبوو لە دەنگی دەرگاکە. کە بەتوندی لەسەری داخستم‌و چووە ژوورێ. لە

هۆش خۆم چووم.. بەڵام پاش ماوەیەك لەسەرماندا هۆش خۆم هاتمەوە.. کەسەیرم کرد خوێنێکی باش لەدەمو دەستم ڕۆشتبوو چەند میلمەترێك بەفریش لەسەر پشتم باری بوو.. لە ئاکامدا بۆم دەرکەوت.. دەستم بەدەرگاکەوە بوومو شەقێکیش لە لاشەویلکەم هەڵدراوە.. ئیتر لە هۆش خۆم چوو بووم.. بەو حاڵەوە ڕازی نەبووم.. بۆیە وتم: خوایە گیان ئەمە تاکەی وادەژین خوایە گیان دڵیان نەرم ببێت دەستم بۆ ئاسمان بڵند کرد تا لە توانامـا بـوو پاڕمەوەنـەرم نـەرم بـەفر دەبـاری.. زۆرم سـەرما بـوو لەسـەرماندا هەڵدەلەرزیم.. لەپی دەستەکانم بەفراوی دەبوون. بۆم دەرکەوت شەو نیوەیی بووە بەردەمی خۆم پاکردەوە لەبەفر ڕووەو قیبلە بەو سەرمایە.. کەلەناخمدا زۆر بایەخی نەبوو دوو ڕکات نوێـژم خوێنـد.. دوای نوێژەکە وتەی ئەو پیاو چاکەم بیر کەوتەوە کەدەیفەرموو ((زستان بەهاری خواناسانە)) چونکە لەشەوگاری درێژدا شەو نوێژ دەکەن، وە (هاوین؛ بەهاری خواناسانە) چونکە ڕۆژگارەکانی گەرمەو خوا ناسی تیادەکات کە ڕۆژووی سونەتە. خوێنەکەی لاشەم بە پاكو نوێـژ دەزانـی چونکە ئیمامی عمر(د٠خ) نوێژەکەی نەبڕی کەخەنجەری لێدراو چاری نەبوو، ئیمامی ئەحمەد ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت بەبەرگی خوێناویەوە نوێژو خوا پەرستی ئەنجام دەدا ناچار بوون منیش ناچارم، لەگەڵ تەواو بوونـدا.. هەرچیم لـەدوعا و پاڕانـەوەو نـزا زانـی دەستم کردە خوێندنی نازانم فرمێسکی خۆشی بوو یان ناخۆشی لەزۆربەی دوعاکانمدا ئەو ئایەتە پیرۆزەم دوبارە دەکردەوە (( **رَبَّنا أغفرلي و لوالديَّ و للمؤمنيْن يوم يقوم الحساب** )) گریام زۆر گریام زۆر دوعای چاکەو چاکسازیم بۆ باوکم‌و براکانم کرد.. هیلاك دەبووم بەڵام لەناخەوە لەسەرەتای خۆش گوزەرانیدا بووم.. لەیادم نەچێت قسەیەکی پیاو چاکێکم بیر کەوتەوە کە دەیفەرموو ((خوای گەورە لەنێوان بانگی مغرب‌و عیشادا کارەکان ئاسان دەکاتو دەیگەیەنێتە ئامانجی خۆی بەڵام من داوای چاکسازی زۆر خێرام دەکرد کەدەفەرمووێت ((كُن فيكون)) لەنێوان پیتی ((ك))و پیتی ((ن))دا ماوەیەکی زۆر کەم هەیە دەمویست لەو ماوەکەمەدا خوای گەورە بۆم بکات.. ئازیزان دەزانن چی ڕویدا.. کاتێکم زانی دەنگی دەرگاکە هاتە بەر گوێم، کرایەوە، پاش چەند هەنسکێك لەقوڵپی گریان هەستم بە بیستنی گریان کرد بەڵام لە ناخودڵما هەر دوعام دەکرد.. بەردەوام بووم.. بەردەوام بووم هەستم کرد دەستێکی گەرم ڕوویەکی گەرمو تەڕ لەپەنا گوێچکەم کەوت.. جوان هەستم کرد کەئەمە یەکێکە بەڵام وام هەست نەکردو بۆی ناچووم کە

باوکم بێت.. وتم ڕەنگە دایکم بێت.. چونکە ئەوەندەی دایک بەسۆزە.. باوك وانییە.. بەبیرمدا هات کە باوکمو براکانم نوستوون دایکیشم ئاگری جگەر هەڵی گرتووەو دەیەوێت بم باتە ژووریّ.. بەڵام بڕیارم دا بوو کەئیتر نەگەڕێمەوە ئەو ماڵە.. تا بڕیاری چاكو گەڕانەوە نەدەن بۆلای خوای گەورەو بەرنامەکەی. دەڕۆم کارێك دەکەم.. زەوی خوا فراوانە.. کەس پەکی ناکەوێت بەڵام من ڕزگار بوونی خێزانەکەم مەبەست بوو نەك مانو ژیانی خۆم..

بەڕێزان ئەوەی بۆی دەچووم وانە بووهەستم بە زبرایی کرد کەلە ڕومەتم خشا.. کەریش بوو ئیتر بۆم دەرکەوت کەئەمە باوکمە.. دەگری.. ئاگری جگەر ئەوی هەلگرتوەو دوعاکانم خوای گەورە قبوڵی کردووەو.. سوپاس بۆ خوا سەرکەوتووم..

بە دەنگێکی نەرمو پڕلە گریانەوە وتی : هەستە.. هەستە ڕۆڵە گیان.. ئێمە کردمان خراپە دەرهەق بەتۆ.. بەڵام تونەو خوایەی لێیدەپاڕێیتەوەو دڵی منی گۆڕی.. لێمان ببوورە.. لێمان ببوورە.. کەوای وت نەمزانی چۆن باوەشم کرد بەملیداو منیش دامە گریانێکی قوڵ.. وتم : بابە گیانم.. بۆ هاتیتە دەر.. بۆ هاتیتە دەر..

باوکم کەتانەو کاتە نەمدیبوو بگری بەدەم گریانەوە وتی : ڕۆڵە گیان خۆشم نازانم.. بڕوابکە نازانم.. هێزێك ناخی هەژاندم.. پاڵیپێوەنام.. پاشان نەمزانی تۆ لێرە ماویت ئەگینا زووتر دەهاتم بە دواتا بابڕۆینە ژووریّ..

بەڵام من وتم : نە بابە گیان تازە من بڕیاری کۆتایی خۆم داوە.. وەدوعاشم بۆ کردوون کە خوای گەورە قفڵی دڵەکانتان بە کلیلی هیدایەت بکاتەوە، ئیسلامتان بکات.. من دەڕۆم تا ئێوە وەها بن.. من نایەمەوە ئەو ماڵە..

هێزم دایە بەر خۆم کەهەستم بەڵام لاقەکانم سڕبوو بوون لە دوام نەهاتن بەرز بوومەوەو کەوتم، بەڵام باوکم کە ئەو خوێنەی بینی لەمن وتی : بەڵێن بێت تۆ چی دەڵێیت ئێمە وادەکەین.. بەڵێن بێت بۆ خوا بژین.. چونکە خوای گەورە تۆی سەرخستو ئێمەش.. ئێمەش دەمانەوێت لەگەڵ تۆبین.. وتم: ( بابە گیان هەر قسەم ناوێت.. کردەوە.. کردەوە بەڵێنم پێدەدەیت)، باوکیشم وتی : لەجیاتی جارێك سەد جار بەڵێن بێت بەڵێن بێت.. خوایە گیان تۆبە بێت لە هەموو تاوانەکانم (فرمێسکی پەشیمانیو خۆشیو خشەع لە چاوانی بارین) ئەوسا بڕوام کرد، سوجدەیەکی شوکرم برد هەر لەوێدا بڕیارمدا بگەڕێمەوە ماڵ بەهێزی باوکم.. باڵی گرتمو چوینە

حەوشەکە، لەپڕ دایکم هات بەرەو پیرم باوەشی پیا کردم گوشیمی بە خۆیەوە..تا ئەوکاتەش ئەوندە هەستم بە خۆشەویستی دایکم و گەرمی باوەشی و غەمرەوێنی هەناسەی نەکرد بوو.. باوکیشم هاواری کردو وتی : لەم ساتەوە یەك کەس بۆی نییە لە ماڵی مندا بێشەرعی بکات.. دەبێت هەمووتان بۆ خوا بژین..

خۆشەویستان ئیتر لەو شەوەوە ماڵی ئێمە بووە ماڵێکی زۆر جیاواز لەشەوەکانی تر.. ئای تام و چێژی ئەم ئاینە چەند شیرینە.. خوایە گیان چەند شیرینە.. بڕیارم دا ئەو ئایەتە پیرۆزە لەلای خۆشنوسێك بنوسم و لە چوار چێوەی شوشەی بگرم کەخوای گەورە دەفەرموێت : ((**إن الدين عندالله الاسلام**)).

# لە قوڵای شەودا دڵە تاریکەکان ڕۆشن دەبنەوە!

چەند ساڵێکی زۆر بوو برایەکی خۆشەویستم لەحیزبێکی عیلمانیدا کاری دەکرد.. بەڵام واماوەیەکی زۆرە هەستی پێدەکەم وازی لێهێناون و زۆر بەگەرمی ئاموشۆی مزگەوت دەکات.. لە وتارە گشتیەکانی مزگەوتدا ئامادەیی هەیە.. لە ناخەوە شەیتان پێیدەوتم : ڕەنگە نییەتی باش نەبێت!

بۆیە بەباشم زانی بەهێمنی و لەسەر خۆ هۆی ئەو گەرم و گوڕییەیم بۆ باس بکات.. چەند جارێك وەك خوازبێنی کەرێك بەڕوویمدا دا بەڵام دەیوت : دەترسم بەباس کردنی ساردی ڕووم تێبکات بەڵام وازم لێنەهانی.. بەڵێنی دامێ کەبۆم باسبکات بەمەرجێك نەیدرکێنم!. چونکە شاعیرێك دەڵێ : ((هەموو دۆستێکت دۆستی هەیە)) بەڵام دڵنیام کرد گەر سوودی هەبوو بۆ کۆمەڵگە باسکردنی ئاساییە.. گەر سوودی نەبوو تەنها نهێنی نێوانمان دەبێت.

بەڵێ ڕۆژێك دانرا بۆ درکاندنی ئەو نهێنییە لە ماڵی خۆیان .. هەموو سەعاتەکان بەساڵ دەگوزەران.. ڕەنگە چەند موویەکی سەرو ڕیشم سپی بووبن تا بۆی باسکردم :

جا بەڕێزان ئەو کەسانەی کەتازەو بەگەرم و گوڕی کار بۆ خوا دەکەن.. دەترسن لە بەباچوونی خێراتەکانیان. کە کات هات بەهێواشی لە دەرگای ماڵەکەم دا.. زۆر بە جوانی بەگەرمی پێشوازی لێکردم.. چوینە ژوورەوە.. دەرگای ژوورەکەی پێوەداو بەخێزانەکەی وت : کەس نەیەتە ژووری و لەم ناوە مەمێنن..دانیشتم من تامەزرۆو ئەویش لە نوکەوە بۆی گێڕامەوە : شەوێك لە خەومدا قیامەت هەستا بوو.. دنیا تەپو تۆزاوی قەرەباڵغی بێتاقەتی.. ناوی مرۆڤەکان دەخوێنرایەوە.. نامەیەکی مۆر کراویان دەدایە دەستی – چاوەکانی نوقاندبوو – هەبوو سەرو دڵ خۆش بوو مرۆڤی وەها هەبوو دەگریا لە بێدەستەڵاتیدا دەستی دەکردە ناڵە ناڵ.. زۆر ناڕەحەت بووم پیاوێکی دراوسێمان کەلە پێشمەوە بوو نامەکەیان دایە دەستی و مۆرێکی لێدرا بوو بەڵام کە سەرە

گەیشتە سەر من نامەیەکیشیان دایە دەستم مۆرێکی پێوە بوو بە ئەندازەی دینارێکی ئاسن، پاش تەواو بوونی کە دەیان دایە دەستت دەیان وت : برۆ بۆ ئەو دەرگایە.. ڕۆشتم ڕۆشتم بۆ دەرگایەکەی کە دراوسێکەمان بۆی چوو.. نامەکەیان لێوەرگرتو سەیریان کردو بەخێرهاتنیان لێکردو بەخۆشیەوە چووە ژورێ ئێستاش دەنگی ئەو سەلامو کەلامە لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، دەنگە دەنگێکی زۆر خۆش دەهات هەستی بۆن کردنم تا ئەو کاتەش بۆنی واخۆشیان نەکردبوو. بەبێ فەرمانی ئەوان خۆم گەیاندە ئەو دەرگایە.. نامەکەیان لێگرتم خوێندیانەوە.. سەیری مۆرەکەیان کرد وتیان : تۆ بۆ ئەم دەرگاو شوێنە نەهاتویت برۆ، دەرگایەکی تریان پیشاندام کەلەسەری نوسرابوو.. ئەوەی لەسەری نوسرابوو لە نوسینی مۆرەکەی من دەچوو بۆیە زۆر گریام.. پاڕامەوە.. تو خوا.. تو پێغەمبەر.. ئەیهاوار.. چار نەبوو پاڵیان پێوەنام تا گەیشتمە ئەو دەرگایە گوێم لێبوو هاوار هاوار گریان دەنگی بەرزو نرم بۆنێکی زۆر ناخۆش دەهاتە دەر کاسی کردم.. دەستم لە قەراغی دەرگاکە گیر کرد.. وتم : توخوا با بچم بۆ ئەو دەرگایەی تر، وتیان : نابێت مۆری ئەم دەرگاو ژوورەی لەسەرەو نامەکەش بەدەستی چەپتە سەیرم کرد ڕاست دەکەن لە نوسراوەکە نوسرا بوو ((أشهد أن لاإله إلا الله و أشهد أن (...) رسول الله)) ناوی ئەو حزبە نوسرابوو کە من دوای کەوتبووم و شەوو ڕۆژ بە دڵو گیان کارم بۆ ئەکرد. بەڵام دراوسێکەمان زۆر دیندارێکی باش بوو لە ژوورەکەی نوسرا بوو (( **أشهد أن لاإلـه إلا الله و أشـهد أن محمـد رسـول الله**)).. دڵم داوای ئەوێی دەکرد بەڵام دەستەڵات نەبوو، کردەوەکانم دوری دەخستمەوە.. ویستم نامەکە فڕێ بدەمبۆ دواوە بگەڕێمەوە.بەڵام ئاخ.. چەند دەستم دەکردنەوە بۆئەوەی بکەوێتە خوارەوە.. ناکەوتە خوارەوە.. ڕام ئەوەشاند بێسود بوو.. نرم دەبوەوە بکاتە زەوی کەچی کاتێکم دەزانی بەدەستمدا دەنوسایەوە. خوایە گیان بە قوربانت بم فریام بکەوە.. پۆل پۆل خەڵکی خۆیان دەکرد بەو ژوورانەدا تەنها من سەرپێچیم دەکرد.. وتیشم کاکە گیان بە قوربانت بم خۆ منیش ناموشۆی ئەوانم ئەکرد.. دەیان بردم بۆ مزگەوت.. خوایە بەفریام بکەوە.. خۆم زۆر ڕاکێشا.. زۆر ماندو بووم.. ناچار بەرەو ئەو ژوورەی کە لێیدەترسام بردیانم یەك پاڵیان پێوەنام کەوتمە ناخۆشتین شوێنەوە.. گڕ.. ئاگر.. دوکەڵ..بەتەواوی کاسیان کردم زۆر پەشیمان بووم کەئەوە جێگەم بوو لە شپرزەیو بێتاقەتی خۆم سوپاس بۆ خوای گەورە

لە خەو ڕاپەڕیم.. بێدار بوومەوە.. چاوەکانم گلۆفت.. خەو بوو.. بەڵام چۆن خەوێك تا من هەم شتی واناخۆشم نەدیبوو؟!

ئای ئەوەی من دیم خۆزگە هەموو ئەوانەش دەیاندی کە دوور لەپەیامو بیرو بڕوای ئیسلام دەژین.. چەند خولەکێك سەرم خستە نێوان هەردوو دەستمو بەقنجی دانیشتم هەر بیرم دەکردەوە.. خۆم یەکلای کردەوە خۆم گوڕی بەخێرای.. سەعات ((٢))ی شەو بوو هەویەکەمو چەکەکەم هەڵگرت ڕووم لەو بارەگایە کرد کەلەنزیكماڵمانەوە بوو.. لەڕێگا بەخۆم وت : پەنجەکانم ئێوە بەرگری گەرمی لولەی تفەنگ ناگرن لەم دنیا ئەی چۆن لەو دنیا بەرگەی ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ دەگرن... لەدەرگام دا، نیگا بان کردیەوە، وتی کاك (....) خێرە بەم نیوە شەوەو بەم شێوەیە.. هیچ ڕویداوە.. وتم : کێ لە ژوورەوەیە؟ وتی : کاك (....) بەڵام ڕەنگە سەیری تەلەفیزیۆنو(CD) بکات. چوومە ژورەوە.. ڕاستی کرد.. نەنوستبو، چومە پێشەوە لێی وتم : کاك (....) ئەمە چەکەکەم.. ئەمە هەویەکەم.. ئیتر من لەگەڵ ئێوە نابم کارو کردەوەتان باش نییە.. نییەتان لەگەڵ من ناگونجێت.. کاك (....) بە سەرسامییەوە دەیڕوانییە من.. وای ئەزانی شێت بووم.. تەلەفیزۆنەکەی کوژانەوەو.. وتی کاك (....) تێکنەچوویت.. خەیاڵ نیت ... تەواو لەسەر خۆتی..

وتم : بەڵێ.. بەڵام تۆبە خوایە لەو کاروبارانەو لە هەموو شتێکی -ئەمانە- ویستم بڕۆم.. کاك (....) توند باڵی گرتم : کاکە عەیبە.. کاکە پێویستمان بە تۆیە، کاکە بڕۆو بەیانی وەرەوە قسەی لێدەکەین!!

بەڵام هاتمە دەرەوەو بەبێ چەكو هەویە وەگەڕامەوە ماڵەوە خێرا دەستنوێژێکی پاكو خاوێنم هەڵگرت دوو ڕکات نوێژم کرد.. زۆر خۆش بوو بەلامەوە.. دوو ڕکاتی تریش دوو ڕکاتی تریش لەو کاتەوە بەڵێنم بەخوای گەورە داوە کە دوای ((قورئان.. پێغەمبەر.. پەیامی پیرۆز.. پاكو بێگەردی ئیسلام بکەوم.. تەنها خۆم لەودا دیوەتەوە.. هەرچی خوا پێی خۆشەو بەختیاری مرۆڤایەتی تیایە کاری بۆ دەکەم.. ئیتر بەسە خراپەو دوور لە خوا ژیان.. سڵاو لە پیرۆزی ئیسلام..کەتەواو بوو لەگێڕانەوەی ڕوداوەکە

وتم : ئەی لەو ڕۆژەوە کەس نەهاتووە بۆلات؟

وتی : باهاتون.. بەڵام بێسودو بەدەستی بەتاڵ گەڕاونەتەوە.. سوپاس بۆ خوای بەخشندە. (( **وأعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا**...))

منـــیش ماڵەکـــەم بەجێهێـــشتو ســـۆمای چـــاوەکانم گەشـــانەوە.. ســـودمەندبووم لەهەموڕوویەکەوە دڵم پاکبۆوە لەناستیدا.

# شینی گوناهبارێک

و:م/ جەمال                                    دارشتنەوە: م. فاتح محەمەد سەمیع

ئـەوەی ئـەم چـیرۆکەمان بـۆ دەگێڕێتـەوە گـەنجێکی (کـومیتی)یـە کـە خـۆیو بنەماڵەکەی دووچاری کارەساتێکی زۆر پڕ مەترسی کردووە.. ئەمـەش لـە ئـەنجامی دوور کەوتنـەوە لـە بـەها بـەرزو پیرۆزەکـانی ئیـسلامو خۆسپاردن بـە ئـارەزووە شـەهوانیو شەیتانیەکان کە بەدرێژایی ژیانی مرۆڤەکان جگە لەسەرشۆڕیو پەشیمانی هیـچی تـری بەرهەم نەهێناوە، بە ئومێدی سوود گەیانـدن بەهـەموو لایـەك بەگشتیو خوشكو بـرا لاوەکانمان خێزانەکەمان کە پێك هاتبوو بە تایبەتی لە دایـكو بـاوکم لەگـەڵ سێ بـرای تـر کـە هـەموویان لـە خـۆم بـچوکتر بـوونو خوشـکەکەم کـە نـاوی "س" بـوو، "س"ی خوشـکم سـاڵێك لـە خـۆم گـەورەتر بـوو، ژیـانێکی زۆر خۆشمـان بەسـەر دەبـرد بـاری ئابوریمان زۆر باش بوو خاوەنی (ڤێلایەك)ی خۆشی خۆمـان بـووین، هـیچ کێـشەیەکمان نەبوو.. لەچواری ئامادەیی دەمخوێند، "س"ی خوشکیـشم لـە پـۆلی پێنجـەمی ئامـادەیی بـوو، مـنو "س"ی خوشـکم زیـاد لـە خوشكو برایـەتی وەك دوو هـاوڕێی خۆشەویـست پێکـەوە دەچـووینە قوتابخانـەو زۆر هـاودەمی یـەکتر بـوین.. ماڵـەوەمان مـاڵێکی کـراوەو تێگەیشتوو بوون متمانەیان پێـدەکردین زۆر یـەکتریمان خـۆش دەویـست –خۆزگایـە مـن نەهاتمایەتـە بـوون- چـونکە ئـارامیو شـیرازەی خێـزانێکم شـێواند.. کارەسـاتەکەش بـەم شێوەیە ڕوویدا..

لەسەرەتای خوێندنی ساڵدا بوو (قۆناغی چواری ئامادەیی)، قۆناغێکی نوێیە – هەنـدێك هاوڕێم پەیداکرد، زۆر هاوڕێیـەتیمان پتەو و بەهێز بوو.

ڕۆژانە دەچووینە دەرەوە پیاسەو یاریمان دەکردو جار جـارەش دەچـوینە قـەراغ دەریا بۆ مەلەکردن.. بەڵام هەوڵم دەدا کە هاوسەنگی لە نێـوان یـاری و چوونە دەرەوە لەگەڵ خوێندن و کۆشش کردنم بۆ قوتابخانە بپارێزم.

ڕۆژێکیان باوکم پرسی: " کوڕم ماوەیەکە دەبینم گۆڕانت بەسەردا هاتووە و چوونە دەرەوەت زۆر بووە"، منیش وتم: " لەگەڵ هاوڕێکانم پیاسەو یاری دەکەین‌و بێخەمبەیی لە خوێندنەکەم، چونکە هاوسەنگی تەواو ڕادەگرم‌و فەرامۆشی ناکەم" ، دڵنیام کردەوە و ئەویش متمانەی بە وتەکانم کرد. بەم جۆرە زۆربەی شەوان هەتا نزیکەی یانزەو دوانزەی شەو دەمماینەوە پاشان دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە.. شەوێکیان لە یانزەی شەو بەدواوە ویستم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە بەڵام یەکێك لە هاوڕێکانم وتی: هێشتا زووە جارێ بانەڕۆینەوە))، منیش وتم: " نەخێر درەنگی کردوەو دەبێت بڕۆینەوە. بەڵام هاوڕێکەم ڕازی کردم وتی: "چایەك لێدەنێین‌و دەیخۆین و دەڕۆینەوە.."

منیش ڕازی بووم، کاتێ چایەکە ئامادەبوو پەلەم بوو خێرا خواردمەوە.. بەڵام دەسبەجێ بەرچاوم ڕەش بوو چاوەکانم لێڵ بوون خەوم لێکەوت، لە هۆشی خۆم چووم کاتێك هۆشم هاتەوە و چاوم هەڵهێنا سەیر دەکەم کاتژمێر ٤٥ر٢ خولەکی شەوە، گێژو وڕبووم سەرم زۆر قورس بوو، هەر کەسەیری کاتژمێرم کرد دەست بەجێ بە پەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، لە زەنگم نەدا بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوتم هەتا باوکم‌و دایکم بە خەبەر نەیەن، بەهێواشی چوومە ماڵەوە دەرگاکەم بە ئەسپایی کردەوە. چوومە ژوورەکەی خۆم بەبێ ئەوەی هیچ کەس پێم بزانێت بەڵام کاتێك چوومە ژوورەوە "س"ی خوشکم دانیشتبوو ئەژنۆکانی لە باوەش گرتبو.. لەچاوەڕوانی مندابوو وتی: لەکوێ بوویت؟!

وتم: لەگەڵ هاوڕێکانم ماینەوە و نەمان زانیوە ئەوەندە درەنگەو هەرچۆنێك بوو ڕازی بوو قەناعەتی کرد. ئەو چووە ژووری خۆی‌و منیش لەشوێنی خۆم تەخت ڕاکشام ڕۆشنایم ون کردەوە.

بۆ بەیانی کە خەبەرم بویەوە هەستم بە گەرماییەکی زۆر دەکرد لە جەستەو لەشمدا، هەستم دەکرد لەناو کرۆکی جەستەمدا خڕۆو ئاڵودە بوونێك دروست بووە، شتێکی گەورزەم لێوون بووە.. بەڵام نازانم چیە؟ زۆر نامۆیە، خۆشم نەمدەزانی چییە، بەڵام یەکسەر بیری تامی چایەکەی دوێنێ شەوم کەوتەوەو بێوەستان چوومەلای برادەرەکانم‌و پرسیارم لێکردن ووتیان:

((بەڵێ زۆر مەشڵەزێ ئەوە تەنها (کەپسول – گولاج)ێك بوو دوێشەو کردمانە چاکەتەوە هەتا مەست بیت ئاسۆی خەیاڵت فراوان ببێت))، ئینجا زانیم (تلیاك)یان دەرخوارد داوم.. پەلەم لێکردن کە هەرچۆنێك هەیە چایەکی لەو جۆرەم بۆ پەیدا بکەن، وتیان: بەسەر چاو پەلەمەکە تۆ بڵێ ئێمە پەیدای دەکەین.. ئێمە هاوڕێتین هاوڕێ.. یەکێکیان ووتی: بەشەرەفم لەبنی ئەرز بێت پەیدای دەکەم.. خێرا بۆیان ئامادەکردم و دایان نا خێرا خواردمەوە، ئەم دنیایەم لەلابوو بە چەرمە چۆلەکە بەڵام کاتێك بە کەپسولەوە خواردمەوە یەکسەر حەسامەوەو دیسانەوە خەونێکی قووڵ یەخەی پێگرتم..

دوایی زانیم کە ئەو ((گولاجە)) ماددەی هێرۆینی تێکرابوو، بە تەواوی وابەستە (مدمین)ی مادده سڕکەرەکان بووم لە سەرەتادا خۆم لە هاوڕێکانم تووڕە کرد بۆچی منتان تووشی ئەم پەتا کوشندەو گاعونە نەفرین لێکراوە کرد.

ئەوانیش لێم بوون بە فریاد ڕەس وتیان: سەغڵەت مەبە هەج کاتێك ویستت وەرە بەبڕێ پارەی کەم بۆت پەیدا دەکەین، ئەمە زۆر ئاساییەو بۆچی لەخۆتی ئەکەیتە کێشە، بابە زۆر کەسی گەورە و دەوڵەمەندو سیاسەت مەدار تلیاك کێشن خەفەت مەخۆ!..

منیش قەناعەتم کردو ڕازی بوومو بڕیارم دا بەردەوام بم، بەم جۆرە بە تەواوی ((ئاڵودە – مدمین)) بووم. پاش ئەوەی زانیان بە تەواوی چوومتە خوێنمەوە، ناتوانم دەست بەرداری ببم بە بیانوی جۆراو جۆر ئەو کەپسولەیان لەسەر گران دەکردم بەڕادەیەك نەتوانم بیکڕمو بەشم نەکات ناچار کەوتمە دزی کردن لە باوکم، کە ئەوسا زۆر ئەستەم بوو بەلامەوە کاری وابکەم، بەڵام ئێستا سانابووە لەلام پاشان دزی لە دایکمو تەنانەت لە "س"ی خوشکیشم، پارەکەم دەبرد بۆ کابرای تلیاك فرۆشو قاچاغچی، جەستەو لارم زۆر لاوازبوو بەڕادەیەك عەلاگەیەکی چەند کیلۆییم بۆ هەڵنەدەگیرا. بەتەواوی لە خوێندن دوا کەوتم لە پۆلی چوار دووساڵ مامەوەو "س" چووە شەشو پاشان لەیەکی پەیمانگا بە دڵێکی پڕ لە هیواوە دەوامی دەکرد. ئەوەندەم درۆ لەگەڵ دیاكو باوکم کردو هەتا متمانەم لەدەستدا بەتەواوی فەرامۆش –ئیهمال–یان کردم بەڵام بەهیچ جۆرێك بە تلیاك کێشی منیان نەدەزانی.

زۆربەی شەوەکان بەدزی باوکمەوە درەنگ دەهاتمەوە تا شەوێکیان کە گەڕامەوە "س" دیسان چاوەڕوانی دەکردم کاتێک چوومە ژوورەوە ئەویش هاتە ژورەوە و باسی ژیانی منو خۆی بۆ کردم کە لە منداڵیەوە چەند پێکەوە بووین چەندین گەشتو سەردانمان بەیەکەوە کردووە. چۆن هەلگری ڕازو نیازی یەکتربووین.. چۆن وەکو دوو هاوڕێ وابووین.

خوشکەکەم وتی: ئێستا پێم بڵێ کێشەت چیە؟ بۆ وات بەسەر هاتووە، کێشت بە تەواوی دابەزیوە، ڕەنگت زەرد بووە، بۆچی هەمیشە کەنار گیریت؟! کێوای لێکردویت، کێشەت چییە؟ من هاوکاریت دەکەمو کارت بۆ ئاسان دەکەم!! لای هیچ کەس باسی ناکەم.. منیش بەر پەرچم دایەوە کە هیچ گرفتێکم نیە بەلام سوودی نەبوو پاشان قەناعەتم کرد کێشە ((موشکلە)) کەمی بۆ باس بکەم، بەتایبەتی پاش ئەوەی کەهەڕەشەی ئەوەی لێکردم کە هەموو شتێك بەباوکم دەڵێت لەدرەنگ هاتنەوەی شەوو هەمووی باس دەکات بۆ باوکم.

ناچار بووم باسیبکەم بەلام دایکم خۆی کرد بەژورداو "س"ی لەگەڵ خۆی برد، وتی: درەنگە ڕۆڵە بخەون، ((خۆزگە دایکم لەوکاتەدا نەهاتایە ژوورەوە))، بەلام "س"ی خوشکم بە ئامازە بۆ کردنێك تێیگەیاندم کە سوورە لەسەر قسەکانیو دەبێت سبەینێ بۆی بگێڕمەوە، منیش پەیمانم دایە کە بۆی باس بکەم. بۆ بەیانی زوو لەماڵ دەرچوومو خۆم گەیاندە برادەرەکانم بۆ وەرگرتنی بڕێکی تر لە زەمە تلیاکی ڕۆژانەم.. بەڵێ ڕۆژانەم، لەوێ لەناو هاوڕێ ناپاکەکانمدا ڕووداوەکەی "س"ی خوشکم گێڕایەوە.. بەلام ئەوان خێرا ڕەنگیان گۆڕاو تورەبوونو هەڕەشەیان لێکردم کە نابێت ئەو ڕازە بدرکێنم، منیش ڕازی بووم بەلام تازە شتێکم لەلای "س"ی خوشکم درکاندوە چیبکەم؟!.

وتیان زۆر ئاسانە، ئەویش بێنە ناو کۆمەڵەکەمانەوە خۆ لەئێمە زیاتر نییە.. ئێمەش خوشکمان هەیەو تلیاك کێشە.. هەر کەوایان وت زۆر تورەبووم گیانم کەوتە لەرزین وەخت بوو بەزەویدا بکەوم، کەوتمە شەڕ لەگەڵیان، بەلام ئەوان وتیان: ئێمە لەبەر تۆ دەڵێین، پەیمانیشت دەدەمینێ بە خۆڕایی تلیاك دەدەمینە تۆشو "س"ی خوشکیشت هەر کاتێکیش ویستمان ڕێگە زۆرە بۆ وازهێنان لە تلیاك پێویست ناکات

خۆت تورە بکەیت، بەم قسەو وتانە جارێکی تر فریوم خوارد، نازانم تلیاك و مادە سڕکەرەکان بۆچی ڕاو قەناعەتو بیرو باوەڕ دەشواتەوەو دەبێتە نێچیری هەموو ڕاوچیەك؟! ((کەپسول))ێکم بۆ "س"ی خوشکم هێنایەوە.

کە گەڕامەوە سەیر دەکەم "س" چاوەڕێمە زۆر پەلەیەتی بزانێ ئەو مەسەلەیە چییە کە لە منی حەشارداوە؟!، خوشکەکەم دەستی خستە سەرشانمو بەیەکەوە دانیشتین، بەڕووە خۆشەکەی وتی: " دەی بۆم باس بکە بزانم کێشەکەت چییە؟"

وتم: " تۆ برۆ چایەك ئامادەکەو وەرەوە باسی دەکەین."

وتی: بەسەر چاو برا ئازیزەکەم، من ئارامم لێبڕاوە تۆ گرفتێکت هەبێتو لەمنی بشاریتەوە!!." ئەو چوو بەلای ئامادەکردنی چاکەوە منیش لەوکاتەدا بیرم دەکردەوە لە کارەکەم لەدڵی خۆما وتم: ((ئاخر ئەم خوشکە دڵسۆزو بەڕەحمەم بۆچی توشی ئەم نەخۆشیەی من ببێت.. گوناهی چیە، من پیاوم باشترە بەلام ئەو... ئەو ئافرەتە کارەساتی لەدوایە، ئاخر بۆچی ناتوانم بڕیارێکی ئازایانە، پیاوانە، موسڵمانانە.. مرۆڤانە بدەم بڵێم نەخێر خوشکەکەم توشت ناکەم، بەلام دیاربوو مادە سڕکەرەکان بڕیاری هەرزوو لە دەستی منا نەهێلابوو.. لە دڵی خۆمدا وتم: یەك جارە دایی بەیەکەوە بڕیاری واز لێهێنانی دەهێنین. با جارێ ئەم مەسەلەی لەبیر ببەمەوە تالای باوکمو دایکم ئاشکرام نەکات ئیتر دوایی هەموو شتێك ئاسانە.. بڕیارم دا کە دەبێت تلیاکی بدەمێ لە هەمان کاتیشدا خەمێکی قووڵ سەری کردو چاوەکانم بۆ خوشکەکەم پڕبوو لە فرمێسك، "س" چاکانی هێناو داینا سەیری کردم خێرا نزیك بوویەوە لێم و وتی: " برام هەموو کەس توشی گرفت و نەهامەتی دەبێت لە ژیان دا نابێت بەو جۆرە ورە بەربدەیتو ئەژنۆت بشکێت)).

فرمێسکەکانی بۆ سڕیم، ئەو دوو دەستە زۆر جیاواز بوو، دەستی ئەو فرمێسکی منی دەسڕی، دەستی منیش ژیانی ئەوی سڕی..

بەزۆر زەردەخەنەیەکم بۆ کردو وتم: هیچ نییە.. بەبێ زەحمەت کەمێك ئاو بهێنە، وتی: بەسەر چاو. خێرا چوو ئاو بهێنێت، هەتا هاتەوە ((کەپسولەکەم)) بۆ کردە چاییەکەیەوە، کە هاتەوە سوپاسم کرد، بەچاوی بەزەییەوە سەیری ئەو

سەربڕنەم دەکرد من ئاوەکەم خواردەوەو ئەویش دەستی برد بۆ پیاڵەکەی خۆی کە لەبەردەمی بوو خواردیەوە، زۆر کەمی پێچوو هیچ خۆی بۆ ڕانەگیرا خێرا هات بەلاداو لەهۆشخۆی چوو، پیاڵەکەی دەستی کەوتو شکا، زۆر شڵەژام هەرچۆنێك بوو ڕامکێشا بۆ ژوورەکەی خۆی، دامپۆشی‌و بەخێرایی پیاڵە شکاوەکەم کۆکردەوەو بەدزییەوە بەو درەنگە بۆی دەرچووم، وتم: ((ئەگەر بەم شێوەیە دایکم‌و باوکم پێبزانن ئەوە منیش دەکوژن‌و تەسلیم بە پۆلیسم دەکەن بەلای کەمەوە))، لەبەر ئەوە سبەی شەویش نەگەڕامەوە، پاش تێپەڕبوونی دوو شەو بەسەر ڕووداوەکەدا گەڕامەوە کە چوومە ژوورەوە سەیر دەکەم دیسان "س"ی خوشکم بە چاوێکی کزو گڕگرتوو بۆ تلیاك چاوەڕێیە یەکسەر وتی: لەو شتەم بۆ پەیدا بکە کە کردبووتە ناو چاکەمەوە.. ئەگینا باوکم‌و دایکم ئاگادار دەکەم)).

وتم: باشە.. باشە.. بەڵام قسەمەکە هەر ئێستا دەچم بۆت پەیدا دەکەم بەڵام قسە لەلای کەس نەکەیت!! وتی: باشە بەمەرجێك هەر ئێستا بۆم پەیدا بکەیت.

خێرا بۆی دەرچووم خۆشم سەرم دەیەشاو وڕبووبووم پێویستم پێی بوو، گەیشتمە لای هاوڕێکانم.. ڕووداوەکەم بۆ هاوڕێ..چۆن هاوڕێیەك گێڕایەوە.. یەکسەر بۆی هێنام‌و گەڕامەوە دام بە "س". حاڵ بەمەشەوە نەوەستا تا ئەوەندە لەسەریان گران کردین بەهیچ جۆرێك لە توانامانـدا نەما کە بیکڕین ڕۆژێکیان ڕۆشتمەوە بۆماڵەوە.. دەبینم "س"ی خوشکم حاڵی زۆر شڕە زۆر بێتاقەتە کرژ بووە.. ئارامی لێبڕاوە، وتی: چیت کرد بۆت هێنام (لەم کاتەدا لەسەر چرپاکەی هەستاو کەوت بە زەویدا) هەستایەوەو ڤیژاندی دەستی کردە گریان.. چۆن گریانێك خۆمم بیرچۆوە، هەرچۆنێك بێت لە ترسی دایکم‌و باوکم بێدەنگم کرد، باشە چی بکەم؟! وتم بەخوا پارەم هیچ پێنەماوەو ئەو نەفرەت لێکراوانەش بەبێ بەرامبەر نایدەن هەر ئەوەندەیە هەتا توشت دەکەن ئیتر نرخەکەی دەبەنە ئاسمان!!.

"س" وتی: من ئەمانە نازانم ((دەستی لە یەخەم گیرکردو خۆی هەستانەوە)) وتی: ئەگەر نەیهێنی خۆم دەکوژم.. تێگەیشتی.

زۆر زۆر شڵەژام وتم: بەخوا بۆت پەیدا دەکەم بەڵام با باوکم و دایکم نەزانن،

ئیتر نازانم چەند وشەیەکی وت حاڵی نەبووم نازانم ئەو دەنگی نزم بوویان شپرزەیی حاڵی من خراپتر بوو بۆیە حاڵی نەبووم بە شپرزەیی ڕاکردنێکی لاوازانەم کرد خۆم کێشا بەو ئینجانە جوانەی کە کاتی خۆی پوورم بەدیاری بۆ "س"ی خوشمی هێنابوو بە بۆنەی بەیەکەم دەرچوونی لە قوتابخانە، بەڵام ئێستا "س"ی خوشکم قۆناغی یەکەمی پەیمانگای بۆ نەبڕا ئەویش وەك من بەر زریانو شەپۆلی تاوان کەوتو هەرەسی هێناو کەوت. هەرچۆن بێت گەیشتمە تلیاك فرۆش، تکام لێکرد بۆ خۆم نا بۆ "س"ی خوشکم هەتا کار لەکار نەترازاوە، بەڵام ئەو تاوانبارە خۆی بۆ ئەو ڕۆژە مەلاس دابوو، وتی: گوێ بگرە بەقەرزو و بەخێرو ئەم جۆرە شتانە لەلای من نییە، بەیەك مەرج دەتدەمێ.. تۆزێك وەستا وتی: بە مەرجێك یەکجار "س"م بۆ بێنیت تەنها یەك جارو تەواو.. تەنها جارێك لەگەڵی ڕابوێرم، ئیتر وەکو جاران بە خۆڕایی بۆ خۆتو بۆ خوشکەکەت کەی بتانەوێت دەتوانن بیبەن!)).

کەوای وت بەلاوازیەکەی خۆمەوە کەوتمە لێدانو پێداکێشانی بەڵام زۆر زوو هیلاك بووم و کەوتم سەرم هەڵبڕی جوێنی زۆرم پێ‌.. سەرزەنشتم زۆر کرد، ئەو لە شوێنی خۆی نەجولا. وتی: " بابە تۆ بەخۆڕایی خۆت ماندوو تورە دەکەی بەخۆی بڵێ ئەگەر ڕازی بوو ئیتر تۆ تاوانبار نیت؟!."

بەسەر شۆڕییەوە گەڕامەوە خێرا "س" هات و چاوەڕوانی دەکردم وتی: کوا هێنات؟ منیش نەمزانی چی پێبڵێم چۆن شتێکی پێبڵێم کە بست ساڵی تەمەنم نەهاتوە بەزمانمدا، بە ناچاری بەبێئەوەی سەر هەڵبڕم وتم: کابرای تلیاك فرۆش داوای ڕابوارن لەگەڵ تۆ دەکات! نازانم تۆ خۆت دەڵێی چی؟!.

ئەوەی کە نەمدەخواست وابێت و نەدەبوو ببێت ڕوویدا "س" یەکسەر وتی: بۆ هەموو شتێك ئامادەم، ئیتر ڕۆیشتین من لەپێشەوەو "س" بەدووراو دوور هات بەدوامدا تا گەیشتینە بەردەم شوقەی کابرا.. چوینە ژوورەوە، بەڵام دوو مرۆڤ دیلو لەقەفەس نراو بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردین، بەمنی وت، بڕۆ یەك سەعاتی تر بێرەوە، پاش سەعاتەکە چوومەوە، لەحاڵێکی زۆر خراپدا داوام لە "س" کرد کە بڕۆینەوە، ئەویش لەگەڵم هاتەوە، هەر دووکما بێدەنگ دەتوت فێری قسە نەبووین.. هەنگاو بەهەنگاو شەقام.. کۆشکەکان.. تاۆری کارەبا نەفرینیان لێدەکردم. تومەس کابرا، هەموو ئەدرەس

(ناونیشان)و ژمارەی تەلەفونی خۆی داوە بە "س"، ئیتر "س" تەنها ئەو جارە لەگەڵ من چوو لەوەودوا خۆی دەچوو بۆ لای کابارو بەتەواوی دەستی لەخۆی شۆرد.. بەڵام تا ئێستاش نە دایکم و نەباوکم ئاگایان لەهیچ نهێنیەکمان نیە، بەزەییم بەواندا دەهاتەوە کە منو "س" تەنها بەڕواڵەت لەو دنیایەی ئەواندا مابوینەوە ئەگینا لەڕاستیدا لەناو تاوانو سەرپێچیو خراپەکاریدا نوقم بووبووین.

ڕۆژێکیان لەماڵەوە بووین.. ئاگانامەیەکی پۆلیسمان بۆ هات کە (کچەکەتان لەگەڵ پیاوێکدا لە ئۆتومبیلێکدا وەرگەڕاونو مردون لەکاتێکدا کە هەردووکیان سەرخۆش مادە سڕکەرەکان بوون) لەگەڵ بیستنی هەواڵەکە منو باوکم و خێزانەکەمان خۆمان گەیاندە سەر جەنازەکانیان، کابرای تلیاک فرۆش و "س"ی خوشکم بوو، هەواڵێکی وا جەرگ بڕو ئابڕوو تکێن بۆ باوکم هەرگیز نەدەهات بەخەیاڵیدا، دەست بەجێ لەوێدا کەوتو گیانی سپارد، باوکم مرد، کارەساتەکە لێرەدایە کە دایکمو براکانم نازانن کە من هۆکاری سەرەکی ئەم ڕووداوەم هەر لەبەر ئەوەشە ناوێرم هەواڵی ئەو تۆڕە تلیاک فرۆشە بە پۆلیسو دەسگا بەرپرسەان بگەیەنم، چونکە یەکسەر منیش تووش دەکەنو هەموو کارەساتەکە بۆ دایکمو کەسوکارم ڕوون دەبێتەوە، ئەو کاتە ماڵەکەمان بەگشتی دەبێتە دۆزەخێکی ڕاستەقینە. ئێستا دوای ئەوەی بە چەند قۆناغێکی چارەسەریدا تێپەڕیومو ڕۆشتم زۆر گران بوو بەڵام چاك بومەتەوەو وازم لەو زارە کوشندەیە هێناوە بەڵام پاش چی من خۆم فەوتان خێزانەکەم هەڵوەشاند.. ئابڕوویانم بدر.. حەیام تکاند. "س"ی خوشکم و باوکم کوشت، دایکیشم پاش ئەم ڕووداوە (ڤێلاکە)ی فرۆشت و شوقەیەکی کۆنی ناخۆشی پێکڕی.

ئێستاش من بێهێزو بێتوانامو ناتوانم کارێك بکەم چونکە ئێستا من گەورەی ئەو خێزانەم، من دەزانم ئێستا نەفرەت لێکراوم نامەوێت دوعای خێر بۆ من بکەن.. بەڵکو دوعاو نزای خێر بۆ "س"ی خوشکم بکەن ئەو بێتاون بوو من تووشم کرد، دوعاو نزای بۆ بکەن کە خوای گەورە لێیخۆش ببێتو بە شەهید قبوڵی بکات لەبەر ئەوە زۆر پاكو دڵسۆز بوو بەڵام دەستی تاوانو خراپەی من ئەوی لەو هەڵدێرمنا تەنها دەروازەی باسکردنی من بۆ ئەم کارەساتەی خێزانەکەم (ئەنتەرنێتە) تۆ بڵێی باسکردنی لەم ڕێگەیەوە سارێژی کەمێك لە زامەکانم بکات. بەڵام هەرگیز بڕوا ناکەم،

چاوەڕێی ئەو ڕۆژە دەکەم کە یان خۆم یان بەرێگەیەك لە ڕێگەکان پێم دزانرێت.. ئەو کاتە بێبەش دەبم لە ڕەحمی هەموو دنیا.. داوا دەکەم خوای گەورە ڕووی ڕەحمم تێبکات.. بەڵام دڵنیام لە قیامەتدا "س"ی خوشکم پێش هەموو کەس یەخەم دەگرێت.. یەخەم دەگرێت. ئێستا پێش ئەوەی لەسەر ئەنتەرنێت هەستم بە چاوی پڕ لە فرمێسکاویەوە ئاواتمە بمرم و هەڵنەستمەوە.. بەڵام نازانم مردن بەدەستی ئێمە نییەو .. ڕووم لە لێخۆشبونی خوایە..

بەرێزان: دایکان باوکان.. لاوان چ خوشك چ برا.. زۆر وریایی ژەهری مادە سڕەکان و شەوەزەنگی دەستی بێڕوناکیان بن.. دەغیلە ئامان.. وریا بن وریا.

٢٨/تەمموز/٢٠٠٢

# کۆرپەیەکی گەرمیان

ڕۆڵەکانی گەلی کورد وەك هەموو ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبو فارسو تورك توشی نائارامیو دڵەڕاوکێو سەرگەردانیو کوشت کوشتار بۆتەوە بە دەستی ئەندامانی (حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی)یەوە.

کەم تا زۆر تا گیان بەخشینو نقوم بوون لە گێژاوی ئەو حزبەدا هاتووە. چەند ڕوداوێك دەخەینە بەر سۆمای چاوە گەشە پڕ هیواکانتان بەو هیوایەی تاوانی ئەو کەسەو ئەو حزبە دژ بە مرۆڤایەتییەمان بیر نەچێتەو، گەرچی ئێمە سروشتی ژیانمان وەهایە.. کە گەیشتینە خۆشیو ئارامی ئیتر هەموو ناخۆشیو نائاسودەییەکانمان لێبزردەبێتو بەشوێن ئارامیو خۆشی دنیادا زیاتر دەگەڕێین، خۆمانو ساتە پڕ ئەندێشەو حەسرەتەکانمان یاد دەچێتەوە.

بەڕێزان بەخێرایی ئاوڕێك لەناو شار دەدەینەوە.. ئەوە ماڵی باوکی شەهیدێکە کە لەناوەختدا گورگەکانی بەعس هەڵیان کوتاوەتە سەریانو کوڕە لاوەکەیان بردووە.. پاش هەفتەیەکخانوەکەیان ڕوخاندوونو پارەی فیشەکەکانیشیان لە باوکی جەرگ سوتاوی سەندۆتەوە.. لاشەکەشی تا ئەم ساتە ونە.. بەڵێ ونە.

ئەوە ئەو دوو ئەوجەوانەن کە لەسەر کڵکۆی دایکیان فرمێسك دادەڕێژن چونکە دایکیان ئامادە نەبوون نهێنیەکانی مێردەکەی بدرکێنێ بۆیە گیانی پاکی سپاردو ڕۆحی پەپولە ئاسای لە بەرزەخدا وەنەوز دەدات. ئەوە ئاهی دایکێکی پرچ سپییە بە فرینەکانە ئەمرۆ پیرۆزبایی لە دایکی هەموو شەهیدەکانی ئەتەوە دەکات کە جەرگی (ساجیدە) بووە جەرگی ئەوان..

ئەوە هەنیسک‌و حەسرەتی خوشکەکانی (تەهایە)، ئەمرۆ ئارام دەگرێت لەگەڵ خوشکی شەهیدەکانی تردا، چونکە (حەلە) هەنیسک دەدات‌و براڕۆ دەکات، ئەم زامانەو چەندینی تر تا ئێستاش ساڕێژ نەبووە.. پێناچێت ساڕێژ بێت. ئەوەش گوندەکانی گەرمیانە وەك هەموو گوندەکانی تری کوردستانی باشوور تووشی کۆچ‌و کیمیا باران‌و ڕامالین بووە..

هەر گوندەو بەشێوەیەك.. دێیەك بە خۆشی، دێیەك بە ناخۆشی، دێیەك بەگرتنی ئەندامانی.. دێیەك بەکیمیاباران کە لە دەرەوەی وڵات ئەو ژەهرە بەخشرابووە ڕژێمی وەخت لە پێناو چۆڕە نەوتێکدا –پترۆڵ- وەرن لەگەڵم ئەوە سەرۆکی وەخت (سەدام حسین)ە لە کۆشکی کۆماریدا بە هەموو سەربازو خاوەن پلەو پایەکانی کۆکردۆتەوە بەمەبەستی خەڵات کردنیان‌و بەخشینی ((**نوط الشجاعة و ویسامی رافیدەین**...)) کەناڵەکەی بەغداد و کەرکوك وێنە دەگرن خەڵکی لە ماڵەکانی خۆیانەوە سەرنج دەدەن.. ئای لەو شەوگارانە.. ئای لەو ساڵانە.. پاش بەخشینی، سەرۆك گەڕایەوە سەر کورسییەکەی خۆی‌و دانیشت، فەرموی لێکردن بۆ دانیشتن هەموو دانیشتن، ڕووی تێکردن ووتی:

((ها بزانم هەریەکەو ڕوداوێکی ئەو ڕۆژانەم بۆ وەگێڕێت کە دیویەتی.. پاشان یەکە یەکە هەڵدەستان لەبەردەم (لافیتەیەکی) بەرزدا دەستیان دەکردە گێڕانەوەی ڕووداوەکان – ئەمەش پاش ڕێزو سوپاس‌و خۆشەویستی دەربڕین بۆ سەرۆك‌و حزمبە پایەدارەکەی‌و سوپا بەهێزەکەی..

یەکێك لە خاوەن (مەدالیا)کە سەربازێکی پلەداری لاشە باریك بوو هەستاو دەستی کردە گێڕانەوەی ئەو پاڵەوانێتییەی کە لەو ناوەدا –گەرمیان- ئەنجامی دابوو، کە بەناو (ئەنفال) بوو –بەڕێزان بۆ ناشرین کردنی ڕابونی ئیسلامی کارو کردەوەکانیان ناوی شەڕەکانی بەناوی صەحابە، سورەتی قورئان، کەسایەتی ئیسلامی، ناودەناو شانازی پێوە دەکرد، وادەی نیوەڕۆ بوو بە ناو دێیەکی چۆڵدا تێدەپەڕیم هەرچی ناوی (بەنی ئادەم) بێت تیای نەمابوو.. ڕۆژانی ڕابردوو ناو بەناو دەنگی گیان لەبەران دەهات بەڵام ئەمەش یەك ماوەی کورتی خایاند.. سەربازەکانمان لەناویان بردن..

بە کۆلانێکی باریکدا گوزەرم کرد.. پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەم بوو دڵم بەهێمنی لێیدەدا لەهیچ شتێك سامم نەدەکرد تەنیا خۆم لەناخەوە دەترسام .. گیانی خۆم خستبووە سەر بەری دەستم لەناکاو دەنگی منداڵێك هاتە بەر گوێم .. دەگریا .. سەرەتا وتم: هیچ نییە گوێم زرنگاوەتەوە . بەلام گریانەکە ناوبەناو هەر دەهات ؛ ژیر دەبۆوە منیش بەترسەوە لەسەرچاوەی دەنگەکە نزیك بوومەوە بە ئاستەم هەنگاوم دەنا.. تەنها دەنگی چرپەی ئەو وشکە گەڵاو چیلکانە دەهات کە لەژێر پۆستاڵە ڕەشەکانمدا دەشکان.

زۆر ترسام.. چەند خەیاڵێکم بۆ هات.. بەلام ترسم ئەوەندە نەبوو کەچی ڕوودەدا.. چونکە سەربازەکە چەکی پێبوو خۆی زۆر بەگەورەو خاوەن هێز دەزانێت.. نزیك بوومەوە.. تەواو نزیك بومەوە دەنگی گریانی منداڵێکی ساوا بوو.. بە ئاستەم گەیشتمە ئاستی ژوورەکە، خانووەکە حەوشەو دەرگای دەرەوەی نەبوو بەهێمنی ملێکم درێژکرد لە پەنجەرەکەوە.. هیچی وام نەبینی شایانی گوللە ئاراستەکردن بێت. چەند هەنگاوێکی تر ڕۆشتم گەیشتمە دەرگای ژوورەکە سەیرم کرد ماڵ کش‌و مات.. هەنگاوم نا گەیشتمە ناوەڕاستی ژوورەکە چاوم گێڕا.. تەواوە.. ئەمە منداڵێکە و لەناو لانکێکدایە -بێشکە- جوان دابەستراوە.. ئەو کاتانەی دەگریا.. نازانم بۆچی بەلام ئەوکاتانەی ژێر دەبۆوە مەمچەکە ئەرمەکانی کە زەنگیانەی شینی تیابوو درێژی دەکرد بۆ ئەو گەڵوازمیەی بە بێشکەکەوە هەڵواسرابوو.. نەخش‌و نیگارێکی جوان و دەسرازەو سەرسنگ‌و قەراغ بێشکەکەی بۆ ڕازێنرابۆوە.. چاوم زۆر گێڕا بەماڵەکەدا لە سوچێکی ئەو ماڵەدا وێنەی ژنێکی جوان لەگەڵ پیاوێکی خوێن گەرمی جامانە بەسەری لاودا هەڵواسرابوو.. دیار بوو ئەمە نۆماڵبوون.. چونکە ماڵ سادەبوو.. ئەوەش لە نۆبەرەیان دەچوو.. بەلام نازانم چۆن لێیان بەجێمابوو.. ئەی چۆن لە برساندا نەمردبوو.. لە تاقێکی پەنجەرەکەدا.. قوتوە شیرم بینی لەگەڵ مەمکە وشکەو بابەتی شیری منداڵ.. زیاتر چاوم گێڕا.. منداڵ بە بینینی من زۆر کەیف خۆش بوو کە سەیرم دەکرد دەمەپانەکەی بۆم پێدەکەنی کە ڕووم لێوەردەگێڕا لچی دەکرد چاوە ڕەشەکانی بۆم دەگریان‌و پڕدەبوون لە فرمێسک -ئای ئەمە چ دڵێکە.. ئەم کەسانەی ئاوا لێك هەڵوەشاندووە.

ترسام لە دڵی خۆمدا وتم: ئێستا لەم کاتەدا سەرۆك بێت من ببینێ کاری خراپ ڕوودەدات. بڕیارم دا بچمە دەرەوە لە ژوورەکەو لە ماڵەکە دوور بکەومەوە. بەڵام ئەی ئەم منداڵە.. بەدواما دەگری بەدەستە نەرمۆڵەکانی داوای دەرهێنانی دەکرد.. حەزم کرد بزانم برسیەتی یان نا بە ئاستەم لولەی تفەنگەکەم خستە ناو دەمی منداڵەکەوە.. منداڵ مژی.. زۆر مژی دەمی لێبەرنەدابەهیوای تەڕایی بوو بچێتە گەروی وشکیەوە.. دیار بوو زۆر برسی بوو.. ئای کە بیرم کردەوە برسێتی چەند ناخۆشە..

منداڵ دەمی لە لولەی تفەنگەکە بەرنەداو منیش پەلەم بوو بگەڕێمەوە خۆم لەم تەنگەژەیە ڕزگار بکەم لولەی تفەنگەکەم دەرهانی لەدەمی، منداڵ دەستی کردە گڕوگاڵ.. تۆزێك سەیرم کرد ئەویش لە بێدەستەڵاتیدا دایەوە گریان.. خەیاڵێکی تر هات بە مێشکمدا جیاواز لە خەیاڵەکانی تر، لولەی تفەنگەکەم خستەوە دەمی، لەگریان وەستا ژیر بۆوە چاوەکانی گەشانەوە فرمێسکەکان قەتیسم مابوون دەبریسکانەوە.. بەڵام پەنجەی ڕاستی پڕ هێزم لە پەلەپیتکەی تفەنگ توند کرد. زرمە لە تەوقی سەری منداڵە کۆرپەکەوە هەستا بەدەستی کێ بە دەستی من.. گریان نەما پرژە خوێن و تەپوتۆزی ژوورەکە ئاوێتە بوون مێشك و گۆشت و خوێن لەو ناوە پژان پژان بوو.. منیش بە ئاسودەی هاتمە دەرەوە.

بەڕێزان دوا هەناسە.. دوا هەنیسك، دوا ئاواتی ئەو منداڵە وەك مەلێکی سپی لە ئاسمانی گەرمیاندا بەرزبۆوە لە هەورەکانەوە بۆ زەوی دەنیشتەوە پاش گەڕان بۆ قوڵایی ئاسمان لە شەقەی باڵی دەدایەوە، لەدوا وتەکانیدا وتی: ئای سەرۆك زۆر ئاسودە بووم.. چونکە ئەمە گەورەبووایە (موخەریب –پێشمەرگە) دەردەچوو، ئەمە گەورە بووایە دژی حزب و دژی تۆ دەبوو.

سەرۆك (سەدام)ی گۆڕ بەگۆڕ چەپڵەیەکی بۆ لێدا بانگی کردە پێش دەستی کێشا بەشانیداو دەست خۆشی لێکرد.. بەڵام چاوی کامێرا هەندێك لەسەربازە دانیشتوەکانی ناو هۆڵەکەی پیشاندا کە بە دەستەسڕەکانیان چاوەکانیان دەسڕی.. تۆ بڵێی فرمێسکی تمساحی نەبوبێت.

# مژدەی پێغەمبەر یونس

چەند مانگێك دەبوو لە بەندیخانەی حکومەتی بەعسی ئەفلەقیدا گیرابووم لە رووناکی خۆر بەندو بێبەش بووم بەتاوانی کە خۆشم نامزانی چیە؟!.

ئەوە چەند شەوێکە لێدانو کوشتنو برین بەشی هەمووانە (تعزیب) ئەو لێدانەی کە کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات.. رۆژنا ڕۆژێ نەرمییان لەگەڵ دەنوانین.. دەزانن بۆ؟ بۆ ئەوەی لەرێگەی وتووێژو خۆشیەوە نهێنی بدرکێنین.. ئەو نەرمیەش ئەومندەیان رێز لێدەگرتی پیاو تەریق دەبۆوە.. هەرنات وت ئەو پیاو کوژانەن.. کە بێهیوا دەبوون دەیان بردین بۆ لێدان.. پاش تەوابوونی لێدان فرێدەدراینەوە ناو ژووری پشوو –بڕوا بکەن گوێنیەکی بێکەڵکی پەرپوت چەندە رێزی هەیە ئێمەش بەو شێوەیە.

زۆر لە هاوڕێیانی زیندان دڵخۆشی یەکترمان دەدایەوە.. خەومان بەژیانی دەرەوەی زیندانەوە دەبینی دەمێکە وتویانە هاوڕێیەتی (نەخۆشخانە، بەندیخانە، سەرفەری غەریبی) زۆر خۆشەویستن، چونکە لەو تەنگانەو تەنگەژانەدا بە دەورتەوەنو هاوغەمو سکاڵاتن.

ئەو رۆژە زۆر ئازاردرام بۆ دووەم جار نینۆکەکانم دەرهاتنەوە.. کارەبا لاشەمیان بەسەر کردبۆوە.. بەڵام هەر سوپاسی خوام دەکرد کە بە نارەحەت تر نەگەم بەو ئایەتە پیرۆزە سەبوری خۆم دەدا (**لا تقنطوا مِنْ رحمةِ الله**) بۆ شەوەکەی بەهەچ هیلاکییەك بێت نوستم و خۆشم نەمزانی لەتاو ئازار چۆن خەوم لێکەوت لە قوڵایی خەودا بووم ... لە خەومدا ڕاکشابووم پیاوێکی باڵابەرزی سەرتاپا سپی و روویەکی گەشاوە و نورانی هاتە لامەوە و وتی: تۆ (...)؟ وتم: بەڵێ قوربان ئەی تۆ کێیت... ئەی ئەم گیان لەبەرانە چین لەگەڵتدا؟ لە خەوەکەمدا کۆمەڵێ ((نەهەنگی گەورە گەورە (حوت)ی لە دەوربوو فەرمووی: کاکە.. باوەرت پتەو بێت.. نهێنی نەدرکێنی.. هیچ

خەمیشت نەبێت پشت بەخوا لەم نزیکانە تۆ ڕزگارت دەبێت بەڵام تا دەتوانیت لەگەڵما ئەمە بڵێرەوە منیش (نبی یونس)م: (**لا إله إلا أنت سبحنك إني كنتُ من الظالمين**، )).

منیش چەند جارێکم لە دوایەوە دوبارەم کردەوە وتم.. وتم ئەویش لەبەر چاوم ون بوو لەگەڵ نەهەنگەکان دیار نەما، منیش چەند جارێ بە بەردەوام دەم وتو دەم وتەوە هەستم دەکرد بەدەنگی بەرز دەیڵێمەوە، لە پڕ ڕاپەڕیم کە سەیر دەکەم ئەمە خەوە هەموو برادەرەکانم بە ژوور سەرمەوە ئەبڵەق بوون.

منیش وتم: ئەوە چیە هیچ ڕوویداوە؟

وتیان: شتێکی واو وات ئەوت.

ئەوەی دیبوم بەخەو بەوردی بۆم گێڕانەوە.. هەموو لاشەم سەرناو گەڕابوو.. هەستم بە نەرمە تایەك دەکرد، یەکێ لە برادەرەکانم وتی: هیچ نییە هەرچی ماوەیەك لێرە مایەوە ئەو جۆرە خەوانە دەبینێ. برایەکی تر زۆر سەرسام بوو بوو وتی: کاك(......) ئەگەر دەرچوویت لەزینـدان إنـشاالله مـاڵی ئێمـەت لـەیاد نەچـێت لەگەڕەکی(....) دەرگایەکی قاوەییەیپێیان بڵێ هیچ خەمی منیان نەبێت دیار بوو ئەم برادەرەم شتێکی لـە ڕوخسارمدا دەخوێنـدەوە... یـان ئـەویش دڵـی خەبـەری دابـوو کەڕزگارم دەبێت ئەو داماوەش ناوەخت بەجلی شەوەوەو لەناو ماڵو منداڵیدا دەریان هانی بوو.. تکای دایكو باوكو ژنو منداڵەکانی دڵی ئەو نامرۆڤانەیان نەرم نەکرد بوو.. بەتەمەن ترین گیراوی ئەو زیندانە بوو بەڵێ بەرێزان نازانم لەگەڵمان یان نا.. بۆ بەیانی یەك بەیەك بانگکراینە ژووری لێدانو داپڵۆسین بەڵام بانگ کردنی مـن جۆرێك سۆزو نەرمی تیا بوو بەدەر لەڕۆژانی تر.

بردیانمە ژورێکی خۆشو دوای کەمێ ڕامانو قسە کردن پەرداخێك ئاوو شەربەتیان خستە بەردەستم فەرموویان لێکردم کە دەست بکەم بەخواردنەوەیان.. پاشان داوای لێبوردنی زۆریان لێکردم وتیان((شتەکە بەو شێوەیە نەبوو کە ئێمە لێی تێگەیشتبوین)) دوعا خوازیان لێکردمو ئامۆژگاریشیان کردم کەبۆ کەس باسی هیچ نەکەم، لەخۆشیاندا وام دەزانی ئەو ساتە لەدایك بوومەتەوە خۆشیەکی زۆر خۆش سەرو دڵی گرتم.. بیرم لەلای شەربەتو ئاوەکە نەما.. دوا جار فەرموویەکی تریان

لێکردم.. بەڵام هەرچەندم کرد دڵم نەیبرد.. وتم : ((ئێوە مزدەیەکی واخۆشتان دامێ ئیشتیهای خواردنەوەی هیچم نەما)) کاتێکم زانی هەردوو چاویان بەستم‌و هەردوو دەستم لەدوواوە سواری سەیارەیەکی تیژ ڕەویان کردم.. پاش ماوەیەك هەستم کرد سەیارەکە وەستاو دایان گرتم.

یەکێك لەچەکدارەکان ((بەدەنگێکی پڕ لەسۆزو چاکەو خۆشی وتی: برا.. تۆ لەئێستاوە ئازادی برۆ بەڵام هەرکاتێ گوێت لێبوو سەیارەکەمان ڕۆیشت تۆ دەتوانیت چاوی خۆت بکەیتەوە، دەستیان کردمەوە تائەو کاتەش دەترسام کەئەمەش یەکێکە لەفێڵەکانیان.. نەمتوانی بڕوای تەواو بکەم لەدڵی خۆمدا دەموت : ((ئێستانا ئێستا گوللەیەك کاسەی سەرم دەسمێت، بەڵام لەقوڵایی ناخمدا ئەو خەوە پیرۆزە زۆر دڵخۆشی دەکردم..))

بەڵێ سەیارە دەنگی هات‌و دنیا کپ‌و مات ئەمزانی شەوە ڕۆژە دنیا لەکوێدایە.. ئەی ئەم لاشە بێ‌سەرو شوێنەم لەکوێدایە بەهەر حاڵ یەك کفنم زەرد کرد.. وردە وردە چۆکم دادا لە سەر زەوی دانیشتم دەزانن بۆ؟!

بەخەیاڵ وتم گەر لەوێ ماین ئەو نالەبارانە دەنگیان لێوە دێت.. بەم کارەم زۆر قەڵس دەبن. بەڵام هیچ دەنگ‌و سەنگ نەبوو بۆیە زۆر لەسەر خۆ پەرۆکەی چاوم کردەوە.. ئای کەدنیا جوانە شایەتومانێکی بەرحەمەتم هانی.. هەردوو دەستم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان تێر تێر سوپاسی خوای گەورەم کرد کەزۆر بەسەلامەتی ڕزگارم بوو بەڵام هەر دڵنیا نەبووم ناو بەناو بەچوار دەوری خۆمدا دەمڕوانی.

بەتەواوی بۆم دەرکەوت ئەمە ڕاستی‌یەو هیچ خەو نییە. پاشان هەوڵم دا بگەمەوە ماڵەوە.. ئەگەر چی لاشەم کفتی لێدان بوو سوپاس بۆ خوا ڕزگارم بوو.. ئەی ئەبێت هاوڕێکانم کەی لە زیندانە تاریکەکان‌و ئازارو لێدان‌و ناخۆشی ڕزگاریان ببێت..

- لەکۆتایدا بەڕێزان : ئەو ماڵەم دۆزییەوە کەناونیشانی هاوڕێکەم بوو.. بەڵام بەداخەوە بەعس ڕوخاندبویان بەسەر ماڵ‌و منداڵیدا.. تائەم نوسینەش هەواڵی هەر نەهات، باوکیشی تا کۆچی دوایی‌کرد چاوەڕوانی دیداری بوو

- ئەو دوو پەرداغەی دانرا بوون بۆم گەر بمخواردایەتەوە بۆم دەرکەوت لەم دوا ساڵانەدا، هەفتەیەك زیاتر لەدنیادا ناژیام توشی مەرگی دەکردیت.. خوایە گیان سوپاس بۆ ڕەحم و سۆزت سوپاس بۆ هیدایەتت.

سوپاس لەسەر هەموو شتێك.

# کــۆچ

یاخوا هیچ شتێك نەبێ بەچاو لێکەری.. بەتایبەتی خراپەکانو ئەوانـەی سـودی زۆر بەکەمی تیا بەدی دەکرێت.. بەمەبەستی کۆچ بـەرەو هەنـدەران.. ئـەو بەهەشـتەی لای لاوان وێنەی نییە.. خۆ رزگار کردن لە جەهەنەمی ولات .. یان بلێین راکـردن لـەواقعی ولاتەکـەمانو. هەنـدێ بابـەتی تـریش ،لاوێـك دوای هـەموو خـەرجیو نارەحـەتی تـا گەیشتۆتە پلەیـەك خزمـەت بەگەلەکەی بکاتـەوە کۆچ دەکات خزمـەت بـەولاتێ دەکات کـەتییا غەوارەیـە.. کـەتوانای خـۆی دەخاتـە کـار بـۆ برێکـی کـەم لـەو دۆلارەی خـەوی پێوەدی. بەرێزان گـەر خـاوەن بروانامـەی بـەرزبێت جێگـەت تـا رادەیـەك باشـە.. بـەلام پێچەوانەکەی خزمەتی ئەو شتانە دەکات کە لە کۆمەلگەی خۆماندا گێزەون بووە لەلای.

دلنیاش بن رۆژێ دادێ لاوان کەم دەبن.. ولات زۆر پێویـستی دەبێـت.. ئـەوانیش لەدەرەوە قسەی کالێ بۆ کۆمەلگە دەکەن.. ناتوانن بەردێ بخەنە سەر بەردێ.. دەزانـن بـۆ چونکە" بەرد لە جێگەی خۆی سەنگینە.." دەبنە قەلەرەشەکەی کە رۆشتنو فرینیـشی لێتێکەلێ دەبێت. جا با ئەم لاوەی هاتۆتە گوفتار بۆمان بدوێ تـەنها کـە (کۆچـی رێگـای) مشتێکە لە ئەندێشەو.. ویستم بەرەو هەندەران کۆچ بکەم.. بـۆ ئـەو کۆچـە برێکـی بـاش پارەو پولم بە قەرزو قۆلەو پاشەکەوتی رۆژانەم خەرکردەوە.. نێتـی باشـم لێهانیو دوای دۆعاخوازی لە دایكو باوكو خـزمو کـەسو کـارانم ئێوارەیەکیـشم دانـا بـۆ ژووان.. پـاش چەند خولەکێك بەیەك گەیـشتین لـە یـەکێك لـە دوکانـە قەشـەنگەکانی نـاو شـار.. دوای خواردنەوەی شەربەت، لەگەلێ (کە.....) خۆشەویست کەوتینە قسەو گفتوگۆکردن یـادم نەچێت (سێ) سـالێ تێپـەری بـوو، دووجـار خـوازبێنیم کردبـوو لـە بـاوکی (کـە....)ی خۆشەویسم بەلام بـاوکی نەگەیـشتبووە ئـەو قەناعەتـەی کچەکەی بکاتـە گـولی گولـدانی دلم.

بەدوورو درێژی مەبەستی گەشتم بۆ هەندەران و تاڵاوی کۆچ بۆ (کە..)ی خۆشەویستم باسکرد. هەناسە لە دوای هەناسەی هەڵدەکێشا.. لەدوا قسەیدا وتی: ( هەر کۆچ دەکەیت.. ئاخ کۆچ.. بەڵام خۆزگە دەتوانی بەڵێنم بدەیتێ کە خۆت بە مرۆڤی بهێڵیتەوە.. نەچیتە قەوارەی ئاژەڵی کێوی‌یەوە دورنەکەویتەوە لە بیروباوەڕو ڕەوشت و کەسایەتیت.. نەکەی بۆ ساتێك خۆشی یان چەند دۆلارێك ئەم مرۆڤایەتی‌یەو ئەم خۆشەویستی‌یە لەدەست بدەیت.. ئێمە کوردین.. بڕوادارین هیچ نەبێت لەبەر سۆزو خۆشەویستی من وەك مرۆڤێکی ئازاد، ئازا بژی.)

قسەکانی زۆر جێگەی بایەخ بوو.. چونکە هەواڵی زۆر برا کورد دەهاتەوە کە بۆ فرانك.. یۆرۆ.. دۆلار هەموو خاسیەت و خەسڵەتی کوردایەتی و موسڵمانێتی و پیاوەتیان لە خۆیان دا ماڵیوە.

بەڵێ.. قاچاغچیم پەیدا کرد.. لێرە پیاوی تەواو خاوەن بڕواو متمانەی بەهێز.. بەڵام بزانین ڕێگا چۆنە چونکە دەمێکە کورد وتویەتی (سەفەرو معامەلە سەنگی مەحەکن)، بەڵێ کەوتینە ڕێگە ماوەی یەك دوو جار لەدەست قاچاغچی بێزار بووم.. بەهەر شێوەو ئەحواڵێك بوو شارەکانی تورکیامان بڕی، دەزانن بەچی بەسەیارە، بەپێ.. لەناو سەلاجەدا (شاحینە).. بەلەم.. بەکولەمەرگی و برسێتی و ساردو گەرمی. زۆر جار مەرگ بە دۆلار بوایە دەمکڕی.. بەلام کە دەگەیشتمە خۆشی و دور لە جەندرمە هەمویم لەیاد دەچۆوە.. ئەمە ڕێگەو چارەنوسی هەموو لاوێکی کۆچ لەبەر بوو.. گەیشتمە ئەسینا.. گیرام.. نەمزانی چۆن گیرام ڕەوانەی تورکیا کرامەوە.. ئەوەندە ئەمبەرو ئەو بەرم کرد بەتەواوی شارەزای هەموو ڕێگەو جێگەو شوێنەکان بووم. لە ئەسینا کوڕێك بووە برادەرم وتی: کاك (...) بۆ نایەی خۆمان بکەینە قاچاغچی.. وەجبە بەرین لە عێراقەوە بۆ ئەوروپا.. دڵنییاش بە پارەو پولێکی یەکجار زۆرمان دەست دەکەوێت. کە بیرم لێکردەوە زۆر ڕاستی دەکرد.. بەڵام خۆ هەروا ئاسان نییە کاری قاچاغچی بۆیە وتم: باشە بەم دووکەسە چیمان پێدەکرێت؟

وتی: کوڕی باش دووکەسی چی شەبەکەین.. شەبەکە!.

نازانم بۆچی وا زوو بڕیارم دا.. وتم: زۆر باشە لە بەیانی‌یەوە ئەندامم.. چەند

دەستەلاوێکمان گەیاندە هەندەران زۆر ئاسانو خۆش بوو بەتایبەتی ئەو کارەی منو ئەو نێوانەی بۆم دانرابوو.

بەسەیارە بەپێ بە ولاغ.. شەو بەشەو ڕێگامان دەبڕی ئەوەش بزانن دەرمانی ڕێگە هەر ڕۆشتن بوو. لەماوەیەکی زەمەنی کەمدا ناوبانگی باشم لەو دەستەیدا پەیدا کرد. ئەمەش دوای گەیاندنی (٦٥) وەجبە کە بەسەلامەتی و بێغەشو لە هەندەران پشوویان دابوو.

لەم ماوەیەدا چەندین یادگاری خۆشو ناخۆش ڕوویدا ئەوەی زۆر ویژدانی هەژاندم.. ئازاری دام کاریتێکردم.. هاوڕێم بن تا بزانن چی ڕوویدا.

نیوەڕۆیەکیان لە گوندی (....)بووم لە خاکی تورکیادا.. سەردەستەکەمان کاك (....) دوو پیاوو یەك ئافرەتی دایە دەستم کە بەسواری ولاغ بیانگەیەنمە گوندی (...) ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو ناخۆشی زۆر بوو. کەوتینە ڕێ بەلام هەمووی چەند کیلۆمەترێك دورنەکەوتینەوە هەوالم بەدەست گەیشت کە ڕێگا زۆر ناخۆشە (جەندرمە) وەك خۆڵ دابارێون زۆر ئاستەمە دەرچوون.. بەلام لەو نێوانەدا یەك دوو بۆسەم دەناسیو بوبوینە (هاوەڵ).. لەیادم نەچێت فێری تورکییەکی باشیش بوو بووم. بە باس کردنی هەواڵەکە دوو پیاوەکە ڕایان گۆڕی لە دێیەکە مانەوە.. تەنها منو ئافرەتەکە کەوتینە ڕێگە.. ڕۆحما لە کونە لوتماندا بوو.. نیوەشەویشەو تاریکە شەو.. زۆر بەئاستەم بەرپێی خۆمان دەدی، ئاشکرا بگەڕێینەوە، چونکە چەند ڕۆژێك بوو لەو ماڵە تورکەدا خزمەت دەکراین. چەند کیلۆمەترێکی تر ڕۆشتین لە مەترسی ڕزگارمان بوو تێپەڕین. بەلام لە جەندرمە خراپتر هاتەلام. شەیتان بۆ نامرێت.. کەی لەناو دەچێت خوا ماڵەکەت کوێر کاتەوە.. چەند سەرنجو قسەو گفتوگۆیەکی خەندە ئامێزمان کرد.. لەناکاو نەمزانی چۆن ئەم وشەیەم بەدەمداهاتو داوای دەست تێکەڵیم لە ئافرەتەکە کرد.. ئافرەت لە بریسکەی مرواریو تریفەی مانگەشەو زۆر جوانتر بوو، مێردو پارەی زۆر ئاگریان تێبەردابوو. بەلام ئافرەت زۆر سەربەرزانە داواکەمی ڕەت کردەوەو ڕازی نەبوو.. منیش پەلەم نەبوو چونکە ئەم گەشتە کاتی ماوە.. پاش جارێکی تر.. ڕازی نەبوو.. کردمە نامەردی خۆم لێتوڕەکرد، ئافرەت بەگاڵتەی نەزانی، پاش کەمێك ئەو شەیتانەی لەلای من میوان بوو بووە میوانی ئەو. چووە بن کلێشەی، بەلام دیاربوو زۆر

بوێرانە دەجولایەوە.. چەند کیلۆمەترێکی تر ڕۆشتین ورتە لەزارم نەهاتەدەر. نزیك دێیەك بوینەوە، لە پشت دێکەوە کانیو ئاوێکی لێبوو.. لامان دایە سەرکانیەکەو لە ولاغەکان دابەزین.. چومە سەرکانییەکە دەستم کردە ئاو خواردنەوە کاتێکم زانی دوو دەستی نەرم بەسەر شانمدا شۆڕبونەوە لەگەردنم توند بوون.. لە پڕ ڕاچڵەکیم لەناخی خۆمدا وتم: جەندرمەیە.. یان ئافرەتەکەیە نیازیەتی بمخنکێنێ. ئاوڕم دایەوە بەلام هێزی ئافرەت تەلیسماوی و ئەفسوناویە.. کە سەیرم کرد، بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: (خۆشەویستی سنوری نیە.. وانییە، ئارەزوو بازیو شەیتانیش سنوریان نییە...وانییە؟!) وتم: وایە، زۆر تەواوە.. جا مەبەستت چییە؟

وتی: تۆ کوڕێکی زۆر ڕێکوپێکی زۆر تەلیسماویو سەرنج ڕاکێشی.. وەرە پێشەوە.. ئەوەی داوات کرد لە خزمەتتدایە.. بەمەرجێك نهێنی نێوانمان بێت. زۆر بە هێمنی لەئافرەت چومەپێش.. دەستم خستە سەرشانی لوتم لە لوتی نزیك کردەوە بە دەنگێکی نەوی و نزم وتم: زۆر باشە ئامادەی.

وتی: ئامادەم .. فەرموو.. چونکە خۆشەویستی سنوری نییە.

وتم: دڵنیابم.. تۆ بڵێی کەس ئاگای لێمان نەبێت؟ وتی: بێخەمبە.

لەوکاتەدا هەستێك ناخی هەژاندم لە دڵی خۆمدا وتم: خوایەگیان حەدم نیە تۆ بەشایەد بگرم بەلام ئاگاداربە لەبەر تۆ ئەم کارە ناکەم.. ئەمە ئامانەتەو ماڵی یەکێکی ترە لەلای من.

دەنگم بەرزکردەوە وتم: (...)خان تۆ ئامانەتی لەلای من منیش خیانەت لە ئەمانەت ناکەم.. تۆ مڵکی کەسێکی تری، وتەکانی (کە)ی خۆشەویستم بیرکەوتەوە. بۆیە دەستیم لەسەرشانم لابردو بەهێمنی هەنگاوێك گەڕامە دواوە.. ئەمە چەند خولەکێکی خایاند.. چاوی لە چاوم بڕی.. گیانم لەرزی ئەژنۆکانم لاشەمیان ڕانەگرت.. بۆیە لە ئاستی خۆم دانیشتم، ئافرەت وتی: ئاخ پیاو.. بارتان نییە.. چاکتان نییە.. بۆ داوات لێکردم بۆ نەهاتیتە پێش بۆچی ناخت هەژاندم.

وتم: ئاخر پەیمانم بە خواو خۆشەویستەکەم پاشان خاكو دایکم داوە.. دەبێت

بەپاکی کاربکەم. تا ئەچمە بازنـەی ئـاژەڵی هەردییـەوە.. تێگەیشتی، زۆر ساردبومەوە لە کەسەکەی ڕابردوو ناچووم.. ئێستاش سەرسامم بەو هەڵوێستەم!.

پاش پشودان کەوتینەوە ڕێگە دەبو پێش هەتاوکەوتن خۆمان بگەیەنینـە نـاو ئـەو دێیـەی لەسـەر ڕێگاماندایـە، لـە بەرزاییـەکی کـورەوە هاتینـە خـوار لەوڵاغـەکان دابەزیبوین.. ئافرەتەکە وتی: کاك (...) زۆر خۆڕاگری زۆر کەسێتیت بەهێزە.

وتـی: لـە تاقیکردنەوەکەتـدا سـەرکەوتیت.. بـڕوام نـاکرد.. چـونکە کـەم لاو ئەوەندە بـەهێز بێـت. وتم: بەهەر حـاڵ پەشیمانم.. داوای لێبوردنـت لێدەکـەم. وتـی: بوراویت بەڵام تەنها مەبەستم تاقیکردنـەوەی تـۆ بـوو.. دەنـا لـەو ئافرەتانـە نـیم. ئـەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ لـەو دێیـە ماینـەوە.. پشویەکی باشمـان دا، دوانیـوەڕۆ سەردەستـەکەمان وەڵامی نارد بـوو کـە بیاندەمـە دەست کاك (...)ی قاچاغچیو منیش بـە وڵاغەکانـەوە بگەڕێمەوە.

بەڵێ تەسلیم برادەرێکی تـرم کـردن، ئـەویش لەگـەڵ چـەند خێزانێکـی تـردا بەسـەیارە دەیگواستـنەوە خواحـافیزەم کـرد.. بەشـەرمەوە، گەڕامـەوە لـە ڕێگـە چـەند برادەرێکـی تـری قاچاغـچیم تـووش بـوو کەوتینـە ڕێگـە بـەرەو بنکـەی یەکـەمجارمان. ئەوانیش وڵاغدار بوون.. هاوکاربوین!. دوای عەسرێکی درەنگ بە بێئاگای دەڕۆیشتین .. کاتێکمان زانی کەوتینە بۆسە (کەمین)ی جەندرمە دڵڕەقەکانەوە.. زۆر پیس بوون.. ئەو کۆمەڵـە زۆر بێـشەرمانە لەگـەڵ خەڵکـدا دەجوڵانـەوە خـەڵکیان زۆر تەسـلم کردبـووە، سنورداشکرابونەوە هەندێکیشیان لەناو بردبوو.

بواری ڕاکردنو دەربازبونمان نەما تەوقیان داین لولەی تفەنگیان تێکردین تەنها سێ ڕێگەمان لەبەر دەمدا مایەوە:

١- پاڕانەوە لەخوای گەورە.
٢- پارەدان (بەرتیل).
٣- بەخشینی گیانمان.

بە تورکی زۆر پاڕاینەوە لێیان بێسود بوو دایان بەزانـدین بـۆ بنکـەی خۆیـان ئـەو شەوە لەلایان میوان بوین. خوا هەڵناگرێ خزمەتێکی زۆریان کردین، بەشەق و جوێنو

سوکایەتی تەنانەت بە پەنجە فەحسیان دەکردین دەیان وت: ئێوە تلیاکتان پێیە.. ئێوە هەرچی خوا پێیناخۆشە دەیکەن...

ئەو شەوە تێپەڕی یاخوا نەگەڕێتەوە، بۆ بەیانی کە تیشکی کازیوە دای لە دارو درەختو سەوزەگیای لا پاڵی ئەو دەڤەرە جوان دەستیمان لە دواوە بەستین، گایەل ئاسا لێیان خوڕین بۆ ژێر دارێکی گەورە، ڕاپانگرتین.. ئەمەی بۆتان باسدەکەم تەنها پێنوس دەتوانێ بینوسێ ئەگینا وەسف ناک ێت. چەند باڵندەیەکی دەنگ خۆش و ڕەنگین دەیانخوێند..

لەبەرزایی ئاسماندا چەند باڵندەیەکی گۆشت خۆر دەسوڕانەوە. لەشنەی ئەو بەیانیەو لەسەمای ئەو درەختانە دیمەنێکی زۆر ناوازەم دەدی وێنەی (کە)ی خۆشەویستم هاتە بەرچاو، زەردەخەنەی دایكو باوكم هاتەیادم.. لەگەڵ برادەرەکانمان هەرچیمان لەدۆعا زانی خوێندمان. سەرۆك دەستەی جەندرمەکان وتی: گوللەبارانیان کەن.. بۆ وەستاون.. ئەمانە قاچاغچیو درۆزن و دزن، ئەمانە خیانەت لە هەموو شتێ دەکەن..

قسەکانی سەرۆك دەستە زۆر کاری لەناخم کرد، بەتایبەتی وشەی (خیانەت)، بیری ئافرەتەکەی دوێنێ شەوم کەوتەوە لە ڕازی نێوان خۆمو خوادا وتم: (خوایەگیان فریام کەویت.. لەقەراغ مەرگدام.. خوایەگیان لەبەر خاتری تۆ شەرەفی ئەو ئافرەتەم پاراستو نەم ڕوشاند، خوایەگیان پارێزگاریم لە ئەمانەت کرد..)

تەقە لە تفەنگی دەستی ژەندرمە هەستا، برادەرەکەی تەنیشتم هاواری لێهەستاو کەوت بەلادا، خوێن لەجێگەی فیشەکەکەوە فوارەی کرد...هاتە بیرم کە هەڵبێم و ڕاکەم.. بەڵام چۆن؟! وەك یەکێك دەستم بکاتەوە بە تەواوی دەستم شل بوو هێزێکم بۆهات کە لە توانای خۆم زۆر بەدەر بوو.. ئەوەندەی چاو بتروکێنی بەڕاکردن هەڵهاتم خۆم گەیاندە ئەسپەکەم خۆم هەڵدایە سەرپشتی و لە ئاوزەنگیم دا، ئەسپ وەك بالگرتن باڵی گرت، ئەو غارەی ئەو دەیکرد بێوێنەبوو.. تەقەی دەمانجەو سیلاحی جەندرمە ڕووەومن دەستی پێکرد.. زۆر بێباکانە گیزەو ویزەی گوللە دەهات.. هاواری خوای گەورەم زۆر کرد.. "خوایەگیان هاوار.. فریام کەویت ڕزگارم بێت.. لەمانە

دەرچم.."

بەرێزان .. ئەو غارەی ئەسپ دەیکرد زۆر شارەزای تیابەدی دەکرا.. لە ناخمدا دەمگوت ئێستا نا ئێستا دەپێکرێم لەتاو ڕۆحی خۆم خۆم بەسەر ئەسپەکەوە مەلاس دابوو، ئای ڕۆح چەند شیرینی!. نەدیوی و گردوپالی بوو چووم بەودیوا.. هەرزرمەو تەقە دەهات بەلام گەیشتبومە ئامانی و ئاسایشی سوپاس بۆخوا لەنارەحەتی ڕزگارم بوو.. هەناسەیەکی خۆشم پڕ بە سیەکانم هەڵمژی.. دوای چەند کیلۆمەترێ غاردان دابەزیم لە ئەسپەکە.. سەیرێکی خۆمم کرد جێگە فیشەك هیچ نەبوو سەیری ئەسپەکەم کرد هیچ نەبوو نازانم چ هەستێك بوو وایلێکردم تێرتێر سەیری چاوی ئەسپەکەم کرد تا ئەو کاتەش چاوی واجوانم نەدیبوو. نەوچەوانیم ماچ کرد.. باوەشم بەسەرو ملیاکرد.. سواربوومەوەو کەوتمەوەڕێ بەرەو خاڵێکی عێراق لە ئاوەدانیەك نزیك بوومەو کارێزێکی پڕ ئاوی سازگاری بەرەو دێکە دەڕۆی لامداو لەسەر کارێزەکە پشویەکم دا.. سێبەرو شنەبای ئەو ساتە زۆر جەوێکی ڕۆحی لەلا دروست کردم.. خۆم فێنك کردەوەو دەستنوێژێکم گرت چەند ڕکات نوێژێکم خوێند.. زۆر خۆش بوو بەلامەوە.. تائێستاش بەدوای ئەو تامو چێژەدا وێڵم.. لەو ساتەوەختەدا کە خوای گەورە لەو نەهامەتیە ڕزگاری کردم. بڕیاری تەواوەتیم دا کە بگەڕێمەوە و واز لەو کارە بهێنم، بۆ هەتا هەتای بەو ڕێگەیەدا گوزەر نەکەم، لەشارەکەی خۆمدا بژیم.. بمرم، زۆر خۆشترە لەژینی غەریبیو غوربەتو دەردی سەری نیوەڕۆ بوو خۆم کردەوە بەماڵدا.. ئای لەو خۆشیەی کەوتە ناو خێزانەکەوە.. ئای لەو شادمانیە.. ئای لەو هەستە پاکەی بەیەکی گەیاندینەوە.. بەلام بەرێزان کۆچ کردمیە دەرچوی ژیانێکی تر.. ئاخ خ خ هەندەران.

خوێنەری بەرێز ڕووداوو بابەت زۆر هەیە لەسەر کۆچ.. هەندەران.. لەتاڵیو سوێری بەشی خۆش، بەشی ناخۆش بونە خۆراکی ماسی.. بونە کرێکاری کەم موچە یان گەڕانەوەی بێئاکامو ئەنجام. هەشە لە گەڕاوەکانی هەندەران لەگەڵ یەکەم هەنگاویان بۆ شار بونەتە خۆراکی خاك بە خۆیانو سەروەتو سامانیانەوە لەسەیارەی ئاخر مۆدێلدا گیانیان لەدەست داوە. چاویان بەشار نەکەوتۆتەوە. هەشیانە بۆتە کوپەی زێڕ بۆ ماڵی باوانیان لە کوردستانو خانوو ماڵو بازاڕی پێکەوە ناوە. شازی ئافرەتیش دەبات،

ئەمەش ئەو لاوە خوێن گەرمە هەناسە ساردەیە کە چەند ساڵێکە لە هەندەران شەوی داوەتە دەم ڕۆژ بێ پشوو کاردەکات بەمەبەستی شادبونەوە بەدیداری دایك‌و باوکی‌و کەس‌وکار گەڕاوەتەوە.. شەوگار نیوەشەو دەبێت لە دەرگای خۆیان دادەبەزێت‌جانتاکەی لەبەر دەرگا دادەنێ.. دڵی نایەت لە زەنگی دەرگابات نەبادا دایك‌و باوکی لەخەو ڕاچڵەکن دەڵێ: بەهێواشی سەردەکەومە سەر دیوارەکەو دەرگا دەکەمەوە و دەچمە ژووری، ئەو کاتە بەئاگایان دەهێنمەوە.. بەسەر دیوارەکە سەرکەوت‌و خۆی هەڵدایە ناو حەوشەکە.. بەڵام بۆ بەیانی دایك بەمەبەستی پاککردنەوەی حەوشەو بەردەرگا دەست دەکاتە شتنی ناوماڵ‌و بەردەرگا، کە دەرگا دەکاتەوە جانتایەکی گەورە لەبەردەرگایە، کەسیش دیارنییە! بۆیە ئەمیش دەیباتە ژوورەوە و خێزان ئاگادار دەکاتەوە، ئەوانیش جانتا دەکەنەوە سەیرەکەن ئەمە جانتای کوڕە هەندەرانییەکەیانە.. ئەی خۆی لە کوێیە، بۆ دیار نییە؟!.. ماڵ زۆر خۆشحاڵ دەبن، ئەگەرچی چاوەڕوانن نەبادا لەماڵی برادەری بێت.. هاکا هاتەوە. دراوسێ‌و خزم‌وکەس هەواڵیان پێدەگات کاك (...) لە هەندەران هاتۆتەوە. بەڵام پاش چەند سەعاتێك پیاوێکی بەرگ تۆزاوی دێتە ماڵیان، ئەمیش بە دەستوری کوردەواری چاوودڵ ڕۆشنیان لێدەکات دەیەوێت دابەزێت بۆ تەواوکردنی کارکە، ئەزانن کاری چیە لەو حەوشەیەدا؟ کاری هەڵکەندنی بیرە، زۆر بە بێئاگایی دادەبەزێتە ناو بیرەکەوە، هاوار دەکات و بەهەناسە بڕکێ دێتە دەرەوە.. باوکی کوڕەش دەڵێ: وەستا(...) ئەوە چیبوو ماربێوەیدایت.. چیبوو؟! وەستاش دەڵێ: ماری چی وشتی چی تەرمێك لە بیرەکەدایە!؟!. باوکی کوڕەکەش: تەرمی چی بۆخاتری خوا وەستا(...) گیان، بەڵام قەدەر جیهانی گەڕانەوەی نییە! وەستا حەبلێکی باش دەباتە خوارەوە بۆ ناو بیرەکە.. لەلاشەی دەبەستێ کاتێ دەریدەهێنن کاکی هەندەرانییە، ماڵ شینی‌و گریانی تێدەکەوێت.. شایی دەبێت بەشین، ئەمە چۆن ڕوویدا؟ کاکی هەندەرانی کە چۆتە سەر دیوارەکە خۆی هەڵداوە بۆ ناو حەوشەکە نەیزانیوە ئەمە لەو ئاستە چاڵی بیری ناوەو سەری بەتاڵە.. حەوشەکە وەك جاران نەماوە.. کەوتۆتە خوارەوە بۆ ناو بیرەکەدەبێتفریای هاوار هاوار کەوتبێ، خوا دەیزانێت گیانی سپاردبوو.

**إنا لله و إنا اليه راجعون.**

# پەروەردەی دروست

کاك (...) خاوەنی دوکانێکی جوان‌و ڕازاوە بوو لە ناوجەرگەی بازاڕدا، کوڕێکی بچوکی هەبوو بەناوی (...) تەمەنی نزیکەی پێنج ساڵ دەبوو زۆری خۆش دەویست، زۆر بەکەمی دەستی لێبەردەدا، بەکەمی دەیهانیە دەرەوە لە ماڵەوە، بە پەروەردەیەکی باش گۆشی کردبوو. قەدەری خوای گەورە وابوو ڕۆژێکیان بە مەبەستی کڕینی جل‌و بەرگ بۆی هانیبویە دوکان، لەدوای کردنەوەی بازاڕو گەرم بوونی هاتوچۆ.. بەنیاز بووە لە بوارێکدا بچێت پێویستی بۆ بکڕێت، کڕیاری یەك یەك‌و دوو دوو دەهاتن بۆ شت کڕین دەوری قەرەباڵغ دەبێت ئاگای لە منداڵەکەی نامێنێ، منداڵ دەچێتە دەر لە دوکان‌و دیارنامێنێ، کاتێك کاك (....) دەوری چۆڵ دەبێت سەرنج دەدات (...) کوڕی دیار نییە.. ناو دوکانەکەی بۆ دەگەڕێت دیارنییە.

پرسیار لە دراوسێ دوکانەکانی دەکات ئەوانیش نازانن.. سەرسام دەبێت لە دیارنەمانی. زۆر بێتاقەت دەبێت دوکانەکەی دادەخات‌و بەو گوزەرەدا بانگەوازی بۆ دەکات.. بەلام دیار نابێت پاش هەواڵپرسینی تر بانگەوازێکی تری بۆ دەکات تا لەزوترین کاتدا بگاتەوە دەستی دەڵێت: خەلکی بازاڕ.. خەلکی بازاڕ منداڵێکی تەمەن "پێنج" ساڵان ونبووە جل‌و بەرگی (لەم حاڵەو لەو ڕەنگەی) لەبەردایە.. هەرکەسێ دۆزییەوە خەلاتی "یەك لیرە"ی دەکەم —نرخی لیرەیەك لەم ڕۆژەدا چەندە) ئەوەندە، پیاوێك لەو ناوەدا گوێی لێدەبێت.. منداڵەکەشی لەلا دەبێت.. تەماع دەیگرێت و دەڵێت: کاك (...) ئاگری جگەر هەڵی گرتووە.. لیرەیەك دەدات، کەم نییە! بەلام بەیانی دەیکاتە دوو لیرە ئەوسا دەیدەمەوە. ئەو شەوە منداڵکە بێبەش دەبێت لەناو پەروەردەی خێزانەکەی خۆی.. بەناموێ نانی ئێوارە دەخوات‌و لەگەڵ منداڵەکانی ئەو ماڵەدا نەکەوێتە یاری کردن‌و کات بەسەر بردن تا کفت دەبێ.. دەخەوێت.

بۆ بەیانی ئەو پیاوەی منداڵەکەی لەلایە دەچێتە بازاڕ.. هەست ڕادەگرێت.. بۆ هەواڵی نوێ تا بزانێ کاك (....) ئەمڕۆ خەڵاتەکە بۆ کوڕەکەی زیاد دەکات.. بەڵام هیچ دەنگ‌و بانگەواز نابێت.

ناچار دەچێتە دوکانی کاك (...)، دوای چاك‌و چۆنی هەواڵپرسینی دەڵێت: ئایا ڕاستە منداڵەکەت ونبووە؟!. باوك: هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی‌و وتی: بەڵێ خەڵاتی لیرەیەکیشم دانا بوو بۆ هەرکەسێك بیدۆزێتەوەو بۆ بهێنێتەوە! بەڵام نەمدۆزییەوە. پیاو: ئەی ئەمڕۆ!؟.

باوك: ئەمڕۆ! ئەمڕۆ خەلات نادەمە کەس.. هەرکەسێکیش منالەکەی لەلایەو گوێی لەو بانگەوازە بووە بە تاوانباری دەزانم!. پیاو: بۆچی! ئەی دوێنێ لیرەیەکت نەکردە خەڵات، کەواتە ئەمڕۆ دەیکەیتە دوو لیرە. باوك: ڕاست دەفەرمویت بەڵام من مەبەستم منداڵەکەم بوو (هیچ کاتێك لەماڵی کەس نەمێنێتەوە، ئەو پەروەردەیەی کە خۆم کردوومە نەشێوێ.. کەوچکی ماڵانیشی بەدەما نەچێت. پەروەردەی من‌و خێزانم زۆر جیاوازترە لە پەروەردەی کەسانی تر. ئێستاش گەر لەلای تۆیە بڕۆ بیهێنەرەوە، دڵنیاشم ڕیسەکەم بۆتەوە بە خوری).

ماوەتەوە بڵێین زۆر ناگامان لە پەروەردەی دروست‌و گەشەداری منداڵ‌و نەوەکانمان ببێت کاروباری ڕۆژانەمان لە پەروەردەی منداڵەکانمان دورمان نەخاتەوە. زۆر غەمخۆری پەیداکردنی پول‌و پارەو پاروە نانین بۆیان با ئەوەندەش خەمخۆری پێگەیاندن‌و تێگەیاندنیان ببین، تا لەدوا ڕۆژدا ئەندامێکی کاراو بەکەڵکی بەهێز بۆ کۆمەڵگەکەمان بێنینە بوون.. ئەگەر نەشتوانین با بەوشەیەکیش بێت کەم نییە.

# یـــاد

ڕۆژی شەهید سەرەتای بەهاری هـەموو سـاڵێکە ئـەو ساڵە وەختـەمان دێنێتـەوە یاد کە گازی کیمیاوی بەهەموو جۆرەکانیەوە (سیانید، خەردەل...) کرا بەسـەر منـداڵ، لاو، ئافرەت، پیاو، پیر، یەککەوتەدا شارێکی وەك هەڵبجە خنکێنرا کە ١٩٨٨/٣/١٦ بوو.

ئەم کارەساتە (جینۆساید)ە هاوسۆزەکانی ئێستای کوردیـان نەهێنایـە هـەژان و ڕاچڵەکاندن.. چونکە دۆستی سەرسینی پیاوانی بەعس بوون.

بەعسییەکان وەك کـردەوە پێـشینەکانیان کـە لـە کۆتـایی ساڵەکانی حـەفتاوە چـەندین گونـدی ناوچـە سـەر سـنورییەکانی کوردسـتانی باشـوریان ڕاگواسـتبوو بـۆ (کۆمەڵگـە) زۆرە ملێکـان، هەنـدێك گونـدو شارۆچکەو ناوچـەیان کـردە تاقیگـەی غـازی کیمیاویش.

کەلەو ساتە وەختانەوە تا ئێستاو داهاتوش کارگیەری لەسەر (لاشـە، نـاخ، وڵات، مرۆڤایـەتی) دروسـتکردووە بـەڵێ دوای (٨) سـاڵ شـەڕ لەگـەڵ ئێرانـی دراوسـێ لـەپێناوی چـیدابوو؟ گەرمـەرامی دۆسـتی دۆسـت نـەبێت. هەشـت سـاڵ گریـان و قوڕبەسـەری و دەربەدەری و کۆچ و هەناسەساردی لەبەرچی..بۆچی؟ تەنها پەشیمانی نواندن بوو کە لە ١٩٨٨/٨/٨ درا بەگوێی خەڵکی عێراقدا لە ئاکامدا چەندین پارچە زەوی لە گونـدو ناوچـە سنورییەکان بونە جێگەی (سـەربازی بێچەك و بێخۆراك و بێموچـە) کـە ڕۆژانـە لاوان.. کاسبکارا.. جووتیـاران کەمئەنـدام ئەکـەن.. یـان مـەرگی لـە ناکاویـان دەکەنـە هاوڕێیـان. ئـەوەش چـەندین گـۆڕی منـاڵی شـیرە خـۆرەی لاوازە لـە بەدخۆراکیـدا توشـی چـەندین نەخۆشی (شێرپەنجە - سرطان) بوون کە هۆکەی غازی (یۆرانیۆم و کیمیاویە)؟؟

ئـەوەش خـاکێکی پـیرۆزە کەبوومەتەجێگـەی دەیـان و سـەدان کەسـی نیـشتمان پـەروەر ، ناومان ناوە ( گۆڕی بەکۆمەڵ ) ئەوش چەند خێزانێکی لەبەر یەك هەڵوەشاوە کە باوك

ئاگاداری رۆڵەی نەبووە .. رۆڵە توشی لادانی رەوشتی کۆمەڵایەتی بووە بەناوی خزمەتی سەربازیەوە .

خوێنەری بەرێز جەنگ زیانی زۆری بە خاكو وڵاتو گەلو داهاتوش دەگەیەنێت لە چەندەها هەنگاوی پێشکەوتودا دوادەکەوێت.. ئەو جەنگانەش هەر کەسێك بگرێت دەیان رووداوو بەسەرهاتی جەنگ لە فەرهەنگی ژیانیا تۆمارکراوە.. چەند باسبکەین.. چەند بنووسین مشتێکە و هیچی تر.

با نزیك ببینەوە لە مامۆستا (....) لەدایك بووی ۱۹٤۹یە لە قوتابخانەی (زانا)ی سەرەتایی سەرگەرمی وانە وتنەوەبوو ساڵی ۱۹۸۹ دوای وانە وتنەوەش لە قوتابخانەوە دەهاتەوە و بەئیش‌و کاری دارتاشیەوە خەریك دەبوو. ماوەیەك بوو ئاگری جەنگی نێوان ئێران‌و عێراق کپ بوبۆوە.. بەڵام سوپای عێراق هەر داوای ئەو کەسانەی دەکرد کە سەربازی هەڵهاتوبون لەگەڵ سەربازی تازەدا.. مەبەستی بوژانەوەی سەربازگەکان بوو بەو مەبەستەش مامۆستا داواکرایەوە.. دایان بەگوێیاندا کە گوایە (تسریح) دەکرێن مامۆستاش بە ناچاری روی لە سەربازگە کۆنەکەی جارانی کردەوە (وەحدەکەی خۆی) پاش دەوام کردنی بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك مامۆستا زۆر بەوریایی هەستی بەچەند شتێ کردبوو بۆیە نێتی (فیراری) لێهێنا، لەبەختی ئەو تەنها دێیەکی قەراغ شاریش جێگەی متمانەو خۆشاردنەوە نەبوو بۆیە زۆر بوێرانە نەچوو ریزەکانی (افواج دفاع وطني) جاشەوە، لەژێر زەمینەکەی ماڵی خۆیان دەستی کردە دارتاشی. لەکارو پیشەی دارتاشیدا کەم وێنەبوو نەخش‌و نیگار تۆڕنەی بەجوانی دەکرد، هەموو پێویستیەکانی ناوماڵی لەدارو تەختە دروست دەکردو دەینەخشاند.

رۆژگار تێپەری هەفتەکان گوزەریان کرد لە نیوەرۆیەکدا مامۆستا بە هەناسەبرکێ خۆی گەیاندە ماڵەوە تەندروستی زۆر تێك چوبوو ناچار بوو بە هەر شێوەیەك بێت لەگەڵ خێزانەکەی (ژنەکەی) خۆی گەیاندە خەستەخانە.. لە پەیتا ئەکۆکی ئەپزەی جوان هەناسەی بۆ نادرا تەنگە نەفەس بوبوو. خێزانەکەی تادەهات غەمبار دەبوو چاوەکانی بونە دەریایەك لە فرمێسك، چونە ژوورەوە بۆ خەستەخانە کاتێکیانزانی پزیشکی ئەو خەستەخانەیە دابارین بەسەریاندا، لەسەر قەرەوێڵەیەك رایان کێشا هەرچی پشکنین هەبوو بۆیان ئەنجامدا. دەرزیەکیان دایە دەستی کە بۆی

بکەن.. چەند پرسیارێکیان لێکرد بەڵام مامۆستا دەرزییەکەی لەدەست کەوتە خوارەوەو شکا.

خێزانەکەیان بانگ کردە ژوورەوە.. کە سەیری کرد مامۆستا بۆدواجار چاوە پڕ هیواکانی ناوەتە سەریەك‌و خەوێکی قوڵی مەرگی لێکەوتووە.. گیانی چووە پاڵ گیانی شەهیدانی هەڵەبجەوە لە بەرواری ١٩٨٩/٥/١٥، پزیشکەکان وتیان: ئەم پیاوە داری بڕیوەتەوە.. لەو دارانەی کە غازی کیمیاوی لەسەر نیشتووە، دارەکان لەو ناوچانەوە هاتوون، لەکاتی بڕینەوەدا کاری لێکردووە.

بۆ سەلماندن‌و دروستی وتەکەیان لیژنەیەکی پزیشکی شوێن کارەکەی پشکنی ڕاستی ڕوداوەکەی سەلماند. ماوەتەوە بڵێین مامۆستا چەند ناوی هاتبێتەوە بۆ سەربازی تا توانیبێتی بەشداری کردبوو لە هەموویاندا بەسەلامەتی گەڕابۆوە بەڵام کە (ئەجەل) هات لە هەرکوێ بویت.. ناگەڕێتەوە.. لە مردن ڕزگارمان نابێت.. جا بۆیە مەرگ لەماڵەوە یەخەی گرت.. نەك لە بەرەکانی جەنگدا..

**قلْ إن الموت الذي تفِرون منه فَإنهُ ملاقيكم ثُم تردون إلى عالِم الغيب و الشهادةِ فَيُنَبِئكم بما كنتم تعمَلون** . هەر لەو ڕوانگەیەوە دوای ڕاپەڕینە شکۆدارە سەرتاسەرییەکەی بەهاری ١٩٩١ی کوردستانی باشور، کوردستان هەنگاوی بەرەو ئاوەدانی ناو گەشەدانەوە بە لادێ‌و شارۆچکەکان درا، لە شارۆچکەی هەڵەبجەی شەهید دوو کرێکار ژێر زەمینی خانویەکیان پاکدەکردەوە.. ئەو گڵ‌و خۆڵەی تێیدا بوو دەریان دەداو پاکیان دەکردەوە. پاش تەواو بوونی لە پاککردنەوەو دەردانی گڵ‌و خۆڵەکە هەردوکیان گیانیان سپارد —لە نەخۆشخانە پشکنینیان بۆکرا، دەرکەوت کە ئەو ژێرزەمینە غازی کیمیاوی تیانیشتووەو ئەمانیش کە پاکیان کردۆتەوە بە بێئاگای تۆزو خۆڵەکە جارێکی تر بووە میوانی ئەوان‌و ئەوانیشی خنکاند. چونە پاڵ شەهیدانی هەڵەبجە.

- ساڵی ١٩٩٤ ئەو ساڵەی سوتەمەنی زۆر کزبوو لە کوردستان بەرمیێ نەوت لەسنوری (٢,٠٠٠ — ٢,٥٠٠) دیناردا بوو خەڵکی دەستیان دابوویە دار بڕین‌و دارسوتان..

ئەو ساڵانەش زۆر سارد بوو ئابلۆقەی سەر عێراق‌و گەمارۆی سەر کوردستان لەسەر گەلی کوردستان بوو.. خەڵکی زۆر بەهیلاکەت دەژیا.. سێ پیاو

لەناوچەی دۆڵی جافەتی دار کۆنەکەنەوە.. هەرسێکیان ئەو غازە خنکێنەرە کوشندەیە لە ناویان دەبات.. تومەزکۆتەرە دارێکیان سووتاندووە کەئەو غازەی لەسەر نیشتووە بەکلۆری دارەکەدا ڕۆ چوو بوو.. هەرسێکیان لەدەوری ئاگرەکە گیانیان سپاردبوو.

بەڕێزان ئەمانە چەند نوختەیەك بوو لەتاوانەکانی وڵاتە بەرهەم هێنەرەکانی غازی کوشندەو ڕژێمی بەعس، بڕێك بوو لەتواناى لەبن نەهاتووی بەعس و هاوکارانی.. کەخوای گەورە بەدوعاو پاڕانەوەی زۆری زۆر لێکراوان سەری لوتی خۆی هەڵگرتووەو باجەکەی دەدات....

# بەزەیی و سۆز

گیانلەبەرە بێزمانەکان بەچکەکانی خۆیان زۆر خۆشدەوێت ئەو ڕەحم و سۆزەی لەلای مرۆڤەکان هەیە لەلای گیانلەبەران زۆر زیاترە، ئەو یاسا جوانانەی هەندێك لەمرۆڤەکان پێشێلی دەکەن و ڕێزی لێناگرن کە لە بەرژەوەندی و خزمەتی خۆشیاندایە، لەلای گیان لەبەران زۆر ڕێزدار ترە. ئەو خۆشەویستییەی لەلای مرۆڤەکان دەگمەنە لەلای گیانلەبەرانی هەردی بەتین و بەهێزترە. مرۆڤەکان زۆر جار دەبنە جێگەی مەترسی بۆ گیانلەبەرانی دەورو پشتیان بەشێوەیەك هێرشیان بۆ دەکەن هەوڵیانە قەڵاچۆیان بکەن.

هەندێك جار مرۆڤ هێرش دەکاتە سەر گیانلەبەران بەڵام بەخێرایی هۆش و هەستی دەهێنێتەوە بە بەرخۆیداو سۆزو خۆشەویستی بۆیان دەجوڵێت و ئازادیان دەکات تا ئەو گیانلەبەرە بگەڕێتەوە ناو ئاوو هەواو خاکەکەی خۆیان.

ئایا قەت باڵندەیەکی کێویت نەدیوە لەو ماڵانەی کە سەردانت کردوون؟ ئایا ئەو باڵندەیە وەك من و تۆ ئارەزووی ئازادی و گەڕان ناکات؟! دە ئازادی کە خوا سەرفرازی دین و دنیات کات.. زۆر ئاساییە خۆت بەشتێکی بەسودەوە خەریك بکەیت بەختیاری زیاتری تیابێت.. دیارە مەبەستت خۆش گوزەرانی خۆتە.. بیرێکیش لەو بکەرەوە تا لە چوارچێوەی مرۆڤێکی سەرکەوتی سەربەرزدا بژیت، دەتوانیت بۆ چەن ساتێك لەگەڵما بیت بەهەستەوە بچینە خزمەت (نەنە ئایشێ))[1] کە لە ژیانیدا گیانلەبەرێکی کێوی زۆر کاری تێکردووەو لەوساتەوە تا کۆ چی دوایی کرد هەموو گیانلەبەرێکی خۆش دەویست بەزەیی پیایاندا دەهاتەوەو بەرگری لێدەکردن وتی:

---

[1] نەنە ئایشێ: ئافرەتێکی بەتەمەنی خواناس بوو، لە شارۆچکەی چوارتا دەژیا تا ڕاگواستنەکە، پاشان لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد، خوالێیخۆشبێت، خێزانی (فەقێ عبداللە ی چوارتا) بوو خاوەنی پێنج کوڕو شەش کچ بوو.

دوو کورم بەناوی (....)و (...) تەمەن هەرزەکاربوون بۆ کاری کشتوکاڵی چووبوونە (سەرسیر) لە گەڕانەوەیاندا بۆ ماڵەوە (ژیشك)[٢]ێکی گەورەیان گرتبوو لەگەڵ خۆیان هانیبوویانەوە، کە گەیشتنە ماڵەوە چێشتەنگاو بوو بەخۆش‌و بەزمووو شادییەوە ژیشکەکەیان پیشاندام وتیان: (دایەگیان واز لە کاربێنەو وەرە سەیری ئەم ژیشکەکە چەند گەورەیە! ئێستا سەری ئەبڕین ئەڵێن گۆشتی ژیشك زۆر خۆشە؟! بۆ نیوەڕۆ بە ساوەرێکەوە بۆمان لێبنێ.. ژیشکەکەیان داناو بە دیارییەوە دانیشتن تا سەری دەربهێنێ‌و سەری ببڕن، ئەویش خۆی گرموڵەکردبوو، منیش سەرنجم ئەدان. ناچار ئەم دیو ئەودیویان کرد بێسوود بوو، بۆیە یەکێکیان وتی: با بیخەینە ناو تەشتێ ئاوەوە!

کوڕەکەی ترم وتی: بۆچی؟!

وتی: لەترسی ئەوەی کە ئەخنکێ سەری دەردەهێنێ و ئەوسا ئێمەش سوژنێکی تیژ دەکەین بە لوتیاو ناهێڵین سەری بکاتەوە بە ناوخۆیدا ئەویش لەتاو ئازاری لوتی بەتەواوی خۆی خاو ئەکاتەوە یەکسەر سەری ئەبڕین..

بەڵام ئەم ژیشکە هەرچەند خەریکی بوون و هانیان‌و بردیان و لەئاودا نوقمیان کرد خۆی خاونەوکردەوە سەری دەرنەهانی.. ئاوەکەیان بۆ زیاد کرد هەر سودی نەبوو.

منیش کە ئەم خۆڕاگرییەو ئەم دیمەنەم دی وتم: ڕۆڵەگیان گوناهتان ئەگا لەو ئاوەی دەربهێنن و بەرەڵای کەن بەخوا ئەمە لە دایکە ئەچێت بۆیە ئەوەندە داکۆکی لەخۆی دەکات، پێئەچێت بێچوی بەجێهێشتبێ.. جا گوناهە ڕۆڵەکانم وازی لێبێنن سەری مەبڕن.

کوڕەکانیشم زۆر لەسەرخۆو بەهێمنی ژیشکەکەیان لە تەشتە ئاوەکە دەرهانی قەدەرێ چاوەڕوانیان کرد بە دیارییەوە کە خۆی بخاو بکاتەوە بەڵام سودی نەبوو.

---

[٢] ژیشك: گیانلەبەرێکی کێوییە وەك گیانلەبەرەکانی تر لەشی بە خوری یا توك یا پەڕ یا پولەکە دانەپۆشراوە، بەڵکو پێستەکەی یەکپارچە دەرزی باریك و درێژ و تیژە، زۆر بەئاسانی خۆی دوژمنەکانی دەپارێزێ کە هەستی بە دوژمنیش کرد سەری دەکاتەوە بەناو خۆیدا وەك تۆپێکی خڕ لێدەکات، ڕەنگیشی خۆڵە پۆشتینیە.

وتەکەم دوبارە کردەوە: ڕۆڵەگیان دەگوناهتان ئەگا وازی لێبێنن بەخوا ڕەنگە بێچووەکانی ئێستا چاوەڕێیبن ئەمە لە دایکە ئەچێت!..

کاتێکمان زانی ژیشك خۆی خاوکردەوەو خۆی خست بە پشتا، گوانە بچوکەکانی دەرخست، پڕ بوون لە شیر، بەچاوێکی پڕ بەزەییەوە سەیری دەکردین.. هەموو سەرسام بووین بەم قسەیەو بەم تێگەیشتنەی ژیشکەکە، چۆن لە زمانی ئێمە تێگەیشت! چۆن ڕەحمی بۆ بێچووەکانی جولا چۆن‌و چەندین چۆنی تر..

پاشان وتم: ڕۆڵەگیان گوناهتان ئەگات ئەم ژیشکە ئەوەندەی تر ئازار مەدەن، هەر ئێستا بیخەنە ناو گوێنییەکەوەو لە کوێ گرتوتانە بیبەنەوە لەو جێگەیە بەرەڵای بکەن ئەم داماوە بێچوی بەجێهێشتووە بۆیە ئەوەندە داکۆکی لە خۆی دەکات و خۆی نادات بەدەستەوە دەی خێرا ڕامەوەستن بڕۆن.

هەردوو کوڕەکەشم خستیانە گوێنییەکەوەو زۆر گوێڕایەڵانە و بەدەست‌و برد ژیشکەکەیان بردەوە ئەو جێگەیەی کە لێیان گرتبوو.

بەڕێزان خوای گەورەو بەخشندە و میهرەبان دەیخاتە دڵی مرۆڤەکانەوە کە ڕەحم‌و سۆز بەرامبەر گیانلەبەران بەکار بهێنن، هەندێ جاریش گیانلەبەران ڕەحم و سۆزیان بۆ مرۆڤەکان بەکار دەهێنن لە چیرۆکەکانی مامۆستا (حەسەن پێنجوێنی) زۆر بە جوانی ڕونی کردۆتەوە کە خوای گەورە گیانلەبەرانی فەراهەم کرد بوو بۆ منداڵە ساواکە تا لە ڕێگەی ئەو بزنەوە لە مردن ڕزگاری‌بوو یان کاك (عەزیز) لەڕێگەی ڕێوییەکەوە بووە ئەندامی کۆمەڵگەکەکان و چەندانی تر لەو هاوشێوەیە. هیوامان وایە بەزەیی زۆرمان بەگیانلەبەراندا بێتەوە.

# چاوەڕوانبن

لە یەکێك لەماڵەکانی شارۆچکەی (....) دا بووە هەڵپەرکێ و خۆشیی و شادی، کوڕو کاڵ و نەوجەوانان لەوناوە هەرایان بوو قریوەیان نەهات. تومەس ئەمە کاك (....) بەیانی ژنی بۆ ئەگوێزنەوە، ئەمانەش کەلێرە کۆبوونەتەوە برازاو هاوڕێ و خزم و خۆشەویستی زاوان وا خۆشی خۆیان دەرئەبڕن،

زاواش بەسەرو دڵی خۆشەوە لەو ناوەدا هەڵئە سوڕاو بەخێر هاتنی برادەرانی ئەکرد. یەکێك لە زاوای پرسی: ئێی کاك (....) زۆر دڵخۆش دیاریت، ڕەنگە ئێوارەش لەخۆشیاندا نانت بۆنەخورا بێت، انشا الله بەیانی بوکت بۆ دائەبەزێت! ئێمەش دڵسۆزی خۆمانت بۆدەرئەبڕین و بەشدار ئەبیین لەشایی و هاڵپەرکێ و نان خواردندا.

کاکی زاواش زۆر بەلوت بەرزی و بێباکیەوە وتی : کاك (....) ئێ جا ئەمە ( **إنشاء الله و ماشاء الله** ) ی بۆچییە، وا ژن و زاڵ ڕۆشتون بۆ ماڵی بوکێ و ئێستا خەریکی بوك گۆڕین و خەنەبەندانن، بەیانیش زوو دەیهێننە ماڵەوە ئێوەش بکەونە خۆشی خۆتانەوە.. ئیتر ئەمە( إنشاو الله و ماشا الله) ی بۆچییە؟!

کاك (....) کە ئەم پرسیارەی لێکرد بەهێمنی وتیەوە : کاکە گیان من دنیا دیدەم کاری خێرو چاکە نەبێت ئینشا الله ی بۆ بکەیت،

زاواش بە پێکەنینەوە وتیەوە إنشا الله ی ناوێت، کاك (....) بێدەنگ بوو.. خەیاڵێك بردیە ئەندێشەوەو لە ئێمە دوور کەوتەوە، چەند ساتێك لە حەوشەکەدا تێپەڕی بە شایی و هەڵپەرکێ و گۆرانی وتنەوە، کفت و ماندوو بوین.. چوینە ژوورەوە دەستکرا بە (دۆمینەو تاوڵەو نوکتە) کردن، کەوتینە دنیای خۆلەبیر چونەوەوەو گاڵتەو گەپ کردنەوە.

لە سوچێکی ژوورەکەدا ((چەکێکی کلاشینکۆف)) هەڵپە سێردرا بوو نازانین چۆن منداڵێك پەنجەی دا لە پەلەپیتکەکەی.. تفەنگ زامن نەکرابوو لەسەر سەڵیە هاڕەی کرد. فیشەکی تیا نەما، زوور بووە تەپ و تۆزو یەك پارچە بێدەنگی و کپی و سەرسامی و حەپەسان، زۆری نەخایاند شڵەژاین.

- ئەوە چی بوو؟
- چی ڕویدا؟
- کەس بەر نەکەوت؟
- سوپاس بۆ خوا سەلامەتین؟!

بەلاّم کەسەیرمان کرد، برای زاوا –کەمندالێکی دەسالاّن بوو- دەستکاری تفەنگەکەی کردووە... بەنەشارەزایی پەنجەی پیاناوە... سەیری خۆمان کرد... سەلامەتین... بەلاّم ئایا وابوو؟! نەخێر!.

لەسوچێکی ژوورەکەدا هاوارێ هات کەسەیرمان کرد کاکی زاوا خەلّتانی خوێنە، ئەتلێتەوە هەموو چوینە سەیری سەیرمانکرد... لێی ورد بوینەوە.. بەلاّم ئازیزان.. ئەوخێر لە خۆ نەدیوە لوت بەرزە تەنها یەك سەیری کردین، وشەی (( إنشاء الله )) ی لەزار هاتە دەر پێلّوی چاوەکانی نیشتە سەر یەك ئێمەش بەپەلە ئەم دیوو ئەودیومان کرد فیشەکەکان هەندێکیان لاشەی کاك (....) یان سمی بوو هەندێکیشیان بەر دیواری ژوورەکە کەوتبوون، دراو سێکانی ئەو ناوە دابارین بەسەرماندا.. بەو شەوەو بەخێرایی گەیاندمانە خەستەخانە، خرایە ژێر نەشتەر گەریو چارەسەرەوە.. شایی بوو بەشلّەژان و غەمگینی.. هێندەی نەبرد هەوالّیان گەیاندە مالّی ((بوکێ))، دەستە خوشکانو ئافرەتو پێخەسوو ئاگادار کرانەوە...((بوك نەجولێنن چونکە زاوا بە سیلاح بریندار بووە، باری تەندروستی خراپە... بمێنێ باشە ژیانی لە مەترسیدایە! لەبەر ئەوە چاوەڕوان بن!.

هەر ئافرەت بوو ئەی وت :

- کێ تەقەی لێکردووە؟
- لەبەرچی تەقەی لێکراوە؟
- کێ ناحەزیەتی؟
- هەندێکتان ڕاکەن... بزانن چۆن بووە؟
- ئەی نەمردووە؟
- باشە چۆن ئەمە ڕوویدا؟.....

نانو کەرەسەی شایی خرایە لاوە.. تەنها ڕستەیەك لە هزری چەند کەسێکدا دەزرنگایەوە (( إنشاء الله و ماشاء الله )) ی بۆچیە.. بەیانی بوك دەهێنن....

((لە کۆتایدا بەڕێزان، لوت بەرزیو لە خۆ بایی بوونو غەرایی، دەردێکی کوشندەو گرانە یاخوا ڕووتان تێنەکات تا لە یادوو زکری پەروەردگار دوورنەکەونەوە.. زۆر یادی کەن.. چونکە خوا ((علیم و خبیره)) لەسەر و هەمموودەستەلاتێکەوەیە وئاگادارە بەهەمموو کارو گفتارێکمان (إن ربك لبالمرصاد).

# بەرهەمی ڕۆژو

پــڕۆژەی دروســتکردنی تونێلێــك لــە نێــوان (شــاری ســلێمانیو شارۆچــکەی دەربەنــدیخان)دا هاتــە ئــاراوە کەلەلایــەن کۆمپانیــای (بــەریتانیا)وە ئــەنجام دەدرا، ئــەم پڕۆژەیە چەند گرنگیەکی هەبوو بەلای بەریتانیەکانەوە، یەکێك لەو گرنگیانە یەکەم تونێل بوو کەلە کوردستانی باشووردا ئەنجام بدرێت، بۆ ئەو مەبەستەش.. ئەندازیارو کەسانی بەتوانا لەبەریتانیاوە هاتنو شوێنەکەیان دیاری کرد، هەندێ کاری سوکەڵەش کەپێویستی بە شارەزایی نەبوو بەخەڵکی ئەو ناوە ئەنجامیان دەدا بەموچەی (کریکار)، بۆ ئەم مەبەستەش لەشارو دێهاتەکانی ئەو نزیکانەوە خەڵکیان ناو نوس کرد.

ئێمەش چەند کەسێك بووین لەو کرێکارانەی کەڕۆژانە بە موچەی کرێکار کارمان دەکرد، ماوەیەك تێپەڕی هەموو کرێکارەکانی ئەم پڕۆژەیە بوینە ناسیاوو خۆشەویستی یەکتر، پارەی کارەکە باش بوو.. کارەکەشمان زۆر گرانیش نەبوو.. بۆیە بەئاسانی دەستبەرداری نابوینو هەر هەموان بەردەوام بووین بە دڵخۆشیەوە. لەناو ئێمەدا کوڕێکی گەنج هەبوو خاوەنی دوو منداڵو ماڵێکی خنجیلە بوو ناوی (سۆفی ....) بوو زۆر خوا ناسو ڕەنگ نورانیو چالاكو گورجو گۆڵ بوو لە هەموو ڕویەکەوە. مانگ تێپەڕی وەرز گۆڕانکاری تێکەوتساڵ خایاندی پڕۆژە هەر بەردەوام بووا، ئێمەش هەر کارمان دەکرد، مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ئەو ساڵە کەوتە هاوینەوە، زۆر گەرم و وشك بوو، زۆر ناڕەحەت بوین ڕۆژانە بێتاقەتو بێ ئارام دەبوین زۆر جار برسێتیو تینویەتی زۆری بۆ دەهێنانو ڕۆژووەکەمان دەشکاند.. یان ئەو ڕۆژە هەر لەسەرەتاوە بەڕۆژو نابوین.. بەڵام (سۆفی ....) وەك ئێمە نەبوو زۆر بە ئارام بوو، زۆر هانی خواناسیو ئیمانداری دەداین.. زۆر ئامۆژگاریو باسی پاداشتی ڕەمەزانی بۆ دەکردین.. هەندێکمان بەغیرەتی ئەوەوە بەڕۆژو دەبوینو ڕۆژووەکەمان ناشکاند.. تا ڕۆژێکیان چێشت تەنگاوێکی درەنگ بوو گەرما تاوی سەند بوو کارەکەمان زۆر گران بوو ئارەقە

بەرومان‌دا دەهاتە خوارێ.. کاتێکمان زانی ((ئەندازیار))ی کارەکە لەگەڵ ((وەرگێڕ))ە کەیدا هاتنە لامان..

بەزمانی خۆیان ماندو نەبونیان لێکردین.. کابرای وەرگێڕ بۆی کردینە کوردی.. ئێمەش وەڵاممان دانەوە. تۆزێك لەلامان وەستان‌و سەیری کارەکەیان کردین.. کەچی نەڕۆیشتن هەر لە کارەکەمان ورد دەبوونەوەو سەرنجی دەدایین -((جا بەڕێزان کرێکار ڕەوشتی وایە کە خاوەن کار لەلای بوەستێ خۆی دەکوژێ ئەوەندە بەگەرمی‌و گورج‌و گۆڵی کار دەکات‌و هەموو توانای خۆی دەخاتە کار بەڵام خاوەن کار کەدیار نەما خاو دەبێتەوە، خۆی دەخافڵێنێ))-

دوای تۆزێك بە وەرگێڕەکەی وت : بزانە نانی چێشتەنگاویان[1] خواردووە؟! کەوەرگێڕەکە لە قسەکەی بۆوە، ئێمەش وتمان : بەڵێ نانمان خواردووەو هەندێك پشوشمان داوە. بەڵام سۆفی (....) وتی بەداخەوە من نەشێوی چێشتەنگاوم داوەو نەنانیشم خواردووە!

ئێمەش بەم قسەی (سۆفی ....) زۆر نارەحەت بووین‌و تورە بوین وتمان : خوا ماڵەکەت کوێرکاتەوە بۆ وانەڵێی!

وتی : ئاخر بەڕۆژووم.. ئەی درۆتان بۆ بکەم.. شتی وا چۆن ئەبێ!

ئێمەش وتمان : ئێ باشە خۆ ئێمەش بەڕۆژووین بەلام نابێت قسە بکەین، ئەمانە غەیرە دینن ڕقیان لە ڕەمەزان‌و موسڵمانە.. ئەوانە بزانن بەڕۆژووین لەکارەکە دەرمان ئەکەن.. دەوس بە.

کەچی سۆفی (....) وتی : کاکە گیان بەر چاو تەنگ مەبن خوا ڕازقی ڕزقە، دڵنیاش بن دەزانن کە موسڵمانین. ئیتر بۆ دەترسن!.

کاکی ئەندازیار زۆر گوێی بەم وتووێژەی ئێمە نەدا.. واتێگەیشت کەقسەی نێوان خۆمانە.. پاش تۆزێك لەکات دورکەوتنەوەو چونە سەیری چەند کرێکارێکی تر

---

[1] نانی چێشتەنگاو: کرێکارو جوتیار لەبەر ئەوەی بەیانیان زوو دەچنە سەرکارو نانیش کەم دەخۆن و زۆریش دەجوڵێن لە دەوروبەری کاتژمێر (٩-١٠) (قاوەڵتی = چێشتەنگاو) پشویەکی نیو سەعاتی دەدەن نان‌و چایەکی خێرا دەخۆن بۆ ئەوەی وزەیەکی باشیان بۆ دروست ببێ چالاکیان بۆ بگەڕێتەوە.

لەولا ئێمەوە.. پاشان هاتنەوە لای ئێمە، دووبارە ئەندازیار وتی : ئایا ئێوە لەم مانگی ڕەمەزانەدا.. لەم گەرمایەدا.. لەم هیلاکیو ماندو بوونەدا بەڕۆژو دەبن؟!
وتمان : بەڵێ قوربان... بەترسێکەوە.. کاکی وەرگێڕەر بۆی باسکرد،

کاکی ئەندازیار بە توڕەییەوە وتی : باشە ئەمڕۆ ئێوە هەمووتان بەڕۆژون..
ئێمەش کەزانیمان توڕە بووەو ئەنجام باش نابێت هەموو وتمان : نەخێر کەسمان بەڕۆژونین چونکە زۆر گەرمایە.. کارمان گرانە بەرگەی ئەم هەموو هیلاکییە ناگرین چەند قسەیەکی تریشمان کرد کە جێگەی ڕەزامەندی کاکی ئەندازیار بوو.. ئەندازیار زەردەخەنەیەکی کرد.
بەڵام لەولاوە سۆفی (....) کەپاچێکی بەدەستی ڕاستییەوە بوو بەدەستەکەی تری ئارەقی ناوچەوانو ڕوی سڕی.. لەکاکی ئەندازیار چووە پێشیو وتی : .. کاکی ئەندازیار ئەو گەرمایەی تۆی بێزار کردووە زۆر خۆشە بۆ کەسێ باوەڕی بەخواو بەرنامەکەی پتەوو بەهێز بێت، ئەو کارەش زۆر ئاسانە گەر لەیادی خوادا بەردەوام بیت ئەو مەشەقەتو ڕۆژوەش خۆشی لەدوایە،

ئەندازیار وتی : ئەوە ئەڵێ چی؟
وەرگێڕ بۆی کردە ئینگلیزی.
ئەویش پێکەنیو وتی : کەواتە تۆ پێتەچێت بەڕۆژو بیت.. ها.. وانییە؟
سۆفی (....)، زۆر بەسەر بەرزیو بوێرانەوە وتی : بەڵێ من بۆ خوا نییەتم هانیوەو بەڕۆژوشم هیچ پەشیمانیش نیم تۆش کەیفی خۆتە.. کاکی ئەندازیار!
ئەندازیار : لە باڵای ڕوانی وتی : ئاخر ناترسی ئەو ڕۆژووەی مانگی ڕەمەزان لەکارەکەو دوور خاتەوەو تەنها ئەمڕۆ بەردەوام بیت لەگەڵ برا دەرانت؟!
سۆفی (....) : مستەر تۆ مەبەستت دەرکردنمە لە کارەکەمو منیش مەبەستم خوا لەخۆم ڕازی کردنو دڵسۆزیمە بۆ کارەکەش چاکیش بزانە گەر نازانی، نانو کارو کاسپی بە دەست پەروەردگاری خاوە ڕەمەزانە، یەك ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان نادەم بەهەزار ڕۆژ کاری تۆ.. پاشان بزانە کەمن پشتم دانا بۆ کۆڵی خەڵکی لە پێناو پاروە نانێکی حەڵاڵدا ئیتر بۆ مەمنونی تۆبم یا بۆ بترسم!
ئەندازیاری بەریتانیا ناوچەوانی جۆرێك پرسیاری لێدەخوێنرایەوە، تۆزێك سەیری کرد وتی : وەرە ئێرە..

سۆفی (....) پاچەکەی دانا کەتا ئەو کاتە بەدەستیەوە بوو چووە پێشەوەو کەمێك لەیەکتر ورد بوونەوە..

ئەندازیار : کاکە گەر بەڕۆژو بیت وەك پێویست کارت بۆ ناکرێت.. ماندو دەبیت.

سۆفی (....) : گەربە ئیخلاصەوە دەستم دایە کارو خوام کردە چاودێر بەسەر خۆمەوە زۆر لەکەسێ باشتر کار دەکەم کەلەترسی تۆ کار دەکات.

ئەندازیار ؛ بە زەردە خەنەیەکەوە وتی : زۆر ڕاستە بەڵام چۆن دڵنیابم کەتۆ بەڕۆژوویت.. سۆفی (....) : بە کەمێك تورەییەوە وتی : دڵنیابە کەبەزمانی بەڕۆژووەوە درۆ بۆ باوکەمو بۆ تۆ ناکەم سور بزانم دوریشم نەخەیتەوە لەم کارە، ئەشزانم ژیان بەبێ ئازار هیچ خۆشیەکی تیانییە ئازاریش ئەو ئاگرەیە کە ژیان ئەسوتێنێ..

ئەندازیار بەجوانی تێگەیشت چونکە کاکی وەرگێڕ هەمووی بەباشی بۆ وەرگێڕا.. ئەو کات ئەندازیار سەرێکی لە قاندو زەردە خەنەیەکی بۆ کرد، بانگی ((چاودێری))ی کارەکەی کرد، وتی :

((لەم ساتەوە ئەم کوڕە گەنجە لەگەڵ ئەم کرێکارانەدا کار ناکات)).. لەولاوە کاکی وەرگێڕ کردیە کوردی، سۆفی زەردە خەنەیەکی کرد، ئێمەش لەناو خۆماندا و لەبەر خۆمانەوە وتمان : ئەرێ وەڵلا سۆفی (....) خۆی نان بڕاو کرد.. خوا ماڵت ئاواکا بۆ ئەوەندە دەم دڕاوی.

پاشان ئەندازیار رووی کردە سۆفی (....)و وەرگێڕو چاودێری کارەکە، وتی : ئیتر ئەم گەنجە خۆڕاگرە کار ناکات.. ((دەستی بۆ دارێکی قەد پاڵی گردەکە درێژ کرد.. ئەم ڕۆژوانە لەبن ئەو دارە جێگەیەکی بۆ چاك دەکەن و نویژو ڕۆژوی خۆی بەچاکی ئەنجام دەداتو دەبێت (کرێ)شی بۆ حساب بکەن تا ( مانگی ڕەمەزان ) تەواو دەبێت.. تێگەیشتن!.

کاکی وەرگێڕ وتی : کاکی ئەندازیار وائەڵێ.. ((بڕوامان بە گوێکانی خۆمان نەکرد بۆیە سەیری یەکترمان دەکرد.))

سۆفی (....) وتی : کاکی ئەندازیار سوپاس بۆ خوا پێویستم بەو جۆرە یارمەتیانە نییە.. ماڵت ئاوەدان بێت کاری خۆم بۆ خۆمو ڕۆژوو هیلاکیشم بۆ ئەو کەسەیە کەهەر خۆی دەتوانێت پاداشتی بداتەوە.. زۆر ئارەزووەمە بەئارەقی ئاوچەوانی خۆم نان بۆ

خۆم و ماڵ و منداڵم پەیدا بکەم. خێریشت ئەگا گاڵتەمان پێ مەکەو وازبێنە بابەردەوام بین لەکارەکەمان.

بەڵام ئەندازیار وتی : ئەمە فەرمانێکەو ڕەت کردنەوەی نییە!! دڵنیاش بە کەمن کەسی خۆڕاگرو خاوەن هەڵوێستم زۆر خۆش دەوێت و زۆر مەبەستمە گەرچی موسڵمانیش نیم. دەفەرموو وەرە لەگەڵمان بابڕۆین..

سۆفی زۆر داکۆکی کرد کەهەر کار بکات و وازی لێبهێنن بەڵام بێسوود بوو بەنابەدڵی سۆفی (....)و ئەندازیارو وەرگێڕو چاودێری کارەکە ڕۆشتن تاچوونە بن ئەو دارو سێبەرەی کەدیاریان کردبوو، تا ئەو کاتەش ئێمە هەر بەفێڵێکمان دەزانی گەرچی لەڕاستییەوە نزیکیش بوو. بەڵام وابوو بەڕاستی، دانیشتن دەم و چاویان بەناوی مەتارەیەك فێنك کردەوەولەبەر چاوی سۆفی (....) تێر ئاوی فێنکیان خواردەوە، مەتارە ئاوەکەشیان بۆ (سۆفی ....) ڕاگرت کە بخواتەوە... بەڵام ڕەتی کردەوە. هێندەی دوو جگەرە بکێشی پشویان دا.. ئێمەش لە دورەوە سەیرمان ئەکرد لەئەنجامدا وتمان : ئای لەوە ئێمە خەیاڵی چیمان ئەکردو چی ڕوویدا.. زۆر ڕاستە کە پێغەمبەر (محمد) درودی خوای لەسەر بێت فەرمویەتی :

((**الصبر في الصدمة الاولى..**))

پاش کەمێك تێڕامان خەیاڵێك هات بەبیرماندا.. لەناو خۆماندا وتمان : باشە خۆ ئێمەش بەڕۆژوین، کەئەندازیار هاتەوە لامان پێی دەڵێین و تێی دەگەیەنین کە ئێمە بەڕۆژوین هیچ نەبێت بەنیوەی (سۆفی ....) پشومان بدەرێ.

بەڵێ خوێنەرانی خۆشەویستم پاش کەمێك چاومان لێبوو سۆفی لەبن دارەکەدا نوێژی ((چێشتەنگا _ ضحى)) ئەکرد.. ئەندازیارو وەرگێڕو چاودێری کارەکەمان هاتنەوە شوێنی کارەکە.لێمان نزیك بوونەوە.. سەیرێکیان کردین و بەلاماندا تێپەڕین بەڵام هیچ قسەیەکیان نەکرد، تەنها زەردە خەنەیەکی گاڵتە ئامێز نەبێت. ئێمەش هەموو سەیری یەکترمان دەکرد، تا کاك (....) هاتە قسەو چوو بەری ڕێگاکەی لە کاکی ئەندازیار گرت و وتی : کاکی ئەندازیار.. گیانەکەم ئێمەش هەموو وەك ئەو پیاوە بەڕۆژوین.. دڵنیابە دەپشویەکمان بدەرێ.

کاکی ئەندازیار ((مهندس)) سەیرێکی کردین و داوای لە وەرگێڕ کرد : ئەمانە چیان دەوێ؟

کاکی وەرگێڕ بۆی کردە ئینگلیزی.

خوا هەڵناگرێت باوان ئاوەدان بێت ئەویش زەردە خەنەکەی دووبارە کردەوەو وتی : ڕاستە ئێوە موسڵمانن، بەڕۆژون، کاریش ئەکەن، بەلاّم (غیرەتو دڵسۆزیو ئاسودەییو ئازایی) لەگەڵدا نییەو نەبووە،

کارو کاسپی دنیاتان زۆر لەلا باشتر بوو لە هەڵوێستی موسڵمانانەی خۆتان، تەنها ئەو گەنجە خاوەن ئیمانی ڕاستەقینەی خۆی بو لە هیچ سڵی نەکردو دوو دڵ نەبوو.. چەندە بەقسە ئازارمان دا بە دەروونیش دوو ئەوەندە بەلاّم خاوەنی هەڵوێستی چەسپاوی بیرو باوەڕەکەی بوو.

ئیتر ئەوەستا، ئێمەش هیچ قسەیەکمان بۆ نەمایەوە تەنها پەشیمانیو ئاخو حەسرەت نەبێت. سۆفی (....) ئەو ڕێزەی کەپەیدای کرد لەبەرهەمی باوەڕێکی ڕاستەقینەی پاکەوە سەرچاوەی گرتبوو.. هەر کاتێکیش کاکی ئەندازیار لەوێ نەبوایە داوای لە چاودێری کارەکە دەکرد کە یارمەتی بدات تا کاری خۆی بکات نەك دانیشتن، ئەویش بەدڵی دەکرد.

# تەلیسمی ئافرەتێک

و:ئامانج محەمەد ئەمین

خۆشەویستانم منی تاوانبارو بێئاگا لە وڵاتێکدا ژیان بەسەرەبەم کە لە هیچ شتێکی کەمنییەو خوای گەورە هەموو نیعمەتێکی بەسەردا ڕژاندووە، ئەمەو جگە لەوەی پیرۆزترین ماڵی خوای لێیەو ماڵەی کەبۆتەقیبلەی موسڵمانان‌و ڕۆژانە پێنج جار لەکاتە جیاوازەکاندا بەو پەڕی خشوعەوە ڕووی تێدەکەن پاشان ماڵی خۆشەویسترین بەندەی خوا دیسانەوە هەر لەم وڵاتەدایە. کە پێغەمبەری ئازیز (د.خ) لەماڵێکدا ئەژیام زۆر بێ کێشەو دەردی سەری بوو ماڵەکەمان بریتی بوو لەدایکم‌و باوکم‌و دووبرا خوشکێك هەریەکەمان سەرقاڵی کارێ بووین‌و باوکیشم هەرچەندە پیر بوو، بەڵام ئارەزوی لەماڵ دانیشتی نەبوو ، لەبەر ئەوە ڕۆژانە لەبەیانییەوە دەچووە کۆمپانیا تاتەواو ماندوو نەبوایە نەدەگەڕایەوە ماڵەوە تەنانەت زۆرجار بەپێ ئەڕۆیشت بۆ شوێنی کار ؛ پێمان دەوت: بە پێ مەڕۆ ماندوو نەبیت" دەیوت: گەر وانەکەم لاشەم سست دەبێت و زوو پەکم دەکەوێت.)) دایکیشم تابڵێی دایکێکی میهرەبان‌و دەم‌و زمان شیرین‌و ڕۆح سوك بوو لەپێناوی خۆش گوزەرانی ئێمەدا ئامادە بوو تەنانەت گیانی خۆیشی ببەخشێ. براکەم لەبەشی ژمێریاری هەمان کۆمپانیای باوکم کاری دەکرد ئەویش تا بڵێی برایەکی بەڕەوشت‌و دڵپاك‌و دڵسۆز بوو، منی زۆر خۆشەویست.. بەڵام خوشکەکەم چونکە تاقانە بوو لە ڕادە بەدەر خۆشمان دەویست نازمان ئەدایە لەناو هاوڕێ‌و برادەرەکانیا تا بڵێی سەلارو بەڕێز بوو. بەشێوەیەك لەهەر شوێنێکدا بوایە کۆمەڵێکی لێکۆدەبۆوەو زۆر ئارەزووی هاوڕێیەتیان دەکرد.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز، ژیانمان زۆر بەخۆشی‌و شادییەوە دەبردەسەر.. ڕۆژانە دەچوومە شوێنی کارەکەم زۆر دڵم پێی خۆش بوو بەڵام ئەوەی جار جار بێزاری دەکردم

((دایکم‌و باوکم)) بوو زۆر سەریان ئەخستە سەرم‌و پێیان ئەوتم : تەمەنت لە ٢٨ ساڵ تێپەڕیوە تاکەی ژن ناهێنی دایکم ئەگریا ئەیووت : کوڕم بە خوا من‌و باوکت بەبەرمانەوە نەماوە ڕۆڵە توخوا تا نەمردوین با لە ژیانی هاوسەری‌و کۆشکی خێزاندار تیا بتبینین، باوکیشم بۆی سەندەوەو وتی : ((ئێ ڕۆڵە خۆت ئەزانی دایکیشتان لاواز بووەو ناتوانێت ئەوەندە خزمەتی ئێوە بکات ئیتر ژن بێنن با ئێمەش بحەسێینەوە..!))

بەڕاستی لێتان ناشارمەوە ئەم قسانەی دایەو بابەم زۆر ئازاریان ئەدام لەلایەکەوە بەزەییم پێیان دەهاتەوە لەلایەکی تریشەوە گاڵتەم بەم قسانە ئەهات‌و بەکۆن‌و بەسەر چووم دەزانی، زۆر جار لەدڵی خۆمدا ئەدوام : ئاش لەخەیاڵێ‌و ئاشەوان لەخەیاڵێ‌ئەمانە زۆر سەیرن هەموو خەیاڵێکیان لای ئەوەیە لەباخچەی ماڵەوەدا دانیشن‌و کوڕەزاکانیان لەباوەش بگرن بابە کەی باوی ئەوە ماوە خوانەکات ترفیعاتەکەم بۆ دەرئەچێت یەکسەر ئەچمە ئەمەریکا ژیان لەوێ بەسەر ئەچێت ئیتر دۆزەخە.. پیاو گەر هاوسەری گرت لەو چاوشین‌و قژ زەردانە بێنێت. نیوەڕۆیەك لەفەرمانگە دەگەڕامەوە زۆر ماندوو بووم کە چوومە ماڵەوە سەیرم کرد ماڵەوەمان هەڵس‌و کەوتیان لەوە ئەچوو نیازی سەفەرێکیان هەبێت، لەوانەیە بڵێن بەچییا زانیت.. چونکە جاران کەلە دەوام دەهاتمەوە هەمووشتێك ئامادەبوو هەر لەنان خواردن‌و چا خواردنەوە بیگرە تا فەراهەم هێنانی کەش‌و هەوای ئارام خەوی نیوەڕوان ئامادە بوو تەنانەت نەعلەکانیش لە بەردەرگای حەوشەدا ئامادە بوو، تا لەگەڵ گەڕانەوەماندا بە نەعلەوە بێینە ژوورو ناو ماڵەکە پیس نەبێت بۆیە بەسەر سوڕمانەوە پرسیم : چییە ئەمڕۆ ماڵ ئاسایی نییە هیچ بووە؟!!

دایکم : کوڕم ئەوەی ڕاستی بێت بەهیواین بڕۆین بۆ سوریا بۆماڵی مامت لەبەیانییەوە خۆمان ئامادە ئەکەین بۆ سەفەر.

منیش هەرچەندە زۆر برسی‌و ماندووبوم وتم : باشە خێری پێوە بێت‌و خواحافیزتان بێت. ئیتر ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی زوو بەسەیارەکەم کەل‌و پەلی سەفەرمان کۆکردەوەو ماڵی باوکم برد بۆ فڕۆکەخانە کاتێك ماڵی باوکم ڕۆیشتن، هەستم کرد زۆر ئاسودەم‌و ئارەزووەکەم ماوەیەك بەتەنیا بمێنمەوە. بۆیە ئەو ڕۆژەم زۆر بە ئارامی گوزەراندم‌و سەردانی چەند هاوڕێیەکی خۆمم کردو پیاسەو سەیرانێکی خۆشمان ئەنجامدا.. ئەو

شەوە هەتا درەنگ لەگەڵ هاورێکانم دا سەرقاڵی خواردنەوەو قومار بووین تا ئەوەندە درەنگماینەوە ئاگام لەخۆم نەمابوو چۆن میوانەکانم ڕۆیشتبوونەوە. هەر بەجل‌و تەنانەت پێڵاوەکانیشمەوە لەسەر سیسەمەکەم خەوتبووم.

بەیانی لەدەنگیا هات‌و چۆی ڕێبواران‌و هاڕو هوڕەی سەیارەی سەر شەقامی ماڵەکەمان خەبەرم بۆوە بۆیە هەر لەگەڵ هەڵسانم خێرا بە پەلە سورای سەیارەکەم بووم تا بڕۆم بۆ (دەوام) ئیتر بێئەوەی دەم‌و چاوم بشۆم‌و نانی بەیانی بخۆم تەنانەت دەسێکیش بێنم بەخۆما هەرچۆنێك بێت گەیشتمە شوێنی کارەکەم‌و سەرم زۆر قورس بوو بێزار بووم ئەمویست کەس لەگەڵم نەدوێت.

جا ئازیزان گەر سەرتان نەیەشێنم حەز ئەکەم ئەوە بڵێم ئەو خەڵکانەی کە پیشەیان ((عارەق خواردنەوەو قومار کردن‌و مانەوەی دوورو درێژی شەوانن)) هیچ کاتێك لەگەڵ تەواو بوونی ئەو مەجلیسەیاندا ئاسودە نین‌و لەدواییدا جۆرێك لە پەشیمانی دایان دەگرێت.. من تێناگەم کەی ڕەوایە مرۆڤێك خوای گەورە ئاسمانەکان‌و زەوی بۆ فەراهەم هێنابێت‌و ڕامی کردبێ بۆی لەبەردەم کەسێك عارەق‌و چوار پارچە وەرەقەی قوماردا زەلیل دەبن‌و دەبنە بەندەی‌و خۆیان بچوك دەکەنەوەو کات کوشتن دەبێتە هاودەمی ژیانیان بۆیە من داوا لە ئێوە دەکەم تا نەکەوتونەتە ئەو گێژاوەی کە ئێستا منی تیام..

بەڵێ ئازیزان کاتژمێر ١٠ر٣٠ ی بەیانی بوو سەرم بەسەر مێزی کارەکەم دا شۆڕ کردبۆوەو خەریکی (ژمێریاری فەرمانگە) بووم، ئەوەندەم زانی یەکێك لەبەردەم مێزەکەمدا وەستاو بە دەنگێکی زۆر ناسکی سەرنج ڕاکێش وتی: ئەتوانیت ئەم ئیمزایەم بۆ بکەی؟! کە سەرم هەڵبڕی ئافرەتێکی لەڕادە بەدەر جوان لەبەردەم مێزەکەمدا وەستابوو بۆیە هەر کە ئەم ئافرەتەم بینی ئیتر هیچ ئاگایەکم لەخۆم نەماو لەشوێنی خۆمدا وشك بووم، جارێکی بەدەنگێکی سەرنج ڕاکێشەوە دووبارەی کردەوە: ئەتوانی ئەو ئیمزایەم بۆ بکەیت.

لێتان ناشارمەوە هەر لەگەڵ دووەم جار گوێم لەدەنگی بوو تەواو بوومە دیل‌و بەندەی هەستم ئەکرد ئەویش هەمان شێوە وەکو من وایە و زۆر بەووردی سەیرم

دەکات، پاشان بەهۆش خۆمدا هاتمەوە و لەبەری هەڵسامەوە و فەرمووم لێکرد و لەسەر کورسیەکەی بەرامبەرم دامنیشاند و خێرا و زۆر بەپەلە شەربەتێکم بۆ بانگکرد... بەدەم خواردنەوەی شەربەتەکەوە لەگەڵ یەکدا کەوتینە قسە ... ئیدی لەوساتەوە بوینە دۆست و هاوەڵی یەکتر دوای ماوەیەك پێکەوە دانیشتن‌و قسەکردن داوای کرد ماڵئاوایی بکات.. ئەم قسەیەی دڵی بەتەواوی داخورپاندم بۆیە بەناچاری ڕازی بووم. بەنیازی دیدار، ڕۆیشت.

خۆشەویستان پێش بەرەو پێش چوونی بەسەرهاتەکە پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین تا هەمووومان تێبگەین کە چەندێك "ئافرەت" کاریگەری هەیە لەسەر پیاوان گەر سەیر کردن‌و پەیوەندییەکانیان ناسروشتی بوون وەك ئەم لاوە کە سەرو سیماو نازو مەکری ئەم ئافرەتە کاری کردە سەر حەیران بون‌و سەرسام بونی‌و لە خشتەی‌برد.

کەواتە پەروەردگار زۆر لەوە بەئاگاترە لە نەفسی خۆمان کە ئێمە بۆی دەچین، دەفەرموێت: (لا تخضعن في القول فيطمع الذي في قلبه مرض).

واتە کاتێك قسە لەگەڵ پیاواندا دەکەن بە نازو مەکرو لارو لەنجەوە قسە مەکەن لەگەڵیان چونکە ئەبنە جێ تەماعی ئەوەی دەرونی بەرامبەرتان لاوازە.

یان دەفەرموێت: (لا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى) مەگەر کورتی‌و تەسکی و تەنگی جلی ئەو ئافرەتە کاری لەولاوە نەکردبێت کەشێت‌و شەیدا بێت‌و ئاوەها توشی کارەسات بێ. کەواتە ئەبێ هەمووومان بڵێین (سبحانك ربنا فقنا عذاب النار أنت ولينا في الدنيا و الآخرة فلا تكلنا إلى انفسنا طرفة عين) بەڵێ ئازیزان کوڕەی سەر لێشێواو بەردەوامە لەسەر گێڕانەوەی کارەساتەکەی و دەڵێت: ئیتر لەو ساتەوەی ئەو ئافرەتەم بینی ئاگام نە لە فەرمانگە ماو نە لە ماڵەوە نە لە هاوڕێ‌و برادەر. هاوڕێیانی شوێنی کارم تەواو هەستیان پێکردبووم بەڵام نەیانئەزانی بۆ وام بەسەر هاتووە بۆیە زوو زوو ئەهاتن بۆلام ئەیانویست تێبگەن من هەڵس‌و کەوتم بۆ وا گۆڕاوە ئەم ماتی‌و بێزاریەم لە دەرەوەی شوێنی کارو لە ماڵەوەیش بەهەمان شێوە بوو، لێتان ناشارمەوە سەرم کردە (مەی) خواردنەوەو بێئاگایی بە جۆرێك نەمەزانی شەوە یان ڕۆژە.. هەمیشە سەرخۆش بووم ئەم بێزاریە زۆری نەخایاند شەوێك لە ماڵەوە بووم تەواو سەرخۆش بووم

ئەمەندەم زانی زەنگی تەلەفۆن لێیدا بە هەرحاڵ بوو خۆم گەیانـدە تەلەفۆنەکە لەگەڵ یەکەم ووشەی (هەلەو)ی تەلفۆنەکە بـە دەنگێکی تەلیسماوی نازدارییـەوە یـەکێك پێـی وتم: مـن (ئـەحلام)م دەنـگـو باسـت باشـی، هـەر لەگـەڵ بیـستنی یەکـەم ووشـەدا وەك سەتلێك ئاوم پیابکەن سەرخۆشیەکەم بەری دامو بە ئاگا هاتمـەوە و بـەزەووق و شـەوقێکی زۆرەوە کەوتمە قسەکردن لەگەڵیا ئیتر وام ئەزانی لەم دنیایەدا کەسێکی تیـا نـازی تـەنها من و ئەو نەبێت، ئەویش دیاربوو هـەمان هەسـتی هـەبوو، بـەو شێوە ڕەفتـارەی خـۆی بۆی دەردەبـڕیم پـاش یـەك کاتـژمێر لـە قسەو پێکـەنین و ڕاگۆڕینـەوە، پـەیمانی ئـەوەم لێوەرگرت کە چەند جارێکی تر یەك ببینینەوە.. بەڵام ناخۆشترین ساتەکانی ژیانم ئـەو کاتەبوو کە خواحافیزەی کرد. ئـیتر ئـەو شـەوەم لێبوو بـەدێوە زەمەیـەکی ترسـناك و لـە ترسی ئەم شەوە چاوەکانم خەویان نـەبینی و داڵغەیەك لە دوای یەکەکانم جارێـك بـەرەو ئاسمـانی دەبـردم و جـارێکیش بـەناخی زەویـدا، بـەڵێ ، خۆشەویـستان ژیـانی مـن ئـەو ئافرەتـە لـە تەلـەفۆنی ئـەو شـەوەوە گۆڕاو بووینـە دوو هـاوڕێ و خۆشەویـستی یـەك بـە جۆرێك سینەماو باخچەو بازاڕو کوچـەو چێشتخانە نـەما لـەم شـارەماندا ئێمـە نەبینـە میوانی و کاتی تیا نەکوژین، لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو حەزم ناکرد ماڵی باوکم بـەم پەیوەندیـە نوێیـەم بـزانن و ئـەویش هـەمان ڕای هـەبوو، ئەمـەش حـاڵی هـەموو ئـەو کەسانەن کە نیەتیان لەگەڵ ئەو جۆرە پەیوەندیانە خـاوێن نییـەو لـەژێر پـەردەیا کاری نادروسـت مەبەسـتیانە. هەرچـەندە دایکـم وەك سروشـتی دایکایـەتی خـۆی هەسـتی پێکردبـووم و زوو زوو پێیـدەوتم: کـوڕی خـۆم زۆر ناسروشـتی ئـەتبینم بـۆ وادەکـەی لەخۆت و چیت بەسەر هاتووە بەڵام من هەر سوور بووم لەسەر ئەوەی لێی بشارمەوە.

بەڵام ئەوەی بێزاری کردبووم هاوڕێیەکی شوێنی کارەکەم بـوو، پێمـەوە لکابوو بێکۆڵدان لە ئامۆژگاری کردن بێزار نابوو زوو زوو پێی دەوتم:" برای ئازیزم بەڕاستی تۆ لە مەترسیدای کـەی ڕەوایـە ئـادەمیزاد دوور لـە هـەموو شـەرمێك لـەخوای پـەروەردگار ژیانی خۆی بگوزەرێنێ هەروەها پێی دەوتم: بـرام مـن و تـۆ لـە وڵاتێکداین بـە ملیۆنـەها موسڵمان لەسەر گۆی زەوی بەهیواو ئاواتی ئەم شوێنەی ئێمەوە ئەژین و چاوەڕوانی ئـەو ڕۆژەن بێینـە سـەردانی کردنـی. بـرام ئێـرە ئـەو کەعبەیـەی لێیـە کـە ملیـارو نیوێـك موسڵمان لە هەموو پەرستشەکانیاندا ڕووی تێدەکەن ئێـرە پێغەمبـەرێکی لێیـە کـە نـەك

تەنها سەروەری مرۆڤایەتیو سەرجەم پێغەمبەرانە بەڵکو کۆی فریشتەکانیش.. خوای گەورە لەبەر خاتری بوونی ئەو ئەم گەردوونەی دروستکردووە، ئیتر منو تۆ وێنەی ئێمە، چۆن بوێرین گوناهی لەسەر ئەنجام بەین. بەڵام لە هەمووی سەیرتر لەوەی لە سیفەتی ئەم هاوڕێیەم دابوو.. ئەوەبوو نەیزانی من پەیوەندیم لەگەڵ ئەو ئافرەتەیا هەیەو پەیوەندیەکەیشمان تێکەڵە بە گوناهیو سەرپێچیو تاوان، بەڵام هەرگیز بەڕەقی نەیئەدا بەڕوومدا، هەر بەڕووی خۆش ئامۆژگاری ئەکردمو بریندار ناکردم ئێستا هەستدەکەم چەندێك ئەو هاوڕێیەم دڵسۆز بوو بەمن، بەلام ئازیزان کاتێك ئادەمیزاد خەسارەتی ئەوەی کرد بێشەرمانە لە حزوری پەروەردگاریا کاری دزێوو نادروست ئەنجام بدات، ئەوا زۆر ئاساییە شەرم لە هاوڕەگەزەکانی نەکات بۆیە منیش وەك یەکێك لەو جۆرە کەسانە زۆر بێباکانە لەگەڵ ئەم هاوڕێیەم دا هەڵسوکەوتم دەکرد تەنانەت تەنانەت وامڵیهات زۆر بێزار دەبووم لەقسەکانی ، بەڵێ خوێنەری خۆشەویست ئەزانم ئێستا تامەزرۆی ئاکامی بەسەرهات ئەو کارەساتەکەی چونکە ئەوەی لەمن روویدا بەسەر هیچ کەسێکدا نەهاتووە چونکە گوناهو تاوانەکەی من لەسەر رۆخی دەریاکان و لەگەڵ ئافرەتە بێنابڕووەکانی ڕۆژئاوا نەبوو تاوانی من لەشارانێکی دوور لە دینداری و خواناسی نەبوو، تاوانی من لە ناو یەکەمین ماڵی پەروەردگارا بوو لەسەر زەوی. تاوانی من لەپاڵ ئەو کەعبەیەدا بوو کە سیمای یەکتا پەرستی پەروەردگارە ئاساڵانە لەناو ئاپۆرای خەڵکیدا تاوانباران بەهۆیەوە دەچنەوە قوزاغەی ئیمانو لە ئامێزی فریشتەکانداو ئاوێتە بە دەستی بەرزەوە بۆی بەدۆعایان خۆیان دێننەوە ڕیزی صاڵحان. بەڵام منی تاوانبار لە ئامێزی هەموو ئەم دنیا پاکیزەییەدا تاوانێکم ئەنجام داوە زەوی بەهەموو بونەوەرەکانی نێوی ئاسمان بەهەمموو کەش کەشانو جیلوەی ئەستێرەکانیەوە فریشتەکان بە کۆڕو کۆمەڵیانەوە نەفرین لەم کارە قێزەونەی من دەکەن.

هەرچەندە بەزەییو سۆزی پەروەردگار بێسنورە بەڵام تروسکەی ئومێدو هیوا لە منەوە دوورن، بەڵێ خۆشەویستان ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێیەکمدا لە ژووری کارەکەمان دانیشتبوین سەرقاڵی کاربووین، زەنگی تەلەفۆن لێیداو هاوڕێکەم هەڵیگرتو جۆرێك لەسەر سورماویم بەدەمو چاویەوە بینی بۆیە یەکسەر دەسکی تەلەفۆنەکەی دایە دەستمو وتی: ئافرەتێکە تۆی دەوێت! هەر لەگەڵ گوێم لەم قسەیە بوو یەکسەر

بەوپەڕی خۆشییەوە تەلەفۆنەکەم لێوەرگرت زۆر بەنازەوە سڵاوی لێکردمو دوای چۆننیو چاکی پێی وتم: ئەمەوێت بتبینم، جێگە ژووانمان (فلانە شوێنە) بەنیازی دیدار، زۆر بە دڵخۆشیەوە تەلەفۆنەکەم داخستەوەو لە خۆشیا نەمەزانی چیبکەمو لەدڵی خۆما وتم: تا ئەوکاتە لەوانەیە شێت ببم، وا ئەزانی یەکەم جارمە ئەیبینم، بۆیە ئیتر لەو ساتەوە چاوەڕوانی بینینی بووم، ساتی بەیەك گەیشتنمان تەنها نیو کاتژمێری مابوو، بۆیە بەپەلە خۆم کۆکردەوەو بەرەو ئەو باخچەیە ڕۆیشتم، کاتێ گەیشتم سەیرم کرد (ئەحلام) لەسەر کورسیەك دانیشتووە پەرداخێك شەربەتی لە بەردەما بوو بەنازێکەوە بە (قامیش) قصب- دەیخواردەوە.

کاتێك گەیشتمە لای هەندێ قسەی ڕۆمانسیمان لەگەڵ یەکدا ئاڵو گۆڕ کرد، پاشان بە هەندێك جدییاتەوە هاتە قسە لەگەڵما وتی: منو تۆ ماوەیەکە بەیەکەوەین و خۆشترین کاتمان بردۆتە سەر من لەم ماوەیەدا بەتەواوی تۆم بۆ تاقی بۆتەوە کە کەسێکی زۆر چاکیو بویتەتە جێگای متمانەی من.. منیش لەم قسانەی سەرم سوڕمابوو چونکە ئەو ماوەیەی منو ئەو تیایا یەکمان ناسیبوو قسەی لەم شێوەیەی نەکردبوو بۆیە زۆر بە متمانەوە گوێم بۆ گرتبوو. پێم وت: هەرچیەك بەمن بکرێت وا ئامادەم بەسەرو گیان ئەویش دوای نواندنی ڕەزامەندی پێی وتم من ئافرەتێکی زۆر دەوڵەمەندم، چەندین کۆمپانیام هەیە، خۆت ئەزانی بەڕێوەبردنی ئەم هەموو کارە ئاڵۆزە بۆ ئافرەتێکی وەك من قورسو گرانە بۆیە بڕیارم داوە ئەگەر ڕەزامەندی بفەرموویت بتنێرم بۆ (شەرم شێخ) لە (میصر) بۆ هەندێ کاری بازرگانی.

لەڕاستیدا ئەم قسەیە تەواو منی توشی سەراسیما و جۆرێك لە شپرزەیی کرد بۆیە هیچم بۆ نەمایەوە تەنها قبوڵ کردنی نەبێت، پاشان ڕاستەوخۆ لە جانتاکەی (ڤیزەو ئیقامەی میصری) دامێو زۆر بە خێرایی وادەی دەرچوونی دامێ تەنانەت ئوتێلەکەیشی بۆ دیاری کردمو پێی وتم: کاتێك گەیشتیتە ئوتێلەکە بە مۆبایلەکەت پەیوەندی بکە بەم ژمارەیەوە ئەوان سەرو مڕی کارەکانت بۆ دیاری دەکەن.. منیش لە حاڵەتێکی وادابووم هەرچیەکی پێبوتمایە بێ سێو دوو ڕەزامەندیم دەردەبڕی.. ئیتر دوای بەسەربردنی کاتێکی خۆش لەیەك جیابووینەوە. چوومەوە ماڵەوە خۆم ئامادەکرد بۆ گەشت، یەکەم کەس دایکم دەرکی پێکردم بۆیە بە ترسێکەوە لێم نزیك بۆوەو پێی

وتم: (کوڕی خۆم نابێ بزانم بۆ کوێ گەشت دەکەیت؟ منیش ناخ زۆر بە توندییەوە وەڵامم دایەوە وتم: کەس حەقی بەسەر منەوە نیە.

ئیتر ئەو داماوە نەیوێرا هیچ بڵێ، سەرتان نەیەشێنم بەدڵێکی خۆشەوە بەیانی کات (٩) لە فڕۆکەخانەوە بەرەو وڵاتی میصر فڕین داوی چەند کاتژمێرێك گەیشتمە میصرو لەو ئوتێلە دابەزیم کە (ئەحلام) بۆی دیاری کردبووم. پاش پشویەکی تەواو مۆبایلەکەم گرت بەدەستەوە، بەو ژمارە تەلەفۆنەی پێم بوو پەیوەندییەکەم ئەنجامدا.. پیاوێك وەڵامی دامەوەو پێم وت: من ئەحلام ناردومی بۆ ئێرە ئەمەوێت چاوم بە بەڕێزتان بکەوێت بۆ هەندێ کاری پێویست)، ئەویش بەگەرمی و خۆشییەوە وەڵامی دامەوەو ئامادەیی خۆی دەربڕی، وتی: دوای پشودان وەرە بۆ لام.

منیش وتم: شوێنەکەت کوێیە تا بێم بۆلات؟!

ئەویش وتی: هەر لەو ئوتێلەدام کە تۆی تیای!

ئەم قسەیە زۆر سەری سوڕمانم، لەدڵی خۆما وتم: ئەو چوزانێ من لەم ئوتێلەوە تەلەفۆنی بۆ دەکەم، ئەی ئەحلام بۆ ئەمەی بۆ باس نەکردم بەڵام هەرچۆنێك بێت گوێم پێنەداو خێرا خۆم گۆڕی و چووم بۆ لای، بەڵام ئازیزان هەر چەند منی تاوانبار ئەوەندە ناهێنم ئێوەی بەڕێز بە بەسەرهاتە قێزەونەکانم ماندوو بەکەم بەڵام حەزمکەم بەردەوام بن لەگەڵما، بەڵکو ببمە پەندو ئامۆژگاریەکی باش بۆ سەرجەم لاوان تا نەکەونە ئەو بارەی کەمن تێی کەوتم‌و تیا نغرۆ بووم. بەڵێ: ئەوەی من بۆی ناچوم و بەبیرمان ناهات لەکاتی کردنەوەی دەرگای ژووری کابرا ڕوویداو بینیم کاتێ لە دەرگاکەم دا بەنیازی خۆم بەهیوا بووم ئەو پیاوە دەرگاکە بکاتەوە کە قسەم لەگەڵدا کرد، بەڵام کاتێك دەرگا کرایەوە (ئەحلام)م لەبەردەمدا بوو بەڵام (ئەحلام)ی چی‌و چۆن کە ئادەمیزاد شەرم دەکات لە گێڕانەوەی‌و زۆر سەرنج ڕاکێشانە خۆی گۆڕیبو بە بینینی (ئەحلام) هەست‌و هۆشم لانەما لەلایەك لەبەر ئەوەی ئایا (ئەحلام) چیدەکات لە میسرو بەتایبەت لەم ئوتێلەدا لە کاتێکدا خۆی ناردوومی بۆ میسر، لەلایەکی ترەوە شێوەو جۆری ئەو جل‌و بەرگەی لەبەریدا بوو.

هەر چۆنێك بوو (ئەحلام) زۆر سروشتیانە فەرمووی لێكردمو چوومە ژوورەوە. لەم ساتەوە بوو كە ژیانم نفرۆی تاوانو گوناهی گەورە بوو لەم ساتەوە بوو خەرمانەی تەمەنو ڕێزو كەسایەتم ئاگری بێئابڕووی كردیانە خەڵوزو بووە قوربانی ڕێی ئارەزوو ناشەرعیەكان. كەواتە خۆشەویستیان كاتێك پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت: (با هیچ كەس لەئێوە نەچێتە خەڵوەتەوە لەگەڵ ئافرەتێكی نامەحرەم دا یاخود دەفەرموێت: هیچ كات دوو كەس كۆنابنەوە ئیلا شەیتان سێیەمیانە).

بەڵێ خوێنەری بەڕێز گەر بێتو گرۆی مرۆڤایەتی ژیانیان تەریب بكەن بەڕێنماییە قورئانیەكانی پەروەردگارو فەرمودە شیرینەكانی پێغەمبەری ئازیز هەرگیز توشی تاوانو سەرپێچی لەو شێوەیەی (حەمماد) نابێت. بابزانین (حەمماد) چۆن پاشماوەی بەسەرهاتەكەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: خۆشترین ساتەكانی پڕ لە ڕابواردنو ئارەزوو پەرستیم لەگەڵ (ئەحلام) لە (شەرم شێخ) بوو، بەڵام جار جار فیكرە تم پێی دەوتم: حەمماد لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا چیئەكەیت؟! چ شەرعو یاسایەك تۆی لەگەڵ ئەم ئافرەتە گرێداوە!! بۆ بیر ناكەیتەوە؟

ئەحلام پێی وتم برۆ بۆ میسر لەوێ هەندێ كاری بازرگانیم بۆ ئەنجام بە كەچی ئێستا هاتووە بۆ ئێرە بۆ لام.. ئایا ئەمە جێی گومان نییە؟!.. بەڵام بەداخەوە بەندو داوی ئارەزووی بێسنورم نەیان هێشت گوێڕایەڵی دەنگە هێمنەكەی فیكرە بكەمو بەو شێوەیە وەك گیانێكی بێئابڕوو لەناو زەلكاوی سێكس و ئارەزووی بێسنوردا دەتلامەوە هەرچۆنێك بێت چەند ڕۆژێكمان پێكەوە گوزەراند، لەپاشاندا ئەحلام وتی: من ئەچم بۆ قاهیرە، منیش وتم: ئەڕۆمەوە بۆ سعودیە چونكە تەنها (٧) ڕۆژ مۆڵەتم لە كۆمپانیاكەم وەرگرتووە، پاش دو ڕۆژ لە گەڕانەوەم لەسەر كورسی ژوورەكەم دانیشتبووم و سەرقاڵی كاری خۆم بووم.. زەنگی تەلەفۆن لێیدا كاتێك هەڵم گرت لە پرسگەی نەخۆشخانەی گەورەی (جددە) وە پێیان وتم:" براكەت سەیارە لێیداوەو پێویستی بە دوو بوتڵ خوێنە، منیش بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر شپرزە بووم بۆیە بێئەوەی پرس بكەم بەكەس خێرا لە شوێنی كارم بەڕێكەوتم خۆم گەیاندە نەخۆشخانەو بینیم باری زۆر خراپە بۆیە بە پەلە چوومە لای پزیشكەكان و پێم وتن: من برای ئەوم و هاتووم خوێنی بدەمێ."

ئەوانیش زۆر بە خێرایی‌و دڵسۆزانە هەڵسان بە تاقیکردنەوەی خوێنەکەم، بۆیە پێیان وتم: (برۆ لە دەرەوە چاوەڕوان بکەو ئێمە شیکاری بۆ دەکەین)..

منیش چوومە دەرەوەو نەیشم دەوێرا پەیوەندی بکەم بەماڵی باوکمەوە لەبەر ئەوەی دایکم بەرگەی ئەو هەواڵەی ناگرت.. بەڵێ خۆشەویستانم ئەوەی کە هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووەو بیرم لێنەکردۆتەوە هەواڵێکم بۆ هات کە سەراپای تەمەنی نغرۆی ئازارو نائومێدی کرد هەواڵێك .. تە وسکە ئاسا ئاگری بەردایە خەرمانەی تەمەنم.. هەواڵێك منی کردە لاشەیەکی زەبوون‌و لاواز.. لاشەیەکی نامۆ بە کۆمەڵگا.. بەڵێ ئازیزان پاش چەند ساتێك دکتۆرەکە هات بۆ لام کۆمەڵێ پرسیاری زۆر گوماناوی لێکردم‌و لەدواییدا پێی وتم: ئایا خێزانداریت یان نا؟!

لەڕاستیدا ئەم پرسیارانە تەواو منی ماندوو کردبوو بۆیە بە بێزاریەوە وتم: دکتۆر ئەمە دادگا نیە پرسیارم لێبکەیت من هاتووم خوێن بە براکەم بدەم!؟

دکتۆر (بە توڕەییەوە) تۆ بەکەڵکی ئەوە نایەیت خوێن بەی) منیش بە هەموو هێزم هاوارم کرد: تۆ دەڵێی چی دکتۆر.. دکتۆر: خوێنەکەی تۆ هەڵگری ڤایرۆسی (ئایدزە) بەکەڵکی کەس نایەت.

بەڵێ لەگەڵ دەرچوونی ئەم وتەیە لە دەمی دکتۆر بێئەوەی ئاگام لەخۆم بێ بەرچاوم ڕەش بوو دوای دوو سەعات لەسەر قەرەوێڵە ((چرپا))ی نەخۆشخانە خۆم دیوەوە.. دایکم‌و باوکم‌و خوشکەکەم بەسەر سەرمەوە وەستابوون‌و بەچاوی پڕ فرمێسك‌و داغ‌و حەسرەتەوە بۆ من‌و براکەم ئەگریان ئیتر دوای سێ ڕۆژ من‌و براکەم لەنەخۆشخانە کراینە دەرەوەو چووینەوەماڵ، ئێش‌و ئازارەکانی ((محمد))ی برام تادەهات سوکتر دەبوون بەڵام ئێشی من تا دەهات قورستر دەبوو، ژیان لای من هیچ واتایەکی تیا نەما تازە من بوومە لاشەیەکی لاوازو جێی تەماعی ڤایرۆسی ئایدزی بێبەزەیی، من بوومەکەسێکی بێزراوی لای دایکم، باوکم، هەموو کۆمەڵگا، تەنانەت لەماڵی باوکما جێگەم نەبۆوەو دوای چەند ڕۆژێك ڕەوانەی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بەتوشبووانی ئایدز کرام‌و وەك وشترێکی تەرپووگەرِێزیان لێدەگرتم، زۆر بەخێرایی کێشم دادەبەزی‌و ڕەنگم لەڕوو بڕا بوو هێواش ڕنگی سپێنەی چاوم زەرد هەڵگەڕان،

ئازیزان هەروەسفێکتان بۆ بکەم ناتوانم حاڵەتەکەی لەبەر گوێی ئێوەی ئازیزدا بەرجەستە بکەم.. چونکە سوپاس بۆ خوا ئێوە تیای نازین، خۆشم نەمئەزانی لەکوێوە من دوچاری ئەم نەخۆشی یە کوشندەیە بووم‌و داڵغەو بیرکردنەوەی زۆر شەوو ڕۆژ یان لەمن تێکدابوو. بوو بوونە ئاوو خۆراك بۆم، ڕۆژێکیان زەنگی تەلەفون لێی داو لەبەدالەی نەخۆشخانەوە پێیان وتم : ئافرەتێك بەناوی (ئەحلام) لەسەر خەتەو قسەی لەگەڵدا بکە.)) هەر لەگەڵ گوێم لەدەنگی (ئەحلام) بوو دامە پرمەی گریان‌و وامزانی ئەحلام ئەبێتە هاوبەشی غەم‌و پەژارەم‌و دەبێتە سەرچاوەی دڵنیایم بەڵام بەداخەوە خۆشەویستانم زۆر پێچەوانەی گومانەکەم دەرچوو بۆیە ( ئەحلام ) بەقاقای پێکەنینەوە یەکەم قسەی لەگەڵدا کردمەوە .. بەلاقرتێوە و بەنازو نوکەکەی جارانیەوە وتی:" چییە ؟ دەڵێی توشی (ئایدز) بووی؟! منیش بەقورگی پڕ لەگریانەوە وتم: بەڵێ من وامزانی تۆ دەبیتە مایەی دڵنەوایکردنم .. ئەویش بەدەم جنێوو سوکایەتی پێکردنەوە پێی وتم : ئەوە بە تۆوە ٦٧ کەسم توشی ئایدز کردووەو گەشتم بەدوا ئامانجی خۆم هیوادارم لەوە زیاتر ڕسوابیت‌و تەرمەکەت بسوتێنرێت چونکە تۆ شایستەی ناو گڵ نیت، بەقاقای پێکەنینەوە وتی : " لە خاکی ئورشەلیمەوە بای بای.. "
بەڕێزان ئەم ئافرەتە جولەکە مەزهەب بوو، دەستەکانم لەوە زیاتر نەیان توانی تەلەفونەکە هەلگرن بۆیە لە دەستم کەوتە خواروو ئەوەندەی تر وورەم تێکەڵ بوو بە بەستەڵەکی تاوان‌و پەشیمانی.

ئازیزان ئێستا من (حەمماد) لەسەر پێخەفی مەرگم‌و تەنانەت ڕووم نیە داوای لێخۆشبوون‌و تەوبە لە پەروەردگارم بکەم من لێرەوەو لە ژووری نەخۆشیەکەمدا چاوەڕوانی مەرگم بەڵام وەك مەرگی ئادەمیزاد نا بەڵکو مردنی لاشەیەکی بۆگەن کردوو ڕیسواو بێزراوی ماڵی باوکم‌و کۆمەڵگاکەم خۆشەویستان ڕووم نیە داوا لە ئێوەش بکەم.. هەمووتان نزای خێرم بۆ بکەن چونکە تاوانەکەم زۆرگەورەیەو لەسەر پێخەفی مەرگم‌و مردنم بۆتە ڕاستیەکی بێخەوش سەرە مەرگێکش ئەوەندە نزیك بێت ئیتر چۆن تەوبە دەبێتە وەرهەم بۆ دوا ڕۆژی بەڵام ئازیزان تەنها یەك داوام هەیە لەئێوەی بەڕێز نەکەن وەك من بێئاگابن نەکەن وەك من هەواو ئارەزوو پەرستی ببێتە خولیای سەرتان، لەبەرنامەی خوا، نەکەن ببنە خۆرەو خۆراکی دەستی ئافرەتانێك کە ئەبنە مایەی

دۆرانــی ئیمــانو باوەڕتــانو ڕەش کردنــی چارەنووسـتان لـەدوا ڕۆژدا، نەکـەن وەك مـن بەرووی دایکتان ئەڵشاخێنو بێفەرمانی بکەن......

لێرەوە پێتان دەڵێم خواتان لەگەڵ من بەناچاریو بێ دەستەڵاتی خـۆم چاوەڕێی مەرگی خۆمەو ڕۆژێ نا ڕۆژێکی تـر ئەچمەوە دیوانی پـەروەردگار و ئەگـەر پلـەی ئـەو کەسەم دەست بکـەوێت کـە دوا بەنـدەی ئوممـەتی (محمـده) درودی خـوای لەسـەر بێـتو لەدۆزەخدایەو خوای گەورە بەفریشتەکان دەفەرموێت : بڕۆن دواکەسی ئوممەتی محمـد لەدۆزەخ دەربێـنن چونکە بە ئەندازەی تۆزقاڵێك باوەڕ لەدڵیا بوو مـن زۆر سوپاسـی خـوا دەکەم .. خواتان لەگەڵ.

# دەستێکی نەرم فرمێسکەکانی سڕیم

کاك (ش) هەرچەندە لەناو شارێکی گەورەدا دەژیا، سوپاس بۆ خوا لەهەر کوێوە سەیرت بکردایە (منارەی مزگەوت) ت لێوە دیاربوو، بەڵام (ش) هاتوچۆی ناکردن، بۆ پرسەو سەرەخۆشیش گەر بچوایەتە مزگەوت ئەوا خێرا دەهاتە دەرەوە، قەت حەزی ناکرد لەناو ئەو باغە ڕۆحیەدا گەشەبکاتو بمێنێتەوە.

ئەوە چەند ساڵێکە تەنها سوجدەیەکی بۆ خوا نەبردووە، بەڵام قەدەری خوای گەورە بەو شێوەیە بو کە ئەم بەندە دور لەخواو پەیامی خواییە لەسەر دەستی کچە پێنج ساڵانەکەیدا هیدایەت وەربگرێت، بەڵێ تەنها تەمەنی (٥) ساڵ بوو، با لێگەڕێین بزانین خۆی چۆن باس لەتەوبەکردنو گەڕانەوەی خۆی بۆ پەیامی پیرۆزی ئیسلام دەکات.

شەوانم لەگەڵ هاوڕێی خراپدا ڕۆژ دەکردەوە، بەشتی خراپو گوناهو تاوان خۆمان خەریك دەکرد، ئەو هاوسەرە بەوەفاو دڵسۆزەم بەتەنیا جێدەهێشت، بەتەنها لەگۆشەی ماڵدا بەبێکەسی شەوی بەسەر دەبرد، خۆشم لەگەڵ هاوڕێی خراپو نادروست بەقاقای پێکەنینەوە تاوانمان ئەنجامدەدا، یەك تۆز هەستمان بەئازاری ویژدانی مردومان نەدەکرد.. ئاخر ئەگەر ئاینو خاوەنی ئاینی ئاسمانی نەبێت ویژدان لەکوێدا بێت.. خێزانم زۆر بەنەرمیو بەگەرمیو روخۆشی ئامۆژگاری دەکردم کە واز لەو هاوڕێ خراپانە بهێنم.. بەڵام من نامبیست.

کاك (ش) بەردەوام دەبێتو دەڵێ:

لەیەکێك لەشەوانی پڕ تاوانو گوناه گەڕامەوە.. کاتژمێر (سێ)ی شەو بوو خۆمکرد بەژوردا ماڵ کشومات، دەبینم خێزانەکەمو کچە بچکۆلانەکەم لەخەوێکی قوڵدان. لەلایان نەمامەوە چوم بۆ ژورەکەی خۆم بۆ ئەوەی بەڤیدیۆ سەیری چەند کاسێتێکی ئابڕوتکێنو پڕ لەشەرمەزاری بکەم.

ماوەیەکی پێ چوو لەپڕ دەرگای ژورەکەم کرایەوە.. دەبینم کچە پێنج ساڵانەکەمە بەچاوێکی رەخنەئامێزو پێناخۆش بوونەوە وتی:

بابە.. عەیبە ئەم کارە شەرمەزارییە.. لەخوا بترسە!

سێ جار لەسەر یەك ئەمەی پێ وتم، پاشان دەرگاکەی داخستو رۆشت، زۆر سەرم سورما، ڤیدیۆکەم کوژانەوە.. دانیشتم دەستم کردە بیرکردنەوەو دالغە لێدان، قسەکانی کچە بچوکەکەم لەگوێدا دەزرنگایەوە، بۆیە خێرا رامکرد بۆ لای تا تێر تێر لەئامێزی بگرم دەستی باوکایەتی بەسەریا بهێنم.. پاداشتی بکەم، بەڵام کە بینیم لەگەڵ دایکیا خەوتووەو لەخەوێکی زۆر خۆشدا پرخەی دێت، دڵم نەهات هەڵی بستێنم لەخەو، بۆیە نەمدەزانی چی بکەم، کەوتمە دالغەی ئامۆژگاری ئامێز.. هەر دەهاتمو دەچوم، لەگەرمەی هاتوچۆی من لەناو ماڵدا بانگی بەیانی مزگەوتەکەی نزیکمان شەوەزەنگی پاڵناو بانگی خوای گەورە درا بەگوێمدا.. ئەمجارە زۆر جیاواز بوو نەمتوانی ئارامبگرم خێرا خۆم پاکردەوەو دەستنوێژم گرت، چوم بۆ مزگەوت..دانیشتوانی چاوەڕوانی نوێژی بەیانی زۆر بەنامۆیی سەرنجیان دەدام بەلایانەوە سەیر بوو.. کێ هاتۆتە ماڵی خوا؟!

چەند رکات نوێژێکم خوێند، قامەتکرا لەدوایی (ئیمام)ی مزگەوتەوە نوێژم دابەست، سورەتی (فاتیحە)ی خوێند.. ئای لەو راچڵەکینە!! لەو دەنگە خۆشە!؟ ئای لەو ئاوڕشێنی دڵە لاوازو بودەڵەیە.. گەشایەوە.. پاشان چەند ئایەتێکی تری خوێند زیاتر دڵی پاراو کردم:

**(ألم يعلموا أن الله هو يقبل التوبة عن عباده ويأخذ الصدقت وأن الله هو التواب الرحيم).**

ناوچەوانم بۆ خوا خستە سەر زەوی‌و سجدەم برد، خۆم پێنەگیرا زۆر بەکوڵ گریان، ئەمویست نەگریم نوێژەکەم بەئاسایی بکەم.. بەڵام خۆم پێنەگیرا.. ئەمە یەکەمین کڕنوش بوو لەدوای حەوت ساڵ بۆ پەروەردگار.

ئەم گریانە بووە مایەی خێر، چونکە هەرچی دوری‌و ساردوسڕی‌و تەمبەڵیەك هەستم پێنەکرد لەوەو پێش لەلام نەما.. باری شانم سوك بوو.. هەستم کرد خۆشەویستی خوا دڵ‌و دەرونی داگرتم.. حەزم نەکرد بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە.. ئیمامی مزگەوتەکە لەدوای تەواوبونی (تەزبیحاتەکان) سەیرێکی کردم، هاتە لامەوە بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم.. دەستی خستە سەرشانم بەدەستی نەرمی فرمێسکانی سڕیم..

زۆر سەیری کردم.. لەگەڵ وردبونەوەمـدا وام ئـەزانی منـداڵێکی بـچوکم‌و کەسـێکی پـەروەردەکار ڕێنمـونیم دەکـات. بـەڵێنم بـەخوا دا کـە تـا لـەدنیادا بجـوڵێم نوێـژەکانم بەجەماعەت بکەم‌و هەرگیز بۆ لای تاوانباری‌و هاوەڵی خراپ نەگەڕێمەوە!

ورده ورده گەڕامەوە ماڵ، بەڵام هەرچەندم کرد خەو نەچووە چاوەکانم.. بۆیـە خـۆم پێچایەوەو چوم بۆ (فەرمانگە)، هاوڕێکانم زۆریـان پـێ سـەیر بـوو، چـونکە مـن زۆربـەی کات دوا دەکەوتم بەهۆی ئەوەی شەوان درەنگ دەخەوتمن بـەدیار سـەتەلایتەوە ومنـەوزم دەدا.

هاورێیەکم زۆر پیاو چاك بوو.. هەواڵەکەم بـۆ گێڕایـەوە.. چـاوەکانی گەشـانەوە.. زۆر سوپاسی خوای کرد.. پێشی وتم: سوپاسـی خـوای گـەورە بکـە کـە ئـەو کـچە بچکۆلەیەی پێبەخشیوی بووە هۆی هیدایەت دانت، سوپاسی خوا بکە.

کاتێك کە نیوەڕۆ هات بەهۆی ئەوەی نەنوستبووم هیلاك بـوم کارەکـانم بەهاوڕێیـەکم سپارد.. زۆر بـەخێرایی بـەرەو مـاڵ گەڕامـەوە تـا پـشویەك بـدەم کیـژە بـچوکەکەم مـاچ بکەم‌و شتی بۆ بکڕم.. چونکە ئەو بووە مایـەی گەڕانـەوەم بـۆ لای خـوا دوکـان‌و شـەقام‌و کۆڵانەکان خانوو خەڵك‌و سەیارەکان زۆر جیاوازبوون لەجاران!

لەغەریبێك دەچوم.. ئای نەفامی‌و گوناهباری.. ئـەم دنیـا جوانـە چـۆن لـێڵ دەکـەیت. گەیـشتمە مـاڵ لـەدەرگا چـوومە ژوورەوە.. هاوسـەرەکەم بەگریانـەوە پێـشوازی لێکـردم.. منیش تاسام پرسیم: چی بووە!؟ بۆ پەشۆکاوی‌و بۆ ئەگریت؟!

وەڵامەکەی وەك هەوره بروسکە وابوو کاتێك پێی وتم: کچەکەمان مرد!! مـردو گیـانی سپارد (انا لله وانا الیه راجعون) کاس بووم.. خەریك بـوو بێم بـەلادا.. ئـای خوایـە گیـان زۆر سـوپاس، تاقیکردنەوەیـەکی ج قورسـە، خـۆم پێنـەگیرا زۆر گریـام.. پـاش ماوەیـەك هێواش بومەوە.. چومە سەر لاشـەی بێگیـانی.. ئـەتوت ساتەکانی شـەوێیە، گـەرم‌و نـەرم چاوەکانی لە خەوێکی قوڵدابون. خێرا تەلەفۆنم بۆ هاوڕێکەم کرد.. ئەویش هـات بـۆ لام خێـرا شـتمان‌و کفنمـان کـردو نوێـژمان لەسـەر کـرد، دایکـی بـۆی بێتاقـەت بـو، گـەرەك زانیان.. لەگەڵ چەند پیاوێکدا بردمان بۆ گۆڕستان.. هاوڕێکەم وتی: ئەبێت تۆ بیخەیتـە گۆڕەکەوە.. بۆ دواجار دوادیدار خوا حـافیزەی لێبکـەیت.. بـەڵێ بەدەسـتی خـۆم تەسـلیم بـەخاکم کـرد.. ئـەم منداڵـە.. ئـەم کۆرپـە ئازیزەم مایـەی هیدایـەت دان‌و ڕێنیـشاندەری

ئیسلام بو بۆ من، ئەو برادەرە دڵسۆزو خواناسەم ئەم ئایەتەی لەکۆتاییدا خوێندەوە کە تا ئێستاش‌و داهاتوش چێژی تایبەتی هەیە لەلام کە خوای گەورە دەفەرموێت:

**(التائبون العابدون الحامدون السائحون الراكعون الساجدون الامرون بالمعروف والناهون عن المنكر والحافضون لحدود الله وبشر المؤمنين..[1])**

لەکۆتاییدا داواکارم لەخوا پاداشتی خێرتان بداتەوەو پاداشتی ئەو هاوسەرە بەوەفایەشم بداتەوە کە بەرگەی ئەو ئازارو ماندوبون‌و دابرانەی گرت.

داواکارم لەخوای گەورە تەوبە لەو کەسانەش قبوڵ بکات کە وەك من وابون‌و حەز دەکەن بگەرێنەوە بۆ لای خوا.. خوای باڵا دەستیش سەرجەم خوشکان‌و برایانمان بخاتە ژێر بارانی رەحمەتی خۆیەوە لەچێژو خۆشی (بەهەشت) بێبەشمان نەکات، ئێوەش پایەدارو سەربەرزی قیامەت بن انشاوالله.. بەرێزەکەم مامۆستای خواناس بەرێز "مامۆستا حسن موفتی" لەچیرۆکێکی کورتدا کە پرە لەئامۆژگاری دەڵێت:

رۆژێکیان (١٦)ی شەعبان بوو سوار قەمەرەیەکی (تەکسی) بوم بۆ گەرەکی (شێخ محی الدین) کاکی شۆفێر وتی: مامۆستا گیان زۆری ماوە بۆ رەمەزان؟

وتم: بۆ؟

وتی: هەر حەز ئەکەم بزانم

وتم: انشالله بەرۆژو ئەبیت؟

وتی: بەڵێ

وتم: پار چۆن بویت لەگەڵ رەمەزان؟

وتی: مامۆستا گیان پار زۆر خراپ بوم.. بەڵام ئەمساڵ هیوادارم زۆر زۆر چاکبم!

وتم: چۆن!؟

وتی: پار جەژنی رەمەزان خۆم ئەگۆری، کورێکی بچوکیشم هەبوو ئەویش خۆی ئەگۆری.. وتی: بابە ئەوە بۆ خۆت ئەگۆری؟!

وتم: رۆڵە گیان جەژنەو ئەچم بۆ جەژنە پیرۆزە!

[1] سورەتی التوبە ئایەتی (١١٢).

وتی: جا بابە گیان ئەمە جەژنی تۆ نییە خۆ تۆ بەرۆژو نەبویت! جەژنی ئەوانەیە کە رەمەزان بەرۆژو بون.

پشتێنەکەم بەدەستەوە بوو بۆم نەبەسترا، چۆکم داداو دانیشتم قسەکەی لەتاسیەوە بردم، بیرم کردەوە.. زۆر قسەکەی کاریگەری بوو.. ئەو منداڵە هەست دەکات، بەڵام من هەست ناکەم.. ئیتر بڕیارم دا لەدووەم رۆژی جەژنەوە بەرۆژو ببم و رۆژوی رەمەزانم قەزا کردەوە سوپاس بۆ خوا چی پێخۆشە ئەوە بکەم.. ئەو منداڵەم بووە هۆی هیدایەتم.. بۆیە چاوەڕوانی رەمەزانم.

بەقسەکانی دڵم زۆر گەشایەوەو دوعای خێرم بۆ کرد.. ئێوەش دوعای خێر بۆ هەموو ئەو بەڕێزانە بکەم کە ڕویان لەپەیامی خوای گەورەیە.. ئامین.

# ئاکامی حەرامو پاکی هاوسەرم

- چەند مانگێك بوو کۆشکی خێزانداریم لەگەڵ (ح) پێکهێنابوو، ئەڵقەی هاوسەریمان گۆڕیبۆوە..

کوڕێکی زۆر لەسەرخۆو ڕێکوپێكو گونجاو لەخواترس بوو.. ڕۆژگارەکانی ئەو ماوەیە لەلامان زۆر بەخێرایی تێدەپەڕین..

هەر لەدوو مانگی یەکەمدا بۆم دەرکەوت کە پابەندە بەنوێژە فەرزەکانیەوەو زۆر خۆی ماندو دەکات بۆ قیامەت، منیش ئەوەندەی ئێستا شارەزای نەبووم، بەڵام ئەو کاری لەسەر منیش دەکرد.. زۆرجار بەفەرموودەی خوای گەورەو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئامۆژگاری دەکردم بەتایبەتی بۆ بالاپۆشی - مُحاجَبه - لەناخەوە زۆر پێم خۆش نەبوو.. دەزانن بۆچی؟ چونکە زۆر بەسادەیی لەماڵی باوکما نوێژو خواپەرستیم دەکرد.. هیچی وا لەئاینی پیرۆزی ئیسلام فێرنەکرابووم، گەر برادەرێکم قسەیەکی لابەلاو پڕوپوچی دژ بەپەیامی خوای گەورەی بۆ بکردمایە زۆر بەئاسانیو ساویلکەیی دوای دەکەوتمو ئاغا بەڵێم بۆ دەکرد..

چەند لەبارەی ئەو (٢٥) ساڵەی تەمەنمەوە بدوێم هێشتا کەمە.. ساڵێك زیاد گوزەری کرد.. ڕۆژێك لە (سەیرانگای سەرچنار) گەڕاینەوە دەرەنگان بوو سوار پاسێکی (مەصڵەحە) بوین، زۆر قەرەباڵغ بوو زیاد لە (٥٧) نەفەری تیابوو.

کابرای (جابی) نەگەیشتە لامان بۆ پارە وەرگرتن، هاوسەرەکەشم دوو نیو دیناری ئاسنی لەدەستا بوو، وەك دوو پشکۆ - سکڵ - ی ئاگر ئەم دەستو ئەو دەستی پێدەکرد، منیش بەسرتەو بەهێواشی پێم وت: (دەیبخە گیرفانت لایبە.. هەڵیگرەوە.. بۆ ئەوەندە خەمتە).

بەرویەکی گرژەوە وتی: سەرباقی پیاوەتی ئەتەوێ خیانەتو دزی لەکابرا بکەم بە (یەك دیناری حەرام قوڕکەی بەسەر منو خۆشتا).

گەڕا.. گەڕا.. خۆیکرد بەنێو خەڵکەکەدا تا پارەکەی تەسلیمی جابیەکە کرد.. پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە.

زۆر ئەم هەڵوێستەم بەلاوە سەیر بوو.. زۆرجار لەنەشارەزاییەوە قسەم ناڕاستە دەکرد، بەڵام زۆر بەهێمنیی و لەسەرخۆی و بەجوانی تێیدەگەیاندمو رەزامەندیم دەنواند.. بەڵێ ئەم هاوسەرگیرییەمان ناوبەناو لەلا ناخۆش دەبوو.. زۆرجاریش هەستم بەپربوونەوەی کەلێنەکانی تەمەنم دەکردو سودمەند دەبووم.

بەڕێزان با زۆر لەڕووداوەکە دوور نەکەومەوە کە بۆ دواجار پاکی هاوسەرەکەمو راستیم لەلا رۆشن بۆوە. هەستم بەعیشقێکی ئیلاهی کرد لەناخیدا.

رۆژێك بەمەبەستی کڕینی پێداویستی ماڵ چوینە بازاڕ هەندێك شتمان کڕی، هەندێك پێویستی ترمان مابوو.. بەردەمی مزگەوتی گەورە وەکو ئێستا پاكو خاوێنو چۆڵیو باخچە نەبوو، هەموی عەرەبانەی ئاسنی سێ تایەیی بوو، کەرەسەی وشکەی خواردنیان ئەفرۆشت زیاد لە (۲۰۰) عەرەبانەی لێدەوەستا. ئەو شەقامە جمەی ئەهات لەرێبوارو فرۆشیارو کڕیارو دەستگێڕ، هات بەخەڵمادا بەهاوسەرەکەم وت:

(ح) خۆ ئێمە هەر شت دەکڕین پارەمان پێیە خۆ پارە وردەکەش خەرج دەبێت بۆ ۱۲ بە (دە) نەکەین.

بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەڵێی چی!.. چی بکەین!؟

منیش وام زانی لەقسەکەم تێنەگەیشتووە بۆم روونکردەوە: بۆ (۱۰) دیناری کاغەز نەدەین بەوکوڕە وردە فرۆشەو ئەویش ۱۲ دیناری ئاسنمان بداتێ[1] (ح) رووبتێکردمو وتی:

ئافرەت من حەرامم پێوە نایەت لەم بازاڕەدا با سەیارەیەك لێمان نەیات.. وازبێنە کەی ئاقڵ نەبیت. تۆزێك تورە بو، بەڵام من هەر سوربوم لەسەر قسەکەم.

وتم: خۆ خەڵکی هەموو ئەمە کاریانە.. دەبا تاقیبکەینەوە.. دەیتوخوا..

وتی: بەو خوایەی تۆ سوێندی پێدەخۆیت سەرکەوتو نابیت..

---

[1] لەدوای راپەڕینەوە جیاوازی نێوان پارەی وردەو کاغەز پەیدا بوو واتە دینارو نیو دیناری ئاسنی سویسری کەمتری دەکرد لەپارەی (۱۰ و ۵)ی کاغەز، هەر بۆیە چەند کەسێك بژێوی ژیانیان لەسەر ئەم کارە بوو، ۱۰۰ دیناری ئاسن ۸۵ دیناری کاغەزی دەکرد.

گەر حەزیشت لەپارە وردەکەیە سەربەسەر وەریبگرە..

وتم: من لەبەر ئەو دوو دینارە ئەم ئاسنە توشی خۆم دەکەم؟!

وتی ئاخری خێر بێت فەرموو.. دڵنیام ئاکامەکەی باش نابێت، بەڵام تۆ کەللە رەقیم لەگەڵ ئەکەی.. حەزیش ئەکەم ئاکامەکەی بەچاوی خۆت ببینیت.

رۆشتم دوو پێنج دیناری کاغەزم دایە دەست کوڕێکی نەوجەوانو ١٢ دیناری ئاسنم وەرگرت.. بەشانازییەوە گەڕامەوەو وتم:

(ح) بۆ ئەوەندە رەشبینیو بەرچاو تەنگی.. بابڕۆین.. پارەکە لەلای من بوو.. بەچەند هەنگاوێکی لەسەرخۆ لەو ناوە دوور دەوتینەوەو چوینە ژێر پردەکەی خوار مزگەوتی گەورەوە.. لەچەند دوکانێك پرسیاری نرخی خواردەمەنیمان کرد ئەمەی بۆتان دەگێڕمەوە ساڵی ١٩٩٢ بوو.

خەڵکی هەموو بەکیلۆ و بەرمزیلی پێداویستیو کەرەسەی خۆراکی دەکڕیو دەیخوارد. ئێمەش بۆ پێکەوەنانی (نۆماڵی) خۆمان هەوڵمان دەدا، زۆرجار کەمخۆراکیشمان دەکرد تا بگەینە جێگەو رێگەو ماڵی خۆمان، ئەمە خەوی هەموو تازە بوكو زاوایەکی دنیایە.

خۆشەویستان لەلای عەرەبانەیەك لەنگەرمان گرتو (سێ) کیلۆ برنجمان کڕی بە (٢١) دینار، کردمانە ناو (عەلاگە)یەکی گەورەی پتەوی ئەستورەوە کە هەموو کات بۆ برنج کڕین بەکارمان ئەهانی هیچ ترسی دڕانو تەقینی نەبوو.

بەبازاڕدا تێپەڕین پرسیاری چەند کەلوپەلێکی ترمان کرد، هەندێکی تریش رۆیشتین گەشتینە بەر (بەلەدیە)کەی ناو بازاڕ، چەند دەسکە سەوزەو تەڕەو توڵەو شتی ترمان کڕی، کاتێك هەستم کرد دەستی عەلاگە برنجەوشکەکەم سووك بوو لەپڕ دڵم داخورپاو سەیرم کرد.. ئەو عەلاگەیەی سێ کیلۆ برنجی تیا بوو وەك ئەوەی چەقۆیەکی تیژی لێدەیت لەم سەر بۆ ئەوسەر دڕاو هەڵتەقی بەبێ ئەوەی یەك عەرەبانە یان یەك کەس لێمان نزیك بووبێت تا بەکاری ئەوانی بزانین.. بەڵێ بەرێزان برنج رژایە ناو ئەو ئاوو قوڕو لیتە ڕەشەی بەردەم (بەلەدیە)کەو تەنها سەرسامی نەبێت هیچی ترم بۆ نەمایەوە..

خێرا عەلاگە فرۆشێك وتی: دادە بۆ کۆی ناکەیتەوە.. یارمەتیت بدەم؟

وتم: جا چی کۆبکەمەوە.. حەیام بێت بەسمە..

هاوسەرەکەم وتی: باشە (کچی باش) بۆ دوو دینـاری ئاسـن زەرەری ٢١ دینـارت لـەخۆت دا.. ئاقڵ بویت.. یا ماوتە ئاقڵو بەویژدان ببیت.. نەموت خـۆت لەحـەرامو مـاڵی حـەرام بپارێزە.

بەتەواوی چوومە سەر بۆچونو قسەکەی، بۆم دەرکەوت هەرچی بەماندوبونو ئارەقی نەوچەوانو هێزی بازوو دەست نەکەوێت جێگە ناگرێت.. با کـەمیش بێـت. زانـیم مـاڵی حەرام گەر بەقەد کێوی پیرەمەگرونیش بێت هەرەس دەهێنێت.. ئێستا نـا رۆژێکـی تـر.. ساڵێکی تر.. نابێتە سوودمەندی بۆ خاوەنی.

بەدەم گەڕانەوەمان (ح) وتی:

هاوسەری بەڕێزم تا دەتوانیت لەکارو کردەوەو پارەی حەرام دووربکەوەرەوە زۆر کەس بەپارەی بەلاش پێگەیشتن، بەڵام تێرنەبوون تا گڵ چاوی تێرکردن.

زۆر کـەس ئـاهو حەسـرەت بـۆ مـاڵی خـەڵك هەڵدەکێـشن، بـەڵام بـا خۆشـی قیامـەت نەدەینە خۆشی دنیاو کۆشكو تەلارو باغی ئەم دنیایـەمان بـەلاوە گرنـگ نـەبێت. خـوای گەورەش لەپەیامە پیرۆزەکەیدا بۆ مرۆڤایەتی دەفەرموێت:

"والآخِرة خَير وأبقى"

# تەوبەکردنی ئافرەتێکی مەسیحی موسوڵمانبوونی*

و/ عبدالقادر علی

(ثناء) ئافرەتێکی (نە صرانی میسری) بوو، دوای هەوڵو کۆششێکی بەردەوام توانی بە پشتیوانی خوای گەورە موسوڵمان ببێت، ڕۆشنایی ئاینی خوا پەردە ڕەشەکانی بڕی، (ثناء) بەم شێوەیە لەزمانی خۆیەوە باس لەچیرۆکی موسڵمان بونی دەکاتو دەڵێت:

منداڵیم وەك هەر منداڵێکی مەسیحی میسری لەناو خێزانێکدا بەسەر برد کە ئەندامەکانی خۆی فێری دەمارگیری دەکردو داوای لێدەکرد کە ئەوەندە پرسیار نەکات، بەڵکو هەر خەریکی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان بێت.

هەموو ڕۆژانێکی یەکشەممە لەگەڵ خێزانەکەماندا دەچوم بۆ (کەنیسە)و دەستی قەشەم ماچ دەکرد، پاشان گوێبیستی دەبوم کە دەیوت:

غەیری ئێوە هەرچی چاکەو چاکسازییە مادام بڕوای وەك بڕوای ئێوە نییە ئەوا هیچی قبوڵ نییە.

من هیچ تێنەدەگەیشتم حاڵم وەك حاڵی سەرجەم منداڵەکانی هاوتەمەنی خۆم بوو، هەر کە لەکەنیسە دەهاتمە دەرەوە خێرا ڕام دەکرد بۆ لای کچە هاوڕێکەم بۆ یاری کردن کە ئەم مسوڵمان بو منداڵی زۆر پاکە ئەو هەموو ڕقەی لەدڵما دەیانچاند درا بەموسڵمانان بەری نەگرت.

پاشان گەورەتر بومو چومە قوتابخانە، لەوێش کۆمەڵێك هاوڕێم بۆ دروست بوو، واتە شاری (السویس) لەقوتابخانە چاوم بەڕەوشت بەرزی هاوڕێ مسوڵمانەکانم پشکوت، وەك خوشکی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، سەیری ئەوەیان نەکرد کەوا ئاینی من لەئاینی ئەوان جیاوازە، دوایی تێگەیشتم کە قورئان هانی موسڵمانان دەدات کە لەگەڵ

* گۆڤاری الفیصل ژ / ٦٥

ئەو کەسانەی موسڵمان نین زۆر ڕێزیان بگرێت‌و ئازاریان نەدرێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت ( **لاينهاكم الله عن الذين لم يقتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا إليهم إن الله يحب المقسطين** ).

یەکێك لەهاوڕێکانم زیاد لەوانی تر یەکترمان خۆش دەویست بەردەوام بەیەکەوە بوین تەنها لەکاتی خوێندنی وانەی (پەروەردەی ئیسلامی) دەبوایە من بهاتمایە دەرو بچم لەسەر دەستی مامۆستا (مەسیحیەکە) وانەی مەسیحی تایبەت بەخۆیان بخوێنم لەگەڵ قوتابیە مەسیحیەکانی تر.

حەزم دەکرد لەم وانە تایبەتیەی خۆمان ئەوە لەمامۆستاکەم بپرسم: ئایا هەر وەك ئێمە دەڵێن موسوڵمانەکان بێباوەڕن، چونکە بڕوایان بەخوایەتی حەزرەتی (عیسی) نییە، ئەمە تا چەند راستە، چونکە موسوڵمانەکان کەسانی بەڕەوشت‌و دەست‌و زمانپاك‌و بەبەزەیین لەگەڵ غەیری خۆشیان چەندە هەوڵم دا نەمدەوێرا، چونکە دەترسام لێم توڕەبێت‌و لەپێش چاوی باقی قوتابیەکان بمشکێنێت، بەڵام خۆم پێنەگیرا ڕۆژێکیان لەپۆلدا پێم وت:

-موسوڵمانەکان کەسانی ڕەوشت بەرزن، بەسۆزن، خۆشەویستی‌و هاوکاری بەسەریاندا زاڵە کەواتە بۆ دەبێت بێباوەڕبن؟ لەبەزەیی بەدوربن؟

مامۆستاکەم کە ئەمەی لێبیستم هەستم کرد زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام توڕەیی خۆی قوتداو بەزۆر زەردەخەنەیەکی دروستکراوی هێنایە سەر لێوەکانی‌و وتی:

-تۆ هێشتا منداڵیت‌و لەدنیا تێنەگەیشتویت، کەواتە ئەو شتانەی کە بینیوتن هەڵت نەفریوێنێ.. چونکە ئێمە زۆر شت دەزانین، بەڵام وەك وتم: تۆ منداڵیت‌و هەستیان پێناکەیت.

من بێدەنگ بوم هەر چەندە یەك تۆز باوەڕم بە ئەو وەڵامە لاوازە نامەوزوعیە نەکرد دوای ئەوە ئەو هاوڕێ خۆشەویستەم کە باسم لێوەکرد،ماڵیان گوێزرایەوە بۆ (قاهیرە) لەیەك دابڕاین، ئای کە لەیەك دابڕانێکی ناخۆش بو!

ئەو ڕۆژە هەردوکمان زۆر بۆ یەکتری گریاین.. هەردوکمان وەك پێش لەیەك دابڕان دیاریمان پێشکەش بەویترمان کرد.

ئەو هاوڕێ موسوڵمانە باشترین دیاری یەك کە هەڵی بژاردبێت بۆ من باس

لەهاوڕێیەتیمان بکات برینی بوو لە (قورئان)ێك، لەناو کیفێکی قاپ قورئانی دا بوو، زۆر جوانو سەرنج ڕاکێش بو دوای ئەوەی پێشکەشی کردم پێی وتم:

-زۆرم بیرکردەوە لەوەی کە یدارییەکی زۆر بەنرخت پێشکەش بکەم لەرەمزی وەفاداری چەند ساڵەی من بێت بۆ بەڕێزت، بەڵام لەم دیارییە زیاتر هیچم بەشایستە نەزانی کە ئەمەش پەیامو گوفتاری خوایە بۆ بەندەکان.

منیش زۆر بەخۆشحاڵییەوە دیارییەکەم لێومرگرت، دەم شاردەوە لەئەندامانی خێزانەکەم، چونکە ئەوان قبوڵیان ناکرد کە یەکێك لەئەندامەکانی خێزانەکەیان کە من بوم قورئان بەدەستەوە بگرێت.

دوای ئەوە کە هاوڕێ موسوڵمانەکەم لێم دابڕا، هەر کات گوێم لەبانگ بوایە ئەوا خێرا قورئانەکەم دەردەهێناو بەدزییەوە ماچم دەکرد، چونکە ئەگەر پێیان بزانیمایە ئەوا توشی گرفتێکی گەورە دەبوم.

ڕۆژگار تێپەڕی بەم شێوەیەی کە بۆم باسکردن من هەر بیر لەموسوڵمان بون..خۆداپۆشین.. نوێژکردن دەکەمەوە، لاشەم لەناومەسیحیەکاندا بوو، بەڵام بەڕۆحو گیان خۆم لەناو موسوڵمانەکاندا دەبینیەوە.

دوای چەند ساڵێك شومکرد بە (یەکێك لەپیاوانی ئاینی کەنیسە) لەگەڵ گوێزانەوەی کەلوپەلی تایبەتی خۆم بۆ ماڵی تازەم، دیاری خوشکە موسوڵمانەکەمم گوێزایەوە کە بریتی بوو لەقورئانەکە نەمدەهێشت هاوسەرەکەم بیبینێت، ئەم ماچ کردنو بەسەنگەوە گرتنەم کاڵ نابۆوە ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبووندا بوو، زۆر بەوەفا دڵسۆزی بەردەوام ژیانم لەگەڵ هاوسەرەکەم بەسەربرد، دوای ئەوە خوای گەورە (٣) منداڵی پێبەخشین.

دوای ماوەیەك لەدیوانی پارێزگادا بوم بەفەرمانبەر، لێرە لەگەڵ چەند دەستەخوشکی موسوڵمان کە بەرگی شەرعیان پۆشیبوو بوینە هاوکاری یەکترو بوینە هاوڕێی یەکتر، زۆرباش بون لەگەڵم، ڕەوشتی جوانو هاوڕێیەتی گەرمیان لەگەڵ مندا بیری ئەو هاوڕێیەیان دەهێنامەوە کە پێشتر باسم لێوەکرد.

کاتێك لێیان دابڕامایە بێتاقەت دەبوم، لەو کاتانەش هەر کات بانگ بدرایە لەمزگەوتەکان ئەوا هەستم دەکرد شتێك خورپەی دڵی دەدام.

دڵە تەپەی پێدەکردم، هەرچەندە من موسوڵمان نەبو بومو خێزانی کابرایەك بوم کە بژێوی خێزانی لەکەنیسەوە بۆ دابین دەکرا.

بەبەردەوامی ژیانی رۆژانەو هاوڕێیەتی ئەو خوشکانەی کە لێیان دوام بیرم لەئیسلام‌و مەسیحیەت دەکردەوە، هەڵدەستام بەهەڵسەنگاندنی ئەو قسانەی کە لەکەنیسە دەیانگوت بەئیسلام‌و موسوڵمان‌و لەگەڵ ئەو واقیعەی کە دەمبینی بەراوردم دەکرد، کە زۆر زۆر پێچەوانەی قسەی پیاوانی ئاینی بوو.

خوای گەورە هەلی بۆ رەخساندم مێردەکەم سەفەرێکی هاتە رێگا هەر خۆم بەتەنها لەماڵەوە لەگەڵ منداڵەکانم مامەوە.

ئەمەش بوارێکی وای بۆ رەخساندم کە بە (رادیۆ - تەلەفزیۆن) گوێ لەوتاری زۆرێک لەزانایان بگرم، لەمیانەی وتارەکانیاندا وەڵامی پرسیارەکانی ناو ناخی منیان دەدایەوە، وە خوێندنی قورئان بەدەنگی (شێخ محمد رفعت) زۆر کاریگەری بوو لەسەرم، وە کاتێک گوێ بیستی دەنگە ئیمانیەکەی (شێخ عبدالباسط) دەبوم دەموت ئەم گوفتارە بەرزە وتەی ئادەمیزاد نییە!

رۆژێکیان کە مێردەکەم لەکەنیسە بوو خۆم بەتەنها لەماڵ بوم چوم بۆ لای دۆلابەکەم دیارییە بەنرخەکەم دەرهێناو خستمە بەردەستم زۆر بەپەرۆشیەوە کردمەوە یەکسەری چاوم کەوت بەو ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت:

**( إن مثل عيسى عند الله كمثل آدم خلقه من تراب ثم قال له كن فيكون )** دەستم کەوتە لەرزە، عەرەقکردنەوەو موچرکەیەک گشت گیانمی داگرت، هەرچەندە من پێشتر زۆر گوێم لەقورئان بو، وە چ لەلایەن هاوڕێکانمەوە یان لەرادیۆو تەلەفزیۆنەوە، بەڵام هیچیان هێندەی ئەو خوێندنەوەیەی خۆم کە خوێندمەوە کاری تێنەکردم، حەزم دەکرد هەر ئاوا بەردەوام بم، بەڵام دەنگی کردنەوەی دەرگای ماڵەوە لەلایەن هاوسەرەکەمەوە نەیهێشت کە بەردەوام بم لەخوێندنەوە.. ناچار قورئانەکەم شاردەوە، چوم بەپێشوازی هاوسەرەکەمەوە، بۆ رۆژی دوایی چووم بۆ سەر فەرمانی رۆژانەم لەفەرمانگە، بەڵام دەیان‌و سەدان پرسیاری سەیر بەمێشکمدا دەهات‌و دەچوو، چونکە ئەو ئایەتە قورئانیەی کە خوێندبومەوە ئەو راستیەی بەتەواوی بۆ رونکردمەوە کە (حەزرەتی عیسی.. سەلامی خوای لێبێت) بەندەو پێغەمبەری رەوانە کراوە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ سەرجەم ئادەمیزاد، ئەو ئایەتە گومان‌و دوودڵی لەلا نەهێشتم بۆم رونبۆوە کە قورئانی پیرۆز وتەی (محمد) نیەو فەرموودەی خوای گەورەیە، چونکە بە جوانی (سورەتی

مەریەم) باسی حەزرەتی عیسای کردووە، زیاتر لام رونبۆوە کە دوای نەمانی عیسا معجیزەکانی نەما، بەڵام (محمد) پەیامەکەی هەر ماوە.

زۆر پرسیاری ترم لەخۆم دەکرد، دەبێت چارەسەری ئەم حاڵەتە چی بێت، بەڵام سوپاس بۆ خوا توانیم کلیلی چارەسەری ئەم گرفتە بدۆزمەوە ئەویش (**أشهد أن لا إله إلا الله واشهد أن محمد رسول الله**).

بەڵام بیرم دەکردەوە (هەڵوێستی مێردو منداڵو کەسوکارو ناسیاوم چی دەبێت بەرامبەرم) ئایا بتوانم موسوڵمان ببم یان نا؟!

چەندان هەفتە بەدوای یەکدا تێپەڕین زۆر بیرم دەکردەوە.. ئەوەندەی دەمتوانی هەوڵی شارەزابوونی ئیسلامو کەسایەتیەکانیم دەدا.

لەلای کەسیش رازی خۆم نەدەرکاند، هەرچەندە من زۆر بە (بەتواناو چالاك) ناسرابوم لەئەنجامدانی کاری رۆژانەدا، کەچی زۆر بێتاقەت بوبوم کاری رۆژانەم بەگرانی بۆ بەئەنجام دەگەیەنرا.

بەڕێزان هەروا ئەمامەوە رۆژێکیان لەفەرمانگە لەسەر کورسیەك دانیشتبوم کەوتبومە قوڵایی بیرکردنەوە.. لەپڕ گوێم لەدەنگی مزگەوت بوو کە بانگی دەفەرموو..

دەی فەرموو (**الله أكبر .. الله اكبر..**) (**أشهد أن لا إله إلا الله واشهد أن محمد رسول الله**) بانگەوازی گشت ئەندامانی دەکرد بۆ نوێژکردنو خواپەرستی.. بەدەنگێکی نەرمو خۆش بەدەر لەو تەقوهوڕو زەنگە ژەنگ گرتووەی خۆمان.

هەستم کرد وردە وردە وشەکانی دەچونە ناو ناخمەوە هێنامیە لەرزەو لەپڕ پەردەی بێباوەڕیو دور لەخوا ژیان یەك بەیەك فەوتان، خۆم پێنەگیرا لەناو هاوڕێکانمدا پڕ بەدەم هاوارم کرد (**أشهد أن لا إله إلا الله واشهد أن محمد رسول الله**) زور کپو بێدەنگ هاوڕێکانم سەیریان ئەکرد، وایان ئەزانی کەسێکی نامۆمو لەئەستێرەیەکی ترەوە هاتوم.. نامۆو نامۆ.. بەڵام پاش کەمێك سەیرم کرد هاوڕێکانم سەریان سوڕما بوو هەندێکیان پێدەکەنین برێکی تریان دەگریان، گریانو پێکەنینو خۆشی تێکەڵاو یەك بون، منیش چیتر خۆم پێنەگیراو دامە گریانو هەنسك دان گریانێکی بەکوڵ، بۆ تەمەنی رابردوم بۆ ژیانی دور لەخواو پەیامی ئیسلام، بۆ تەمەنی خۆم کە کڕنوشێکی بۆ خوای پەروەردگا

تیانەبوو، داوام لەخوا کرد کە لەگوناهم خۆش بێتو ژیانی تازەو نوێم پڕ بەرەکەت بکات.

چونکە تەمەنی بێبەرەکەتو دور لەخوا ژیان، مرۆڤەکان بەرەو دەریای قوڵی نامرۆڤانە دەبەن.

ئەم موسوڵمان بونەم خێرا بەناو فەرمانبەرانی فەرمانگەدا وەك ئاگری دارستان خێرا بەگشت لایەکدا بڵاوبۆوە.. هەندێك لەهاوڕێکانی پێشوم کە ئەوان موسوڵمان نەبون، ئەمەیان بەهەلزانی خێرا چونە ماڵو بەماڵەوەیان راگەیاند، خۆشیان درێغیان نەکردبو لەوەی کە خراپەو کەس پێیقبوڵ ناکرێت، بۆیان هەڵبەستم وە هەمویان گومانیان پێئەبردم کە لەدوای ئەم موسڵمان بونەوە شتێکم لەژێر سەردایە، نیازی شتێکم هەیە!

بەڵام من گوێم نەدائێ هەرچی باسیان دەکردو بەخۆڕایی بەدەمیانەوە هەڵدەبەستم کاری لێنەکردمو سوربوم لەسەر رەوتی موسوڵمان بونو بەرەو لای خوداچون.

جا بۆ ئەوەی موسوڵمان بونەکەم ئاشکراو رون بێت، لەڕوی یاساییەوە هەرچی پێویستیان کە هەبوو جێبەجێم کرد، بەشێوەیەکی رەسمیو یاسایی موسڵمان بوم، کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵ چی ببینم سەرم سوڕما هاوسەرەکەم کە هەواڵی موسوڵمان بونی بیستبوو، هاتبو هەرچی جلوبەرگم هەیە لەحەوشەی ماڵدا ئاگری تێبەردابو سوتاندبوی هەرچی ئالتونو زێڕێك کە هەبوو، دەستی بەسەردا گرت، بەڵام من هەر خەفەتی منداڵەکانم بوو کە بیبات بۆ لای خۆی نەمدائێ تا ئەمە بکات بەهۆکاری جەخت کردن لەسەرم تا لەموسوڵمان بونەکەم پاشگەزبیمەوە، زۆر بەزەیم بەمنداڵەکاندا دەهات، چونکە ئەگەر لای من نەبونایە ئەوا ئەوانم موسوڵمانانە بۆ پەروەردە نەدەکرا.

زۆر پاڕامەوە لەخوا کە منداڵەکانم لێدانەبڕێن.. تا بتوانم موسوڵمانانە پەروەردەیان بکەم، خوای گەورە نزای قبوڵ کردم.. هەندێك خوشكو برا ئەوەیان پێڕاگەیاندم، یاسایەك هەیە لەدادگا کە لەوێوە دەتوانی داوای منداڵەکانت بکەیتو منداڵەکانت دەستبکەوێتەوە.

ڕێگای دادگام گرتەبەرو بڕوانامەی موسوڵمانبونم پێبوو، سوپاس بۆ خوا دادگا فەرمانی بەقازانجی من دەرکرد.. (داوای لەهاوسەرکەم کرد کە یان موسوڵمان بێتو بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵماندا بژیو لەیەك دانەبڕێین یان لەیەك جیابونەوەمانو

بەخشینی منالەکان بەمن، چونکە هێشتا منداڵ بون، نەگەیشتبونە تەمەنی یاسایی)، بەلاّم هاوسەرەکەم لوت بەرزی گرتی‌و پشتی لەراستی کردو موسولمان نەبوو.

بەم شێوەیە منداڵەکان لای من مانەوەو لەگەڵ باوکیان لەیەك جیابوینەوە.

هەرچەندە لەیەك دابراین‌و پەیوەندیمان بەیەکەوە نەما، بەلاّم زۆر بێشەرمانە (خۆی‌و کەس‌وکاری‌و کەس‌وکاری خۆم) پروپاگەندەو قسەی ناراستیان بۆ هەڵدەبەستم هیچ کاری لەمن نەکرد.

چونکە کە سەیری مێژووی ئیسلام دەکەیت باشترین کەس‌و خواناسترین زاناو کەسانی بۆ خوا رەخساو درۆو بانگەشەی درۆیان بەدەمەوە هەڵبەستراوە.. تەنانەت شایعەو قسەی ناراست بە (پێغەمبەرو خێزان)ەکەشی وتراوە سەلامی خوایان لەسەربێت.

ئەی کەواتە دەبێت حالّی من چیبێت کە ١٤٢٠ ساڵ دوای پێغەمبەرو هاورێیانی دەژیم.. بەردەوام سەرەرای خراپەی کەس‌وکارم من هەر نزای هیدایەت دانیان بۆ دەکەم تا موسولمان ببن چیتر دوای رێچکەو رێبازی دەستکردی مرۆڤو وتە بریقەدارە بێبناغەکانی کۆمەڵگە نەکەون.

ئێوەش نزای خێر بۆ من‌و سەرجەم ئەو کەسانە بکەن کە حەز دەکەن موسولمان ببن، بەلاّم (کارو پلەو کورسی‌و مۆدیل) چاوی گرتون‌و ئەقلی لەحیم کردوون.

# هیوای ئازادی لەچاوی لاوکدا

کوڕە گەورەکەم لەخۆشەویستیدا پێمان ئەوت (لاوك)، تەمەنی گەیشتە (١٨) ساڵو تاقەتی قوتابخانەی نەما.. چەند هاوڕێیەکی ئەملاولایان لێگرت.. دەستی کردە کوردایەتی، ئەو ساڵانەی (پێشمەرگە) ناویان زۆر بەرزو پیرۆز بوو، خاكو ئاوو گەل هەموویان قەرزارباری ئەوان بوو، دەسەڵاتی رژێم لەکوردستانی عێراقدا باڵا دەست بوو، لەو ساڵانەشدا هیچ لاوێك خۆش گوزەران نەبوو لەژین.. لەو ساڵانەدا دیوارو کوچەو کۆڵانەکان بەدروشمی کوردانە لەشەوگارە تاریکە قوڵەکاندا دەنوسرانەوە.. راستی قسەکەم ئەو دیوارانەن کە ئێستاش ماون، ئەو دروشمانە دوای چەند جار بۆیەکردن هەر ئاسەواریان دیارەو برای شەهیدەکان کە بەلایدا گوزەر دەکەن دەڵێن: ئەمە کاکەمان ساڵی هەشتاکان بەبۆیەی پەمپ نوسیویەتی..

بەهەر لایەکی ئەم شارەدا دەڕۆیشتین دەزگای داپڵۆسینی (حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی) دیاربوو، پاساوڵەکانی لەکونە دیوارەکانەوە سەیریان ئەکردین.. چەند لاوێك لەبەندیخانەکانی ناو شارو دەرەوەی شاری سلێمانی توندکرابوون، رۆژانە جۆرەها سزای جەستەییو دەروونی دەدران.. رۆژانە سوکایەتی بەکەس‌وکارو ماڵو منداڵیان ئەکرا.. لەگەڵ ئەمەشدا چەندین کەسیش لەم شارە خۆشەویستەماندا هەبون کە رێوی ئاسا خۆشەویستی (بەعس)یان بۆ کەسان باسدەکردو هەواڵیان دەگەیاند. بۆ سلاوی عەرەبێکی ئالەباری هیچ ئەدیو ئەچوونە ئاسمان.. خۆیان پێوە فش ئەکردنەوە: (فلانە رەفیق حزبی برادەرمە.. هەرچیت ئەوێ بۆت ئەکەم!!)

خۆشەویستم ئەو رۆژانە لەگەڵ هەوری بەهاردا ڕەوینەوە، بەری خۆر رۆشن بۆوە، بەڵام ئاسەواری ئەهامەتیان لە (زەویو دڵو دەروونی) کەسانی خۆشەویست بەخاكو ئاو هەر ماوەو.. بەم زوانەش سارێژ نابێت.. ئەگەرچی گەماڵە دیکتاتۆر (دێڵ ئاسا) دایان

بەدەستەوەو (موعەزەز موکەرەم) خزمەتی ئەکەن، ئەوەی مەبەستمەو هەمو دەمانەوێت بزانین سیخوڕی هەندێك کەس بو کە بۆ رژێمی دیکتاتۆری دژ بەمرۆڤایەتیان ئەکرد.

لاوك: هەستا چووە دەرەوە.. کوڕێکی زۆر چالاكو بەتوانابوو داوای یەك دوو چالاکی ناوشاریان لێکرد.. هاتەوە پێم وت: رۆڵە دانیشە قوڕ مەکە بەسەرماندا!.. رۆڵە دانیشە، سودی نەبوو، رۆژێکیان بو بەتەقەو هەراو قلیشانەوە! چی بو چی رویدا.. پاش یەك دوو سەعات وتیان: محافقی سلێمانی (شێخ جەعفەر بەرزنجی) بەدەستی خۆی هەیکەلەکەی کاوەی لەجادەی توی مەلیك روخاندووەو چەند قسەیەکی ناشرینیشی بە (پێشمەرگەو کورد) داوە وەك خۆی کورد نەبووبێ. لەو ناوەدا چەندین کوڕو کچو خەڵکی ئامادە بون، بووە بەهەراو تەقە زۆریان بۆ (محافظ) هێناوە خەریك بووە پەلاماری بدەن‌و حسابی بۆ بکەن، بەڵام (محافظ) خێرا سواری سەیارەیەك بووە بۆی دەرچووە.. چۆن ئێستا (موعەزەز موکەرەم) لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بەرەو (نەرویج) رەوانە کرا، بۆی دەرچوو گەیشتەوە شوێنی ئامانی‌و داواشی لەچەکدارەکان کرد دەستبکەن بەتەقە کردن لەو لاوانە.. چەند کەسێك (کوژرا ـ بریندار بو ـ گیرا.. رایکرد..)

کاکە لاوك بەبرینداری خۆی خستبووە ماڵێکەوە لەو ناوە شەوگارێکی درەنگ هانیانەوە بۆ ماڵی خۆمان‌و ئەو ماڵە برینەکەیان جوان بۆ تیمارکردبو.. چەند رۆژێك خزمەتمان کرد.. قسەمان بۆ کرد.. پاش چاکبونەوە چالاکیەکی تری ئەنجامداو ئیتر نەمان دییەوە.. پاش ماوەیەك بەژنێکی نەناسدا نامەیەك‌و چەندین وێنەو قسەی خۆشی بۆ ناردبوین[1]، بەڵێ لاوك چووە ریزەکانی پێشمەرگەوە لەدوای چەند مانگێك بەکەسێکی دڵسۆزو بەڕێزو ئازا ناسرا، ئیتر خەمەکان لەسەر شانی ئێمە گران دەبوو، ئێواران کە لەدەرگا دەدرا رۆح ئەچووە کونەلوتمان، کە دەرگامان ئەکردەوە ماڵی کاك (رەحیم)ی دراوسێمانە هاتوون بۆ (شەونشینی‌و سەردان)، ئەو ماڵانەی کوڕیان دژی (بەعس) لەدەرەوە بوو زۆر دڵیان بەیەکتر ئەکرایەوە.. سەردانی یەکتریان ئەکرد لەهەواڵ‌و بارودۆخ ئەیانکۆڵییەوە.

---

[1] نامەی پێشمەرگەکان بۆ کەس‌و کاریان بەمنداڵاندا دەگەیشتە شار، بەڵام لەلایەن رژێمەوە ئەوە ئاشکرا بو، پاشان نامەیان جوان دەپێچایەوەو دەیانخستە ناو مەنجەڵە ماستەوەو بەرەو شار ئەهات.

بەڕێزەکەم:

ئەو کاتانە وابو هەر ماڵێك (کوڕ) یا (برا)یەکیان لەدەرەوە (پێشمەرگە) بوایە نانێکی ئیسراحەتیان ناخوارد، کەس‌وکار لەهەموو لایەکەوە لێیان لا لوت ئەبون، ئەزانی بۆچی؟ نەوەك شەوێك لەماڵی ئەو کەسە بمێنیتەوە: تۆ جێگەی ترسیت.

ڕۆژە خۆشەکان زۆر کەمبون، چەند ڕۆژێکی لێڵو تاریك ئاسۆی ژینیان گرتم، ڕۆژێکیان گەڕامەوە بۆ ماڵ یەکێك لەمنداڵەکان وتی: باوە.. کاك (جەلال)ی موختار هاتبو ئەیوت: باوکت کە هاتەوە سەرێکم لێبدات.

بەبیستنی ئەم هەواڵە جەرگو دڵم بەربۆوە.. لەناخی خۆمدا هەستم بەترسێك ئەکرد! وتم:

- تۆ بڵێیی لاوکی کوڕم گیرابێت؟
- ئەبێت لاوك شەهید نەکرابێتو ئەم زانیاری پێگەیشتبێت؟
- ئەبێت موختار منی بۆچی بێت؟

ئەمانەو چەندینی تریش بەهزرو بیرمدا تێپەڕین.. نانم بۆ نەخورا، بەرچاوم تاریك بو، خێرا خۆم گەیاندە ماڵی موختار، کاك جەلالی موختار: کاکە برا، گیانەکەم لە (دائیرەی ئەمنی سلێمانی)یەوە بانگیان کردومو وتویانە: کوڕی کاك (فەریق) پێشمەرگەیە.. ئەبێت بەئەزیەتی ئەزانێت بەیانی سەردانێکی (دائیرەی ئەمن) بکەیت، خۆشم لەگەڵتا دێم مەترسە.

تفێکم قوتداو بەزۆر زەردەخەنەیەکی ساردم خستە سەر لێوەکانم وتم: جا کاکە جەلال گیان من چیم دەسەڵاتە.. کوڕی ئەمڕۆژە چی بەقسەی باوکیان ئەکەن؟

وتی؛ من ئەمانە نازانم وا پێم ڕاگەیاندی.. ئەبێت هەر بچیت، ئەو شەوە نازانم چۆن ڕۆژ بۆوە.. بۆ بەیانی بەرەو (دائیرەی ئەمنی سلێمانی) بەخوێندنی هەزار دوعاو ئایەتەلکورسی لەگەڵ (موختار) ڕۆشتم.. ڕۆح لەجێگەیەکی سەختەو دەرناچێت؟ سێ کفنم زەردکرد.. ئەژنۆو قاچەکانم هێزی جوڵەو هەڵگرتنیان نەما..

گەیشتینە دائیرەی ئەمنەکە، زۆر (بەڕێزو ئیحترام)ەوە بەخێرهاتنیان کردین، پاشان چوینە ژورێکی تر، ئیتر موختار نەهات، تەنها مامەوە لەناخەوە دەترسام.. بەڵام وام دەرنابڕی کابرایەکی قەڵەوی ڕەشتاڵەی چوارشانە لەسەر مێزو کورسیەك دانیشتبو پیاوێکی وەرگێڕی بانگ کردو لەلامەوە دانیشت، ژورەکە بۆنێکی خۆشی لێئەهات، تاقمە

قەنەفەی تازە، دیوارەکان بەچەند تابلۆیەك رازێنرابونەوە لەسوچی هەر تابلۆیەکەوە ناوی کوردێکی لەسەر بو کە هەدیەی مدیر ئەمنی کردبوو، وێنەیەکی گەورەی (صدام حسین)ی گەماڵە دیکتاتۆر هەڵواسرابو، نازانم بۆ ئەبێت هەمو دیکتاتۆرێك وێنەی لەهەمو شوێنێك هەبێت، ئەمە یاسای دەولییە یان بەزۆر یان خۆشەویستی..

بەیەکەم وشەی عەرەبی بەخێرهاتنی کردمو گۆمی بێدەنگی شڵەقاند، خۆم عەرەبیم باش دەزانی بەڵام وا خۆم نیشاندا کە عەرەبی نازانمو پێویستە وەرگێڕ بۆم وەربگێڕێت.

پاشان بەپێکەنینێکەوە وتی: بەرێزت باوکی (لاوك)یت کە پێشمەرگەیە؟

وتم: بەڵێ

وتی: لەکوێیە؟ وتم: نازانم! وتی: چۆن نازانیت.. باوکێکی بێرەحمیت.. سەردانت نەکردووە؟!

وتم: نەخێر.. وتی: باش گوێبگرەو سەرپێچی مەکە! وتم فەرمو!

وتی: کوڕەکەت پێشمەرگەیە لەنزیك گوندی (...) لەناوچەی گەرمیان بەیانی بچۆ سەردانێکی بکەو بیهێنەرەوە با ئێمە هیلاك نەبینو ئێوەش توشی ئازارو زیندان نەبن، کوڕەکەشت هەرچی بوێت بۆی جێبەجێ دەکەین، بەدڵنیاییەوە.

وتم: قوربان لەڕاستی قسەکانتان ئەترسم، (تۆزێك هێور بومەوە کە قسەکانی لەوەئەچون کوڕەکەم نەکوژرابێت).

وتی: ئەو ئاوێنەیە ئەبینی؟ (بەپێکەنینەوە)

بەبێزارییەکەوە وتم: بەڵێ!

وتی: چۆن خۆت دی لەو ئاوێنەیەدا ئاوا کوڕەکەت ئەبینین!

وتم: چۆن؟

وتی: رۆژانە ئێمە ئەزانین لەدەرەوەی سلێمانی چی ئەگوزەرێت.. بەیانی بچۆ بیهێنەرەوە هیچ لەسەر مەڕۆ.. ئەمەش ناونیشانی کوڕەکەتە: دەستێك جلی رەشو کراسێکی بۆری لەبەردایە.. دو برادەری خۆشەویستی لەگەڵدان سەعات (١٠) ی بەیانی دێنە سەر کانیەك لەخوار گوندی (...) یەکەم کەس تا دووەم کەس کوڕەکەی تۆیەو سێیەمیش کوڕێکی ترە.

چەكو تەقەمەنی ئەوەندەو ئەوەندەیان پێیە، بەکورتی هەمو ناونیشانەکەی دامێ.

پاش چەند وتوویژێکی تر لەدوا قسەیدا وتی: ئەبێت هەر بچیت بیهێنیتەوە.. ئەگینا زۆر خراپ خۆت ئەبینیتەوە؟! قسەکانی بەرەو ڕەقیو زبری ئەچون ناچار بەڵێیەکم بۆ کرد.

بەدڵێکی شکاو بەناڕەحەتی هاتمەدەرو گەیشتمە ژوری (ئیستقبال) کە سەیر ئەکەم چی ببینم، ئەو هەمو ژنو پیاوە هەمو بە (تەقریر)ەوە دانیشتونو چاوەڕێی چونە ژورەوە دەکەن (هەمویان سیخوڕ) بوون، هاتمە پرسگەو لەوێوە بۆ دەرگای دەرەوە، لەڕێگای گەڕانەوەمدا هەر کەسێك چاكو چۆنی لەگەڵ ئەکردم وامئەزانی هەر لەگەڵ منیان نیە؟! تاگەیشتمەوە ماڵ.

ماڵو منداڵ بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم، هەر هەمو قسەکانم بۆ گێڕانەوە، دایکی لاوك وتی: (ئۆه خوا دەوامیان نەیات، کوێرو لاڵبن بۆ ئەوەندە رقیان لەکوڕی خەڵکە، خوا فەوتو فەنایان کات ماڵیان ببێتە جێگەپیاز).

ئەو شەوەم بەساڵێك لێ ڕۆیشت، وەی لەدڵی خۆم وەی لەترسی گرتنی کوڕەکەم، وەی لەزاڵمی ئەو کابرای ئەمنە.

بەیانی هەستام لەخەو، دو دڵبوم بچم.. نەچم؟!

ناچار خۆم کۆکردنەوەو بەهەر ئەحواڵێ بو سەیارەم ئامادەکردو بەرەو ئەو ناوچەیەی ناونیشانیان دابومێ کەوتمە ڕێ، لەزاڵگەکان (سیطرة) ڕێگریان ئەکردم، بەڵام نوسراوێکی (مدیر ئەمنم) پێبو.. لەکاتی پێویستیدا دەرم ئەهانیو کارئاسانی بۆ ئەکردم.

ئەچومە قوڵای ناوچەی پێشمەرگەوە بەرەو ئەو جێگەیە ڕۆشتم کە ناونیشانی (لاوك)م لێوەرگرتبو.. کاکی ئەمن چی وت هەر هەموی ڕاست بوو، بەچرکە لادانی نەبوو، جلوبەرگو قیافە خیلافی نەبو، پاش پشودانێکی کەم لەبن دارێکدا لێیان چومە پێشەوە. لاوك بەبینینی من سەرسام بو، دەستم کردە ملیو تێر ئەملاولایم ماچ کرد.. دڵم بۆی پڕ بو لەگریان.. بەڵام خۆم گرتو قسەم نەکرد، یەکە یەکە برادەرەکانی پێناساندم.. لەگەڵ قسەی ئەودا هەمو ناونیشانو ناوی ئەوانم بیر ئەکەوتەوە کە (مدیری ئەمن) باسی کردبوو دایبومێ.

لاوك: باوە گیان خێرە واهاتوی چیت ئەوێ.. هەمو ساغو سەلامەتن؟!

وتم: بەڵێ کوڕی شیرینم هیچ غەمی ئێمەت نەبێت.. ئێمە تەنها غەمو پەژارەی تۆمانەو هیچی تر. ئەی بارودۆخت لەگەڵ هاوەڵانتا.. لەگەڵ شۆڕشدا.. لەگەڵ ئەم دەفەرمدا.. چۆنە چۆن!!؟

وتی: زۆر باشین.. لەهیچمان کەم نیە.

وتم: رۆڵە گیان بۆ شتێ هاتوم.. ناوێرم بیڵێم..؟ یان نەیڵێم!

لاوك: باوە گیان مەترسە ئەم دو برادەرەم زۆر خۆشەویستن.. هەمومان یەکگیانین.. بەیەك کەوچك نان ئەخۆین.. هەرچی نهێنیو بابەتی خۆمان هەیە لەلای کەسمان نامۆ نیە! ئەوانیش وەك لاوك وان بۆ تۆ.. فەرمو بزانم چیت ئەوێ؟

وتم: بەخوا رۆڵەگیان ئەمەیان پەیوەندی بەوانەوە نیە، بابچینە پەنایەك با تەنها خۆمو خۆت بین!

رازی بوو، چەکەکەی هەڵگرتو وردە وردە بەدەم گێڕانەوەی چەند یادگارییەکەوە لەوان زۆر باش دورکەوتینەوە.. چوینە ژێر دار بەڕوارێکی گەورە کە بەگەڵا سەوزەکانی سێبەری بۆ زەوی کردبو، بەهەمو لایەکدا ئاوڕم دایەوە دەستم کردە ملە قوتێ..

لاوك: ئەوە چیتە بابە گیان.. بۆ وا ئەترسی؟ هیچ رویداوە؟

وتم: سەگی سەگباب ئەوەندە شت رویداوە تۆ بەخۆت نەزانیوە.. هەستە بابڕۆینەوە، واز لەکوردایەتی بێنە.

لاوك: بۆ باوە.. بۆ وات لێهاتووە.. خۆ کەسوکارمان نەگیراون؟!

وتم: جا ئەمڕۆ نا سبەینێ.. تۆ لێرە بیتو خەڵکی جاسوسی بکەن هەر ئەگیرێین!

لاوك گاڵتەی بەقسەکانم ئەهات.. (هەتیوە کەرە جوان گوێم بۆ شلکە ئەوسا بەڵێنی خۆت بدە، دڵنیام کە لەگەڵما زۆر بەناسانی دێیتەوە).

لاوك: باوە گیان قەت وام لەتۆ رانابینی بەم شێوەیە بڕوا بکەی، فەرمو.

هەمو کەسێك دەزانن تۆ پێشمەرگەی، دوێنێ (مدیری ئەمنی سلێمانی) بەموختاری گەڕەکەکەی وتبو کە باوکی لاوك دەبێت بێت بۆ لام.. هەتا چومە لای سێ کفنم زەرد کرد.. رۆڵە گیان ئەو خەڵکە هەموی بونەتە پیاوی حکومەت، مدیر کە منی بینی لەبەرم هەستاو رێزی تایبەتی لێگرتمو زۆر قسەی نەرمو گەرمو خۆشی بۆ کردم.

لاوك: جا ئەوە سروشتی ئەوانە، تا بکەویتە ئەم واقعەوە.. ئەگینا درۆ ئەکەن.. پیاو خراپن.

باوك: دە کەرە کەر بزانە چی ئەڵێم.. ئاخر سەری خۆت و ئێمەش مەکە بەقوڕا.. رۆڵە گیان کابرای ئەمن هەمو شتێکی بۆ باسکردم.. ئەم جل و بەرگانەی تۆ.. ئەم چەك و تەقەمەنی و ئەم هاوڕێ و جێگەیەش.. هیچی نامۆ نین.. ئەگینا منی سەرگەردان چوزانم ئێستاو بەم شێوەیە تۆ لێرە ئەبیت.. وەرەو وەك پیاوی مەرد واز لەو نامەردانە بێنە، وەرەو کاسبی خۆت بکە.. چیت داوە لەم کرێکارییە بەلاشە.. دڵنیابە هیچت لێناکەن.. گرێنتی تۆیان پێداوم.

رۆڵە گیان لاوك.. دایکت و کەس وکارت کۆڵیلت بۆ ئەکەن، ئاخر لەسەرچی و لەبەرچی ئەم تەمەنە جوانەت وەك ئاژەڵی کێوی بەم شاخ و داخانەوە بەسەر ئەبەیت و قوڕە بەسەر لاوێتی و تەمەنی ئێمەشدا ئەکەی.. تاکەی بەدیار چڵکاوی پیرێژنێکەوە دائەنیشی.. وەرەوە ناومالّ و کام جێگەو کام خواردنەی خۆشە بیخۆ.. کوڕم دنیا وا نییە وەك تۆ لێیحاڵی بووی.

باوە گیان دنیاو کوردایەتیش زۆر لەوە گەورەترە کە تۆو کەسانی تریش لێیتێگەیشتون، گوێی مەدەمێ.

لاوك گیان رەحم بەم لەش و لارو جەستەو تەمەنەی باوکت بکە.. با لەبەر تۆ لەروناکی خۆر بێبەش نەبین.. با لاشەو ئەندامی خوشك و براکانت نەکەونە بەر چزەی شەلاقی ئەو بەعسیە بێویژدانانە.. رۆڵە لاوك (کوردایەتی.. پێشمەرگایەتی) هەموی فشەیە.. هەموی درۆیە.. ئەوانەی لەگەڵتن هەمویان خیانەتکارو سیخوڕو ناپیاون.. تۆ لەگەڵ ئەوان مەژی.. دەستی کردە گریان.

باوە گیان هەزار ئەوەندە بگریت و بلاڵێیتەوەو قسەی رەق و نابەجێ بۆ من بکەیت وا ئەزام مێشێکەو بەلای لوتما ئەڕوات.. پاشان تۆ منت بۆ کوردستان گەورەکردووە کوردستانیش تۆی لەسەر لاشەی خۆی گەورە کردووە. ئەو رێگەیەی من هەڵمبژاردووە رێگەی (شەرەف و ویژدان و سەربەرزی و کوردانەو مەردانەو هەمو سیما پاکەکانی پیاوی چاکە) من پەشیمان نابمەوە.. پەیمانم بە کوردو کوردستان و بەخاك و خوێنی شەهیدان داوە یا من یا ئازادی کوردستان.. یا نەمانی دوژمنان.. چونکە کەم ژیان و کەڵ ژیان دروشمی هەمو لاوێکە خۆی بکاتە گوڵاڵە سورەی ئەم باغە جوانەی کوردستان.. دوژمنوا لەمل شکان و لەناوچوندایە.

رۆڵە گیان ئەوان هەر لەئەستوریدان.. ئەمانی چی؟!

نا بابەگیان غەدر لەئەستوری ئەچرێت.. بابە گیان دڵنیابە سەرکەوتو ئەبم.. یا بەرگی من ئاڵای سەرکەوتن ئەبێت.

رۆڵە گیان شتم زۆر بیستووەو هەمووشی راست بوون یەك قسەی ترت بۆ ئەکەمو خوات لەگەڵ..

فەرموو بەڵام دڵنیابە کە نایەمەوە.

باوك سەیرێکی ئەملاولای کردو تۆزێکی تر چووە پێشەوە لەلاوك بەچرپە وتی: کابرای مدیری ئەمن لەکوێ ئەزانێت تۆ ناوت (لاوك)ە؟ لەکوێ ئەزانێت تۆ ئەم دوو هاورێیەت هەیەو بەم هەموو ناونیشانە راستەوەی کە بەمنی دابو؟

لەکوێ ئەزانێت کە تۆ لەم ناوچەی گەرمیانەدایت؟ چۆن ئەزانێت لەچ کاتو ساتێکدا پەیتە سەر ئەم کانییە؟ بەچی ئەزانێت لەماوەی ئەم هەفتەیەدا چەند چالاکیتان کردووەو ناوو کاتو جێگەو ژمارەی پێشمەرگەو هەموو ئەو وردەکارییانە دەزانێتو بۆی باس کردووم؟

چۆن زانی چەند چالاکیتان سەرکەوتو بووەو دەستکەوتتان چی بووە چەندی ترتان تێکشکاون؟ رۆڵەگیان بیرکەرەوە.. ئەم کارەی تۆ ئەیکەیت تەنها خۆ تراندنەو هیچی تر.. رۆڵە بەدەنگە زوڵاڵەکەی (فەرهاد[1]) تێمەگەوە.. رۆڵە رۆژێ دێت ئەوان ئەگەنە جێگەیەکی گەرمو پڕ لەهەموو نازو نیعمەتێك تۆش دەبیتە خۆراکی خاكو برادەرەکانیشت رەنگە لاشەکەشت هەڵنەگرنەوە. لاوك ئامان بەقسەم بکە ئەم شۆڕشە ئەو ئاسۆ رونو گەشەی نییە کە تۆ بۆی ئەڕوانی، لاوك ئەی هاوار.. کەی لەقسەکانم تێئەگەی؟

لاوك سەیرێکی باوکی کرد.. رەنگی روخساری باوکی شێوابوو هەناسە لەقەفەزەی سییەکانیەوە بەپەلە ئەهاتنە دەر.. بەپشتێنەکەی دەمو چاوو روخساری سڕی..

---

[1] بێژەرێکی ئەو کاتەی رادیۆ بوو کە زۆر بەجۆشو خرۆشەوە چالاکیو رووداوەکانی باس ئەکردو هەر کەسێك یەکجار گوێی لەو بوایە بۆ رۆژی دوایی رادیۆی ئەکرد‌ی‌و تامەزرۆی هەواڵەکان دەبوو ئێستاش ناوبەناو لەئەرشیفدا ئەو دەنگە لێدەدرێت، بەڵام کوردستان لەدەنگو رەنگی بێبەشە، چونکە لەهەنەرمەندانە حەیاتەکە ژیان بەسەر ئەبات.

لاوك بەسەرسامیەوە وتی: باوە گیان.. بەم نارەحەتیەی تۆ هیچ نیگەران نیم.. ئەمە جۆرێکە لەفێڵو تەڵەکەکانی رژێمو ئەو حزبە دەسەڵاتدارانەی کە دیکتاتۆریانە حوکمی گەل ئەکەن. بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیارە لای من یەك شتە!! چۆن ئەم زانیاریانەی ئێمە کە زۆر نهێنین.. بەتایبەتی جێگەو رێگەمان دەگاتە دەستیان؟!

باوك وەك ئەوەی نیوە قەناعەتێکی لەکوڕەکەیدا دیبێت وتی: جا رۆڵە لەهەموی سەیرتر ئەیزانی رۆژانە چی ئەخۆن، کێ سەردانتان ئەکات؟ ناوی نهێنیتان.. هەندێك ناوی وت.. لاوك زۆر سەرسام بوو رەنگی تێکچوو بەهێمنی وتی: بابە گیان چیتری باسکرد بۆم بڵێ!

رۆڵە گیان کاك (سەعید) کێیە؟ لەم ماوەیەدا ئافرەتێکی گوندی (..) هانیوە زیاد لە (٥) مەڕی بۆ کراوە بەنانو چێشتو وێنەیەك لەو زەماوەندە لەلای کابرای ئەمن هەبوو.

چەند نهێنیەکی تریشم بۆ باسکرد ئەو هەر تامەزرۆی بیستنی بو پاشان وتی: بابەگیان ئەم سەردانەی تۆ زۆر نهێنی ژیانی فێرکردم.. فێری کردم ئیتر چۆن کوردایەتی بکەم فێری چاوکراوەیی متمانە تەنها بەخۆبونی کردم، راستیان وتووە (دایكو باوك بۆ رۆڵە وەك ئاوو خاکن بۆ رووەك) بابە یەك پرسیاری ترت لێدەکەم بەس بەو شێوەیەی دەیزانیت لەسەر زاری مدیری ئەمنەوە ئاوا وەڵامم بدەرەوە؟

لاوك ویستی پرسیارەکە بکات، بەڵام دەنگی یەکێك لەهاوەڵەکانی هات.. کاك لاوك.. کاك لاوك.. کات درەنگە بابگەڕێینەوە.. باوکیشت با لەگەڵمان بێت بۆ سەرەوە.

خێرا لاوك بەرەو سەرچاوی دەنگەکە تاوی دایە خۆیو رۆشت لەمن ونبوو.. پاش چارەکە سەعاتێك هەردوو برادەرەکە لەگەڵی هاتنو کەوتن بەسەر دەستو پێمدا.. بەلامەوە سەیر بو.. ئەوە چییە کاکە.. بۆ وائەکەن؟!

یەکێکیان وتی: کاك لاوك ئەڵێ باوکم هاتووە بەدوامداو فشارێکی زۆرمان لەسەرە لەلایەن دائیرەی ئەمنەوە جا لەگەڵ باوکم ئەڕۆمەوە.. توخوا کاکە گیان ئەم کوڕە گەنجە مەبەرەوە.. زۆرمان لەلا گرانە.. شۆڕش تینوی ئەم لاوانەیە.. تو کوردستان.. تو خوێنی شەهیدان.. تو مەبەدەنت.. کاری وا نەکەی، بەرۆشتنی ئەو کەلێنێکی گەورە ئەبێتە کارەکەمانەوە.. کاکە لەجیاتی لاوك یەکێکی ترمان بەرە.. بەهەردوکمان بەهێنەدەی کاك لاوك چالاك نین.

بەم قسەیەیان پێکەنینم هات.. زۆر داکۆکیان کرد من باکم نەبوو. وتم: زۆر ئاستەمە گەڕانەوەم بەبێ ئەو.. زۆر خۆم لەشۆڕش و ئێوەش خۆشتر دەوێت.. هەر دەمینەمەوە..

کوڕەکەم دوو گەنجەکەی بردە پەنایەکەوە پێیوتن:

ئێوە چەکەکانتان فڕێ دەن و بەپێخاوسی و بەگریانەوە دوا باوکم بکەون و بڵێن ئێمە لەگەڵت تا شار دێینەوە.. ئێمە هەموو شتێك ئەکەین بەو مەرجەی لاوك نەگەڕێتەوە..

بەڵێ بەقسەیان کرد.. چەند مەترێك لێم نزیکبوونەوە تا هاتنە بەردەستم.. لاوك هاواری کرد نەجوڵێن هەر ئێستا هەردوکتان ئەکوژم وەك پیاوێکی جەربەزە لێیان هاتە دەست.. خۆی لێ توڕەکردن..

میلی کلاشینکۆفی لێڕاکێشان.. هاواری کردە من.. بابەگیان وەرە ئەملاوە ئێستا وەك سەگ ئەیان تۆپێنم.. خۆت لایە دەست هەڵبڕن دوو هاوڕێکەی زۆر بەسەرسامیەوە هەردوو دەستیان هەڵبڕی و جوڵەیان نەکرد..

باوە گیان وەرە ئەم دووتفەنگە بگرە.. ئەو دەمانچەیەش فڕێدە.. کاکی خۆشەویستم..دەمانچەیەك بەقەدی یەکێکیانەوە بوو فڕێیدا.. ئەومیش هەلگرە بابەگیان.. وەرە پێشەوە ئەو دوکەرپیاوەش بپشکنە.. ئەمانەی تۆ باسیان ئەکەیت تەنها ئەم سێ کەسە ئەیزانین یا منم یا ئەم دووانەیە.. دڵنیابە من شیری پاك و پارەی پاکی تۆ پەروەردەی کردووم شتی وا لەچارەم نەنوسراوە.. ئەم دوانە ناپاك و سیخوڕن.

دوو برا پێشمەرگەکە زۆر تێکچوون هاواریان لەلاوك کرد.. چییە لاوك سیحرت لێکرا.. تێکچووی.. کاك لاوك ئێمە هاوڕێی سەنگەرین ئێمە هاوڕێی گیانی بەگیانین.. ئێمە هاوڕێ و هاوڕازو هاوکاری یەکترین.. ناپاکیمان دەرهەق ئەکەیت ئامان بەقسەی باوکت ئەکەیت.. کاك لاوك هاوار.. بۆ واتلێهات.

کوڕەکەم وتی:

هەر ئێستا ئەتانکوژم.. باوکە ئەولایان لێبگرە من ئەزانم مەسەلە چییە!

بەم قسانە بێت هاوڕێکانی لاوك چەندە دێرینن ئەوەندەش جاسوس بون.. ئێوە کوردایەتی ناکەن ئێوە ناپاك و سەرشۆڕن.. خێرا راستی بڵێن، یەکێکیان وتی: کاکە لاوك هەردەم تۆ برا گەورەبویت.. هەموو کات تۆ دڵت زیاتر بۆ کارەکەت سوتاوە.. تۆ یەکێك بوی لەو شۆڕشگێڕانەی ئێمەشت فێری کوردایەتی کرد..تۆ ئاسۆیەکی گەشت لەپێشە لەم ساتەدا نابێت ناپاکیمان لەگەڵ بکەیت.. ئەوە پلانی دوژمنانە.

ئەوەی تریان کە زانی وەزعیان لەباشی نابێت وتی: کاکە لاوك خۆمان چاك ئەکەین ئەم جارە لێمان ببورە!

لاوك: یەعنی ئەوەی باوکم ئەیڵێت راستن.. ئێوە ناپاکن؟

یەکێکیان وتی: نەخێر.. بەڵام.. نەیوێرا قسەکەی تەواو بکات!

لاوك وتی: هەر ئێستا خۆتان رووت و قوت بکەنەوە.. باوکە چاودێرییان بکە.. پارچە پارچە جل‌وبەرگەکانتانم پیشان بدەن (کوڕانی تەنگانە.. ئەم کوردستانە چاوەڕێتانە!)

یەکێکیان هیچ چارێکی نەماو سەیری برادەرە پێشمەرگەکەی تری کردو ناچار پارچە پارچە جل‌وبەرگەکەی دانا.

باوکە گیان جوان دەست لەجل‌وبەرگەکانیان بدە.. بزانە هیچیان پێیە؟

دەستم لەشرواڵەکەی دا سەرەکەم گیرفانێکی بچوکی نهێنی زۆر باشی بۆ دروستکراوەو جیهازێکی بچوکی تیایە.. وەك (موبایلی) ئێستا، ئەی خائینانە ئەمە چییە؟

لاوك: مەرحەبا.. هاوڕێی سەنگەر.. ئەمە کاری کێیە؟ باوکە زۆر راست ئەکەی ئەمە جاسوسە.. جاسوس.. ئەوەی تریان خۆی روتکردەوە.. ئەمیان لەچرچی شرواڵەکەیدا چەند نامەیەکی نهێنی تیابوو کە فریای گەیشتنی نەکەوتبوو.. ئەمەیان جیهازی پێنەبو، بەڵام کوڕەکەم وتی: کوڕی باش ئەو پشتێنەت بەرە دەست باوکم.. پشتێنی جلی کوردی چەند مەترێ نەبوو.. لێم وەرگرت لەگەڵ وەرگرتندا هەستم بەقورسیەك کرد.. لەپشتێنەکەدا قەف قەف دەستم لێدا تا گەیشتە بەردەستم.. سەیرە ئەمە چییە؟

بابە دوژمنان هەموو کات راست ئەکەن، بەڵام خۆمان فێری خۆمانیان ئەکەین گەر ئێمە خۆمان خەفە نەکەین کابرایەکی ئەمن چوزانێت ئێوە ئەمە کارتانە.. توخوا عەیب نییە بۆ ئێوە.. روو رەشبن.. حەیاو ناموسی ئەو کەسانەشتان بردووە کە بەپاکی کاردەکەن کوڕوکەس‌وکاری ئێمەتان شەرمەزار کردووە.. بابە ئەمانە خوڕەی شۆڕشن.. ئێستا بەسزای گەل‌و شۆڕشیان ئەگەیەنم.. هاواریان کرد.. کاکە لاوك.. نامان.. ئێمە کردمان بێگانەپەرستی تۆ برای چاکبە لەگەڵمان.. دڵنیابە ئیتر سیخوڕی ناکەین.. رویان کردە یەکتر هەتیو چەندم وت با کاری وانەکەین.. تۆ وتت کێپێمان ئەزانێت.. ئەوەی تریان وتی چاوت لێیە کاکی ئەمن کاری پێمان نەماوە، بۆیە ئاوا حەیای بردین.. زۆر لۆمەی خۆیان کرد، بەڵام لاوك هەنگاوی نا بەسەر لاشەی شەلاڵی خوێنیانداو دوو تفی

لێکـردن.. ئـارەقی نەوچـەوانی سـڕی‌و وتـی: بابـە گیـان ئـەو دەمانـچەیەم بـەرێ قـژی درێژیانی خەڵتانی خوێن کرد.. کەرەسەکانی کۆکردنەوەو ئاورێکی لێدامەوە.. بابە گیـان زۆر سـوپاس بـۆ هەوڵەکـەت.. کـە گەڕایتـەوە زۆر سوپاسـی (مـدیری ئـەمن) بکـەو چاوی خوشك‌و براکانم ماچ ئەکەم دەستی دایکم ماچ ئەکەم خوات لەگەڵ.

سـەیری بـاڵاییم کـرد تـا لەچاوم ون بـوو.. ئـاهێکم هەڵکێشا.. بەلامـەوە سـەیر بـوو کوڕێکم پەروەردەکردبێت لەبەرچاوی خۆم دوو مـرۆڤ بێگیـان بکات.. بـەڵام حـەقی بـوو هـەر کەسـێك لەبـچوکترین خیانەتـەوە تـا گـەورەترین خیانـەت ئەمـە ئاکـامی ئـەبێت.. بەدەستی بەتاڵ گەڕامەوە شار.

لـەدەرگای ماڵمـداو چـوومە ژوورەوە ئەنـدامانی خێـزان بـۆ کەسـێکی تریـان ئـەڕوانی، بەڵام دڵنیام کردن کە (لاوك)م دیوەو بەقسەی نەکردووم‌و گەڕاومەتەوە.. ئەبێت خۆمـان بـۆ هـەموو شتێك ئامادەبکـەین لەلایـەن ئـەو دڕندانـەوە.. ئێوارەکـەی نـان خـورا.. یـەك بەیەك منداڵەکان دەستنوێژم پێشتن‌و قورئـانێکم هـانی‌و هەموویانم سوێند دا کە باسـی هیچ نەکەن ئەگەر لەسەریشیان بدەن.. پاش دڵنیابوون رووداوەکەم بـۆ گێڕانـەوە.. هـۆی ئەم هەواڵ‌و پشێوییەم گێڕایەوە بۆ ئەو دوو جاسوسەی کە لاوك کوشتنی.

چەند رۆژێك تێپەڕی.. شەوێکیان لەنانخواردن بومەوە.. لەدەرگا درا.. کچە گەورەکـەم دەرگای کردەوە هات بەرەنگێکی هەڵبزڕکاوەوە: بابە گیان سەیارەیەکی چەکدار لـەدەرەوە داوای تۆ دەکـەن، خێـرا خـۆم کـۆکردەوەو چـووم بەدەنگیانـەوە: فـەرمون منتـان ئـەوێت، یەکێکیان وتی: باوکی لاوك تۆیت؟

بەپچڕ پچڕی وتم: بەڵێ.. بە..ڵێ

دە فەرمو سەرکەوە لەگەڵماندا، فریای خواحافیزە نەکەوتم ئاورێکم دایـەوە کـە سـەیر ئەکـەم سـەربان‌و سـەردیوار هـەموی چـەکدارە.. حەوشـەکە پـڕ بـو لـە (ئـەمن‌و ئیستیخبارات‌و قوەت خاسەو قوە تەواری)..

کچەکەم بەدەنگی بەرز هاواری کرد: (بابە گیان خـوا حـافیزت بێـت، توخـوا...) فریـا نەکـەوت قـسەکەی تـەواو بکـات بەقۆناغـە تفـەنگێك بێـدەنگیان کـرد، لەگـەڵ سواربونی سەیارەدا چاوەکانم تاریـك داهـات دەسـتەکانم لەیـەك تونـدبون هـەزارەها بیروبۆچوون‌و هەواڵی سەیرو سەمەرە بەمێشکمدا گوزەریان دەکرد.. هەستم کرد لەسـەیارە تێزڕەوەکـە دابـەزیم‌و دەسـتیان گـرتم چـەند هـەنگاوێك رۆشـتین هەسـتم بـە (قادرمـەو لوسـی

زەویەکەی ژێر پێم) نەکرد.. لەدڵی خۆمدا وتم: (ئێی کاکە لاوك ئەمڕۆ منو سبەینێ دایکتو دوو سبەی براو خوشکە جوانەکانت.. ئەم کافرانەش وەك درندەی برسی.. خوایە بەگەورەیی خۆت رەحممان پێبکەیت..) کاتێکم زانی وەستێنرام.. چاوم کرایەوە.. دەستم شل بو خۆم لەبەردەم کاکی (مدیری ئەمنی گشتی)دا بینیەوە.

سلاو ئەبو لاوك ئێستا چۆنی.. سەفەرەکەت کرد؟

زۆر بەبوێرانەوەو بەزەردەخەنەیەکەوە: سلاو رەییس.. لەخزمەتدام

بردمیانە ژوورەکەی خۆیو بەیەکەوە دانیشتین.. بانگی چاو ساردەمەنی کرد.. چەند ساتێك بێدەنگی ژوورەکە گوێچکەکانی دەزرنگاندەوە.. لەپڕ مدیر وتی: ها باوکی لاوك سەردانەکەت چۆن بو.. بۆمان باس بکە! بەڕاستیو بێپێچوپەنا.. چونکە هیچ لەئێمە شاراوە نییە! خەریك بو بڵێم نەچوم.. بەلام من کەسێکی راستگۆم.. هەرچی ئەبێ بابێت! لەنوکەوە بۆم باسکرد.. تفم قوت دەداو هەستم بەگۆڕینی رەنگی دەموچاوم ئەکرد،.. کاکی مدیریش هەردوو دەستی خستبووە ژێر چەناگەیو چاوە زەقەکانی تێبڕیبوم.. کاکی وەرگێڕیش دەیکردە عەرەبی بۆی یەکێکیش لەولاوە ئەینوسی.. چەند لاپەڕەیەك رەش کرایەوە.. لەشوێنێکدا قسەکەم گۆڕی مدیر بەنوسەرەکەی وت: خەتێکی سور بەژێر ئەم قسەیەدا بێنە!.. بۆچی گەورەم باوکی لاوك قسە مەکەو بەردەوام بە.

گەیشتمە باسی کوشتنی دوو پێشمەرگەکەو گەڕانەوەم بەدەستی بەتاڵ مدیر ئاهێکی هەڵکێشا:

بەم کارەمان زەرەرێکی زۆرمان لێکەوت، بەلام گرنگ نییە گرنگ ئەوەیە کوردێك کەم بێتەوە، ساتێك تورەبوونی خۆمم خواردەوەو مدیر روی تێکردم: ئەی بۆ زوو سەردانت نەکردین.. هەر ئەبێ بێین بەدواتا.

بەهەر جۆرێك بو هێزم دایە بەر خۆم: روم نەهات بەدەستی خاڵی.. پاشان ئەوەی ئێوە داواتان کرد من نەمتوانی جێبەجێی بکەم!

مدیر زەردەخەنەیەکی ئاگراوی کرد، لەسەر کورسییەکەی هەستاو هاتە تەنیشتمەوە دانیشت: ئەمانەی باست کرد هەموی راست بون تەنها ئەو رستەیە نەبێت..

چۆن ئەزانی؟

روی کردە وەرگێڕ: لەوساتەوەی تۆ گەڕاویتەوە شار بچوکترین هەواڵ تا گەورەترین چالاکی بەدەستمان ئەگەیشتووە لەو ناوچەیەوە، ئەتوانم بڵێم لەروی ئەزیەتو

ماندوبونەوە ئێمە کەوتینە ئیسراحەتەوە، چونکە (جیهاز لەسەر جیهاز نەکرا: ژمارەمان نەوەندە کەسە.. مەبەستمانە لەفلان جێگە چالاکی ئەنجامبدەین.. کەسەکان بەرگیان لەو جۆرەیە.. شێوەیان ئاوایە).

یان ئەمڕۆ لەفلان جێگەوە چالاکی ئەکەین‌و دەگەینە شارۆچکەی (چەمچەماڵ) لەرێگەی گڵەوە لەدوری رێ (٥) کیلۆمەتر هێزتان ئامادەکەن.. یەکەم‌و چوارەم کەس مەکوژن ئەوانی تر قەلاچۆکەن.. هەندێکیان راست ئەبون.. هەندێکیان تەنها هیلاکی‌و سەریەشەمان بۆ ئەمایەوە لەو کاتەوە هەمومان کەوتینە ئیسراحەتەوە.. زۆر سەیرم بەقسەکانی ئەهات.. جاسوس دروستکردن هەروا ئاسانە.. ئەی بۆ ئەم کارمیان ئەنجامدا؟!

پاش قەدەرێك لەتێرامان وتی: حەزت لەئازادییە وتم: ئەوەی ئازادی بێت‌و بۆ کەس پێویست بێت هەیە.. مەگەر کەسێك عێراقی نەبێت.

سەیرێکی وەرگێڕی کرد: باوکی لاوك ئەتوانیت بڕۆییت، بەلام خۆزگە کوڕەکەت بەقسەی ئەکردییت.. پاش چەند چرکەیەك بەسەیارەیەکی خۆیان هاتمەدەر لەدائیرەی ئەمن‌و لەنزیك ماڵی خۆمان دایان بەزاندم.. لەماڵدا کشوماتی میوان بوو هەناسەکان بۆنی بێئومێدیان لێدەهات.. چاوەکان چاوەڕوانیان لێئەتکا.. رۆژگارەکان تێپەڕین.. لاوکی بالابەرز بەهێزێکی زۆرەوە ساڵی ١٩٩١ هاتەوە ناو شار.. لاوك پاکی خۆی سەلماند.. لەهەموو روبەڕوبوونەوەکانی دوژمنی بەعسدا بەشداری کرد، بەچاوی پڕ هیواوە ئازادی دی، بەلام مەخابن گوللەی براکوژی سینەی لاوکیان پێکاو لەئارامگای سەیوان ئارامی گرت.

خوشکەکانی، منداڵێکی چاوگەشی دڵپڕ هیوای، هاوسەرێکی گەنجی شەرمن، لەبەرگی رەشدا رۆژگارە تاریکەکان بەسەر ئەبەن.. بەڵێ بەرێزەکەم.. بەم کارانەی داگیرکەران زۆر وانەی رابردوومان بۆ رون ئەبێتەوە.. بەم کارانەی ئێستاشمان زۆر رۆژگارمان دەبێتە شێوان ئاسا.. جاسوس لەهەمو ناوچەو دانیشتن‌و کۆڕو کۆمەڵێکدا هەیە!!

لەسەرەوە لەتۆ دڵسۆزتر، لەژێرەوەش لەمن‌و تۆ جاسوسەو خیانەتکارە..

شاراوە نەبێت لات زۆر رۆڵەی بەنەمەکی ئەم شارە تا ئێستاش باوك‌و دایکیان چاوەڕوانی دیداریانن.. دڵیان بڕوایی ناهێنێ دینارێکی شەهیدانەیان وەرگرن! زۆریان تەمەنی لاویان بۆ کورد خەرج کرد، کەمئەندامبوون.. کوردیش لەبازاڕدا تەنها (یەك پەنجا)یی لەم چاپە نوێیە هەڵدەداتە بەردەمیان.

لەکۆتاییدا.. سڵاو لەو دایکەی رۆڵەی بەهەزاریو نەداری پەروەردە کرد.. بەهەزار کزە کز خوێندنی سەرەتایی پێتەواوکردو کردیە قوربانی بۆ کوردو کوردستانی ئێستاش شۆڕشو کوردی تازەپیاکەوتوو بەری رەنجی ئەخۆنو ناتوانن تەنها خانویەك بکەنە دیاری دەستیان بۆ ئەو دایکە پرچ سپییە.

سڵاوی وەفاداری لەو ئافرەتە خاوەن هاوسەرە شەهیدەی کە لەبەر ناشرینی روخساری دەرگای دەزگاکانی بەسەردا دادەخرێت لەژوورەوەش گوێی لەقاقای ئەو ئافرەتە خاوەن مۆدیلەیە کە لەگەڵ هاوڕێی هاوسەرەکەیدا زۆر بەکەیف سازییەوە لەتاسەوە ئەچن، بەپارەی مۆڵ ئەوروپا ئاسا مێز ئەڕازێننەوەو بەخۆشییەوە رائەبوێرن.

سڵاو لەو منداڵە بێباکەی باوکی بووە شەهیدی رێگای شۆڕشی کوردو کوردستان ئێستاش چاوە چاویەتی بۆیاغی پۆستاڵی پاسەوانەکانی دەرگای ئەو فەرمانگەیە بکات کە سەرۆکی فەرمانگەکە لەشۆڕشی شاخدا هاوڕێی باوکی بوو.

سڵاو لەو شۆڕشەی گەل کردیو زۆر بەکەمی گەل بەرهەمەکەی ئەخوا.. سڵاوی خۆشەویستی لەو کەسانەی بەچاکیو بەپاکی پەیامی کورد ئەگەیەننە دۆستی کورد.. هاوڕێی کورد.. دور لەرو پامایی.. دوبارە سڵاو لەو پێنوسە پاکانەی بەپاکی کارو پرۆژەو دوارۆژی گەل ئەنەخشێنن.

بەڕێزەکەم هیوادارم کەم تا زۆر لەچێژو ئاکامی ئەم چیرۆکە واقعیە تێگەیشتبیو هەناسەکانت ئاسودەیی لەئاسۆیەکی رون لەچیای خاوەن بەفرو هەڵۆی سپیەوە ببینن.

# بەندیخانە لەماڵی باوکم خۆشترە

و/ عبدالقادر علی

داڕشتنەوەی/ م. ئاوات

یەکێك لەمامۆستایانی خانەی تایبەت بە (نەوجەوانان ـ مێردمنداڵان) لەبەندیخانە کە کاری ئەم دەزگایە بریتیە لەراستکردنەوەی هەڵوێستی (نەوجەوانان) لەو تاوانو خراپەکاریانەی دوچاری دەبن، بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

یەکێك لەسەیرترین حاڵەت کە لەبواری کارکردنمدا روبەڕووی بوبمەوە، بریتی بوو لەکوڕێکی نەوجەوان تەمەن ۱۳ ساڵە کە بەتۆمەتی بەدڕەوشتی گیرابوو، دوای ئەوەی کە ماوەی بەندیەکەی تەواوکرد، چوم بۆ لای پێموت: تۆ هەفتەی داهاتوو بەر دەبیت بۆیە پێویستە کەسوکارت ئامادەبن بۆ ئەوەی (کەفالەت) یان لێومربگیرێت.

کەچی ئەو لەوەڵامدا دەستی کرد بەگریان.. منیش یەکەمجار وامزانی لەخۆشیا دەگری بەوەی دوای هەفتەیەکی تر ئازاد دەبێتو بەکەسوکاری شاد دەبێتەوە، بەڵام گریانێکی زۆر گریا، رەنگی تێك چوو، زانیم کە کارەکە بەم جۆرە نییە بۆیە بردەمەلاوە، پرسیارم لێکردە: بۆچی هێندە دەگریت؟

وتی: نامەوێت بەندیخانە بەجێبهێڵم حەز دەکەم بمێنمەوەو بەر نەدرێم.

هەرچەندە ئێرە بەندیخانەیە کەس تیایا ئازاد نییە، بەڵام بڕوا بکە زۆر لەماڵی باوکم خۆشترە.

وتم: بێگومان تۆ هەڵەیت، چونکە هیچ ماڵێك هێندەی ماڵیٚ خۆت خۆش نییە کەسیش هێندەی کەسی خۆت دڵسۆزت نییە!!

وتی: ئاخر بەڕێزتان ئاگاتان لەماڵی من نییە، ئەگەر ئاگاتان لێبێت هەرگیز وانالێن گوێبگرە بزانە چیت بۆ باس دەکەم ئەوسا خۆت حەکەم بە!

دەستی کردە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیو وتی:

پێش هەشت ساڵ لەمەوبەر دایکم وەفاتی کرد، منو خوشکێکی بەجێهێشت کە ئەو دوو ساڵ لەمن بچوکترە، چەند مانگێکی کەم بەسەر وەفاتی دایکمدا تێنەپەڕی کە باوکم پێیوتم:

(نیازی ژن هێنانی هەیە، باجیم جێگای دایکم دەگرێتەوەو خزمەتی منیشو خوشکە بچوکەکەم دەکات) چونکە منداڵ بوم لەم باسە ناگەیشتم.. نەمدەزانی (باوەژن) چییەو هەڵوێستی بەرامبەرمان چۆن دەبێت، هەفتەیەك بەسەر ئەم قسەیەی باوکمدا تێپەڕیو شایی گێڕا، باوەژنی تازە بەماڵی ئێمە ئاشنابوو، سەرەتا زۆر لەگەڵمان باش بووا ڕێزی دەگرتین، بەڵام وردە وردە بەرەو گۆڕان چوو، لەگلەییو گازندەوە بەرەو هەڕەشەو چاولێسورکردنەوەو لێدانو تەمبێ کردن، ئەو دایکە نوێیەمان بۆ تێرکردنی ئارەزوو گەمەو خۆشی شەوانەی باوکمان بوو، هەر کات باوکم بگەڕایەتەوە خێرا بەرەو پیری دەچوو دەیگوت: ئەزانی کوڕەکەت ئاوای وتو کچەکەت ئاوای کردا

باوکم بەهیلاکی دەگەڕایەوە ماڵ تاقەتی ئەوەی نەبوو گوێ بیستی سکاڵا بێت، ئێمەش بەهۆی ئەوەی کە منداڵ بوین نەماندەزانی بەرگری لەخۆمان بکەین، یان هەر نەیان دەهێشت قسە بکەین، ئیتر باوەژنم خۆیو ویژدانی، چی بۆ هەڵدەبەستین، لەسەرەتاوە باوکم ئامۆژگاری دەکردین، پاشان هەڕەشەی لێدەکردین چاوی سوردەکردەوە، بەڵام دوای ئەوەی سکاڵاکانی باوەژنم زۆر بون لەسەرمان، باوکیشم رەفتاری گۆڕا، فەلاقەو دارکاری کاری رۆژانەی بو لەگەڵمان.

دوای ئەوەی باوەژنەکەم (سێ) منداڵی بوو زۆر خراپتر بوو لەگەڵمان، وردە وردە من بومە خزمەتکارو خوشکەکەشم کارەکەریو ماڵی باوکم.

دەبوایە لەگەڵ خوشکە داماوە منداڵەکەم کاری رۆژانەی ناو ماڵ رابپەڕێنین.. من کەلوپەلی بازاڕم دەکڕیو خوشکەکەشم ماڵی دەسڕیو قاپەکانی دەشتو کاری چێشت لێنانی بەڕێوە دەبرد، منو خوشکەکەم حەسودیمان بەخوشك براکانمان دەبرد کە منداڵی باجیەکەمان بوون، بەوەی قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکرا.. یاریان لەگەڵ دەکرا، جێگای سۆزی باوکمو باجیم بون.

رۆژانە هەندێك شیرینیو گوڵە بەرۆژەو شتم دەفرۆشت، بۆم نەبو وەك منداڵێك تەنها یەك (لوقمە قازی) بخەمە دەممەوە.. خوشکە داماوەکەشم دەستەکانی دەتەزینو سڕ دەبون لەناوی ساردا کە دەهاتمەوە بەدزییەوە ئەهاتە پەنام دەستەکانیم بۆ گەرم

ئەکردەوە بەپەنجە ماندووەکانم فرمێسکەکانیم ئەسڕی منداڵەکانی باجیم بەپەلە ئەم هەواڵەیان ئەگەیاند.. ئیتر ئاسمان بەسەر هەردوکمان ئەڕوخا بەڵێ ئەڕوخا!!

باوکم وای هەست دەکرد منو خوشکەکەم بوین بەبار بەسەریەوە دەبینە مایەی تێکدانی گەشو هەوای خۆشەویستی ماڵ، بەوەی باجیەکەم شکاتی زۆر لێدەکردین، باوکم بەوە تاوانباری دەکردین کە گوێڕایەڵی ناکەین، لێمان ناڕازی بو باوکم دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا نەمابو بۆیە ئازاری ئێمەی ئەدا.

تا باوەژنم لێمان رازی نەبوایە ئەم رووی تێنەئەکردین، یادگاری رۆژە خۆشەکانی دایکمانی لەبیرچوبۆوە.. دایکم ئێمەی زۆر خۆش ئەویست باوکیشم هەروەها..

(بەڵام خۆزگە کە دایك مرد.. منداڵەکانیشی لەگەڵ بخەنە قەبرەکەوە.. چونکە باوکیش دەبێتە باوەپیارە).

بەڵێ کاکی چاودێر لەگەڵمای.. حەز ئەکەی بۆت تەواو کەم..

وتم بەڵێ بەردەوامبە..

وتی: بەڕێزەکەم زۆر ناوو ناتۆرەی ناشرینیان بۆ هەڵدەبەستین وامان لێهاتبو ناوی خۆمان لەبیرچوبۆوە.. هەر بەناوو ناتۆرە خۆمان دەناسیەوە!

هەرچی جلوبەرگی کۆنو دڕاو فڕیداوی خەڵك هەبو لەبەری ئێمەدابو.. هەرچی جلوبەرگی تازە چاكو گەرمی بازاڕبو لەبەری منداڵەکانی تردا بوو لەهەموو خواردنێکی خۆشو لەهەموو سەردانو سەیرانێك بێبەش بوین، بەڵام ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە روداوێك بوو پار زستان رویدا.

بەیانیەکیان سك ئێشەیەکی توندم گرت.. ئازارم زۆر بوو، کەچی باجیم سەرەڕای هەموو بەدەمەوە چونێك وتی: بڕۆ نان بکڕە بۆ ئێوارە.

دنیاش زۆر ساردبوو تەنها پاڵتۆیەکم نەبو لەبەری بکەم بۆیە پێم وت: ناتوانم ئازارم زۆر زۆرە، کەچی ئەو خوانەناسە چو بەباوکمی وت خۆی نەخۆش خستووە بۆ ئەوە نەچێتە دەر نان بکڕێت.

باوکم یەکسەر پەنای بردە بەر لێدانم زۆری لێدام.. خوشکەکەم هاواری ئەکرد، بەڵام دەستەڵاتی نەبوو منداڵەکانی باجیم بەیاری خۆشیان ئەزانی هەڵئەپەڕینو پێئەکەنینو چەپڵەیان بۆ باوکیان لێدەدا، دایکیشیان زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی بوو.. ئای خوایە گیان ناحەقی قبوڵ نەکەیت.. ئای..

واملێهات بردیانمە نەخۆشخانە (پێنج) رۆژ لەوێ لەژێر چاودێری پزیشك دا مامەوە، دڵخۆشبووم بەم لێدانو کەوتنەم لەنەخۆشخانە وتم: بەڵکو باوکم حاڵم ببینێتو بەزەیی پێمدابێتەوە بگۆڕێت، بەڵام بەداخەوە هەر بەردەوام بوو لەلێدانم.

دوای هاتنە دەرو بەجێهێشتنی نەخۆشخانە کە بینیم ماڵی باوکم ئاوایە، حەزم نەکرد بچمەوە بۆ ماڵ، دوای ئەوەی لەماڵ خۆم دزییەوە خوشکە داماوەکەم بەجێهێشت، لەگەڵ کۆمەڵێك کەس ئاشنایەتیم پەیدا کرد، کە (بێسەرپەرشت) بون منیش لەگەڵ ئەوانەدا خرامە زەلکاوی خراپەکاری، دەبێت بڵێم ئەوان باوەشی سۆزیان بۆ کردمەوە ئەو سۆزەی لەدوای مردنی دایکمەوە، لێم رەنجاو نەمبینیەوە.

دوای ئەوەی توشی چەند جۆرە تاوانێکی جۆراوجۆر هاتم، لەلایەن دەستەڵاتدارانەوە گیرام، خرامە بەندینخانە.. کەخرامە بەندینخانە هەستم کرد کە چەند خراپەم کردووە! ئەمەش لەرێگەی ئەو چەند ئامۆژگاریو وانە پڕ سودانەوە بوو کە مامۆستای بەندینخانەکە بۆی دەوتین.

داوام کرد لەخوا

لەتاوانەکانم خۆش بێت.. هەرچی کردومە نەزان بوم.. کەواتە من لەسەر هەڵە نیم کاتێك کە ئەڵێم ناچمەوە بۆ ماڵ هەر لەبەندیخانە دەمێنمەوە.. بەڵێ دەمێنمەوە کاتێك ئەمەم لێبیست زۆر بێتاقەت بووم، چونکە گرفتی ئەم، پیاوی گەورە ناتوانێت هەڵی بگرێت ج جای منداڵێکی سیازدە ساڵ، نەمدەزانی چۆنی وەڵام بدەمەوە ئایا خۆی تاوانبارە، یان باوکی کە بۆنی باوکایەتی لێنایەت؟ یان باجیەکەی کە تۆزقاڵێك ترسی خوا لەدڵدا نەبووە سەبارەت بە منداڵەکان؟

لەبەر خۆمەوە دەموت: ئەگەر ئەم منداڵە بیتوانیایە بەئارەزووی خۆی باوك هەڵبژێرێت ئەوا هەموو سەروەتو سامانی دنیای بۆ دەفرۆشێت.

وە ئەو کاتە باوكو باجی ئەم مێردمنداڵە بچوکترین نرخیان نەدەبوو.

دەستم خستە سەرشانی.. زۆر هانمدا کە ئیتر لەدەرەوە وەك پیاوکار بکات، بەو پارەی کارە خۆی بژێنێت. بەڵام سەری خستە سەر هەردوو ئەژنۆیو ئەژنۆکانی لەئامێز گرت وتی: نا.. ناگەڕێمەوە.. کۆمەڵگامان نرخی من نازانن.

لەکۆتایدا خوای گەورە هیدایەتی باوکانو دایکان بدات ئەوانەی کە بەیەکسانی تا ئێستا مامەڵەیان لەگەڵ منداڵەکانیان نەکردووە، لەگەڵیاندا (راستو رەوانبن)

بەپێی فەرمودەی خواو پێغەمبەر منداڵەکانیان پەروەردە بکەن تا ببنە کەسانی سودبەخش بۆ خۆیان و کۆمەڵیان، گەردنی باوك و دایکیان لەئاگری دۆزەخ رزگار بکەن.

ئازیزم دڵنیابە تۆ باوکی یان دایکی منداڵێکی.. یان چەند منداڵێك زۆر وریابە لەپەروەردەکردنیاندا.. لێپرسینەوەت بابەردەوام هەبێت.. لەکێشەکانیاندا هاوکاری بکە.. هاورێی چاك و رێکوپێکیان بۆ دیاری بکەن.. لەمۆژگاری کردنیان کۆڵ مەدە.. چەندەت پێخۆش بوو ئەو کۆرپانەت هاتونەتەبوون.. ئەوەندەشت پێخۆشبێت منداڵەکانت چنار ئاسا باڵا بکەن، دار گوێز ئاسا بەری بەنرخ بدەن.

تۆ بە دوعاو نزای ئەوان لەبەرزەخ و بەهەشتدا پایەت بڵند دەبێتەوە.. گەر پەروەردە کارێکی کارا بوبیت، چونکە پێغەمبەر محمد (درودی خوای لێبێت) ئەفەرموێت:

سێ شت دەبنە خێری بەردەوام و نەبڕاوە بۆ خاوەنەکانیان (قورئانێك.. یا نوسراوێك کۆمەڵگە سود بەخش بن لێوەی، مزگەوتێك یان پردێك یان نەخۆشخانەیەك.. یا قوتابخانەیەك کە چەندین کەس سودی لێوەربگرن، منداڵێکی ساڵح و رێکوپێك بۆ کۆمەڵگەو ئاین).

# لەپرسەی مەرگی عیشقی "هەنسک"دا

## چیرۆکێکی واقعی لەحەرەمی زانکۆی سلێمانیەوە

دارشتنەوەی: بێستون ژاڵەیی

بەیانیەك لەبەیانیە زستانییە خۆرهەتاوییەکانی زانکۆ هەموو شتێك هاڵاوی گەرم بوونەوەی دوای شەوێکی ساردو زوقماوی لێهەڵئەسا، گروپێك لەخوێندکاران لەمۆڵەتی پشویەکی کورتدا لەکەشی قالبگرتووی محازەرەیەکەوە بۆ دنیای ئازادتری ئەوێ بەحەماس و دڵخۆشتر بوون.

هەنسك: کچە خوێندکارێکی ئەم زانکۆیەیەو ئەمساڵ لەقۆناغی سێیەو لەیەکێك لە کۆلیژەکانی زانکۆدایە، ئەم کچێکە هیوادار، خۆش کەیفو بەزەوق و سەلیقەو بەردەوام بەدەم خۆری ژیانەوە پێئەکەنێ، هەنسك دڵپاکەو هەموو شتێك لەدەوروبەریا سادەو جوان ئەبینێ تا ئێستا زللەی زبری و سەختیەکانی ژیان گۆنای ناسکی زیندەگی ئەمیان نەتەزاندووە، یەك وێنەو یەك ڕوو، یەك تێگەیشتنی بۆ ژیان کردن هەیە، هەموو وتەیەکی جوان، هەموو وێنەیەکی لەرواڵەتدا جوان و هەموو فرمێسکێك ئەگەر بۆ نواندن تەمسیلیش بێت لەناخەوە هەنسك ئەهەژێنێت.

هەموو شتێك لەژینگەی ژیانی ئەم کچە زانکۆییەدا چیرۆکی عەشق و ئەڤین ئەگێڕێتەوە، گۆرانیەکان پڕ لەعیشق، فلیمەکان هەروەها رۆژنامەو گۆڤارو کتێبەکانیش چرپەو رازی هاورێکانیش، نامەی نهێنی نێو جانتای کچە خوێندکارەکانی هاوڕێشی، بەلام ئایا ئەم شەپۆلانی عیشقە هەر هەمان عیشقی حەقیقی و بالاو گەرم و نەمرەیان چی تر؟ ئەمە پرسیارە گەورەو گرنگەکەیە کە تا ئێستا نەبەخەیاڵی هەنسکدا هاتووەو نە لەگۆرانی و فلیم و چیرۆك و شیعرو رۆمان و دەمەتەقێیەکی مەحرەمانەشدا وروژێنراوە، بۆیە هەنسك بەجدی وا بیرئەکاتەوە لەدنیای عیشقدا نابێت کەس درۆ

جیهانی تیا لەناو نەچێت.. لەدێر زەمانەوە ئەمەیان داناوە.. قەناعەتی خۆیانە.. لەسەر زەوی (بێڕەوشتی) دروست دەکەن پەرەدەسێنێ.. بەڵام لەکۆتایدا (موسوڵمانان) لەناویان دەبەن.. ئەزانن ئەمە تەقدیری خواییە.

- دەوڵەتی روسیایان روخاند (شیوعیەت) ئەما بەدەمی خۆی (گوربارشۆف) وتی: ئەوا (یەکێتی سۆڤیەت) هەڵوەشاو (شیوعیەت) ئەما یەکسەر ئەمریکا لەبەرنامەی (**مایعبر عن الوجه النظر الحكومة الامريكية**) لەدەنگی ئەمریکا وتی: ئێستا دوژمنی ژمارەیەکی ئەمریکاو غەرب لەدوای ئەمانی (شیوعیەت).. ئیسلامە.. بەڵێ ئیسلامە، بەئاشکرا لەرادیۆکەیاندا وتی: زۆبەی زانستو زانیارییەکان لەلای جولەکەیە.. کاری بۆ دەکەن، دەیکرن ئامانجیانە کەس هیچ نەزانێ خۆیان نەبێت، خۆیان هەمو شتێ بن لەجیهاندا بەهەر شێوەیەك بو کەشتیەکی ئاسمانی ئەمریکی هەڵدرایە ئاسمانو بۆ گەشتی مانگ کاری کرد، یەکێك لەسەرنشینەکانی پیاوێکی جولەکە بو. جولەکە زۆر شانازی پێوە دەکرد. کەشتیەکە کارەکانی ئەنجاماو ویستی بگەڕێتەوە سەر زەوی هەمو کەسە گەورەو بەتواناکانی جولەکە لەگەڵ هەمو دانیشتوانی شارەکانی ئیسرائیل لەفەلەستین بەمەلاین چاو چاوەڕێ بوون جێگەو رێگەو خواردن ئامادەی ئەو ئاهەنگە کرا بو کە بەنیازبون بۆ ئەو کەشتیەوانەی بکەن، بەڵام لەنزیك بونەوەی لەسەر زەوی لەبەرچاوی ئەو هەمو کامێراو کەناڵانەداو مرۆڤایەتیدا.. ئیسرائیل ئەم خەوەی نەهاتەدیو (فڕۆکەکە) بەئاسمانەوە سوتاو کەوتەخوارێ هەمو سەرنشینەکانی گیانیان لەدەستدا.. چاوی رەشی جولەکە کاڵ بۆوەو خواردنو جێگەی ئاهەنگ کرایە جێگەی پرسە، ساڵی ٢٠٠٣.. بەڵام بەرێزم لەئاسمان رویداو خوای گەورە پشتی شکاندن.. گەر لەسەر زەوی روویبدایە زۆر بەراشکاوی دەیان وت: (دەستی ئیسلامیەکان بووە ئەم تیرۆریستیەیان ئەنجامداوە)، بەڵام سوپاس بۆ خوا.

- بۆ زیاتر رون بون لەو کارو کردەوانە لەچەندین جێگەدا خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسیان دەکات، حەزرەتی (موسا) علیه السلام یەکەم پێغەمبەر کە لەهەمو پێغەمبەرەکان زیاتر ناوی لەقورئاندا هاتووە.. کە هۆزەکەی چەند ئالەبارو سەرسەختو

دور لـەخوا بـون، بـەهیچ شـتێك باوەڕیـان نـەكردووە.. داواكارییـان زۆر بـووە، زۆر دنیـا خۆشەویست بون.. ئازاری پێغەمبەرانیان زۆرداوە لەرابردودا.

پێـشەوای مرۆڤایـەتی محمـد (درودی خـوای لەسـەر بێـت) لەچـەندین (حەدیـسی سەحیحدا) باسی ناپاکیو ستەمی جولەکە ئەکاتو پاشان لەناوچونیان بەدەستی (محمدی مەهـدی) (ستكون بعدي خلفاء، وبعد خلفاء امراء وبعد الأمراء ملوك ، وبعد الملوك جبـابرة وبعد الجبابر ة المهدي).

(لەدوای من خەلیفە حوكم ئەكات پاشان كۆمەڵێ دێن (ئەمیرایەتی) ئەكەن دوای ئەوە دەسەڵاتی ئیسلام بو بەئەمیرایەتیو ئەمیرایەتیش نەما، دەسـەڵاتی (مەلیكایـەتی) پەیـدا دەبێت كە ئەویش نەما ئەمجارە (دیكتاتۆرو ستەمكار) پەیـدا دەبـن (جبـابیرە - ئەوانـەی ستەمو ناحەقی لەخەڵك ئەكەنو ئەیانچەوسێننەوە، لەپاش ئەوانە ئینجا (مەهدی) دێت

خوێنەری خۆشەویـست.. ئـەی دڵـزاكاو بـەتاوانی كەسـانی سـەردەم.. ئـەی دڵپـڕ هیـواو ئاواتی كپ كراوە باش بزانە ئێستا سەردەمی (زاڵمەكانە) خەلیفەكان ڕۆشتنو ئەمیرەكان وەك (صلاح الدینو..) كە دوای روخانی (عەباسی)یـەكان هـاتن، پاشـان مەلیكایەتیـشمان بینی رۆشتن ئێستا حوكمو دەسـەڵاتی (سـتەمكار - جبـابرە)یـە كـە حـوكم بـەئاینی خـوا ناكەنو دژایەتی دەكەن.. پاشـان (مەهـدی)یـە، دوای ئـەویش شـاری مەدینـەی پێغەمبـەر (درودی خـوای لێبێـت) كـاول ئـەبێت دەڵـێ: وایلێـدێت (چـەقەڵو گـورگ)[8] دێتـە لای (گۆڕەكـەی پێغەمبـەرە)وە كـەس نییـە دەریانبكـات، كـاروانی بـەو نـاوەدا دەڕۆن دەڵـێن: بیستومانە لەزەمانی پێش ئێمەدا ئـەم نـاوە چـەندەها كـەس تیایـدا كۆبونەتـەوە لـەدوای ئەمانەش، جەنگی جیهانی سێیەم دروسـت دەبێـت لەحەدیـسدا بـە (مەلحەمـەی عوچـما) ناوی هاتووە، پاشان شاری قودس لەدەست جولەكە رزگـار ئـەكرێت، لەپاشـاندا (دەجـال)، دێـت وەك كەسـێكی ئاسـایی وایـە (٧٠,٠٠٠) جولەكـەی ناوچـەی خۆراسـانی لەگەڵدایـە

[8] چەقەڵ گورگ ئایا راستی دەبن یان كەسانێك دەبن وەك چەقەڵو گورگ ئەوە خوا دەیزانێ؟

لەدایك و باوکێك دەبێت کە (٣٠) ساڵ منداڵیان نەبووە، پاشان هەمو دەستەڵات و توانایەکی هەیە خاوەنی پارەی زۆرو نانی زۆرە.

خەڵکێکی زۆر دوای ئەکەون ئیدیعای (خوایەتی) ئەکات.. خەڵکە سادەو ساویلکە بڕوای پێدەکەن و ئیمانی پێدێنن بۆ هەمو لایەك دەچێت تەنها روەو مەدینەو کەعبە نەبێت. پاشان حەزرەتی (عیسی) دێتە سەر زەوی و (دەجال)، ئەکوژێ بەچەکێك کە تەنها ئەو لەو چەکەی پێیەو زۆر بەهێز دەبێت لەدەرگای (قودس)دا مرۆڤایەتی لەم (دەجالە) رزگار دەکات، ئەمانە نیشانەی گەورەی دنیا کۆتایی هاتنە کە بەکورتی: (هاتنی مەهدی ـ کاولبونی شاری مەدینە ـ روداني جەنگی جیهانی سێیەم ـ گرانیەکی گەورەی سێ ساڵە ـ دوکەڵێکی گەورە (الدخان) کە هەمو سەر زەوی دەگرێتەوەو ماوەی ٤٠ چل شەو زەوی دادەپۆشێ، پاشان رزگارکردنی قودس، پاشان هاتنی دەجال پاشان دابەزینی حەزرەتی مەسیح ـ عیسا ـ "علیه السلام" هەموشی لەماوەی "٧" حەوت ساڵدا رودەدات، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) باس دەکات کە خەڵکی زۆر بەنارەحەت فریای بەدواداچوون و گوێگرتنی (متابعە) دەکەون لەکۆتایدا خوا گەورە لامانبدات لەو نارەحەتی و سەغڵەتیانەو مرۆڤەکانی ئەو سەردەمەش بەئیمانداری بهێڵێتەوەو ئاگامان لەچرکەکانی رۆژگارو هەناسەکانی مێژو بێت.. ئەم بابەتە زۆر لەمە زیاترو باشتری دەوێت، بەڵام هێندە بەسە.

# نوێـژی بەیـانی

خوێنەری ئازیز/ دەزانیت کەسانی ساڵانی رابردوو بۆچی دور لەنەخۆشیو دەردو بەڵابوون؟ دەزانیت بۆ هێندە بەکارو تواناو لەش ساغو هیممەت بـەرزو موتـەقی بـوون؟ بگەڕێرەوەو بەکردارەکانی خۆتاو بزانە لەچ لایەنێکەوە کـەم تەرخـەمیت هەیـە؟ بـەڵێن بدە.. عەزمی خۆت جەزم بکە.. گەر نەشت بو ئـەوا زەنگی مۆبایلەکەت ئامادە بکە بـۆ ئەم کارە خێرە.

پیاوی ئاشتی، سەرۆك وەزیرانـی ئیسرائیل (ئێـرۆن شارۆن) گـەورە پیـاوی جوولەکـە لەچاوپێکەوتنێکدا دەڵێت، ئێمە لەعەرەب ناترسین!

- ئەی لەموسوڵمانان؟
- لەوانیش ناترسینو تازە رەگمان داکوتاوە.
- هیچ کاتێك لێیان ناترسن؟

دوا وەڵام/ لەیەککاتــدا لەموســوڵمانان دەترســین ئــەویش ئــەو کاتەیــە کــە ژمــارەی نوێژخوێنانی بەیانیان گەیشتە هێندەی ژمارەی نوێژ خوێنانی نوێژی (هەینی ، جومعە) ئەو ساتە دەبنە مەترسی بۆ (دونیای جولەکەو دۆستەکانی)

بەڕێزەکەم.. مزگەوتەکان لەتۆی گەنج خاڵییە..

شـەو زوبنـو و زەنگـی مۆبایلەکـەت ئامـادە کـە پـێش بـانگی بـەیانی بەئاگابێتــەوە. دەســتنوێژێکی خــاوێن (أحــسن الوضــوء) بگــرەو چــەند رکاتێــك شــەونوێژ بخوێنــە.. لەدواســاتەکانی شــەوە زەنگــدا پــەردەی گوێکانــت بــەدەنگی بــانگی بڵنــدی مزگەوتــەکان دەزرنگێتەوە.. لارەملو بێ ئیرادە نوێژی تەنهای بەیانی بەئەنجام مەگەمنەو بنویتـەوە.. بـەڵکو وەرە دەرمـاڵ، بەدەم وەڵامدانـەوەی بانگەکـەوە بـەرەو مزگـەوت هـەنگاوی هێـدی بنێ.. ئای! لەو کاتو ساتە کپو خامۆشو خۆشانە.

هــەوا خــاوێن ئاسمــان بریــسکە دەدات لەئەســتێرە بێــدارەکان.. کەشــێکی رۆحیــت لەلادروســت دەبێــت هــەمو ســونەتەکان دەتوانیــت بڵێیــت، گــەر ماڵەکــەتان تــۆزێ دورە مزگەوت بێت. چـەند رکاتێـك نوێـژی سـونەت لـەماڵی پـەروەردەگاردا بـەجێ بگەیەنـەو

لەریزی نوێژ خوێناندا رابوەستە.. لەدوای مامۆستاوە نوێژی بەیانیت بە (جەماعەت) بخوێنە.. بەناخی ئایەتو وشەکاندا شۆڕببەرەوە.. لەکۆتاییدا دەزانیت هەست بەچ ئاسودەییەك دەکەیت رۆحی پاکی ئیمانت گەشە دەکات.. (وێردوو ئەورادەکان) بەجوانیو بەدڵی ئامادەبوونەوە بخوێنە، بەو هەوا پاكو نەسیە خۆشەی بەرەبەیاندا بەرەو ماڵ بگەڕێرەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لەم بارەیەوە دەڵێت: بەجێهێنانی نوێژی (خەوتنانو بەیانی) بەجەماعەت خێری (شەونوێژی ئەو شەوەی هەیە) و لەبەرکردنی چەندەها لاپەڕەی کاری قوتابخانەو کاری تره، مەنورەوە.

ساتە ئامۆییەکان ناگەڕێنەوە.. قورئان بخوێنە.. ئەو ساتە هەست بە (تەدەبور) دەکەیت.. (خیر العمل في بكوريها) دەزانیت هەست ناسکی چییە ئەزانی هەوڵو ماندووبون چییە؟ بەڵێ. دەزانیت بۆ رۆژەکەی چەندە چالاك دەبیت، گەر بەردەوام بیت چەندە رۆژگارەکانت بەش دەکات.

نەخشەی جوان جوان بۆ کاری ئەو رۆژەت دەکێشیت.. هیوادارم بتوانیت کاری بۆ بکەیت پەیمانم بدەرێ کە تاقی بکەیتەوە!! بەئاسودەیی چێژی ئەو چرکە ساتانە لەبنی دانی گەنجیتا دەرناچێتو دەبێتە مایەی خێروخۆشیو توێشوویەکی قیامەتی.. دڵنیابە ئەو کارانەی ئەمرۆ لەکەناڵە تەلەفزیۆنیەکاندا ماندوت دەکاتو لەکات خەوت دەگرێ (تارمایی - سەرابێکە)و پاش هەڵهاتنی خۆری رۆژێکی نوێ شێرە بەفرینە ئاسا دەتوێتەوە.

لەدوا پەیڤی ئەم ساتە پڕ خۆشیو شادییەدا هیوای بەردەوامیو کامەرانیو دڵسۆزی دەخوازم لەپەروەردگاری گەورە داواکار شادبن.

**والسلام عليكم و رحمة الله وبركاته**

# ئەوینی دایکم

## دوای گەڕانەوەم لەدەرەوەی وڵات

ن/ عبدالعزدین حمدان

و/ م. عبدالقادر علی

ح.ح.م کە لاوێکی هەستیارەو لەزەلکاوی نەفامیدا درێژەی بەژیان نەداوە خۆی دەڵێت:

کاتێك باوکم لەژیان دەرچوو.. چووەوە باوەشی خاكو ئارامی گرت، من منداڵێك بووم وەك خەو ئەو ساتو رۆژگارانەم دێتەوە یاد، دایکم بەخێوی کردم.. پەروەردەی کردم بەو بڕە پارە کەمەی کە لەماڵان بەڕەنجی شانو باڵو شەونخونی دەستی دەکەوت کە (جل شۆری ماڵان ـ نانکەری ـ کارەکەری) بۆ ئەوەی من بەعەزمی ژیان ئالودەکاتو ببمە دارو لەسایەو بەری بحەوێتەوە.. زۆر بەنازداریو تاقانەیی ناردمیە بەر خوێندن.. بۆ ئەوەی خوێندن تەواو بکەمو لەدوارۆژدا دایکی پیری لێقەوماو پشویەکی خۆش بداتو بحەسێتەوە.

قۆناغی (سەرەتایی ـ ناوەندی ـ دواناوەندی ـ زانکۆم) تەواوکرد، زۆرم خۆش ئەویست زۆر بەوەفابووم لەگەڵیدا، بێفەرمانیم نەکرد، بەباڵای بەرزما هەڵی ئەڕوانیو ئەلحەمدولیللای دەکرد. بەباشم زانی بۆ تەواو کامڵ بوونی بڕوانانەکەم بەرەو دەرەوەی وڵات بارگەی غەریبی هەڵگرم!

دایکم لەگەڵما هاتو بەڕێی کردم لەڕێگا ئەتوت یەکەم جارە ئامۆژگاریم دەکات زۆر بەقوربانو بەساقەم دەبوو، ئەیوت: کوڕم من هەر تۆم هەیت.. ئازیزەکەم ئاگات لەخۆت بێت، کارێك نەکەیت خوا پێیناخۆش بێت، رۆڵە شیرینەکەم ژیان ئەم چەند ساڵەی

تەمەن نیە، زۆر وریابە کوڕی خۆشەویستم تکایە تا دەتوانیت لەنامەو هەواڵ پرسینت بێبەشم نەکەیت.

منیش بەزەردەخەنەیەکی بێڕۆحانەوە دەموت: جا کێ بۆت دەخوێنێتەوە.. خوا گەورەیە.. با بکەم.

پاش چەند ساڵێك پاش چەندین بەسەربردنی کات لەبێ کاتیدا.. خوێندنم تەواو کردو بەپلەو پایەی بەرزەوە بۆ لای دایکم و شارەکەم گەڕامەوە!

بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەمدا کۆمەڵێ: (دابو دەستوری رۆژئاوا)م لەگەڵ خۆم بەخەڵاتی جەستەیی هانی بوو، من بەناو لەخەڵکی جیا دەکرامەوە.. زۆر گۆڕابوم.. هاوڕێو دراوسی بەباشی هەستیان ئەکرد.. تا رۆژێکیان گوێم لێبوو باوکی (خ) قسەی بۆ منداڵەکانی دەکرد:

رۆڵەکانم ئەگەر پلەوپایەو بڕوانامەی بەرز.. هەندەران.. ئاوا مرۆڤەکان بگۆڕن! ئەم بڕوانامەیە بەتورێکی قوڕاوی، زانستو زانیاری ئەگەر (ئەخلاقو ئەدەبی) لەگەڵ نەبوو بیخەنە تەنەکە خۆڵی بەر دەرگاوە بابڕوات بۆ شوێنێکی پیستر.

بەڵێ: من گاڵتەم بەهەموو شتێك لەژیان دەکرد.. تەمەنو ژیانم تەنها پارە کۆکردنەوەو چێژی حەرام بوو، بەڵێ چێژی حەرامو هیچی تر.

بەهۆی بڵندی بڕوانامەکەمەوە کارێکی زۆر باشو بەرزم دەستکەوت، پاشان خولیای ئافرەتو ژنهێنان دای لەکەللەم.. دایکم زۆری پێخۆش بوو، خێرا ئافرەتێکی زۆر رێكو پێکی بۆ دۆزیمەوە، بەڵام ئاخ.. ئاخ بەدڵم نەبوو، دەزانن بۆ؟ چونکە سەروەتو سامانی زۆری نەبوو! دوای ئەوە ئەو ئافرەتەی کە خۆم دەمویست دایکم حەزی ناکرد ببێتە هاوسەرم، بەڵام هەر کردمە هاوسەری ژیانم.

شەش مانگ بەسەر خێزانداریماندا تێنەپەڕی بوو هەستم دەکرد خێزانم دایکمی خۆش ناوێت، وایلێکردم کە وا منیش دایکم لەبەرچاو بکەوێتو لێم ببێزرێت، تا ئەوەی رۆژێکیان گەڕامەوە ماڵ دەبینم خێزانەکەم دەگری.. کە لێم پرسی: ها.. هۆی چییە ئەگریت؟ چی قەوماوە؟

وتی: لەوەزیاتر ئارام ناگرم یا من یا دایکت دڵنیابە نەبێت یەکێکمان هەڵبژێریت.. ژیان وا ناچێتە سەر.. ئیتر ئارەزووی خۆتە! خۆی راوەشاندو بەتورەییەوە چووە ژوورەکەی خۆی، منیش.. منێکی داماڵراو لەئادابو نەریتی ئاینیو کۆمەڵایەتی.. بەچکە رۆژئاوایی.. زۆر تورەبووم هەر خێرا دەستی.. دەستی دایکم گرتو رامکێشا تا دەرگای دەرەوە.. بەپاڵێك فرێمدایە دەرەوە، بەڵام لەدوا سەرەنجیا نزای خێرو چاکەی بۆ نەکردم.. هاتمە ژوور کەمێك حەسامەوە.. خێزانەکەم وەك سەرکەوتوی پاڵەوان لێوانی ئاوی بۆ هانیم.. بەنەرمێکەوە وتی: بژی پیاو.. دەستخۆش، بەڵام دوای کپ بوونەوەی تورەبونەکەم پەشیمان بومەوە چومەوە دەرێ تا دایکم بدۆزمەوە.. بیهێنمەوە بۆ ماڵ.. بەڵام ئاخ نەمدۆزییەوە.. سەری خۆی هەڵگرتبوو، لەو نزیکانەش نەمابوو!

گەرامەوە ژوورێ باری غەمو هەناسەی ساردم لەبیرچۆوە خێرا خێزانەکەم باسەکەی لەگەڵدا گۆریم، دایکمم لەیادچۆوە.. ئیتر هەواڵی دایکم نەما.. ماڵ سەرانسەر گۆرا.. گۆرا پاش چەند مانگێك لەکارێکمدا دوچاری نەخۆشییەکی سەخت هاتم.. کحول.. ماڵ.. دارایی.. گەنجی .. بروانامە، هەموویان لەدورەوە سەیریان ئەکردم.. لەنەخۆشخانە کەوتم.. خێزانم کەم کەم سەردانی ئەکردم.. دایکم زانیبووی نەخۆشم هاتبووە سەردانم، بەڵام پێش گەیشتنە لام خێزانەکەم دەری کردبوو نەیهێشتبوو بم بینێت.

پاش چەند هەفتەیەکی تر لەنەخۆشخانە هاتمەدەر.. باری دەرونیو تەندروستیم هەتا ئەهات روو لەخراپی بوو.. واملێهات نەتوانم لەکارەکەمدا بەردەوام بم.. قەرزێکی زۆر کەوتە سەرم کار بەمەش نەچووە پێش، تا رۆژێکیان خێزانەکەم زۆر بەراشکاویو راستەوخۆو بێهیچ شەرمێك وتی: تۆ نەخۆشیت.. من بۆ لەشساغیو رابواردنو بروانامەو سەروەتو سامانەکەت شووم پێکردووی، بەڵام بەداخەوە تۆ ئێستاو داهاتوش نەخۆش ئەبیت.. ئیفلاست کردووە، هیچت نەماوە دڵنیابە ناتوانم لەگەڵ تۆ بژیم، دەبێت تەڵاقم بدەی!

بەراستی هەواڵێکی ناخۆش یان داواکارییەکی زۆر قورس بوو.. ناچار پاش چەند قسەوباسو ئامۆژگاری سودی نەبوو تەڵاقم دا..بەتەنهایی مامەوە.

رۆژێکیان لەسەر قەرەوێڵەکەم لەبیری تەمەنی رابردوو کارە دزێوەکانما بووم یەکسەر راپەڕیم.. وەك بڵێی تا ئێستا خەوتبێتم.. زۆر پەشیمان بوومەوە.. بەڵام دوای چی؟! هاتمە دەر وەك کەسێکی نەشارەزاو نامۆ کۆڵان بەکۆڵان و کوچەو گەڕەك دەگەڕام بەدوا ئەو کەسەدا کە نۆمانگ بوبومە جێگە ئازارو خۆشی.. ئەویش دایکە بەوەفاکەم بوو.. دوای ماندوبونێکی زۆر زۆر دۆزیمەوە.. بەڵام لەکوێ و لەچ حاڵەتێکدا.. لەچ گوزەرانێکی ژیاندا. ئای غیرەت..

دەبینم لە کەلاوەیەکدا کەوتووە خێرخوازان ژەمە خواردنی دەدەنێ و شرەوشیتاڵی لەخۆوە ئاڵاندووە.. چوومە لای دەبینم گریان سیمای تێکداوە.. روخساری شێواوە.. بۆیە خۆم خستە سەر قاچەکانی و گریام.. بەڵێ گریام.. ئەویش وەك من گریا، بەم شێوەیە هەردووکمان بۆ ماوەی یەك کاتژمێر زیاتر گریاین. لەو رۆژە بەدواوە هێنامەوە ماڵەوە، پەیمانم بەخوا دا تا ماوم بەندەی خوای گەورەو خزمەتکاری دایکم بم.. پەروەردگار چی پێخۆش بێت ئەوە بکەم.. گوێڕایەڵی دایکم بم.. دڵیم نەلاواند.. دەموچاویم دەشت، دەستنوێژم پێهەڵئەگرت.. خواردنی چاکم ئەدایە زاری.. شەوانە تا چاوی نەچوایەتە خەو.. نەئەخەوتم.. لەگەڕانەوەمدا تا دەستیم ماچ نەکردایە دانەئەنیشتم، ماوەیەکی زۆرە هەر ئاواین.. ئینشائەڵڵا هەروا دەبین. هەموو خورەوشتی ئەورووپام لەخۆما دورخستەوە.ئەی خۆشەویستانی خاوەن دایك و باوك، خوای گەورە خەڵاتی کردوم کە لەگەڵ دایکمدا خۆشترین ساتەکانی تەمەنمان بەسەر دەبەین.

خوای گەورە لەهەموو لایەك خۆشبێت و بیکاتە توێشوی ئەو دنیامان. بەفەرمودەیەکی پێشەوای مرۆڤایەتی (محمد) درودی خوای لەسەر بێت کۆتایی ئەم رووداوە دەهێنین؟

**الجنة تحت أقدام الأمهات** (بەهەشت لەژێر پێی دایکانەوەیە) بەڕازی کردنی دڵیان بەهەشت مسۆگەر دەکەین، ئینشائەڵڵا.

---

سەرچاوە/ رۆژنامەی البلاد ژ ٩٠٢١

# زللەی میهرەبانی[1]

لەدوای راپەڕینە شکۆدارەکەی بەهاری ۱۹۹۱ و پەیدابونی گرانیو کەمدەستی، کوردستان بووە جێگەی چەندین (رێکخراوی بیانی) بۆ هاوکاریو یارمەتی دانی خەڵکی هەژارو نەداری کوردستانو ئاوەدانکردنەوەی (گوندو شارۆچکەکان) بەچەندین کاری مرۆڤانە وەك (دروستکردنی مزگەوت، قوتابخانە، پرد، نەخۆشخانە، سەرچاوەی ئاو و ئاودێری، راکێشانی جادە، قەلاچۆکردنی نەخۆشییەکانی کشتوکاڵو مەڕو ماڵات، ئەڵغام هەلگرتنەوە، بەخشینی خۆراكو پارە بەدانیشتوانی شارو گوندەکانو قوتابخانەکان، هەریەکەو لەوڵاتێکەوەو هەریەکەو بەشێوازێکی جیاواز کەوتنە خزمەتی (قوتابییان، دانیشتوان، نەخۆشخانە..) دامەزراندنی چەندین کەسی بەتوانا لەلای خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان بەپارەیەکی باش لەو رۆژگارو ساڵانەدا.

برایەك دەگێڕێتەوە: دوای کارەساتە جەرگبڕەکەی هەڵەبجە ئاوارەبوینو لەدوای راپەڕین لەساڵی ۱۹۹٤دا لەئێران گەڕاینەوە، وتیان: فلان رێکخراوە (سێ بزن دەدات بەهەر ماڵێك کە لەئێران گەڕاوەتەوە، منیش چوم ناوم نوسیو پسوڵەی هاتنەوەم تەسلیم کرد، پاش ماوەیەکی زۆر دەسی دەسیو ئەمڕۆ بەسبەی ئیتر لەو باوەڕەدا نەبوم بماندەنێ، هەتا ماوەی سێ ساڵ پاشان وتیان وەرن بزنەکەتان وەرگرن ـ منیش وتم: شەرت بێت گەر راست بێت سێ بزنمان بدەنێ، یەکێکیان دەکەم بەخێرو بەسەر دەرو دراوسێدا بەشی دەکەم.

---

[1] بەدەستکارییەوە لەهەفتەنامەی (یەکگرتو ژمارە ۱۹۳) ساڵی ۱۹۹۸/٦/۲٦ وەرگیراوە.

لەگەڵ چوار ماڵی تردا چوین بۆ شوێنی ڕێکخراوەکەو حەیوانەکانم بینی کە زانیم ڕاستە نەماندەنێ، شەیتان چووە ناو دڵمو نیەتی خێرەکەی پێ گۆڕیم لەدڵی خۆمدا وتم: هەرسێکیان دەفرۆشمو گیسکێکی بچوك دەکڕمو دەیکەم بەخێر خۆ خێر هەر خێرە، ئیتر بێئاگابوم لەوەی کە خوای کاربەجێ ئاگادارە بەم کەینو بەینەو، بەپێی نیەت گۆڕینەکەم پاداشتم نەداتەوە. بەڵێ لەگەڵ چوار ماڵەکەی تر بزنەکانمان وەرگرتو بەهەمومان گەلابەیەکمان گرتو بارمان کردن، خۆمان لەپێشەوە سواربوین، لەنیوەی ڕێدا دابەزین، کە سەیری حەیوانەکانمان کرد یەکێ لە سێ بزنەکەی من کە بەساغی بارمان کردبون مرداربوبۆوە.. زەنگی پەشیمانی لێیداو یەکسەر بەخۆمدا چومەوەو لەدڵی خۆمدا وتم:

ئەمە زللەی میهرەبانی خوابو.. تا تەسلیمی نەفسی سەرکەشم نەبم، چونکە بەڕاستی وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ( .. **إن النفس لأمارة بالسوء إلا ما رحم ربي** ) (٥٣-یوسف).

# شەیدای گۆرانیم

فریشتە: کچە خوێندکاری پۆلی پێنجەمی قۆناغی دواناوەندی بوو لەو کەشە ئاڵۆزەی گوزەری کردبوو بەسەریا بۆمان دەدوێت:

زۆر حەزم لەگۆرانیو دەنگی گۆرانی بێژانو مۆسیقا دەکرد، بەردەوام رادیۆکەم لەسەر گۆرانی دادەنا.. ئەگەر رادیۆ نەبوایە ئەوا کاسێتی ناو تەسجیلەکە.. ئەمدیواودیو دەکرا.. یان شریتی CDو کلیپە سەمابازییەکان.. گوێم لەهەموو گۆرانییەك دەگرت.. نەمدەزانی گۆرانی چاكو خراپ هەیە.. بۆیە هەواڵ پرسینی هونەرمەندان.. خوێندنەوەی کاروباری رۆژانەیان، چاوەدێری کردنی هاتنە بازاری بەرهەمی نوێیان کاری بەردەوامم بوو، واملێهاتبوو کە بڵێم دەتوانم واز لەهەموو شتێك بهێنم تەنهاو تەنها گۆرانی بیستن نەبێت.. بەرهەمی خۆماڵیو بێگانەم دەکڕیو بەتاسەوە گوێم بۆ رادەگرت لەگەڵیا نەموتەوە.. ئەوەی کە تێبینەدەگەیشتم هێندەی ئەوەی کە تێی دەگەیشتم حەزم بەبیستنی دەکرد، بەشێوەیەك نارەزەء گۆرانی بیستن بوم کە ئەگەر سۆزو بەزەیی خوانەبوایە ئەوا سەرگەردان دەمام خەریکە یادم ئەچێت بەرگی کتێبو دەفتەرە گەورەکانم وێنەی گۆرانی بێژەکان بوو بەرەنگو روخساری جیاجیاوە.. لەگەڵ هاوەڵەکانما، باس باسی گۆرانیو کاسێت گۆڕینەوە بوو! بەڵام قەدەری خوا وابوو نزیك بەنیوەی ساڵی خوێندن مامۆستایەك نەقڵ بوو بۆمان تا بڵێی رێكوپێك، هێمن.. زیرەك.. روخۆش.. کراوە بوو لەگەڵ قوتابییەکان زۆر بەنەرمیو بەخۆشی مامەڵەی لەگەڵ دەکردین.. لەهەواڵو بارودۆخی هەمومانی دەکۆڵییەوە بەهەموو شێوەیەك یارمەتی دەداین.

دەیبینیم کە بەردەوام خەریکی گۆرانی وتنم لەبەرخۆمەوە، رۆژێکیان بەتەنها پێی وتم: باشە دادە فریشتە گیان گۆرانی وتن بۆ پشودانە ئەگەر تۆ هێندە خۆت بەگۆرانی

وتـن سـەرقاڵ بکـەیت بەچـی پـشویەك بـەخۆت دەدەیـت!؟ دوای ئـەوە گـۆرانی وەك هەرشتێکی تر دوسەرە( بنیات نـەر) (روخێنـەر) تـۆ جیاوازی ناخەیتـە نێوانیـان، وە تـۆ ئێستا قوتابیت پێویستە خوێندنو کۆشش باش بکەیت داهاتویـەکی گەشو رون لـەپێش بگریت.. نەك ئاوا کاتی خۆت بەخۆڕایی بەسەربەریت! ئایا وایە خوشکی شیرینم یان نا؟

منـیش زۆر بەسـادەییو خـوێن سـاردییەوە وتم: بـەڵێ! بـەڵام بـۆ خۆشـیو کـات بەسەربردنە، بۆیە بەردەوام لەداخی ئەو بەدەنگی بەرز گۆرانیم دەوت، نەمـدەزانی ئـەم مامۆسـتایە وەك خوشـکێکی بـەوەفاو دڵسۆزم وایـە، لەدڵسۆزییەوە قسەو ئامۆژگـاریم دەکات، بەڵام ئەو بەو هەڵوێستە خوارانـەی مـن تێکنەچوو، بـەردەوام بـوو لـەئامۆژگاری کردنم.

رۆژێکیان وتی: باشە ناترسیت تـۆ بـەم شێوەیە سـەرزەوی بـەجێبهێڵیتو هاورێکانـت ئەسرینت بۆ برێژن.. پاشان دور لەخواو یاسای خوا بژیت.

وتم: خوا بەرەحمە تۆ بۆ ئەوەندە رەش بینی ئەی خوا (غفور و رەحیم) نییە؟!

مامۆستا وتی: ئەی نازانیت لەگەڵ ئەوەشدا خوای پەروەردگار (**شدیدو العقابە** )!

دوایـی وتم: باشـە ئەگـەر خـۆم بـەم گۆرانیانـەوە خـەریك نەکـەم چـیبکەم؟ بەچـی بێتاقەتی خۆم بەسەربەرم!؟

مامۆسـتا وتـی: کـاتی خـۆت بەبیـستنی کاسـێتی سـودبەخش بەسـەربەرە (کاسـێتی زانستیو کۆمەڵایەتیو رامیاریو ئیسلامی) چەنـدینی تر بێنەو ببیستە!

وتم: ئەمانەی تۆ باسیان ئەکەی لەکوێ دەستم دەکەون.. شتی وا کوا هەیە؟!

وتی: دیارە تۆ تەنها ئەو تۆمارگایانە دەزانیت کە لەو جۆرە بەرهەمەی پێشتر باسمـان لێوەکرد دەفرۆشـن.. مـن ئێـستا ناونیـشانی چـەند تۆمارگایـەکت دەدەمـێ بچۆ بـۆ لایـان دەتوانیت سودی تەواو وەربگریـت، پاشـان پێویـستە خـۆت بەزانـستو زانیـاری پـڕ چـەك بکەیت نـەك بەبابەتێ کە سبەینێ بەسەربچێ.

مامۆستاکەم زانی من بەراستی گوێی لێدەگرمو بەپەرۆشم بـۆ رۆژی دوایـی کاسێتێکی بۆ هێنام، پڕ بو لەئامۆژگاری بەرزو جوان سەرنجی راکێشام، بەڵام تۆزێك گوێم لەگۆرانی دەگـرتو تـۆزێکی تـر لەئامۆژگاریـەکان، تـا ئـەوەبوو بێتاقـەت بـوم نـەمزانی گـوێ

لەکامیان بگرم. پاش ماوەیەك کەوتمە بیرکردنەوە.. ئاخۆ کامیان سودم پێدەگەیەنێت؛ گۆرانی خراپ یان ئامۆژگاری بەرز بۆ کیژێکی وەك من لەم بەهاری تەمەنەدا؟!

زۆر بەقەناعەتەوە کە شارەزابووم ژیان ئەوە نەبوو منی هەرزەکار تێگەیشتبووم بەزوویی ڕام گۆڕی، بڕیاری یەکجارەکیم دەرکرد کە کاتی خۆم بەشتی خراپو بێکەڵکەوە بەسەرنەبەم.

ئەو کاسێتانەم هەموی سڕییەوە بەرهەمی (سرودو گۆرانی گونجاوو بابەتی جۆراوجۆر)م لەسەر تۆمارکردن.. ئەوەی سودبەخش دەبوو چێژم لێوەردەگرت دەمدایە دەستە خوشکەکانم.

لەسەرەتاوە حەزم لەهەندێك یاساو پابەندی ناکرد.. بەڵام سوپاس بۆ خوا پاشان مامۆستاکەم وردە وردە گۆڕام.. گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە پۆشینی بەرگی شەرعی بەجێهێنانی فەرمانی خوایە چۆن گوێڕایەڵی دەکەم بۆ نوێژو ڕۆژو ئاواش گوێڕایەڵی دەکەم بۆ خۆداپۆشین.. تا ڕۆژێکیان مامۆستاکەم خەڵاتێکی جوانی کردمو پێشی وتم:

لەلای مامۆستایان زۆر خۆشەویست بویت.. چونکە نمرەکانت سەرسامانە زیادیان کردووەو لەشانی قوتابیە زیرەکەکاندایت، الحمد لله.. منیش دڵم پڕبو قورگم گیرا.. هەرچۆنێك بێت وتم:

مامۆستا گیان ئەمە یارمەتیو هیدایەتی خوایە سوپاست دەکەن.. پاشان ئەمە خەڵاتی ئێوە بێت.. ئەی نەبێت خەڵاتی خوایی چەندە گەورەو فراوان بێت.. ئەی ئەبێت پەروەردگار چەندەی پێخۆشبێت، ئیتر ڕۆژ بەڕۆژ روو لەزیرەکیو گەشەی روحی بوو، الحمد لله.

لەکۆتاییدا بۆم دەرکەوت کەناڵەکانو دەزگای لاوان گرنگی بەگۆرانی دەدەن تا گەنجان لە (قورئانو ئادابی جوانو رەوشتی بەرز دور بکەونەوە) وە سوپاسی ئەو مامۆستا بەرێزش دەکەم کە لەراستیدا تەنها مامۆستای وانە نەبوو بەڵکو مامۆستای پەروەردەکارو رەوشتو ئاینداری بوو بۆ هەموو خوێندکاران.

هیـوادارم مامۆسـتایان بـەو گیانــە بـەرزەوە لاوان گۆشـبکەنو بیکەنـە ئەنــدامێکی سودبەخش بۆ کۆمەلگا.. بڕیارمدا لەداهاتودا ببمە مامۆستاو ڕێگەو ڕێبازی ئەو بـەڕێزە بەر نەدەم.. بڕیارمدا

تێبینی: مامۆستا (ئەورەسی) ڕەحمەتی خوای لێبێت لەبارەی مامۆستاوە دەڵێ: یـەكو یەك نابێت قەت بکاتە دوو دەبێت بکات (١١) یـازدە.. واتـە دو مامۆسـتا بەرامبـەر یـازدە مامۆستابن لەهەمو ڕویەکـەوە ئەگەر سیان بـون ئـەوە دەبێت بکەنـە (١١١) سـەدویازدە.. دەبا ئێمەش مامۆستایان خۆمان پڕ چەك بکەین بەزانستو زانیاری سەردەمو نوێگەریو گەشاوە هەڵهێنجراو لە "کتابو سونەوە" سەرکەوتوبن..

مامۆستا گیان تۆ پێشەنگی جوانانی

چرای روناکی خاکی کوردستانی

"بەختیار زێوەر"

# سۆزی شێرە بەفرینەکان

و/ عبدالقادر علی

(یاسەمین خیام) کچی مامۆستای قورئان خوێن (مەحمود خەلیل الحصري) یە ناوی تەواوی خۆی (إخراج الخضري) لەمنداڵیەوە لەناو خێزانێکی موسوڵمانو دینداردا چاوی هەڵهێناو پەروەردەیەکی باشی وەرگرت لەسەر دەستی باوكو دایکی.. خۆی دەگێڕێتەوە کە لەمنداڵیدا باوکی کورو کچەکانی کۆدەکردنەوەو قورئانی بەسەردا دەخوێندن جا هەر کات یەکێکیان رۆژانە (یەك پەڕە لە قورئانی) لەبەر بکردایە ئەوا - قرشێکی - دەدانی کە پارەیەکی باش بوو، ئەم هاندانەی باوکی وایکرد کە چەند سورەتێکی زۆر لەبەر بکات.. دەنگە خۆشەکەی باوکیشی بەمیرات بۆ مابۆوە.

باوکی زۆری دڵپێخۆش بوو کە کچەکەی ناوا رێگای باوکی گرتووە لەخزمەت قورئاندایە.. گەورەبوو شوی کرد، بەم شێوەیە ئافرەتێکی ملتزم (پابەند) بوو، بەلام کە شوی کرد هاوسەرەکەی هیچ خەمی لێنەدەخوارد، بۆیە یاسەمین کەوتە داوێکی بچوك بەمەبەستی خستنەناو تۆڕێکی گەورەتر، ئەویش ئەوە بوو چەند کەسێك لەناوازدانەران هاتن بۆ لای وتیان: تۆ ئەو دەنگە خۆشەت هەیە کە بەهرەیەکی خواییە حەیفە بەندەکانی خوا لێیبێبەش ببن، ئێمە نالێین گۆرانی خراپ بڵێ، بەلام - تواشیح - ی ئاینی هەموی - مناجاتە - ە لەگەڵ خواداو باس لەخۆشەویستی پێغەمبەر دەکات (درودی خوای لەسەر بێت)، بۆیە حەز دەکەین تۆش لەو خێرە بێبەش نەبیت.

دوای ئەوە (یاسەمین) قسەکانی بیست کەوتە گومان، بەلام هەڵفریواندنی بەمەبەستی خزمەتی بە (ئاین) وایکرد بکەوێتە داویانەوە، ئەوانیش خێرا بەدەمیەوە هاتن ناوازی جۆراوجۆریان بۆ دانا، ناوی کەوتە سەر روبەری رۆژنامەو گۆڤارەکان، وایلێهات بو بەئامێری دەستی ئەو کۆمەڵەی کە باسمان کرد، کار لەمە ترازا بەناوی ئەوەی (کێ

بەگۆرانی وتن کافر دەبێت، هونەر بۆ خزمەتی جەماوەرە)، بەیەکجاری هەڵخلیسکا، باوکی رەحمەتی زۆری پێناخۆش بوو، لەملاو لا گلەیی‌و گازندە روی لەباوکی پیری ئەکرد.. باوکیشی دەیوت:

- (من چی لێبکەم تا لەماڵی مندا بوو زۆر پابەند بوو، ئێستا کە شوی کردووە لەسنوری دەستەڵاتم چۆتە دەرەوە).

کاری ئەو دەستەیەی پێشوو هەر بەمەوە نەوەستا، باس هاتە سەرباسی جوانیەکەی (کە چەندە ئافرەتێکی جوانە، رێکوپێکە، بەس گرفتی ئەوەیە بە - مۆدێل - جل‌وبەرگ ناپۆشێت)، دوای ماوەیەك هۆش خۆی هاتەوە ویستی رزگاری بێت لەداوی خراپەکاری، بەڵام ئیرادەو ویستی لاوازی خۆی وایکرد کە رزگاری نەبێت، باوکی خواناسی بەو داخەوە سەری نایەوەو کۆچی دوایی کرد.

تا ئەوە بوو لەساڵی ١٩٩٢ سەردانێکی (فەرەنسا)ی کرد کە گەیشتە ئەوێ سەیری کرد حکومەتی (فەرەنسی) بە (وەزیرو گەورە کاربەدەستانەوە) خەریکی چارسەرکردنی کێشەی (دو کیژی) تازە لاون، یەکەمیان (عائیشە ٢٠ ساڵ) و دوەم (فاتمە ١٨ ساڵ) کە لەبەر ئەوەی خۆیان داپۆشی بوو رێگای خوێندنیان پێنەدەدرا، بەڵام خۆگری ئەمان بو بە مایەی ئەوەی حکومەتی (فەرەنسا) لەگەورەترین دەستەڵاتەوە (پۆزش) بۆ ئەم دو کچە خواناس‌و باڵاپۆشە بهێننەوە ئەمانیش بەسەربەرزییەوە رویان کردەوە خوێندنەکەیان‌و بەرگی شەرعیان نەگۆڕی.

ئەم روداوە زۆر بەتودنی - یاسەمینی - راچڵەکاند، کەوا ئەم چەندە بڕوای لاوازەو دڵی خۆشە موسوڵمانە، کەچی بەپێویستی خەڵکی بەرگ دەپۆشێت، نەك بەو شێوەیەی خوا لەقورئاندا باسی لێوە کردووە.

کە گەڕایەوە دەستێك جلی درێژی پۆشی، بەڵام هێشتا مەرجە شەرعیەکانی تیادا نەبوو، پاش ماوەیەك رووی کردە مزگەوتی (المهندسین) کە (**مصطفى محمود**) وتاری تیا دەخوێندەوە، لەوێ لەگەڵ (زهیرە العبد) ئاشنایەتی پەیدا کرد، کە لێپرسراوی چالاکی مزگەوتەکە بوو، کە ئەمیش وەختی خۆی بەرگی باڵاپۆشی (شەرعی) نەپۆشیبو،

بەڵام دوایی تەوبەی کردو گەڕایەوە ـ یاسەمین داوای کرد لە (زهیر العبد) نـزای خێـری بۆ بکات ئەمیش بێتە ریزی ئەمانەوە.

بەمەش دڵی ئارام نەبۆوەو ئاوی نەخواردەوە چوو بۆ لای زانـای پایەبـەرزو هاوچـەرخ خوالێخۆشبوو (محمد الغزالی) ئەویش ئامۆژگاریەکی باشی کرد.

دوای ئەوە (یاسەمین) بەجارێك گۆڕاو وازی لەو (بەناو هونەرمەندانە) هێناو ژیانێکی نوێی دەستپێکرد.

یەکسەر (مەڵبەندێکی قورئان لەبەرکردنی ئافرەتان)ی لەتەنیشت مزگەوتەکەی باوکی کردەوە.

گەورە زانایانی بۆ بانگ دەکردن تا (وتار) یـان بـۆ بخوێننـەوەو ئـەوانیش وەك پیـاوان لەئاینی ئیسلام شارەزا ببن، پاشـان چـەندان (پێـشبڕکێ) لـەبوارەکانی (زانـستی ئیـسلامی، زانستی هاوچەرخ) دا سازدا.

بەم شێوەیە ـ یاسەمین الخیام ـ بووە مەشخەڵی بانگەواز بۆ خوشکانی لەسەر سفرەی ئیسلام .. بۆ ئەوەی ئافرەتانیش ئەرك‌و مافی خۆیان بزانن لەڕوانگەی شەرعەوە.. خوای گەورە تەوبـەی قبـوڵ بکات، هیدایـەتی گشت ئەوانـەش بـدات بـۆ تەوبـەکردن کـە تـاوان ئەنجام دەدەن. (یاسەمین) لەدوای ئەو هەموو گێژاوە زانی نرخی ئیسلام چەنـدە باڵایە.

بەرێزەکەم پەندو ئامۆژگاری زۆر بـەدی دەکـەین لـەم رووداوە واقعیـانـەدا بەگشتی‌و ئەم روداوەش بەتایبەتی:[1]

١- نەشارەزایی (باوك) بۆ دۆزینەوەو هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ رۆڵەکانی.

٢- باوك چەندە شارەزای دین بوو، بەڵام لەکۆمەڵناسیدا کەم ئەزمون بوو.

٣- ساویلکەیی‌و سـەرجەنجاڵی هاوسـەرکەی‌و لێنەپرسـینەوەی لـە (یاسـەمین) کـە چـی دەکات.

٤- زۆرزانی‌و زاڵمی دەوروبەر کە گورگ ئاسا پەلامار دەدەن.

[1] ئامادەکردنی: ئاوات ابوبکر

٥- لێبڕانی (دوژمن بەدین) بۆ لەخشتەبردنی خوشکانو برایانی خاوەن کەسایەتی بەهێز.. بەچەندین هۆکاری دنیایی.

٦- لەکۆمەڵگەی کوردیشماندا چەندین (نوسەرو شاعیرو ئەدیبو رۆشنبیرو خوانناس) بەرچاو دەکەون کە ئەوەندەی گرنگیان بەکۆمەڵگا داوە نیو ئەوەندە گرنگیان بەماڵو منداڵیان نەداوە تا بە (پەروەردەیەکی گەشو جوان) جگەرگۆشەکانیان گۆشبکەن، بۆیە خۆیان جێگەیان کوێر بۆتەوە.

٧- ترسانی وڵاتانی زلهێزو خاوەن دەسەڵاتو دەمپڕ لەهاواری دیموکراسی لە لەناوچوونی (دەسەڵاتو کورسی) رێگە بەمرۆڤی پاكو چالاك نادەن.. چونکە دەزانن خۆیان چەندە لاوازنو هەگبەکانیان پوچە، ئەندامەکانیان لەدەست دەچێت بەروناکی مەشخەڵی بالاپۆشان.

٨- خوێن ساردیو تەریك وەستانی (خوشکان) لەبواری زانستو زانیاریو زانستە (ئیسلامیەکاندا)، ئەگەر سەرنجت دابێت (ئافرەتان) بۆ هەموو جێگەو رێگەیەك دەرگایان بەڕودا والایە، بەلام بۆ (مزگەوت)و فێربوونی پەیامی خوای گەورە (قەدەغەیە).

٩- کۆڵنەدانو گەڕانەوەی بەهێز، ئاکامی بەهێزە، بەلام کەوتنو هەڵنەستانەوە زۆر ئابڕو بەرانەیە.. خوای گەورەش (تەوبە)ی تاوانباران بەپاکی قبوڵ دەکات.

١٠- سەیرنەکردنو بەزۆرنەزانینی تاوانی بچوك بەتاوان، بێهیواش نەبون لەرەحمی خوای گەورە.

١١- یەکێك لەگەورە جولەکەکان دەڵێت: ئەوەی بەگۆرانیەكو بادەیەك شەراب دەیکەین لەوانەیە بەچەندان تۆپو چەکی قورسو سوپا بۆمان نەکرێت.

١٢- با خوشكو خێزانو کەسمان رو لەو جێگە خێرانە بکەن کە یادی خواو پەیامی خوای تیا فێر دەبن، ئەگەر چونە جێگەیەك فێری زانستو پێشکەوتنی نوێ بون با ئەو جێگەیە لەڕوی شەرعیەوە باوەڕپێکراو بێتو ئافرەتیو نرخی خۆی لەدەست نەدات.

١٣- داکەندنی بەرگی شەرعی ئافرەتان لەفەرهەنگی هەندێك كەسدا پێشكەوتنە، بەڵێ پێشكەوتنە بەرەو دۆزەخ.

١٤-ئەگەر مۆدیلات و فڕێدانی بەرگی شەرعی ئافرەتان پێشكەوتن بوایە، دەبوایە ئێستا (سلێمانی) خاوەنی چەندان (كەشتی ئاسمانیو بنكەی ئینتەرنێتو بابەتی پێشكەوتن بوایە) بەڵام ئایا وایە؟!

١٥- وانەوەرگرتنەو گەڕانەوە لەوڵاتانی غەریبیو غوربەتداو هەستكردن بەچێژی بڕواداریو پەیامی مرۆڤایەتی بەدەر لەو چێژو هەستەی كە لەناویان دەژین یان بڵێین كاتێك (ماسی نرخی ئاو دەزانێت كە دێتە وشكانیو تاسەی چونەوە ناو ئاو دەكات)، یان (مرۆڤ كاتێك هەست بەئاسانیو نیعمەتی هەوا) دەكات كە دەچێتە نەخۆشخانەی (بوژاندنەوەی دڵو هەناو) "ئینعاش"

---

سەرچاوە:

١) اسرار وراء حجاب الفنانات ل ٩٢-٩٥.

٢) كاسێتێكی وتاری شێخ احمد القطان كە وتاربێژێكی ناسراوی كوێتیە.

# لاوێکی زانکۆ و
# گەڕانەوە بۆ جیهانی ڕۆحی پاک[1]

بەڕێزەکەم سۆمای چاوە گەشەکانت شاد وەرەو لەم دەفەری بەهارە وەرزییەتا بۆ ساتێك گوێ لەزایەڵەی زەنگی ئەو لاوانە ڕاگرە کە لەکاروانێکی دوری بێخۆڕەوە بۆ روناکیو ئاسۆی گەشی ئەم هەوارە نوێیە سەرتاسەری بەبەختیارییەوە گەڕاونەتەوە..

ئەزانیت لاوان کۆڵەکەی کۆمەڵو هیوای دوارۆژی گەلانن؟!.. بەڵێ!

ئەزانیت نەیارانی پرۆگرامەکەی خوا بۆ گەیشتن بەئامانجی تەڵخیان بەربەرەکانی ئەم پەیامە خواییە دەکەن؟

ئەمەش بزانە هەوڵو توانایان بەهەموو نرخێك لەکاردایە بۆ لادانی لاوانو توێژی رۆشنبیران بۆ گوناهو تاوانکاری کە لەفەرهەنگی بێگوێیاندا ئەمە هەموو بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتییە!

دڵنیام گەنجو لاوی زۆرت دیوە تەنها لەزماندا نەبێت ئیتر لەهیچ ڕواڵەتێکی تردا لەکوردو رۆڵەکانی ئەم شارە خۆشەویستەمان ناچێت! زۆر نامۆن.. بەنامۆی گەشە دەکەن بەنامۆیی گوزەر دەکەن.. تا لەتاراوگەو لانەوازیو غوربەتدا بۆ دواجار چاوی گەشی بێهیوایان تاریك دادێ.

یەکێك لەرۆژهەڵاتناسەکان دەڵێت:

- گەر دەتانەوێت وڵاتانی (ئیسلامی) بخەنە ژێر رکێفی خۆتانو ئیسلام قەلاچۆ بکەن ئەوا خەریکبن هەرچی بۆتان ئەکرێت لاوەکانیان توشی لادان بکەن، با لەبەرنامەو

[1] مرۆڤ پێکهاتووە لەسێ کەرەسەی گرنگ (لاشە، ڕۆح، ئیمان)ە بەنەبونی یەکێکیان مرۆڤێکە هاوەڵەکانی پەلەی شاردنەوەو کردن بەژێر گڵیا دەکەن.

بانگەوازی ئیسلام دوربکەونەوە، تا وایان لێدێت هەر بەناو موسوڵمان بن.. وایان لێبکەن شانازی بەرابردوو کەلەپوری خۆیانەوە نەکەن، بۆ ئەوەی کە ڕەوشتو دەستوری خۆتان بڵاوبکەنەوە هەوڵ بدەن لایان دەن، ئەمەش تەنها بەوە دەکرێت فێری بەرەڵایی و بێڕەوشتییان بکەن! بەهەرچی هۆکارێك و شێوازو کەرەسەیەك بووە.. تا وایان لێدێت شانازی بەژیان و دەستورو بیرو ئایدیۆلۆژیای ئێمەوە بکەن.. با خۆیان بە کەم بزانن..

- قەشە زوێمەر:

یەکێکە لەگەورە موبەشیرو خۆرهەڵاتناسەکانی خۆرئاوا لەکۆنگرەیەکی تەبشیری لەشاری (قدس) دا لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەڵێ:

(ئێمە پێویستە موسوڵمان بکەین بەمەخلوقێ پەیوەندی بەخواو بەسەرمتا ئەخلاقیەکانەوەش نەمێنێ کە ژیانی ئاسایی هەموو گەلێکی لەسەر بەندە.

موسوڵمانان بکەین بەمەخلوقێك تاکە (ئامانج) و کۆتا (مەبەستیان تێرکردنی گەدە ـ سك ـ و جنسیان ـ شەهوەت ـ بێت)!!

دڵنیام کاریان بۆ کردووە رەنگیشی داوەتەوەو جێگەدەستیان لەجیهانی ئیسلامیدا دیارە، بەڵام ئەوان بەنهێنیو ژێر بەژێر کاردەکەنو خەنجەر ئاسا کۆمەڵگە دەبڕن.. بەڵام ئێمەی جیهانی ئیسلامی دەمی هاوارو قسەی زلو دەرخستنی بەرنامەو کاری نهێنیمان لەچاوتروکانێکا پەخش ئەکەینو کردەوەکانمان زۆر لاوازە، کەمیان نییە.. بەرێزم با لە (لاو) دورنەکەوینەوە سەرنجبە بابزانین ئەم گەنجە لەمیحرابی ئەسریندا چ پەشیمانیەك هەڵدەڕێژێت.. چۆن باس لەخۆی دەکات.. چۆنو چۆن.

هەمو زەمەنەکانی ژیانم بەبەردەوامی خەریکی کاری بێهودەو خراپەکاری بوم، هەرچەندە لەمنداڵیەوە (باوكو دایك)م بەزۆر نەك بەقەناعەت نوێژیان پێدەکردم، بۆیە دەڵێم نوێژەکانم ریاکاری بوو.. مەبەستم ئەوەبوو باوکمو دایکم ئەوەندە لەگەڵم نەڵێن.. هەر لەمنداڵییەو بەهۆی هاوڕێی خراپەوە فێری (جگەرەکێشان) بووم.. قەت ئاگام لەموسوڵمانان نەبوو.. نەمزانی بارودۆخی موسوڵمانان چۆنە!؟

لەزانکۆ لاوێکی سپی دەم بەپێکەنین‌و هێمن قسەی لەگەڵ دەکردم.. تا بڵێیی هێمن‌و زیرەك‌و لەسەرخۆو دڵسۆز بوو، بەڵام من رقم لێیبوو.. چونکە ئامۆژگاری خێری ئەکردم کە باشبم‌و جگەرە نەکێشم.

رۆژێکیان لەزانکۆ برێك گۆڤارو بابەتی جۆراوجۆری پێشان دام سەبارەت بە (کوشتارو لەناوبردنی موسوڵمانانی چیچان) لەسەر دەستی کۆمۆنیستەکان) دا هەروەها موسوڵمانانی (بۆسنەو کۆسۆڤۆ و زۆر وڵاتی ئیسلامی تر).

کە بینیم زۆرم پێناخۆش بوو. بەڵام ئەویش ماوەیەك بوو.. لەبیرم نەماو چووە گۆشەی بیرچونەوەوە.

کاتێك کە بانگ لەبڵندگۆی مزگەوتەکانەوە دەدرا، دڵی من‌و دیوارەکەی تەنیشتم تەریب بون زۆر لەیەکدەچوون لەوەڵام دانەوەو بەرەوپیرچونیدا.

چەند جارێك لەهەواڵەکاندا گوێبیستی (کوشتاری بەکۆمەڵی موسوڵمانانی چیچان‌و بۆسنە ئەتك کردنی پیاوانی کشمیر) دەبوم لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە کە خۆیان بەهەڵگری ئاڵای سوری شۆڕش دەزانی‌و پەیامی یەکسانی‌و رزگاریان لەدەستابوو! پەیامی مرۆڤ بەراستی، بەڵام تەنها بەدەم.

بەڵام وەك بۆم باسکردن هەر ئەو کاتە بوو دوایی لەیادم دەکردو بیرم نەدەما.

هەر لەزانکۆدا کۆمەڵێ هاورێم هەبوو کە (کاسێتی ڤیدیۆ CD)ی وێنەی نابرِوتکێن‌و پڕ لەبێ شەرمیمان دەگۆڕییەوە.. هەرچی تازە بکەوتایە دەست یەکێکمان ئەوا ئەوی تریش بەشداری بینینی دەکرد.. بەڵێ ئەمە گوزەران‌و حاڵی لاوی گەلێکە کە شانازی دەکات کە رۆشنبیرو مۆدێرن‌و موسوڵمانە.

رۆژێکیان ئەو هاورێیەی کە باسم کرد هات بۆ لام، بەڵام رەنگ‌و روخساری گۆڕابووە گەش‌و روخۆش‌و بەئەدەب‌و ویقارەوە لەقسەکردندا وتی:

- کاسێتێکی باشم بۆ هێناوی هیوادارم ئەمشەو بتوانیت سەیری کەیت! منیش کاسێتەکەم لێوەرگرت.. بردمەوە بۆ ماڵ زۆر بەتامەزرۆوە بەدیارییەوە دانیشتم هەر کە پەنجەم خستە سەر ڤیدیۆکە بەم شێوەیە کاسێتەکەی پێشکەش کردا

تۆمارگای ـ قرتبە ـ ئیسلامی کاسێتی (خاچپەرستی سەر لەنوێ) پێشکەش دەکات، چیم بینی خوایە؟! کوشتنی موسوڵمانو ئاوارەکردنو ئەتك کردنی ئافرەتو لێدانو گۆڕی بەکۆمەڵو گریانو هاواری منداڵو کاولو روخاندنی منارەو مزگەوتو مەزراو بازاڕو دوکان. خۆم بۆ نەگیرا نەخێر خۆم بۆ نەگیرا گریام!! گریام!! زۆر گریام، هەستم کرد توشی لەرزوتا هاتم!! وام هەست دەکرد یەکێکم لەو قوربانیانە کە لاشەم سەربڕدراوەو وێنەی خاچ لەسەر لاشەم هەڵکەندراوە.

زۆر جوان بۆم دەرکەوت ئەم هەمو کوشتارە تەنها لەبەر ئەوەیە (ئەمانە موسوڵمانن) گەر بێتو ئەمانیش بەندەی خوا نەبونایە.. ملیان بۆ ئارەزوبازی بکردایەو بتەکانو بیروباوەڕە هەڵبەستراوەکانی پاپاو خراپەکارەکانی ئەمانیان بەپیرۆز بزانیایە حاڵیان بەم شێوەیەی لێناهات.

ئەو شەوگارە خەو لەچاوانم تۆرا.. ئەمدیواو دیوم زۆر کرد.. نەمزانی چی بکەم.. سەیرم کرد وا مانگەشەوەو تیشکی زیوینی هاتۆتە سەر مێزەکەمو کتێبخانەکەم.. لەو گۆشەنیگایەوە چاوەکەوت بەو قورئانەی چەندین ساڵە بەس بۆ بەرەکەت بەبێناز دانراوەو ووشەیەکی لێنەخوێنراوە.. تۆزی لەسەر نیشتووە، بۆیە بەوپەڕی تامەزرۆییەوە لەئامێزم گرتو ماچم کرد، کە لەلایەکی نوسرابو (لا یمسه إلا المطهرون) ٧٩ الواقعه.

بۆیە خێرا چووم خۆم خاوێن کردەوەو دەستنوێژێکی جوانم گرتو خێرا قورئانەکەم کردەوە دەستم کرد بەخوێندنو گریان.. لەو دنیا کشو ماتەدا تەنها هەنسكو قوڵپی گریانو دەنگی من دەبیسترا.. بەردەوام قورئانم خوێند، شەیتان هاتە خەیاڵمو پێی وتم: هەستە برۆ بنوو.. خوا چۆن لێت خۆش نەبێت.. تەوبە ئەکەی! زاڵم.. برادەرەکانت بەیانی چاوەڕوانتن بەوشکیو دور لەم دنیا ئالۆ والایە ژیان بێتامە.. وازبێنە) تۆزێك وەستام.. پاش چەند ئایەتێك گەیشتمە ئەو ئایەتەی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

(و إذا سالك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان فليستجيبوا لي وليؤمنوا لعلهم يرشدون) [٢]

بەردەوام بوو.. تا کاتێکم زانی دەنگی (ألله أکبر.. ألله أکبر)ی مزگەوت هاتە گوێم.. خۆم بۆ نەگیرا یەکسەر بەرەو پیری بانگی خوا لەبەندەکانی رووەو مزگەوت چوم بۆ نوێژکردن. بەڵام بڕوا بکەن لەبیرم چوبۆوە چۆن دەستنوێژ بگرم.. پیاوێکی نورانی ریش قەڵەمی سپی پیرم بینی پێم وت: ئەگەر زەحمەت نەبێت دەستنوێژ بشۆو بابیرم بکەوێتەوە؟ ئەویش زۆر بەگەرمی وتی: بەسەرچاو

فریای جەماعەت کەوتم لەوساتەوە ژیانم گۆڕا.. تەواو گۆڕا.. ئیتر لەو بەیانەوە ژیانم گۆڕاوە.. خەریکی کاری چاکەو وتەی چاکەم.. سوپاس بۆ خوا دورکەوتمەوە لەخراپەو خراپەکاری‌و خراپە وتن.. داواکارم لەخوای گەورە پشت‌و پەنای ئەو کەسانەبێت بۆ گەڕانەوە بۆ لای بەرنامەکەی خۆی، کە تا ئێستا نەیانتوانیوە بەرەو دنیای پاکبوونەوەو خۆ رزگارکردن لەتاوان‌و گوناه بچن.

خوای گەورە تەوبەی ئەم لاوەو تەوبەی گشت لایەك قبوڵ بفەرموێت کە تەنها بەندەی خوای باڵا دەست بین لەژیاندا لەژێر سایەی دەستوری ئیسلامدا بژین‌و سەرفرازی قیامەت بین ئینشائەڵڵا و باق بریقەکان‌و کورسی‌و پلەو پایەو نان‌و کاری کەس کارمان تێنەکات.. چونکە خوای گەورە چی لەچارەت نوسیبێت ئینشائەڵڵا هەر دەبێت.. ئەمرۆ ناسبەینێ.

[٢] ئایەتی ١٨٦ البقرە.

# بەڕێوەبەرێکی خیانەتکار[1]

زۆربەباشی دەمانناسی هاوڕێی دێرینی باوکی رەحمەتیمان بوو لەرۆژانی پێشمەرگایەتیدا کاك (س) هاوسەنگەرو هاوڕێی‌و خۆشەویستی شەهیدی سەرکردەی باوکمان بوو.

بەچاوی رێزو خۆشەویستیەوە سەیرمان دەکرد.. لەخۆشەویستیدا پێمان دەوت "مامە" باوکم شەهیدی سەنگەری کوردستان بو لەیەك شەڕدا "مامە"ی تازەو باوکم بەشداریان کردبو زۆر نەبەردبوو، بەڵام باوکم کە ئەو ساڵانە ئێمەو دایکیشمی برد بۆ (گوندێکی) ئازادکراوی ژێر دەستەڵاتی پێشمەرگەی کوردستان دایکم بەرگی ماتەم‌و رەشی پۆشی‌و ئیتر باوکمان نەگەڕایەوە لامان شەوانە بەفرمێسکی دایکمان دڵتەنگ دەبوین، رۆژانەش بەسۆزو خۆشەویستی خەڵکی گوندو هاوڕێ خۆشەویستەکانی باوکمان گۆش دەکراین، حکومەتی عێراقی بەزەبری سوپای زۆرو چەکی تازە ئەو گوندەیان کاول کردو هێزی پێشمەرگە "مقەڕ"یان گواستەوەو ئێمەش لارەمل‌و سەرگەردان ماین ناچار رومان کردەوە شارو زۆر بەکەساسی‌و کرێچێتی دەژیاین من کچە گەورەی دایکم بوم تەمەنم زۆر نەبو دو خوشکی بچوکتر لەخۆم‌و برایەکی چەند مانگەش کە دایکم ناوی نا "غەمگین" بەهۆی ماتەمی باوکمەوە ئەگەرچی ئەو ناوە کچانە بو، بەڵام دایکم گوێی پێنەدا.. دایکم لەشار دو ژوری پەیداکردو بەهەژاری دەژیاین.

جارجارە یارمەتی شۆڕشمان بۆ دەهات.. جارجارەش بەبێ شێو سەرمان دەنایەوە.. زۆر هەژارو گوناح بوین.. دایکم زۆرکاری تاقیکردەوە سەرکەوتو نەبو.. ناچار بەیارمەتی بەرو دراوسێ‌و هەندێ لەخزمان دەچوین بەرێوە.. بەڵێ بە کەوچکی ماڵان دەژیاین.

---

[1] لەترسی رۆحی روخاوم نەتوانم ناوی بهێنم (کچە شەهید).

رۆژگـار روی لەگـەڕان کـردو سـوپای عێـراق نـشوستی هـاوردو ئێمـەش بـەهاوڕێو خۆشەویستانی باوکم شادبوینەوە کاك (س) زۆر سەردانی دەکردین هـەمو کاتێـك بـەبێ دیاری ناهاتەلامان چاوی سۆزو خۆشەویـستی بـۆ دەگێـڕاین.. هـەمو کات دایکـم دەیـوت.. رۆڵـە گیـان راکـەن دەسـتی مامتـان مـاچ کـەن.. مامـمـان بـووە کاربەدەسـتی حزبـی لـە (فەرمانگە)یەکدا.. منیش بالآم پەیدا کردبوو.. رۆژێك مامم وتی:

کچی خۆم وا دایکت دانیشتووەو تۆش گەورە بوی بۆ نایەیت لە (فەرمانگەکـەی خـۆم) بەکارێکی باش داتمەزرێنم.. دایکم زۆر خۆشحاڵ بو بەو هەڵوێستەی مامم.. منـیش رازی بوم شەڵلا ملم بشکایەو ئەو کارەم نەکردایە.. ئاخ..

رۆژگـار تێپـەڕی ساتەخۆشـەکان گەشـەیان دەکـرد.. پـارەو پـولی باشـم بـۆ دایکـم ئەهانیەوە دایکم زۆر دڵشاد بو.. برا بچوکەکەمو دو خوشکەکەم پۆشتە کـردەوە.. پاش ماوەیەك کرامە (سکرتێرە)ی مامەو مامم بەرزبۆوەو کورسییەکەی جوانترو باشتر کـرد.. رۆژانە چـەنـدین میوانو کەسـایەتی گـەورە سـەردانیان دەکـرد، یـەکێك بـۆ کـاری حزبـی یـەکێك بـۆ کـاری شەخـصی یـەکێك بـۆ پلەوپایـەی پێـشمەرگایەتی.. مـامم زۆر گۆڕابـوو، بەلأم من زۆر بەباشی گوێم بەو گۆڕانەنادا.. رۆژی وا هەبوو درەنـگ دەهاتـە فەرمانگـە.. دەمپرسی: مامە گیان خۆ ناساغ نەبوی بۆ دواکەوتی؟!

بەڕەقیو زبری دەیـوت: ئـەوە کـاری تـۆ نییـە دانیـشە.. پۆرتم ئەشکاو دادەنیـشتمەوە لەسەر کورسییە شکۆدارەکەم..

شتێك زۆر نارەحەتی کردم.. چەند ئافرەتێکی داماوی رەشپۆشی دایکم ئاسایی هاتنـە لایو چـەند داواکارییـەکیان لێکـرد، بـەلأم مـامم زۆر بـەدڵڕەقی وەلأمـی دانـەوەو دەری کردن.. پاش هێمن بونەوەی چومە لایو بەباشی تێمگەیاند کە: ئەوانـەو کەسـانی ئـەوان بون ئەم رۆژە گەشەیان بۆ تۆ دروستکردووە، لەکورسیو مێزەکەی هەستاو هاتە لامەوە.. زۆر بەسـەیر سـەیری کـردم وتـی: راسـت دەکـەی، بـەلأم ناکرێـت هەچـی داواکـرا خێـرا جێبەجێ بکرێت.. دەبێت بەبەرنامە بێتو کاری بەوردی بـۆ بکرێـت وانیـە کچە جوانـە خوێن شیرینەکە.. پێکـەنینێکی زۆر جیـاوازی کـرد.. هەسـتام هاتمـە دەر لـەلای پـاش

چەند رۆژێك چەند کەسێکی پۆشتەو رێك و پێك هاتنەلای.. بانگی کردمە ژوور بەزمنگەکەی.. هەموویانی پێناساندم.. زۆر کەیف خۆش بو لەگەڵیاندا..

پاشان وتی: ئەو (کارگوزارە-فەراش)ەم بۆ بنێرە.. چومە دەرێو فەراشەکەم بۆ نارد، ئەویش بەبۆڵە بۆڵ هاتەوە دەرو سینیەك "قاوە"ی بۆ بردن پاش هاتنەوەی وتم: ها کاك (ع) ئەوە چییە؟ بۆ شێواویو بۆڵە بۆڵ دەکەیت؟

وتی: ئەمانە هەندێکیان کاسەلێس بون بەهۆی ماستاوچێتیانەوە هاتونو داوای پلەوپایەو زەویو ماڵ دەکەن.. دیاری باشیشیان هێناوە، بەڵام دایکی شەهیدو کوردی ساغو پاك بەتورەبونو قسەی رەق دەردەکرێن.. راستی دەکرد.. بەڵام لەبەر نان نەبرینم منیش قسەم نەکرد.

چەند ئافرەتێکی کەشخەو شۆخ هاتنە لای بەرێزەوە رایی کردنو گوێی بۆ داواکارییەکانیان شل کردو کاری بۆ کردن.. من زۆر بێتاقەت بوم..

بەڵام هیچم بۆ نەکراو نەوترا.. کە دەگەرامەوە هەمو گۆرانکارییەکانم بۆ دایکم دەگێرایەوە.. جارجارەش درۆشم دەکردو دەموت: دایە گیان مامم زۆر سەلامی لێدەکردیو هەواڵی ساغو سەلامەتیتی دەپرسی.. ئەویش دەیوت: خوا پایەداری کاتو بۆ ئێمەی بهێڵێ.

رۆژێکیان مامم بانگی کردمە ژورەکەی زۆر لێم وردبۆوە هاتە لامەوەو وتی: سوپاس زۆر ماندوم کردوی چیت ئەوێ بۆت بکەم؟! تەنها خۆشیت.. سوپاس، بەڵام چەند قسەیەکی بۆ کردم بۆنو شێوەیان زۆر لەمامیەوە جیاواز بوو بەجێم هێشت.. پاش چەند سەعاتێك هاتەدەر لەژورەکەی وتی: کچی جوان من دەرئەچم گەر هەواڵیان پرسی تازە نایەمەوە بۆ رۆژی دوایی، پاش تەواوبونی دەوام منیش گەرامەوە.. هەستم بەدڵە خورپەو خۆشەویستی دەکرد دەمزانی مامم نیازی چی هەیەو بەنیازی چییە.. رۆژگارەکان تێپەرین هەناسەو سۆز گۆرا.. خۆم دایە دەست مامی هەوا بازم.. بەسۆزی رازی بوم.. خۆشم نامزانی بۆچی!! مەیلی بێئیرادەم یا سۆزی خۆشەویستیان بەڵێنی پوچو بێفەر یانو چەندین یانی تر..

بەڵێ رۆژێك مامم وتی: ئەمرۆ چەند میوانێك دێت ئاگاداربەو دەست بەخۆتا بهێنە..سکرتێرە دەبێت زۆر جوان بێت وەك تۆو جوانتریش.. هەر چاوەڕوان بوم کەس نەبو.. کات درەنگ بو کەس نەبو.. فەرمانگە چۆڵ بو هەمو کارمەندەکان (واژو -ئیمزا) یان کردو رۆشتن.. چومە ژور بۆ لای.. بەچاوێکی پڕ خۆشەویستییەوە بۆی ڕوانیم.. مامە گیان کەس دیار نەبو برۆمەوە. زۆر لێم نزیك بۆوە دەستی خستە سەرشانم هەناسەی تێکەڵ هەناسەم کرد.. چاوی بریە چاوەکانم هەستم بەترس کرد.. وتی: مامە بەقوربانی جوانیو شۆخو شەنگیت بێ رۆشتنەوەی چی.. چەند رۆژە لەم فەرمانگەیەدا کار دەکەیت.. بۆ ئەم ساتە بووە.. تۆ شو ئەکەی منیش پارەدارم ژن ئەهێنم وەرە پێشەوە.. بەو قسەیەو چەند قسەیەکی تر روخامو خۆم تەسلیم کرد.. چەند کاتژمێرێك پێکەوە بوین.. نزیك عەسرێکی درەنگ بەخۆشحاڵییەوە گەڕامەوە.. دایکم وتی: کچم بۆ درەنگ گەڕایتەوە؟

وتم: دایە گیان میوانی (فەرمانگە - دائیرە) زۆربون منیش ناچارمامەوە.. ئیتر لەو رۆژەوە خۆم بەهاوسەری مامم حساب دەکردو زۆر لەجاران زیاتر خۆم رێكو پێك دەکرد.. خۆشیەکان سنوریان نەما.. لەگەڵ هەر چونە ژورەوەمیەکدا بەلێوی سوراوەوە گۆنای مامم بەجێ دەهێشت.. زۆر بەباشی ئالودەی بوم.. چەند مانگێك تێپەڕی بەمامم وت: کەی بچینە دادگاو کاری هاوسەریمان ئاشکراکەینو زەماوەند سازکەین. ئەویش دەیوت: پەلەت نەبێت با ژنەکانی ترم رازی بکەم.. ئەوسا کاری (دادگا) ئاسان دەبێت.

سەیارەکەی پارەو سەروەتەکەی لەخزمەتمابون.. زۆر خۆشحاڵ بوین.

رۆژێکیان باسی باوکمی کردو وتی: هیوادارم توانیبێتم دڵو رۆحی باوکت رازی بکەم کە ئێوەم خۆشحاڵ کردووە... پاشان مرۆڤەکانیش خۆ گانین لەیەك پێستدا بمێننەوە.. رۆژی شاخ گۆڕا ئێستا رۆژی شارەو پێشکەوتن رۆڵی خۆی دەبینێ.. چەند قسەیەکی ئارەزوبازی کردو هەستی جنسیم سات بەسات زیادی دەکردو خۆم بۆ شل دەکرد.. ئەگەرچی من لەتەمەنی (کچو کوڕە)کانیدا بوم، بەڵام زۆر خۆم لێگۆڕا بوو.. زۆر بەکەمی حسابم بۆ پرچی سپی دایکم دەکرد.. بەفیزەوە ماڵم گۆڕی بوینە خاوەنی

خانویەکی تازە.. بەمنەتەوە دەموت: لەسایەی منەوە ئەمەتان دەستگربو. بەڵام دایکم دەیوت: هیچت نەکردووە ئەم خانوەش بەناوی مامتەوەیە.. راستی دەکرد مامم وتی: تا دەمرن تیایدا بن، ئەوەش لەبەر تۆ کچی جوان.

رۆژگارەکان دەبونە سەعات.. بەڵام چەند کەسێکی فەرمانگە هەستیان کردبو منیش بۆ ساغ بونەوەی "زەواج" رەتم دەکردەوەو دەم وت: ئێمە لەفەرمانگەدا وەك خێزان کار دەکەین.

چەند مانگێك تێپەری هەستم کرد (سك - حمل)م هەیەو بە (بەرێوەبەر)م وت ئەویش وتی: زۆر ئاسانە پارەت دەدەمێ بچۆ لەلای یەکێك لەباری خۆتی بەرە، منیش بۆ ئاشکرانەبون‌و نەروخانی کەسایەتیم‌و شەرم لە دایکم هەستام ئەو کارەم ئەنجامداو رزگارم بو. زۆر هیلاك بوم زۆر گران بو نیوە مردو بوم.. کاتێك چومەوە ماڵ دایکم لەماڵ نەبو بەسەردان رۆشتبو، ئەو شەوە نەگەڕایەوە.. بۆ بەیانی بەلاوازی چومە سەرکارو بۆ (بەرێوەبەر)م باسکرد،، هاتە لامەوە شڵپەی لەلا رومەتم هەستان بەسمێڵە زبرەکانی‌و وتی:

بڕۆرەوە ماڵ‌و بۆ ماوەی (یەك هەفتە) ئیجازە بە.

بەڵێ گەڕامەوە ماڵ‌و دایکم هاتبۆوە، بەنەخۆشی سەرماو سۆڵە خۆم رزگار کرد.. دو دەستە خوشکی فەرمانگە لەسێیەم رۆژدا هاتنە لام‌و هەواڵیان پرسیم.. وتیان "بەرێوەبەر" ئەم نامەیەی بۆ ناردوی.. نەمکردەوە تا رۆشتن.. پاش ماوەیەکی کەم، نامەکەم کردەوە.. بڕی (٢٠٠) دیناری سویسری تیابوو لەگەڵ (نامەیەك‌و فەرمانێکی کارگێڕیدا) کە نوسرابو لەهەفتەی داهاتووە دەبێت پەیوەندی بکەیت بەفەرمانگەیەی (..) بۆ کاروباری خۆت‌و کارت لەلای من تەواو بووە "ئینفکاکم"، بۆ نوسیویت‌و خوات لەگەڵ برازای خۆشەویستم.

زۆر تاسام.. زۆر پەشیمان بومەوە.. ئەو کاتە هەستم کرد کچە شەهیدم.. زۆر تورە بوم زۆر نارەحەت بوم.. بەڵام پاش چی تەنهایی دوعاو نزاکانم بۆ (تیاچون‌و سەرشۆڕی مامم بو) منیش غەمبارو هەناسە سارد منیش لەهەمو کارێك دۆڕاو.. هیوادارم ژیانێکی

رەش یا سپی چاوەڕوانم بێت ئەگەرچی بێئیرادەبوم.. ئەگەرچی سادەو ساکارو لارە مل بوم.

لەکۆتاییدا

- ئامۆژگاری بۆ هەمو گەنجێك ئاگاداری کەسایەتیان بن لەکەسانی نەفس نزم نزیك نەبنەوەو نەکەونە داویانەوە.

- ئامۆژگاری ئەو خوشکە ئازیزانەم دەکەم کە پلەو پایەی دنیا فریویان نەدات تا نەبنە قێزەونترین مرۆڤی ئەم سەردەمە.

- ئامۆژگاری کاربەدەستان دەکەم بەچاوی ئەمانەتەوە سەیری خوشك و خێزانی بەردەستەکانیان بکەن و گورگ ئاسا تێیان نەڕوانن.

- ئامۆژگاری بێت بۆ دایك و باوکان لەکچەکانیان لەکوڕەکانیان بپرسنەوە تا لەساتە ناخۆشەکاندا ئەسرین و حەسرەت و پەشیمانی نەڕێژن.

- خۆزگە لاف و گەزافی هەلپەرستان نابونە روخانی کۆشکی خێزانداری نوێ بۆ لاوێ کە تازە بناغەی ژیان دادەمەزرێنێ.

- داواکارم هێندە لاوازو بێئیرادەو خۆش باوەڕو ترسنۆك نەبن هەردەم بوێرو خاوەن عەزمی بەهێزو سروشتی پاك و چاوی پڕ تین بن.

-هیوادارم کەم تا زۆر سودمەند بوبی لەم چیرۆکە واقعیەو گەر حەزت کرد زیاتر لەئازاری کچان و ئافرەتان شارەزابیت بچۆ رۆژنامەی (ڕێوان) بخوێنەرەوە لەوێش (رۆژنامەکەیان) وێنەی ئەم کچە شەهیدە دەبینیت.

# دڵتەنگ مەبە نازانی خێر لەچیدایە؟

زۆرجار هەوڵ بۆ کارێك دەدەیت نابێتە نسیبت بێتاقەتو دڵتەنگ دەبیت، بەڵام ئاکامەکەی خوا بە باش دەیگێڕێ وەك ئەم روداوە واقعیە، کاك کەریم خاوەنی سەیارەیەکی قەمەرە بوو هاتوچۆی (بەغداد ــ سلێمانی) دەکرد، سایەقێکی کارامەو لێهاتوبو، لەشاری بەغداد گیرا.. بەهۆی هەڵەیەکی بچوکەوە، بەڵام سزایەکی قورس، بەگرتنی سەیارەکەی بۆ ماوەی هەفتەیەكو زیندانی کردنی خۆشی، زۆر دڵتەنگو نارەحەت بوو شایستەی ئەو سزایە نەبو، بەڵام کە زانیان کوردە پاش بەربونی (غەرامە)یەکی قورسیشیان کرد، زۆر بێتاقەت بوو، بەڵام چاری نەبو لەنزیك زاڵگەی دەرچون لەبەغداد گرتیانەوە..

پاش لێکۆڵینەوەو قسەو باس خستیانەوە زیندانێکی ترو دەستبەسەرکردنی سەیارەکەی دو رۆژ تێپەڕی بەسەر زیندانی کردنەکەیدا.. بۆی دەرکەوت ئەم سەیارەی ئەم سەرنشینیەتی خۆی لەمنداڵێك داوەو منداڵەکەش مردووە.. خزمو کەسوکاری منداڵەکە ژمارەی قەمەرەکەیان گرتووەو داویانە بەزاڵگەو مەفرەزەکانی پۆلیسی هاتوچۆی ناو بەغداد کاك کەریم زۆر نارەحەت بو نایزانی چی بکات.. بەڵام وەك بروسکەیە بەمێشکیا مژدەیەکی خۆشی بۆ هات کە (ئەم منداڵە ٤) رۆژ لەمەوبەر بەکارەساتی سەیارەکەی ئەم گیانی لەدەستداوەو سەیارەکەش بەجێی هێشتووە، بۆیە داوای لەبەڕێوەبەری زیندانەکە کردو چووە لای، زۆر بەهێمنی روداوەکەی بۆ گێڕایەوە کە (سەیارەکەی ئەم یەك هەفتەیە گیراوەو لەفلان جێگەو رێگە.. جا بۆیە ئەم نەبووە، بەدواداچونی بۆ بکەن)، بەڵێ گوێیان لێگرتو بەدواداچونیان بۆ کرد.. پاش چەند

سەعاتێك بەربو لەزیندانو قسەکەی راست بو، بۆیە کاك کەریم وتی: پیاو نازانێ خێر لەچیدایە.. گەر نەگیرامایە.. دەبومە قاتل، ڕو زەردو شەرمەزاری ئەم کەسانە دەبوم.

لەکۆتاییدا دەڵێین:

**سُبحانَكَ لاعِلمَ لَنا إلا ما عَلَّمتَنا إنَّكَ أنتَ العَليمُ الحَكيم**

ئایەتی (٣٢) البقرە

# خزمی ناپاک

لەشۆفێریدا کارامە بووم، بەڵام تا ئەو ساتانەش هەر سەیارەی خەڵکم بەکرێ ئەگێڕا توانای کڕینی سەیارەم نەبوو.. رۆژێکیان کاك (س)ی خزممان کە ئەو کاتە پارەی (تەعویزی)* وەرگرتبو هاتە لام‌و وتی:

کاك (ن) تۆ سایەقی باش دەزانیت‌و منیش پارەم هەیە حەز ئەکەم سەیارەیەك بکڕم‌و تۆش بیگێڕیت چەندەی پەیدات کرد وەك بـرا ئەیکەین بەدوو بەشەوە.. منیش زۆر بەلامەوە باش بوو وتم:

زۆر چاکە هەر ئەمڕۆ پارە بێنەو ئەچینە (مەعرەزی سەیارەکان)، قەمەرەیەکی کرێ دەکڕین..و بەباشی دەیگێڕم.. بەڵێ (قەمەرەیەکی تەکسی) باشم بەدڵی خۆم کڕی‌و ئەویش پارەکەی دا.. مانگی یەکەم‌و دووەم کارم پێکرد زۆر باش بوو لەسایەقیی زیاترم بۆ ئەمایەوە، سەیارەکەش (خەرجی - مسرەف)کەم ئەویست، بەڵام رۆژێکیان هات بەخەیاڵمدا: باشە بۆ من هەوڵی کڕینی ئەم سەیارەیە نەدەم بۆ خۆم.. بۆ لەژێر چنگی ئەو دەری نەکەم.. بۆ ئەو هەموو هیلاکیە بۆ خۆم نەبێت!؟

شەیتان کەوتە بنکڵێشەم.. مانگی سێیەم پارەیەکی کەمم بۆ بردو ئەوی تـرم لادا.. مانگی چوارەم لەو کەمترم پارە بۆ برد، ئەوەی تـرم لادا، خاوەن قەمەرە وتی: کاك (ن) ئەوە بۆ پارەکە کەمیکرد؟!

* تەعویز: ئەو پارە مۆڵە بوو کە حکومەتی عێراقی ساڵی ١٩٧٨ دەستیکردە راگواستنی گوندە سنورییەکانی نێوان عێراق‌و ئێران لەپاداشتی (ماڵ‌و ملکیان) دا لیژنەیەك پارەی بۆ دەنوسین‌و وەریان ئەگرت ئەو مولکەیان دەبووە ئەرزی موحەرەمە، خەڵکەکەشی پارەیان دەدایە خانوو لەشار یان سەیارەو شتیان پێدەکڕی، یان دەچونە (کۆمەڵگاکان = مجمع)ەوە.

وتم: کاکە ئیش وەکو جاران نەماوە.. پاشان خەرجیەکی زۆرم تیا کردووە هەر ئەوەندە ماوەتەوە.. ئەگەر بڕواش ناکەیت لەبەیانی زووتر نیە وەرە لەگەڵم بزانە کەس لەقەمەرەی تەکسی ئەپرسێت، داماو بڕوای کردو بۆ بەیانی چووم بەدوایدا لەپێشی قەمەرەکە لەلای خۆمەوە دامنیشاند، تەجیلم بۆ کردەوە.. زۆر کەیفی پێئەهات.. بەلای هەر کەسێکدا ئەڕۆیشتن ئەیوت: تۆ بڵێیی ئەو پیاوانە قەمەرەیان ئەوێت؟

منیش ئەموت: ئەگەر بیانەوێت خۆیان دەست ڕائەگرن.

بەم شێوەیە ئەو ڕۆژە تا نزیکی عەسر حۆڵم کرد لەقەمەرەداو چوینەوە ماڵ وتی: وەڵا کاکە ڕاست ئەکەیت هەر باشیشە ئەو پارەیەشت دەستئەکەوێت.. ئەو داماوە ئەشارەزابوو لەبارودۆخی ناو شار تازە هاتبونە شار.. ئەیزانی کە ئەفەر هەبوو لەپێشەوە کەسیتر دەست لەقەمەرە ڕاناگرێت.. بەو شێوەیە ماوەی چەند مانگێك کارم پێکردو هەر پارەی کەمم بۆ ئەبرد.. ڕۆژێکیان چوومە لای وتم: کاك (س) من زۆر مەمنونی تۆم ئەگەر بوارم بدەی من ئەچم بەلای کارێکی ترەوەو سەیارەکەت بۆ دادەنێم.. یان ئەوەتا بەکەڵکی دوو کەس نایەت لێت ئەکڕمەوەو پارەیەکی لەسەر دابنێ.. کاك (س)ی داماو ئاگاداری ساختەچێتی من نەبوو دڵپاك وتی: باشە خۆت ئەزانیت چەندەمان پێداوە بەشتێك دایبنێو پارەکەم بدەرێ.. با لەمە زیاتر خەفەت بارتر نەبم. وتم: ئاخر کاك (س) گیان ئێستا ئەو پارەیە ناکات، پاشان ئەوە چەند مانگێکە پارەی پەیدا کردووە.. بەکەمتر دایدەنێین.

وتی: خۆت وەکیل بەو منو خۆشت مەغدور مەکە.

ئەو زۆر بەساویلکەیی دەدواو ئەیئەوت: باشە کە کارو کاسبی نییە چۆن تۆ سودی لێئەبینی، بەنیوە قیمەتو بەقەرز لێم کڕییەوە.. بڕێك لەوپارەیەی کە دەستم کەوتبوو پێشەکی دامێو ئەوەی مایەوە کردمانە قەرزی مانگانە.. بەدڵی خۆشو بەگێلی ئەو پێکەنینم ئەهات.. وردە وردە قەرز تەواو بوو، بومە خاوەنی سەیارەی خۆم، بەڵام بەداخەوە.. زۆریش بەداخەوە هیچ بیرم لەدادگای خوای گەورەو خیانەت لەو پیاوە نەکردەوە.

تا رۆژێکیان لەگوزەرێکدا بەیەکەوە بوین‌و باسی ئەو کارەم بۆ کرد.. لەم ساڵانەی دوایدا.. داوای گەردن ئازایم لێکرد..

ئەویش وتی: من بەساختەچێتی ئەو پارەیەم دەستکەوت.

وتم چۆن؟

وتی: لەلای لیژنەکە زەوی‌و زارو شتی زۆرم نووسی.. ئەوانیش پارەی زۆریان بۆ نوسیم، پاشان تۆ سودت لەو پارەیە وەرگرت.. بەڵام خۆت ئامادە کە بۆ پاداشتی خیانەت‌و هەڵنێر.. چونکە دڵنیابە (ئەو کەرەی بەپارەی بەفر بکڕدرێت ئاو دەیبات).

وتم: تۆ گەردنم ئازا کە.. خوا گەورەیە.

وتی: گەردنت ئازا بێت، بەڵام بەمەرجێك دووبارەی نەکەیتەوە لەژیانتدا.

بەڵێنم پێدا.. و لەو کارەش پەشیمان بووم.. بەڵام دوای چی؟!

# 25 ساڵ خیانەت

بارودۆخ لە (فەلەستین) تا بێت هەر لەحزمیەك رو لەهەڵئاوسانو پێش هاتی ترسناکە، ئەوەی ئێستا لەوێ ئەگوزەرێت سەرەتای مەترسیەکی گەورەیە لەموسوڵمانان فەلەستین، رۆژانە گەلێکی مەزلومو بەشخوراو سوکایەتی بەئاینو موقەدەساتو بونیان ئەکرێت.. ئەکوژرێو ئەبرِدرێ ناموسی هەتك ئەکرێ، ئێمە ناکرێ وەك گەلێکی موسوڵمانو مەزلوم تەنیاو خوێن ساردو بێدەربەستانە لەسوکایەتی جووەکان بەهاوئاینەکانمان بروانینو هەندێك جاریش بکەوینە ژێر کاریگەری ئاوا قەناعەتێکەوە کە ئێمە چەوساوەی زوڵمی عەرەبانین، ئەمە (لوژیكو مەنتیق) نیە.

خۆشەویستان ئەو شەرەی ئێستا لەوێ ئەگوزەرێت بمانەوێو نەمانەوێت ئاشکرای بکەین یا نا، شەری ئاینەو قینی جولەکە لەهەموو موسوڵمانێکە، بۆیە دەبێت حسابی بین، ئەگەرچی زۆ لەسەرکردەی وڵاتە عەرەبیە بەتواناکان ژێربەژێر لەبەر بەرژەوەندی کورسیان هاوکاریانن.

ئەم چیرۆکە واقعیە کە بۆتان دەگێرمەوە:

بەسەرهاتی گەنجێکی عەرەبی موسوڵمانە کە ٢٥ ساڵ ئەڵقە لەگوێو چڵکاو خۆری جولەکە بووەو دوای ئەوان توریان داوە، خۆشی پەشیمان بۆتەوەو تۆبەی لەبەکرێ گیراوی کردووە.

گۆڤاری العالم لەژمارە ـ ٥٨٤ ـ ی دا ئەم چیرۆکەی بڵاوکردۆتەوە، سەرئەنجام خیانەتو ناپاکی لێوە ئاشکرا بووەو ئەمەش لێرەدا دەرئەکەوێ سەرئەنجامی پوچ دەرچوونی خیانەتو ترسناکی فروفێڵی جووەکانیش دەرئەخات.

ئەمە تەنیا چیرۆکێك نییە لەسەر کاری سیخوری، ئەمە راستیەکە دەربارەی ئەو هەموو تاوانو پیلانانەی بەرامبەر ئیسلامو موسوڵمانان ئەکرێ ئەمە وانەیەکە بۆ وریابوونو تێگەیشتنی لەسروشتی کاری دەزگا سیخوریەکانو ئامانجەکانیان.

بــەڵێ لەســەر زەویــە داگیرکراوەکــانی فەلەســتین دۆسـیەکە (فەحایدیــە) فەلەستینیەکان پڕیەتی لەچەندەها چیرۆکی بـەکرێ گـیراوان، مێـژووی مرۆڤایـەتیش لەهەموو جۆرەکانی روبەڕوبوونەوەدا چەندەها چیرۆکی تیایـە، ئـەوەی شـیاوی وتنـە جـۆری روبەڕووبوونــەوە لەگــەڵ جولەکەکانــدا زۆر جیــاوازە.. داگیرکــەر چــەندین شێوازی ناشیرینو نامۆ بەکار ئەهێنێ بۆ خستنە داوی نێچیرەکانیو جێبەجێ کردنی بەرنامەکانی، ئەم روداوە چەند ناوچەیەکی (فەلەستینو ئوردونو سعودیەو لوبنـانو تورکیا) ئەگرێتەوە، دواتر لەبەندیخانەی (مەجدۆ)، بەدەستی دەزگـای ئاسایشی سـەر بە (حەماس) کۆتایی پێدێت.

کاتێك کـە ویـستراوە ئـەم بـەکرێ گـیراوە گەورەیـە ریزەکـانی بزوتنـەوەی حـەماس ببڕێو بچێتە ناوەوە بەتایبەت دەزگای سەربازی بزوتنەوەکـە، ئەمـەش بەشوێن کـارە تۆڵەسێنەرەوەکانی (حەماس) کە بەشوێن شەهیدبوونی ئەندازیار (یەحیا عەیاش) دا هات.

گۆڤاری العالم بۆ ناوی بەکرێ گیراوەکە کە لەئێستا بەدواوە خۆی قسە ئـەکا، خـۆی بەسەرهاتی خۆی ئەگێڕێتەوە، پیتی (خ)ی بەکارهێناوەو ئێمەش هەروا ئەکەین.

(خ) سەبارەت بەژیانی خۆی ئەڵێ:

لـەناو خێزانێکـدا گـەورە بـووم جگـە لـەناو و هەنـدێ عـاداتو تەقالیـد هیـچی تـرم لەئیسلام نازانی، لەگەڵ باوكو دایکێکـی نەخوێنـەوار لـەکۆی (١٠) دە منـداڵ مـن سـێیەم منداڵی خێزانەکەم بووم ماڵمان لە (قودس)، بوو باری قـورس بـژێوی وایلێکـردم زوو واز لەخوێنـدن بهێـنم لـەپۆلی سـێیەمی ناوەنـدیـدا رووم کـردە بـاری گرانـی ژیـان ئـەو بـارە دڵتەزێنەی کە داگیرکەر خولقاندبووی، ئـا لـەم (گۆمـە بۆگەنـە)دا داری نەهامـەتی سـەوز بوو لقوپۆپی کردو منی گەیاندە ئەم ئاستە، ئەمە پەروەردەی مـن بـوو لەتەمـەنی پـازدە ساڵیدا بەهۆی تۆڕە ئیستخباراتیەکانی (صەهوێنیە)کانـەوە چیرۆکی ونبـوونو رووخـانم دەستی پێکرد.

لەسـاڵە رەشـەکانی عـومری مـن گـەلی فەلەسـتین لەسـاڵی ١٩٧١ بـوو کاتێـك کـە گیـانی گەنجێکی وێڵ بـەدەمارەکانی گیانمـا هاتوچۆی ئـەکرد، وەك هـەموو گـەنجێکی پـەروەردە نـەکراو بەپەروەردەیەکی پاكو چاك دەستم کرد بەنەتك کردنی ناموسی خەڵکیو شـوێن کچو ئافرەتەکانیان ئەکەوتم.

هاتوچۆی گەڕەکە جولەکەکانم نەکرد، بوونی ئەو گەڕەکانە مەترسی زۆری لەسەر گەنجی تازە پێگەیشتوی فەلەسینی هەبوو.

رۆژێك چاوم کەوت بەکچە هاوسێکەمان بەجل و بەرگێکی تەسك و دانەپرشراو ماکیاجەوە.. خۆمم پێنەگیراو لێی نزیك بوومەوە.. دەستم بەقسەکردن کرد لەگەڵیدا کە هەستم کرد دەوروبەرمان چۆڵە پەلامارم دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم و رایکردو خێزانەکەی ئاگادار کردەوەو ئەوانیش باوکمیان ئاگادارکردەوە، لەوێوە دنیا رووخا.. باوکم بردمیە ژورێکی چۆڵەوە کە بۆ کۆکردنەوەی کەل وپەل و خواردەمەنی ئامادە کرابوو، بنمچیی ژورەکە پارچە ئاسنێکی شۆڕی پێوە بوو قاچ و دەستی بەستم و هەڵیواسیم وەك جەلادێك تێم بەربوو بەلێدان و قسە پێوتن، بەدەنگی بەرز هاواری ئەکرد: (هەر ئەو کوژم) ئاوازی هەر (ئەو کوژم) ئەو ژوورەی هەژاندبوو.. بیرم لەرابردوو ئەکردەوە.. بێئەوەی پەروەردەم بکاو پێداویستیەکانم بۆ دابین بکات ئێستا وەك (حاکمێك) وەکو (جەللادێك) هاتۆتە وێزەم لەسەر گوناهێك کە ئەو خاوەنیەتی بۆ لەخۆی نادات، بۆ سزا بۆ ئەو نەبێت؟!

لەژێر چزەی شەلاقدا بێئاگا وتم: خۆشم ئەوێ!

باوکم تورەتر بوو وتی: خۆشەویستی راستەقینەت فێر ئەکەم ئەو وتەیەم لەخۆیەوە بوو، چ خۆشەویستیەك کە من هیچی لێنازانم و لەسەری پەروەردە نەکراوم.

چاوم لەژێر چەتری ترس و لەرزا هەڵهێنا.. جگە لەهەژاری و نەداری چیترم شك نەبرد، بەردەوام بێبەزەییانە لێیدەدام.. پڕ بەگەروم هاوارم ئەکرد.. دایکی بەسۆزیشم لەپشت دەرگای داخراوەوە هەر داوای بەزەیی لەپیاوێکی بێبەزەیی ئەکرد بۆ گەنجێکی بێئیرادە لەژیاندا.. تا خاڵم دەرگای شکاندو بەهەموو هێزێکیەوە باوکمی دوورخستەوەو لەشیشە ئاسنەکە دایگرتم و خوێن بەلاشەمدا دەهاتە خوارێ زیاتر لەهەشتا شەلاق ـ قامچی ـ لێدابووم (زینا)، کەریش بەو شێوەیەی پێناکرێت.. ئایا زینام کردبوو؟!

- نەخێر.

هەرچەند هەموو شتێك ئامادەبوو بۆ ئەو جۆرە کارانە بەتایبەت لەئافرەتێکی بێئیلتیزامی وەك هاوسێکەمانەوە.

دایکم ناردمی بۆ لای پورم بۆ چارەسەری برینەکانم، چونکە ئەو پەرستیار بوو، رادەی شەش مانگ مامەوە، دوایی گەڕامەوە ماڵی باوکم دانیشتنی بەزۆری لەماڵەوەدا

بەسەردا سەپاندم، دایکم‌و خاڵم، باوکمیان هێنایە سەر ئەو رایەی کە وازم لێبێنێ‌و بمنێرێ بۆ ئیش کردن من جگە لەترسی باوکم هیچی ترم نەئەزانی، بەسەرگەردانی لەماڵ چوومە دەرەوە.

بڕیارمدا لەو باروگوزەرانەدا رزگارم بێت.. لێرەوە نەهامەتی من دەستی پێکرد، ئوتێل (A): ئوتێلێکی جولەکەکانە لەقودسی داگیرکراو هەوڵمدا بچمە ژوورەوە پاسەوانی ئوتێلەکە نەیهێشت.

بەهەر شێوەیەك بوو دوای هەوڵدانێکی زۆر گەیشتمە (پرسگە)ی ئوتێلەکە، داوای ئیشێکم کرد کە بیکەم.. هەر ئیشێك بێت. داوای ناسنامەیان لێکردم، پێم نەبوو، وتم: تەمەنم پازدە (١٥) ساڵە.

وتیان: کارمان بۆ تۆ نییە، چونکە یاسا رێنادات.

بەدەم گریانەوە لاشەی خۆمم روت کردەوە ئاسەواری لێدانەکانی باوکم نیشاندان، وتم:

(تاکە چارەیەك بۆ دەربازبوون لەم گرفتەی من ئیشکردنە).

ئەفسەری ئاسایشی ئوتێلەکە هات‌و حاڵەتەکەی بینیم‌و سۆزێکی گورگانەی بۆ نواندم‌و بردمیە ژوورەوە هێمنی کردمەوە.

وتی: دوو دڵ مەبە، بەهەر نرخێك بووە ئیشێکت بۆ ئەدۆزینەوە.

ئەمە یەکەم سۆز بوو لەژیانمدا بەرامبەرم بنوێنرێت، دوای ئەم هەموو تاڵی‌و نەهامەتییەی کە دیبووم ئەویش لەکێوە، لەجولەکەیەکەوە، سەیرە (خ) بەکرێگیراو لەگێڕانەوەی بەسەرهات‌و بەدبەختیەکانی ژیانی بەردەوامەو دەڵێ:

درۆ ئەکەم ئەگەر بڵێم سەربازە جولەکەکەم خۆش نەئەویست‌و هەستم بەسۆزی نەکرد، دەستم کرد بەپاککردنەوەی قاپ‌و قاچاغی ئوتێلەکە دواتر لەشیرینی دروستکردندا ئیشم کرد،

زیرەك بووم‌و زوو فێری ئیشەکان ئەبووم، دواتر کرام بەکارگوزاری ئوتێلەکەو هەندێ زانیاری دەربارەی خۆشاردنەوەیان پێدام کاتێك (سەرپەرشتیاری وەزارەت)ی کار بهاتایە بۆ ئوتێلەکە، چونکە تەمەنم یاسایی نەبوو بۆ کارکردن لەو شوێنەدا مانگانە (١٥٠) لیرەی ئیسرائیلیم وەرئەگرت، کە ئەمە بۆ ئەو کاتە زۆر بوو، باوکم زۆر دڵخۆش بوو کاتێك پارەم خستە گیرفانی.

پارە زۆر خۆشەویست بوو لای، هەموو مانگێك پارەکەمی ئەبرد پەشیمان بووم لەوەی کە هەواڵی ئیشکردنەکەمم دابووێ، چونکە هیچی نەئەدا بەخۆم. بوومە سەرچاوەی پارە بۆیو نیشانەی رەزامەندیش ئەوەبوو کە هەموو مانگێك پارەکەمی بدەمێو ئیتر بەلایەوە گرنگ نەبوو لەکوێوە دێ.

## سەرەتای قۆناغێکی نوێ (گەیشتن بە راحل)

راحل: کچە تاقانەی ئەفسەرێکی مومخابەرات بوو لەگەڵ باوکیا بۆ بەرژەوەندی (شابا) کاریان دەکرد، زۆر جوان بوو تەمەنی (٢٠) ساڵ بوو، رەوان قسەی ئەکرد، بەرەچەڵەك عێراقی بوو.

بەهۆی ئیشەکەمەوە لەئوتێلەکەدا (یەکترمان ناسی، پەیوەندیمان بەهێز بوو، نزیك بوونەوە، گاڵتەکردن، خۆشەویستی)،

بەڵێ پێشەکیەکانی کاری سێکسی (زینا) تا شەوێك لەماڵیاندا خۆمم بینیەوە کە نزیك لەئوتێلەکە بوو.. باوکیم ناسیو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، پارمەتیم لێوەرگرت، چوومە ژوورەکەی (راحل).

لەچەند ساتێکی کەمدا لەکەشێکدا خۆمم دییەوە کە بەخەیاڵمدا ناهات.

ژوورێکی بچوکی رازاوە بەجۆرەها وێنەی پیاوو ئافرەتی ئەکتەرو گۆرانی بێژو جێخەوتنێکی جوانو بۆنێکی خۆش، ئەمە جولەکەیە،،

لەسەر جێگەکەی دانیشتمو دەستی هێنا بەسەر شانماو بەنەرمییەکەوە وتی: خۆشت دەوێم؟!

هیچ نەبوو لەوەی رێم لێبگرێت بڵێم: ئا خۆشم دەوێی.. ئەو زەویەشم خۆشدەوێ کە گوزەری پیا ئەکەی. ئەمە یەکەم جار بوو لەگەڵ کچێکدا تاك ببمەوە.

باوکم گوێی نەدا بەدیار نەبوونم، بۆ؟

لەبەر ئەوەی هێشتا خۆشەویستی پارەی ماوە

لێی پرسیم: بۆ ناگەرێمەوە؟

وتم: پێویستی کارەکەم وایە.

باوکم وتی: باشە.

پەیوەندیم لەگەڵ (راحل)دا گەرم بوو وام لێهات بێئەو تامی ژیان نەزانم (خەوتن، خواردن، خواردنەوە) لەوەش ترسناکتر (سێکس) هەرچی گەنجێکی سەرگەرم بیەوێ لەگەڵ (راحل)دا بەهەمێنیو زۆری دەست نەکەوت.

دوای ئەو پەیوەندییە (سۆزیو گیانیو بەرژەوەندی)یەی کردم بەجوولەکەوە هەڵتەقیم بەهەڵوێستێکدا قەت بەخەیاڵمدا نەنەهات.

ئا لەو ژووری تامو چێژی گەنجانەدا (راحل) وتی: خۆشەویستم پرسیارێکت لێبکەم بەمەرجی بەڕاشکاوی وەڵامم بدەیتەوە.

وتم: فەرموو

وتی: ئایا جولەکەت خۆشدەوێت؟!

وتم: ئا.. ئا لەپێناوی تۆدا هەمزو ژیانم خۆش ئەوێ، هەموویانم خۆشدەوێت.

وتی: لەپێناوی مندا نا، ئەمەوێ بزانم بەبێ من خۆشت دەوێن یان.. نا؟

وتم: بەڕاشکاوی ـ سراحت ـ نا.

وتی: بۆ؟

وتم: لەبەر ئەوەی زەویان بردوین.

راحل شەیتانانە لێیپرسیم: کێ ئەڵێ ئەوە زەوی ئێوەیە.. ئەوەی زەوی جوولەکەیە بەدرێژایی هەزاران ساڵ.

وتم: نا هی عەرەبە، ـ گفتوگۆکەمان گەرم بوو ـ،

وتی: بەڵگەت چییە؟ بۆم بسەلمێنە!

شڵەژامو بێدەنگ بووم.

بەدرێژایی ژیانم هیچم بۆ باس نەکرابوو تا شارەزابم

وتی: بەڵگەم پێیە لەگەڵ باوکمدا دابنیشە، بۆت بسەلمێنێ کە ئەم سەر زەوییانە هی جوولەکەن.

بۆ ئەوەی پەیوەندییە (حەرامو ناشەرعییە)کەم بەردەوام بێتو نەپچڕێم ئامادەیی خۆمم نیشاندا، کاتی بۆ دیاری کردم، دانیشتن لەگەڵ باوکیدا شتێکی نوێ بوو بەلامەوە ترسو شڵەژان، شتی کتوپڕی پێوە دیاربوو، دوای پێشەکییەکی سادە بەوشەیەکی بروسک ئاسا رایچڵەکاندم وتی:

سەرم سوڕما لەپرسیارەکەی، من بۆ شتێکی تر خۆم ئامادەکردبوو، پرسیارێکی تری لێکردم.

تفم قوت دایەوەو هەناسەم هاتەوە یەك بەنارەحەتییەکەوە

وتم: بۆ کێ؟! ئێوە کێن؟

بێدەربەستانە وتی: موخابەراتی ئیسرائیلین (موساد)،

تەکانم دا.. دڵم لەتاوانا سەمای ئەکرد، دەمارەکانم گرژبوون، ویستم خۆم کۆبکەمەوەو بڵێم بەدەنگی بەرز: نا.. نا.. نەخێر.

بەڵام لێوم نەبزواند، پەتی بێدەنگییەکەمی پچڕاند.. بەدەرهێنانی هەندێك وێنە لەژێر ئەو کورسیەی کە لەسەری دانیشتبوو فڕێی دایە سەر مێزەکەی بەردەمم هەندێکیان کەوتنە خوار، سەیرم کردن زیاتر لە (١٠) وێنەی منو راحل بوون بەشێوەی بێئابڕوانە گیرابوون لەکاتی خۆیدان وامئەزانی خۆشترین کاتی ژیانمە، ئەم جارەش وتی:

چی ئەبێ گەر ئەم وێنانە بگەنە باوکت؟

وتم: نا.. جارێکی تر ئەو دڕندەیە!.. تکات لێدەکەم شتی وا نەکەی.

- زۆر شڵەژام - چیت ئەوێ لێم؟

لەسەرخۆ وتی: پەیوەندی، بەباوکی (راحل)م وت: باشە.. باشە.. باشە

دەموچاوی کرایەوەو زەردەخەنەیەکی زەردیش سەر لێوەکانی راحل کەوت، لێم نزیك بۆوە، راحل خۆی‌و باوکی دەستیان کرد بەڵدانەوەم، وتیان:

ئەم کارە ئاسانە، کەس پێینازانێت، شتی گرانیش نادەن بەسەرتا، لەگەڵ راحل‌و ئەوانی تریشدا بەخۆشی ژیان ئەبەیتە سەر، پارەی زۆرو ژیانێکی خۆش بەسەر ئەبەیت.

راحل دەستی گرتمەوە بەرەو شوێنی جاران.. بەم شێوەیە رێگەی رووخانم گرتەبەر.. رێگایەك کە گەڕانەوەی تیا نییەو کۆتایشی نیە!!

**چۆن بەکرێ گیراو دروست دەکرێت!؟**

دوای دوو رۆژ لەوەی بۆم گێڕانەوە لەکاتێکی بڕیارلەسەردراودا لەگەڵ (باوکی راحل) چووم بۆ شوێنی دیاریکراو لەسەیارەیەکدا سواربووین بەرەو بینایەکی پۆلیس لە (قودس) رۆشتینن لەنهۆمی دووەمدا چوینە ژورێکی فراوان کە لەناوەڕاستی مێزێکی شێوەبازنەیی چەند کورسییەك بە دەوریدا دانرابوون لەلای راستیدا تۆپێکی نەخشەی جیهان دانرابوو دیواری ژوورەکە بەچەند نەخشەیەکی شارە فەلەستینیەکان کە

(شوێنەواری جولەکە) یان تیایە رازێنرابۆوە، وەك شارەکانی (قودس، حەیفا، یافا، عەکا، ئەسرود، ئوم رشاش)، ئەم وێنانە نامۆبوون بەلامەوە بەتایبەتی شوێنەکەش، خەیاڵم فڕیو ئاگام لەخۆم نەبوو سەیری وێنەکانم ئەکرد، باوکی راحل وتی: دانیشە

دانیشتم.. ئێستا سەیری وێنەکانم ئەکرد چاوم بەهۆڵەکەدا ئەگێڕا، بەهاتنەژوورەوەی هەندێك کەس پەتی خەیاڵم بچڕاو شڵەژامو لێیان ئەترسام.

لێی نزیك بوومەوە چرپاندم بەگوێیدا وتم: ئەمانە کێن؟

من چینەکەم لەگەڵیاندا؟ بەزەردەخەنەیەکەوە پێی وتم: پاش کەمێکی تر ئەزانی، پێکەوە دانیشتینو بەشێوەیەکی کۆمەڵو تێکەڵ وتیان: بەخێربێیت.

یەکە یەکەی ئەندامەکانیان پێناساندم:

د. دێڤێت: پسپۆڕ لەبواری مێژوودا، هەرچیت پێویست بوو لەمێژووی جولەکەوەو خاوەندارێتی لەزەوی فەلەستینو زەوی (ئەرزولمیعاد) دا پێت ئەڵێو فێرت ئەکات.

کاپتن موشێ: پسپۆڕ لەهونەری بەرگری کردن لەخۆ (دفاع عن النفس) زانیاری تەواوت لەو بارەیەوە دەداتێ.

کاپتن ئیسحاق: فێری هەندێ چەکی پێویستت دەکات.

من هزرم فڕی بوو!! تەنها تۆزێ زەردەخەنەم کرد، تەنها ناوی ئەو چەند کەسەم لەخەیاڵەو نازانم ئەوانی تر بۆچی هاتوون،

دوای ئەوە دانیشتنەکە کۆتایی هات، باوکی راحل وتی: لەئێستاوە قۆناغێکی تازە دەستپێدەکەیت، بەوازهێنان لەئوتێلەکە.

وتم: ئەی پارە.. ئەی باوکم؟!

بەپێکەنینێکەوە: دوودڵ مەبە، بەزیادەوە هەرچیت بوێ بۆت دەکەین، ئێستا تۆ لەگەڵ ئێمەی هەفتەیەك مۆڵەتت پێشکەش دەکەم، دوای دەگەڕێیتەوە بۆ دەستبەکاربوون، چی ئەڵێی؟!

وتم: سوپاست دەکەم.

بەگاڵتەیەکەوە لێیپرسیم: مۆڵەتەکەت لەگەڵ کێ بەسەر ئەبەیت؟

وتم: نازانم خەریك بوو شەرم ئەیگرتم.

بەڵێ باوکی راحل لەوێدا وتی: (راحل)م ئامادەکردووە مۆڵەتێکی خۆش لەقەراغ دەریا لە (ئوم رەشاش ـ ئیلاد) بەسەر دەبەیت، راحل لەوێ (شوقەیەکی) بەکرێ گرتووە.

گەشتەکەمان دەستپێکرد (مەلەکردن، سەما، خواردن، خواردنەوە) ئەو هەفتەیە بەیەك رۆژ تێپەڕی، رۆژانێکن لەیاد ناچن.. دوای هەفتەکە گەڕامەوە ماڵ بیانوی زۆری کارو سەرقالیم بۆ باوکم هێنایەوەو هەندێ پارەم دایە.

هەرگیز لەمنی نەپرسی بوو لەکوێ بویت؟ تەنیا پارەی ئەویست.

لەسەر پەیمانەکەی پێشو پەیوەندیم بەباوکی راحلەوە کرد، کاتێکی بۆ دانام، رۆژی دوای بەیەك گەیشتن سواری سەیارەیەك بووین و بەرەو (تەلرەبیع) رۆشتین، چوینە شوێنێکەوە کە پێشتر نەمدیبوو (سەربازگە)یەکی گەورە!! جادەی پان، شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکە، بینای دورودرێژ، فڕۆکەی سەربازی، بەچاوگێڕانم بەو شوێنانەدا هەستم بەدرێژی رێگا نەکرد، چەند پرسیارێك لەمێشکمدا گرێیان ئەخوارد: من بۆ لێرەم.. بۆ.. ئەم شوێنە کوێیە؟! بەباڵەخانەیەکدا سەرکەوتینە سەرەوە، دانیشتین نانمان خوارد،

د. دیڤیت کە راسپێردرا بوو بیسەلمێنێ کە زەوی فەلەستینی زەوی جولەکەیە دەستیپێکرد:

زەوییەکانمان خوا بەڵێنی پێداوین کە زەوی ئێمەن.. (ئەرزی میعادن) ئێمە ئامادەین بەئاشتی لەگەڵتانا بژین و ناتان کوژین وەك موسوڵمانەکانی لەگەڵ ئێمەیان کرد.

ئەم جۆرە رستانەی بەسەرما خوێندەوە بۆ ئەوەی (قەناعەتم) پێبکات، وشەکانی وەك ئەوەی لەگەڵ شیری دایکما خواردبێتم لەمێشکمدا جێگیربوون! من لەرزۆك و لاوازو دۆڕاو بووم هەستم نەکرد دیلی ئەوم هیچ وشەیەکم لێ ون نابوو بەدەمیا هات تۆزێك بێدەنگ بوو، دوای ئەوە دەستی کرد بەگەڕان لەجانتاکەیا هەندێك شتی دەرهێنا وەك:

(نەخشەو کتێب و بروسکەی کۆن و نامەی کۆن) دەیخوێندەوەو وەریدەگێڕانە سەر زمانی عەرەبی کە بەئاسانی لێیتێئەدەگەیشتم، هەندێ کتێبی دەرهێنا دەربارەی شارستانیەتی جولەکە لەسەردەمی (کەنعانی)یەکاندا چەند سەرم سوڕما کاتێك:

١/ هەندی نەخشەی فەلەستینی دەرهێنا کە مۆری تورکی پێوەبوو.

٢/ وێنەی مەلیك فاروق سەلام لەهرتزل دەکا.. بەڵگەنامەیەکی پێشکەش ئەکا تیایدا هاتووە (مەلیك فاروق شاهیدی ئەدا کە فەلەستینی موڵکی جولەکەیە لەدێرزەمانەوە، عەرەبەکان هیچ موڵکایەتییەکیان تێدا نییە؟!

٣/ وێنەی مەلیك (عبداللەی یەکەم)ی پیشاندام کە بەدەستی راستی سەلام لەپیاوێکی ئاینی جولەکە دەکاتو بەدەستی چەپیشی بەلگەنامەیەکی پێئەدات کە هەردوکیان دەستیان پێوەیەتیو زەردەخەنە دەکەن، ئەم بەلگەنامەیە بەزمانی (عەرەبیو عیبریو ئینگلیزی) نووسرابوو مۆری ئەویشی پێوەبوو.

٤/ نەخشەیەکی ئەلمانی پیشاندام کە ئەیسەلمێنێ فەلەستین زەوی جولەکەیەو هەندێ لەو نەخشانە لەزەمانی (هتلەر) دا سوتاونو نەماون.

ئەمانە هەموویان وایان لێکردم نەترسم، ئەوانە سەرانی عەرەبن شایەتی بۆ ئەوان ئەدەن من چیم؟؟!

د. دیڤیت هەر قسەی بۆ ئەکردم: لێرەدا باسی چەوسانەوەی جولەکەی کرد لە (ئەوروپا) وە بۆ (روسیا)و (ولاتانی عەرەب، بەچڕی باسی ئەو مەرگەساتانەی کرد کە بەسەر جولەکەدا هاتوون، بەتایبەت لەسەردەمی دەستەلاتداری (هیتلەر)دا.

من بۆ ماوەی چەند سەعاتێك دانیشتمو گوێم بۆ ئەو وانانە گرت دواتر بۆ ماوەی چەند رۆژێك بەردەوام لەسەر ئەو وانانەو خولی لەو جۆرەم ئەبینیو لەنێوان هەر خولێکدا رابواردنو ئارەزووبازیو تێکەلی ژنە جولەکەی بەدوادائەهات ئەمە باوی جووەکان بوو!

لەقولاییو کانگای دلەوە قەناعەتم کردبوو کە زەوی فەلەستینی هی جولەکەیەو مافی خۆیانەو ئێمە شەڕیان پێئەگێڕین.

بەلێ: من چونکە دۆڕاوبووم (رۆحم پێش عەقلم) لەگەلەکەم جیابوبۆوە، دوای ئەوە چوومە خولێکی ترەوە کە مەشقکردن بوو لەچەكو راهێنان لەسەر کاراتی، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە توانای جەنگیمان بەهێزبێت کە پێویستن بۆ هەموو بەکرێگیراوێك کە بەهۆیانەوە پارێزگاری لەخۆی پێبکات بەپلەی یەکەم، دووەمیش بۆ ئەوە بوو کە ئەو ئەرکانەی ئەکەونە ئەستۆی بەجوانی رایان پەڕێنێت.

ئاهەنگێکی رێزلێنانیان بۆ گێڕامو نزیکەی (٢٠) کەسایەتی ئامادەبوون، لەنێوانیاندا (ئەفسەرو سەرباز)ی ئافرەتی تیابوو.

دوای وتنەوەی وانەکان دەستمان ئەکردە خواردنو خواردنەوەو سوڕدان کاسێتی عەرەبی خرابویە سەرا!

یەکێك لەئافرەتە سەربازەکان دابەزیو دەستی کردە سوڕدان باوکی راحل ئاماژەی پێدام، کە ئەتوانی لەگەڵ ئەودا بیتو چەند ساتێك لەگەڵی بمێنمەوە.

دوای ئەوە (٥٠٠) پێنج سەد لیرەی ئیسرائیلی پێدام (١٥٠) سەدوپەنجا لیرەم لێدا بەباوکمو ئەوی ترم لەخواردنو خواردنەوەدا خەرج کرد.

خولێکی تر دەستی پێکرد زۆر قورس بوو: مەشقکردنی زۆر بوو.. بەرنامەیەکی نان خواردنیان بۆ دانام، بەڵام پابەند نەبووم پێیەوە.

مەشقکردن لەسەر (جۆدۆکاراتی) و (بەرگریکردن لەخۆت) خولیام بوو لەگەڵ بەکارهێنانی جۆرەها چەك کە لەخولێکی چڕوپڕی شەش مانگیدا تەواوکرا.

دوای خولەکە ئاهەنگ وەك جاران گێڕدرا ژمارەیەکی زۆر (ئەفسەرو فرۆکەوانو سەربازی ژن ـ مجندە)ئامادەبون.

مۆڵەتی کارەکانی پێشووم وەرگرتەوەو لەگەڵ پێشکەشکردنی (٥٠٠) لیرەی ئیسرائیلیو بەدلەیەکی سەربازیو مەدالیایەکی سەربازی کە لەسەری نوسرابوو (٨٨) هەشتاو هەشت، بەدلەکەم لەبەرکرد کاتێك چوومە ناو ئەفسەرەکانەوە سلاوی سەربازیان لێئەکردمو منیش وەلامم ئەدانەوە.

شریتێکی سەربازی بەشانی چەپمدا شۆڕ بۆوە چەند وێنەیەکم بە بەدلەکەوە گرت. باوکی راحل وتی: ئێستا حاڵت باشەو دەتوانیت هەر کارێکت پێبسپێرن ئەنجامی بدەی.

ئەمە بۆتان ئەگێڕمەوە لەساڵی ١٩٧٣ دا بوو.

کاتێك لەگەڵ تیمە گەڕۆکەکاندا ئەگەڕام (دەوریات) داوام لێکرابوو هەرچی بەبەسودی ئەزانم بیگەیەنم.. لەسەرەتاوە زۆر داوای هەواڵگەیاندیان لێناکردم.. بەڵام وردە وردە ئەوە بووە کاری رەسمی من لەفەلەستیندا.

یەکەمجار ئەم کارانەم ئەکرد هەستم بەدڵتەنگی ئەکرد، نارەحەتو نائاسودە دەبوومو قورس بوو بەلامەوە.. بەڵام وردە وردە لەگەڵیاندا ڕاهاتمو کەسایەتی خۆمم تیا ئەبینی.. تا وای لێهات تامو چێژیشم لێئەبرد.

یەکەم کارم: هەستام بەوێنەگرتنی چەند لاوێك کە بەشداریان لەراپەڕینێکدا ئەکرد لەگەڵ (مخابەرات)دا بەڵێن دەریم ئەکرد، بەپێی جۆری هەواڵەکە پارەم وەرئەگرت، (مقاوەلاتم بۆ مخابەرات) ئەکرد.

بەم شێوەیە پێوەیان نوسام، هەوالگەیاندن بووە خولیام. (ع) گەنجێکی فەلەستینی بوو زۆر رقم لێیبوو بەمندالی پارەکانی ئەبردم دلرەق بوو لەگەلما، جارێکیان (ع) لەپلانێکی باشدا لەگەل چەند گەنجێکی گەرەکەکەماندا بوو هەموو شیانم دەناسیو بێئەوەی پێم بزانن گوێم لێگرتنو لێیان تێگەیشتم کە (دەیانەوێت "سەیارە"یەك بتەقێننەوەو سەیارەکەشیان دیاری کرد کە کێ وەریئەگرێ، لەکوێو لەگەل سوتاندنی بیناکەشا) کارەکانیان دابەش کردو کاتیان بۆ دانا.

نەخشەکەیان توندتۆل بوو، زۆر ئازابونو باوەڕیان بەخۆیان هەبوو زۆر بەپەرۆشیش بوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەو ئەو خزمەتە بەولاتەکەیان.. قێزەونانە هەوالەکەم گەیاندو پێم وترا: سوتاندنی بیناکە گرنگ نییە، رێئەدەین بیکەن گرنگ ئەوەیە سەیارەی تەقینەوەکە پێویستە چاودێریان بکەین، دووربینێکیان پێدام کە سەیر بکەم بێئەوەی کە خۆم دیاربم، بۆ ئەوەی بەبەلگەوە لەسەر ئیشەکەیان دەستگیر بکرێن، رۆژی دواتر هەستام بەئەنجامدانی کارەکەمو سەیری شوێنەکەم دەکرد، دوای ماوەیەك سەیارەیەك هات زۆر بەخێرایی خالی کرا (بزمار، مس، ساچمە، مادەی مێوێکی سپی، وایەری گەورەو بچوك، چەند کاتژمێرێکی گەورە)، زوو هەوالەکەم گەیاندو قەناعەتم هەبوو کە نێچیرەکە پێوەبووە! زۆر هەولم دەدا بەدەمی کارەکەمەوە بچمو وامئەزانی بۆ خۆمی ئەکەم، کاتێك هەوالەکەم گەیاند بە (کاپتن ئەلیاس)، وتی: کەسەرەکان کەموکوڕیان تیایە!

وتم: چۆن؟

وتی: زەرفت بینی خوێی رەشی تیابێت؟

وتم: نەخێر!

وتی: دە بڕۆرەوە چاوەدێریان بکە.. کەرەسەکان ماویانە.. ئەیهێنن.

گەرامەوە هەمان شوێنو گوێم بۆ گرتن.. باسی ئەوەیان کرد کە کەرەسەکان ماویانە.. فلانە رۆژ ئەگات.. جارێکی تر ئەم قسانەم گەیاندەوە (کاپتن ئەلیاس).

وتی: چاودێریان بکە.. مراقبە!

لەرۆژی دیاریکراودا کەرەسەکان گەیشتن، هەر زوو هەوالەکەم گەیاندەوە، کتوپڕ لەشکری ئیسرائیلی گەمارۆی شوێنەکەیان دا، هەموویان دەستگیرکران.

کە (ع) یەکێك بوو لەوان، هەموویان دانیان نا بەچالاکیەکەیانداو نیازی خۆیان ئاشکرا کرد لەژێر ئەشکەنجەدا. لەپێنج ساڵەوە تا پازدە ساڵ حکوم دران.

دوای ئەو چالاکیە گرنگەم ئاهەنگێکی تریان بۆ گێڕام جوومکان، بەدلەی سەربازیان لەبەرکردمو شریتێکی تریان کردە شانمو هەندێکی تریش پارەیان دامێ کە هەموویم لەئاهەنگو ئارەزووبازیدا خەرج کرد، ئەمە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ بوو.

ئەوەی لێرەدا دەبێت باسی بکەم (پانتۆڵ)ێکیان پێدام کە گیرفانێکی شاراوەی تیابوو بۆ پارە هەڵگرتن بۆ ئەوەی باوکم پێینەزانێت، چونکە باوکم هەموو جۆرە گیرفانێکی ئەپشکنیمو هەرچیم پێبوایە ئەیبرد.

من زۆر بێغیرەت بووم لەبەردەم ئەودا بۆ خۆشم لەژیانیشدا هەروابووم، دوای ئەو کارە لەسەر بەکارهێنانی (دەزگای پەیوەندیکردنو ناردنو مرەکەبی نهێنیو جفرەی نهێنی رایان هێنام).

### سەرەتای قۆناغێکی ترسناك تر

دەمانەوێت بتکەینە پاڵەوان، لەگەڵ د. دیڤێت دا خولێکی تازەم بەم شێوەیە دەستپێکرد، د. دیڤیت ئەو وانانەی پێئەوتمەوە کە دەربارەی پەیوەندی کردن بوون. خولێکی چڕو پڕ بوو لەسەر جۆرەها دەزگا لەبینای (زمرد) لە (قودس) دەستپێکرد، وێنەی ژمارەیەکی زۆر ئەفسەری (سوری - ئوردنی - میسری) بەهاوەڵی هاوتا (ئیسرائیل)یەکانیانم لەوێ بینی کە وتیان: ئەمانە هاوڕێتانن رووخاونو بەپارە کڕیویانن، لەشوێنە گرنگەکانی (نیشتمانی عەرەب) دا کارئەکەن.

وێنەی چەند سەرکردەیەکی عەرەبیشم بەهەمان شێوە بینی کە چەند ئەفسەرێکی جوولەکە لەژێر ناوی جیاجیادا خۆیان گەیاندبوونێ، وێنەیان لەگەڵدا گرتبوون نیازە خراپەکانی خۆیانیان لێگەیاندبوون.

د. دیڤیت ئامۆژگاری کردم لەکاتی (راهێنان) دا نەخۆمەوە بۆ ئەوەی بیروهۆشم ئامادەبێت،

وتی: حەشیشەی بۆنیو مادەی سەرخۆشکەر بەکارمەهێنە، (ماراغۆنا) قەیناکا - بەپێکەنینەوە - کاری سێکسیش کەمکەرەوە.

لەسەر ئەم دەزگاو مادانەش راهێنانم کرد:

یەکەم (دەستگایەکی کاتژمێر کە نێنەرو وەرگربوو)، شفرەیەکی بەپیتی ئەبجەدی عەرەبی لەسەربوو بەرامبەر هەر ژمارەیەك شفرەیەك هەبوو حاسیبەیەکی لەسەر بوو (ئەمپێنێکی) وەرگرو نێنەریشی لەسەربوو.

دووەم: (مرەکەبی نهێنی) کە دوو شوشە بوو یەکێکیان نیشانەیەکی زەردی لەسەر بوو کە بۆ نوسین بەکارئەهات، شوشەکەی تر مرەکەبێکی سەوز بوو کە دوایی نوسینەکەت بێئەشۆردەوە، رەنگی زەردێکی روبە پرتەقالی ئەینواند.

سێیەم: (راهێنان لەسەر دوو جۆر مادەی بێهۆشکەر)، یەکەمیان: مادەیەکی بێهۆشکەر بوو ئەکرایە ناو خواردنەوە، ئەوەی ئەیخواردەوە بێهۆش ئەبوو، بەڵام ئاگای لەخۆی ئەبوو ئارەزووی سێکسی هەبوو چاویشی ئەکرانەوە لەگەڵ ئەوەشدا (وروژێنەری سێکسی - منشط الجنسي): هەر کەس ئەیخواردەوە نەیئەتوانی (کۆنترۆڵی) خۆی بکات، وەکو ئاژەڵی لێئەهات‌و هەڵپەی ئەکرد بۆ کاری (سێکسی) دواتر باس لەم مادە روخێنەرانە ئەکەم. بەڵێ ئازیزم (خ)ی خیانەتکار چیرۆکی (٢٥) ساڵ لەخیانەت‌و ناپاکی خۆی‌و کارکردن لەگەڵ دەزگا جولەکەکانی ئەگێڕێتەوە: رۆژێکیان باوکم لەگەڵم دانیشتبوو بەهێمنی دەستیکرد بەقسەکردن: ئیشێکم هەیەو واش دەرچوو، داوای لێکردم لەگەڵ (مامما) بچم بۆ (ئوردن) ئەو چێشتخانەیەك ئەکاتەوە منیش لەگەڵیا کار بکەم.. نەمئەزانی چۆن وەڵامی باوکم بدەمەوە هەتا بیرم دەکردەوە.. پرسم پێکردن، وتیان: زۆر باشە ئێمە کاری ئاوەهامان ئەوێت لەتۆ کە بچیت بۆ (ئوردن) لەوێ ئیش بکەیت.

زۆر پێخۆشحاڵ بووم، ئەگەر داواکاری مخابەرات‌و کاری باوکم نەگونجایە ئەبووە گرفتێکی گەورە چیم بکردایە.

خۆم پێچایەوە.. ناونیشانی چێشتخانەکەم لە (عمان) پایتەختی (ئوردن) وەرگرت دام بە (مخابەرات)و ئەوانیش ئاگاداریان کردم کە (وا)ی لەوێ ئەبینم‌و رێنمایم دەکات، لەرێگەی ئەوەوە کار دەدرێتە دەستم، (وا)ی بەکرێگیراوێکی (ئیسرائیلی) بوو لە (عمان) پەیوەندی پێوەکردم، ناونیشانی شوقەیەکی دامێ لەگەڵ کلیلەکەیدا، چووم بۆ شوقەکە تێیگەیاندم ئیشی من چییە؟

- چاودێری کردنی (سەفارەت - باڵوێزخانە)ی (سوریا - عێراق - تونس - مەڵبەندی بزوتنەوەی فەتح لەئەرش‌و میسان) پشت مەڵبەندی (هەیئەی رۆشنبیری‌و سەفارەتی ئەمەریکاو باڵەخانەی مخابەراتی ئوردونی لەعەبدەنی مەڵبەندی ئاسایشی گشتی

(الأمـين العـام) لـە (ئـەرش‌و میـسانی) لەگـەڵ مەڵبەنـدی (هەیئـەی رۆشـنبیری) کـە ژمارەیـەکی زۆر لەئەفـسەرانی ئـوردنی هاتوچـۆیان دەکـرد، ئەچـونە ئـەو مەڵبەنـدەو ناهەنگ‌و کۆڕی زۆری تیـا ئـەگێڕا.. سێ سـەیارەی (مارسـی دس و BMW) یـان لـەلابو، لەئیسرائیل فێری (سایەقی) یـان کردبـووم‌و مۆڵـەتی (شـۆفێر)یـشیان بەتـەزویر کراوی‌و بەئامادەی لەلای (وا)یەوە بەدەست گەیشت.

کاری من لەچێشتخانەکەی مامەدا تـا سـەعات یـەکی پاشـنیوەڕۆ بـوو، چونکە تایبـەت بوو بەقوتابیانەوە،، مامم رازی بوو کە ئیشێکی تریش بکەم بەدەمیەوە، چـونکە تـەواوی ئەو پارەیە کە وەرم ئەگرت لای مامم ئەچووە گیرفانی باوکمەوە.

لەگـەڵ (وا)ی ئیـشم بـۆ رێکخـرا لەیـەکێ لـە (ئارایـشتگاکاندا صـالون)دا کـە نـاوی ئارایشتگای (٩٨) بوو لەوێ بەکارگوزار دانرام‌و کاری سـەرەکی کردنیشم (سیخوڕی) بـوو، مانگی (٧٠) دیناری ئوردونیان دەدامێ ئەم (صالۆنە) مخابەراتی ئیسرائیلی دایـنابوو دوای چەند رۆژێك (وا)ی هات (چەنـد دەزگایـەکی پەیوەنـدی کـردن‌و کـامیراو مـادەی سـڕکەرو وروژێنەری سێکس‌و چەند شتێکی تر کە لەئیسرائیل مەشق‌و راهێنانمان لەسەر کردبـوو لەگەڵ خۆیا هێنای، سەرەتای ئیش بەدانیشتنێکی دوورو درێژ دەستی پێکـرد کـە (پلانـی داهاتو)ی تیا باسکراو ئیشەکانیش دابەشکران.

سـەرەتا کـاری مـن چاودێری کردنـی (بالۆێزخانـە)کـان بـوو کـامێرای بچوك لەپێـشی سەیارەکە دانرابوو لەدووری (٢٠) مـەترەوە ڕامان ئەگرتن‌و ماوە مـاوە ئـەمان گـۆڕین، بـۆ ئەوەی گومان بۆ وەستانی سەیارەکان دروست نەبێت. هەرچی زانیاریمان دەست ئەکـەوت یەکە یەکە خێرا ئەمان گەیاندن، وێنەکانیشی (ئەفسەری مخابرات) خـۆی وەریئـەگرتن.. کـاری سـیخوڕی لەسـەر (سـەفارەت)ەکـان بەسـەرکەوتوویی ئەنجامـدراو درایـە دەسـت کۆمەڵێکی تر.. ئێمەیان خستە سەر کارێکی تر، کە (روخاندن - اسقاط) بوو!!

بەڵێ کاری من روخاندنی ئەو کەسانە بـوون کـە (ئیـسرائیل) پێویـستی بـەوە بـوو کـە لـەڕووی (ئـەخلاق)ییـەوە بیـان روخێنـێ‌و بەنۆکـەرو بـەکرێ گیراویـان بکـات. ئەفـسەری مخابەرات کە لێپرسراوی ئێمە بوو هەندێ وێنەی (ئـافرەت‌و ئەفـسەری ئـوردنی) پێـدایـن وتی:

دەبێت ئەمانە بروخێنین‌و کەسایەتیان لەکەدار بکەن، خـاوەنی صالۆنەکە ژنێـك بـوو کە ناوی (B)بوو، چەنـد رۆژێکی تر ئافرەتێك ئەگاتە ئێرە کە ناوی (R)ە کارمان لەگـەڵ

ئەکات.. تا بڵێی جوانو سەرنج راکێش بوو.. ئەوان هەردوو (جوو)بوون دەستمان بەکارکردو وێنەکانمان لەبەردەمدا هەڵواسی، هەر کەس بهاتایە ناو ئارایشتگاکە لەگەڵ وێنەکانی بەردەمدا بەراوردمان ئەکرد.. بێنەوەی بەخۆی بزانێت.

ئارایشتگاکە پیاوانەبوو لەچینی بەرز هاتووچۆیان ئەکرد شوێنێکی (کەشخە - راقی) بوو، شوێنەکە تەنها بۆ روخاندن ئامادەکرابوو!

* ژورێکی تیابوو کە کامێرای ڤیدیۆی تێدا دانرابوو لەدەرەوە کاری پێدەکرا لەهەر چوار گۆشەکانی ژوورەکەشدا چوار کامێرای بچوك دانرابوو لەگەڵ چەند (کەشافە)یەکی ڤیدیۆ لەبنمچیی ژوورەکەدا.. هەر کەس بهاتایە لەوانەی کە ئەمان ویست لەناو شەربەتێکدا (وروژێنەری سێکسی) مان دەدایە.

دوای ئەوە کە (وروژێنەرەکە) کاری ئەکرد ئەمانکردە ژوورێکەوە کە پڕبوو لەوێنەی (رووت)و پاشان (R) ی جولەکەشمان بەرووتی ئەکردە لای ئەو (وروژێنەرە) ئەوەندە بەهێز بوو یەکسەر پەلاماری ئافرەتەکەی ئەداو ئێمەش وێنەمان ئەگرتو دوایی وێنەکانم پیشان ئەدا.. ناچار ئەبوو ئیشمان لەگەڵ بکات.

* دوای ئەم کارە داوامان لێکرا دەزگای قسەوەرگرتن (التنصب) بخەینە ناو (سەفارەتخانە) کانەوە.. بەتایبەت سەفارەتی (عێراق)، چونکە بنکەی رێکخراوە فەلەستینییەکانی زۆر تێدابوو لەوێ مەشقیان دەکرد.. زیاد لەوەش عێراق خاوەنی دەزگایەکی سەربازی گرنگ بوو ئەو کاتە کە ئەویستزا زانیاری زۆر لەسەر کۆبکرێتەوە.. هەروەها مەڵبەندی رۆشنبیرییەکیش سەرگەرمی ئەو کارانە بوون، لەپڕ مامم چێشتخانەکەی داخست، گەڕایەوە فەلەستین، ئەمە ساڵی ١٩٧٨ بوو!

- پەیوەندیم بەئەفسەرەکەی (موساد)ەوە کردەوەو مۆڵەتی دامو وتی: لەکاتێکی تردا بەیەك ئەگەینەوە لەسەر شتی تر رێکدەکەوین، کارەکانی تریش کۆمەڵەکەت ئەیبەن بەرێوە.

لەوێوە ئاگام لەوان نەما.. گەڕامەوە فەلەستین.. لەهەمان شوێنی جارانا بەیەك گەیشتینەوە، راپۆرتێکی درێژم لەسەر ئیشەکانم دایە وەك جاران زۆر پێکەنی.

پرسیم: بۆ پێئەکەنی؟!

وتی: تۆ ئەتوانیت هەرچی گەلەوێرانی بکەیت!

وتم: پێم بڵێ چۆن؟!

وتی: (لیبانون مسکل) کە جولێنەرو وروژێنەری زۆر تێدایە توانیم بەزۆری لە (ئوردن) بڵاوی بکەینەوە، وەجا ئەو کاتە بیبینە چی لێدێت.

وتم: ئەی بۆ نایکەیت؟!

وتی: ئێستا کاتی نەهاتووە، ئەو جۆرە کارانە بۆ کاتی ئاشتی ئەبن، کاتێك ئەبێ کە دەرگای ئاشتی بەروی وڵاتاندا روبدات (جوو) زۆر لەشەڕ ئەترسن پێویستمان بەئاشتییە..

ها ئێستا خۆت ئامادەکە بۆ شوێنێکی تر.

- بۆ کوێ؟

- بۆ سعودیە.

ئەو ناوە زۆر ترساندمی، پێشی وتم: کە ئەو کارە پێکەوە رێکدەخەین.

## بەرێگادا بۆ سعودیە

لەپێشا دەبو فیزەی کار رێکبخرێت ناوێکیان پێدام لە (عمان) کە هاوڵاتییەکی سعودی بوو بەناوی (ق)ەوە.. دەمێك بوو کاری بۆ (موساد)ی ئیسرائیلی دەکرد، چومە لای.. کاری بۆ دیاری کردم، ئەم ئیشەم لەتافی لاوێتیدا نەکردو باشم لینەزانی.

وتی: ئەبێ ئەم گەشتەت لەگەڵ من رێکبخەیت!

چومە لای باوکم و پێم وت کە کارێك هەیە لە (سعودیە) ئەمەوێت بچم.. رێگەی دامو چوومە (عمان)، لەوێشەوە چوومە (ریاض) لەگەڵ (B) ژنەدا رۆشتم کە جوولەکەیەکی زۆر جوانبوو بەزمانی عەرەبیش بەچاکی قسەی ئەکردو بەرەگەز (فەڕەنسی) بوو بەهاوەڵی (وای) و (ژنەکەی R) داوامان لێکرا بچینە ناو (مەکتەبی بزوتنەوەی رزگاری خوازی فەلەستینی)یەوەو (دەزگای قسە وەرگرتن - التنصب) تیا بچێنین، چەندەشمان بۆ کرا لەڕوخانی رەوشتی لەنێوانیاندا ئەنجامی بدەین و لەنێوان (دبلۆماسی)یە عەرەبەکاندا بەتایبەتی ناودارەکان، دەزگای تایبەتی و مرکەبی (نهێنیمان) بۆ هاتە (شوقە)کەو کە لە یەکێ لەگەڕەکەکانی (ریاض) دا بەکرێمان گرتبوو، باڵەخانەیەکی تا ئارەزوو کەیت قەشەنگ بوو.. دوو سەیارەشمان لەبەردەستدا بوو.. دەستمان کردە کارو جوڵە، چوینە ناو (مەکتەبی - نوسینگەی رزگاری خوازی فەلەستین)ی کارێکی گران نەبوو، چونکە هەمیشە (پێشانگاو کۆڕ)یان هەبوو، ئێمەش وەکو فەلەستینی بانگهێشت دەکراین،

بەهاورێیـەتی ژنـەکانمان هاتوچـۆی (نوسـینگە)کـەیانمان کـرد بـەهۆی (وروژێنـەری سێکسی)یەوە توانیمان یـەکێك لـە (دبلۆماسـی)یـەکانی نوسـینگە فەلەستینیەکە بخەینـە داوەوە بیرِوخێنین، ئەو یەکێك بوو لەنزیکەکانی من.

دوای ئەوە توانیمان دەزگای (قسە وەرگرتن) بەهۆی ئەو (نزیکەمەوە) لـەناو (سویـچی کارەبا)ی ژووری (هەڵسوێنەری کاروباری سەفیر) بچێنین.

- ئەو دەزگایە زۆر بچوك بوو لەقـەبارەی (مێش)ێکدا بـوو پێیـان دەوت (ژبابـە) ئـەم دەزگایە زۆر هەستیارە لەدووری (٥-٦) مەترەوە قسە وەرئـەگرێتو ئـەینێرێت بـۆ دووری (٤٠) چل کیلۆمـەتر لـەوێش دەزگایـەکی وەرگرمـان دانـابوو لـەدووری (٣٠) کـم لـەدووری ماڵەکەی خۆماندا، بەراستی ئەنجامەکەی سەرسورهێنەر بووا!!

بـەهۆی ئـەم دەزگایـەوە توانیمـان هەرچـی دانیـشتنی گرنگـی (نوسـینگەی ڕێکخـراوی رزگاری خوازی فەلەستین) بەراستی هەیە وەربگرین.

لەوانە (رفاندنی چەكو تەقەمەنیو نەخشەکانیانو دانیشتنە گرنگەکانیانو لەرێگەی (ئوردنـە)وەو لەرێگـەی (کارگـە)کانیـەوە بـۆ نـاو (فەلەسـتین) چـەند کـاری تـر لەرێگـەی (یەمـــەن) و (لوبنـــان)ەوە کـــە زۆرجـــار ئـــەم جـــۆرە کارانـــە لەرێگـــەی ســـەرکردە فەلەســتینیەکانەوە ئــەنجام دەدرا.. هــەروەك ئاشــکرابوونی (سیاســەتی ســەربازی بزوتنـەوەکەو ئامانجەکانیو کارە داهاتووەکانیو گواستنەوەی کاری سـەربازی بـۆ لوبنـان، لەداهاتودا کە (ئەبوزەعیم) راسپێردرا بـوو بـەم کارانـە لەگـەڵ ئاشـکرا کردنـی نەخـشەی داهاتویان کە نیازیان هەبوو چەند (کۆگایەکی تەقەمەنی) لە (صەیداو بـەیروت)، لـەژێر زەویدا هەروەها لە (عین الحلوە)، دروستبکەن، کە بتوانرێـت بـەپێی نەخـشەکانی خۆیـان سەیارەکانیشیانی تیا حەشار بدرێت بۆمبابارانی هەمیشەیی کاری لێنەکات.

یەك بەیەك هەواڵەکانمان ئەگەیاندەوە (تەلئەبیب) دوای ئـەوە دەزگایـەکی پەیوەنـدی کردنیشمان دایە ئەو نزیکەمان کە توانیبومان بیرِوخێنین هەر بەهـەمان شێوە توانیمـان دبلۆماتێکی (ئوردنیش)، لە(**ریاض**) بروخێنین.

* لەساڵی ١٩٨٠ لەرێگەی نوسـینگەی بزوتنەوەکـەوە (جـەواز سـەفەرێك) ی تـەزویریان بـۆ کـردم چومە لوبنـان لـەوێش لەرێگـەی وشـکانیەوە بەپاسـێك (٥٠) نەفـەری بـەرەگـەز جیـاواز لەچـەند وڵاتێکـەوە هـاتبوون چـوینە (سـوریا) لەسـەربازگەیەکدا دانـراین، سـێ هەفتە تیامایـنەوە، لەگەڵ مەشق کردنێکی سوك لەسەر چەند جۆرە چەکێك وەك:

(کردنەوەو هەڵبەستن‌و چۆنیەتی بەکارهێنان)یان.

لەو سەربازگەیەوە گواستراینەوە بۆ سەربازگەیەکی کە لە (صەیدا) بەفەرمانێکی رەسمی مەشقمان لەسەر جۆرەها چەك کردو و ئاهەنگێکی بەخێرهاتنیان بۆ گێراین کە (ئەبو جیهاد)یشی تیابوو.. دوای بەخێرهاتنی‌و مەشقکردن دابەشکراین منیان کردە سەرۆکی گەشتەکان واتە (دەوریات)، چونکە لێهاتوو بووم لە (سایەقیدا)، ئەوەش وای کرد کە بەئازادی بەناو سەربازگەکاندا بجووڵێم، پێش ئەوەی سەفەری (لوبنان) بکەم بەدە رۆژێك چاوم بە (ئانی) ئەفسەر کەوت‌و تێیگەیاندم کە ئیشم لە (لوبنان) چییە، ناونیشانی (نوسینگەیەکی گەشت‌و گوزار)ی دامێ‌و ئەوەی پێویست بێت لەوێ دەستم ئەکەوێت‌و ئەو سەعاتەی کە هەمبوو گۆڕی بەسەعاتێکی تازە بچوکتریش کە لەرێگەی ئەو سەعاتەوە بەردەوام پەیوەندیمان هەبوو، چەند شتێکی تری پێدام وەك (٨٥) هەشتاو پێنج جۆر کلیلی دەرگا. دەزگایەك بۆ ناردن‌و کامێرایەکی تایبەتی بۆ وێنەگرتنی بەڵگەنامە (وەسائقە)کان‌و عەینەکێکیش کە بەتیشکی (ژێر سور - تحت الحمراو) کاری ئەکرد بۆ بینینی شەو.

رۆژانە راپۆرتم دەنارد دەربارەی سەربازگەکان‌و دەرگاکان‌و هۆکانی گواستنەوەو چەك‌و تەقەمەنی‌و شێوەی گواستنەوەی، تا جارێکیان ئاگادارکرام لەگواستنەوەی (چەك‌و تەقەمەنی) کە لەرێگەی دەریاوە گواسترایەوە، داوام لێکرا کە چاودێری رێگاکە بکەم‌و جەنەراڵ (ئانی) لێئاگادار بکەم، هەستام بەو کارەو هەواڵەکانم نارد.. پێش (نیو سەعات) هەواڵم پێدرا، کە ئەو ناوە بەجێ بهێڵم، بۆردومانی کاروانەکەیان کرد بەفرۆکە.. بەڵام هیچیان پێوەنەبوو.. کە هەواڵەکەم گەیاندەوە (ئانی) زۆر تورە بوو نارەحەت بوو، شوێنی هەندێ گەنجینەی چەك‌و تەقەمەنیم زانی، بەڵام بۆردومانیان کردبوون.. زەرەری لێنەکەوتبوو! چونکە بینای چەك‌و تەقەمەنیەکان تۆکمە بوون لەژێر زەویشدا بوون.

* دوای ئەو کارانە هەستام پێیان، داوام لێکرا کە کاری رووخانی رەوشتی ئەنجام بدەم لەناو شۆرشگێرەکاندا.. ئەو کارەشم کردوو ماوەی سێ ساڵ دەستکەوتی زۆرم هەبوو، ئەنجامی چاکی گەیاند کە هەندێ کەسی (لوبنانی‌و فەلەستینی)م لەرووی ئەخلاقیەوە روخاند.

★ داوام لێکرا دەزگای هەواڵ ناردن لەهەندێ سەربازگەدا دابنێم ئەمە کارێکی گرانبوو.. چونکە (سەربازگەکان - معسکرات) ژمارەیەکی زۆر سەربازو ئەفسەری تێدابوو.. هاتوچۆیان گەرم بو.. بەڵام (ثانی) ناوی هەندێك (ئەفسەر)ی پێدام کە پێشتر کاری روخاندنیان لەسەر کرابوو لەرێگەی ئەوانەوە توانیم بگەمە هەندێك سەربازگە لە (صورو صەیدا - عین الحلوه) شوێنی کۆبونەوەکان دەزگا هەواڵناردنیان تیا بچێنم.. لەبەرگرانی کارەکە هەندێ جار پەنام ئەبردە بەر (دەرمانێکی خەوێنەر) کە بۆ ماوەی نیو سەعات توشبووەکەی ئەخەواند. توانیم بچمە هەندێ ژوور، ئەو چاویلکەیەی کە باسم کرد توانیم بەکاری بهێنم کە ئەمخستە سەرچاوی راستم بەهۆی کامێراکەشەوە وێنەی ئەو بەڵگەنامانەو پسولانەشم ئەگرد تەنانەت کلیلی دەرگاکانیش دوای ئەو کارانەش راسپێردرام کە رەواج بە (مادە بێهۆش)کەرەکانیش لەچەشنی (تلیاك) بدەم لە (لوبناندا) بەتایبەتی لەنێو جەنگاوەرەکاندا.. ئەم کارەم زۆر سەرکەوتو نەبوو!

ئەو سەربازگانەی منیان تیابووم کاتێك (پارتی زانەکان) بیانویستایە پەلامارێك ئەنجامی بدەن شەو ناهەنگیان بۆ ئەگێڕان و خواحافیزەیان لێئەکردن پێش ئەوەی کارەکەیان ئەنجام بدەن هەواڵم ئەگەیاند کە ئەبووە هۆی شەهیدبوونیان یان سەرنەگرتنی کارەکەیان، یەکە بەیەکە هەموو ئەنجامەکانم ئەزانی!؟ کاتێك ئیسرائیل باشوری لوبنانی داگیرکرد من لەوێبووم، لەگەڵ رووداوەکاندا ئەژیام، زۆرجار دەکەوتمە داوی مەرگەوەو رزگارم دەبوو، تا ساڵی ۱۹۸۳ دوای سێ ساڵ داوام لێکرا کە کە (لوبنان بەجێ بهێڵم، لەرێگەی ئوردنەوە بگەرێمەوە فەلەستینی داگیرکراو).

## جێگیربون لەفەلەستین

دوای ئەوەی ئەم رۆڵەم پێراسپێدرا بوو لەلوبناندا گەرامەوە ئوردن و ماوەیەکیش مامەوە ناهەنگێك گەورەیان بۆ گێڕاین لەگەڵ (خواردنەوەو سەماکردن و رابواردن) کارتێکیان پێدام کە بەهۆیەوە ئەمتوانی بچمە هەموو (مەلهاو سەماگەو یانەکانی خواردنەوە)وە.

★ لەئوتێلێکی شاری قودسدا دەستم بەکارکردن کرد تا ساڵی ۱۹۸۸ پلەبەندی کارەکانم لەفەلەستیندا لەساڵی ۱۹۸۳ەوە بەم جۆرە بوو کە بۆتان ئەگێڕمەوە:

یەکەم لەساڵی ۱۹۸۳ بۆ ساڵی ۱۹۸۸ سەرەتای راپەرینەکان بوو لەم ماوەیەدا کارەکانمان سوکبوون بریتی بوون لە (وێران کردن ـ روخاندنی خورەوشت ـ کۆکردنەوە زانیاری‌و چەندەها کاری تر).

مخابەرات داوایان لێکردم کەسی نزیکی خۆم تێوەنەگلێنم نەك منیش ئاشکرا ببم.. ئەوان نەیان ئەویست من لەدەستبدەن.

لەم ماوەیەی ئیشکردنەدا زۆرێك لەتۆرە فەلەستینیەکانمان ئاشکراکردو کۆمەڵانێك بەکرێگیراومان دروست کردو هەندێکیشیان فێری جۆرەها چەککران. من سەرۆکایەتی‌و سەرۆك کاری‌و رێنمونی هەندێك لەو بەکرێگیراوانەم ئەکرد لە (قودس‌و بەیت لەحم‌و رامەڵڵاو خلیل) لەو ماوەیەدا کاری زۆرم نەبوو!!تەنها کارێکم ئەوە بووخرامە خولێکی چرو‌پری بەکارهێنانی چەکەوە بۆ ماوەی سێ مانگ کە لەسەربازگەیەکدا بوو لە (تەلئەبیب) بەرووی (یافا)دا لەسەر قەراغی دەریا، لەو خولەدا کە بۆم باسکردن فێری بەکارهێنانی جۆرەها چەککرام، لەگەڵ جۆرەها تەقەمەنی‌و نارنجۆك‌و نیشانە شکاندن بەدەستی راست‌و چەپ‌و نیشانەی وەستاو و جوڵاو، نیشانەکان بریتی بوون لەوێنەی مرۆڤ کە نیشانەی (سوور) لەسەر شوێنی کوشندە دانرابوو! دەبوایە بپێکرایە کە بریتی بوون لە (دڵ و قورگ‌و سەر) ئەم خولەشم بەسەرکەوتوویی تەواوکرد.

دووەم قۆناغ لەساڵی ۱۹۸۸ ەوە دەستیپێکرد بۆ ساڵی ۱۹۹۰ کە کاتی راپەرینەکان بوو.

راپەرین بە (بەرد) دەستی پێکرد.. ئەمان ئەرانی چۆن وەڵامی ئەو منداڵانە بدەینەوە!! هەموو رۆژێك یەکێکمان لێئەکوشتن، بەڵام بەردباران زیاتر ئەبوو! بەوەشەوە نەوەستان بۆمبی (مۆلۆتۆف)یشیان بەکار ئەهێنا.. کە هەندێك جار ئەبووە هۆی سوتاندنی سەیارەو بریندار‌بونی پیاوە بەکرێگیراوەکانیشمان.. دەبێت ئەو گاڵتەجارییە کۆتایی بێت رێنادەین منداڵ یاری بەداهاتووی (ئیسرائیل) بکەن.. ئەمە ئەوپەڕی گاڵتەجارییە بەو قسانە (س)ی ئەفسەر هاتە قسە لەگەڵماندا کە بریتی بوین لەکۆمەڵی سەرۆك‌و لێپرسراوی بەکرێگیراوان.. لەم دانیشتنەماندا کارمان بۆ دیاری کرا.. دەستمان پێکرد.. بە (سەیارەو جلی پۆلیسی)یەوە، منداڵە راپەریوەکانمان ئەفراندو لێمان ئەگرتن‌و جاری وا هەبوو بۆ ماوەیەکی زۆر دورودرێژ راومان ئەنان‌و شوێنیان ئەکەوتین بەکۆڵانەکاندا تا ئەمانگرتن.. ئەم کارەشمان لەو شوێنانەدا ئەکرد کە ئەیان ئەناسین کاری دزی‌و شکاندنی دەرگای دوکانی راپەریوەکانمان ئەکرد لەگەڵ سوتاندنی سەیارەی

عەرەبەکان بەمادەیەکی سوتێنەری خێرا لەگەڵ سەربازەکاندا بەشداریمان ئەکردو گوللەمان ئەتەقاند کە هەندێکمان برینداروکوژراو ئەکردن[1].

ئەو دزیو کاولکارییەی ئەمانکرد لەنێوان خۆماندا بەشمان ئەکرد، هەروەها بەناوی لایەنە فەلەستینیەکانەوە (دروشم) - شعارمان بەدیوارەکانەوە دژی لایەنەکانی تر ئەنووسیو (پڕوپاگەندە - دیعایە)یەکی زۆرمان بەو ناوەوە ئەنوسینو هەندێك جار بەناوی ئەوانەوە باسی خۆپیشاندانی وەهمیمان بڵاوئەکردەوە.. ئەمە سروشتی کارەکەمان بوو لەماوەی دوو ساڵدا.. دوای ئەوە دۆخێکی تری وەرگرت ئەویش بەسەر گەرمکردنی خەڵکی بەخۆیانو لایەنەکانەوە نەك بەئیسرائیلەوە.

**قۆناغی سێیەم: لەساڵی ١٩٩٠- ١٩٩٢**

ئەم قۆناغە دەتوانرێت ناو بنرێت قۆناغی روخاندن: مخابەرات گەیشتبوونە ئەو رایەی کە روخاندنی گەلو وێرانکردنی بەسە بۆ زاڵبوون بەسەریاو کۆتایی هێنان بەراپەڕینەکەیان. دەستمان بەئەنجامدانی نەخشەو پیلانەکان کرد: ئەویش (شوردنەوەی مێشك)ی بەکرێگیراو بوو بەجۆرێك ببێتە پیاوێکی بەبیروباوەڕو چارەنوسی خۆی ببەستێتەوە بە (ئیسرائیلەوە)و گیان فیداو خۆبەخت کار بێت بۆ (ئیسرائیل)، ئەمەش بۆ عەرەبێکی موسوڵمان گرانە، ئەمە کارێکی گرانو درێژخایەنە لەگەڵ هەموو کەسێکیشدا ناکرێت، مخابەرات ئەیتوانی بەکرێگیراوی بکاتە راهاتن، ئالودەبون (ئیدمان) وەك راهاتن لەسەر مادە بێهۆشکەرەکان کە ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت، وە لەگەڵ ئارەزووبازیدا تێکەڵ بکرێت، کە ئەمەش لەدڵو دەروونی بەکرێگیراودا دەچەسپێو ناتوانرێت وازی لێبهێنێت.

ئێستا من بەئێوە ئەڵێم: مخابەرات زۆر بەئاسانی ئەتوانێت بەکرێگیراو دروست بکات، وایلێبکات دوای دەرچوونی داگیرکەریش ئەو (خیانەت) وەك خوێن لەدەمارەکانیدا بجوڵێت!؟.

**قۆناغی چوارەم: ساڵی ١٩٩٢- ١٩٩٣**

---

[1] ئەمە کاری دەستەڵاتدارەکانە.. بۆ ئەوان نییە دروشمی مافی مرۆڤ پیادە بکەن، بەڵام بۆ زۆرلێکراو دەبێت هەموو بەندەکانی مافی (منداڵو ژنو مرۆڤ) پیادە بکات.. پاشان شەڕ بەچەكو تەقەمەنی بۆ ئەوان زۆر ئاساییو رەوایە، بەڵام بەردو راکردن بۆ ئەمان ئاساییە!!

لەم قۆناغەدا جموجۆڵو گوڕو تینی بزوتنەوەی (حەماس)ی ئیسلامی لەزیادبووندا بوو، ئەم قۆناغە قۆناغی چڕکردنەوەی چالاکیەکان بوو لەسەردەمی (حەماس) دەربارەی چالاکیەکانو چاودێریو بەدواداچوونمان ئەکردو کارمان لەسەر روخانی ئەندامانی (حەماس) ئەکرد، چونکە چونە ناوەوەی ئەم جۆرانە لەبەر دینداریان گرانە پێویست بوین بگەڕێین بەدوای هۆی تردا، ئەویش چڕکردنەوەی چالاکیەکانمان بوو لەسەر ناوەوەی خێزانەکانیان بەتایبەتی (ئەندامانی خێزانی سەرکردەکانیان لەکوڕو کچو ژنو براو خوشكو ئامۆزاو پورزاو خاڵۆزا)، بەهەر نرخو شێوەیەك بووە لێیان رابکێشینو لەڕووی ئەخلاقو دینەوە بیانڕوخێنین.. هەتا منداڵە تازە پێگەیشتووەکانیشیان کە تازە فێری دینداریو پەروەردەی ئاینی ئەکران کە هەر چۆن لەگەڵ لایەنەکانی تردا ئەم کارەمان ئەنجامداو ئەنجامیشی هەبوو.

لەسەرێکی تریشەوە بەربەرەکانی (حەماس)مان ئەکرد بەداخستنی (مزگەوت) و (گرتنی ئەوانەی خەریکی فێرکردنو وانە وتنەوە بوون) داواکرابوو لە (بەکرێگیراوە)کانمان لەمزگەوتەکانا ئاشووبوو پشێوی بنێینەوە بۆ ئەوەی داخستنیان ئاسان بێتو حکومەت بتوانێت بەو بیانووانەوە دایان بخات.

ئەم کارانەمان سەرکەوتوو نەبوو لەبەر ئەوە بەشێوەیەکی تر دەستمان بەکارکردن کرد، بەم رێگایانەی بۆتان باسدەکەم:

یەکەم: ئەو منداڵانەمان ئەگرت کە نوێژ ئەکەن لێپێچینەوەمان دەربارەی نوێژکردنو قورئان خوێندن لەگەڵ ئەکردن تا لەماڵەوە بترسنو رێیان لەهاتوچۆی مزگەوت لێبگرن.

دووەم: گرتنی ئیمامی مزگەوتەکانو تاوان دانەپاڵیانو حکوم دانیان بۆ ماوەی درێژخایەن بۆ ترساندنی نوێژخوێنانو منداڵەکانیان بۆ ئەوەی هاتوچۆی مزگەوت نەکەن. فەرماندرابوو بە (کرێگیراو)ەکان هەستن بەکاری (نێربازی) لەناو مزگەوتەکاندا، پەردەی لەسەر هەڵماڵدرێت تا مزگەوتەکان پیرۆزیان لەدەست بدەنو لەبەرچاوی دایكو باوکی منداڵانی هاتوچۆکەرانی بکەوێت.

## قۆناغی پێنجەم: لەکاری خیانەت لەساڵی ١٩٩٢ – ١٩٩٥

ئەم قۆناغە ئیش کردن بوو دژی (کەتیبەکانی عزمت الدین قەسام) (باڵی سەربازی بزوتنەوەی حەماس) ئەم کارەشمان لەباشوری فەلەستین چڕ کردبۆوە لەناوچەکانی (قودس ـ بیت لحم ـ رامەڵلا ) بەم جۆرە:

یەکەم: سواری سەیارەی عەرەب ئەبوین‌و بەتەواوی چەك‌و تەقەمەنی‌و دەزگای پەیوەندی کردنەوە، وە بەدرێژایی شەووڕۆژ هاتوچۆمان ئەکرد چاودێری ئەو هێلانەمان ئەکرد کە تەقەیان لێئەکرا، ئەگەر سەیارەی جولەکەمان بدیایە (خۆی بەتەنها) دوای ئەکەوتین تا بەسەلامەتی ئەمانگەیاندەوە شوێنی خۆی.. جارجارەش کەوتنە (مەفرەزەکانی جەیش)و پارێزگاریمان ئەکردن بەکارهێنانی سەیارەی عەرەبی بۆ ئەوە بوو کە چوینە ناو شارە عەرەبیەکانەوە ئاسان بوو هاتوچۆ بکەین.

دووەم: بەکارهێنانی شوێنە مردووەکان: ئەو شوێنانەی کە (مخابەرات ڕێکخستنی کەتیبەکانی) تیا ئاشکرا بکات ڕێکخستنی نوێمان تیا دروست دەکرد، کاری دەستوەشاندنمان پێئەنجام ئەدان بۆ ئەوەی کەتیبەکانی تر وابزانن لەوان‌و دروست بوونەتەوە.

لەکاتی دەستوەشاندندا ئەمانگرتن‌و ڕەوانەی زیندانەکانمان ئەکردن بۆ ئەوەی لەوێش بکەن‌و سودبگەیەنن‌و بەهۆیانەوە چونە ناو کەتیبەکانەوە ئاسان بێت، بەڵام ئەم جۆرە کارانەمان زوو ئاشکرا ئەبوون لەلایەن کەتیبەکانی (عزمت الدین قەسامە) وە بەهۆی ئەو ڕێگا جۆرەبەجۆرانەی کە ئەوان ئەیانگرتەبەر.

تەوەرێکی تری ئیشمان کارکردن بوو لەسەر ڕوخاندنی ئەو کەسانەی کە جێگەی متمانەو بڕوای (حەماس) بوون‌و لەرابردوودا زۆر چالاك بوون، ئەگەر لەگەڵ یەکێکیاندا سەرکەوتنمان بەدەست بهێنایە بەکارمان ئەهێنا بۆ لێدانی کەتیبەکان لەناوەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە جێگەی بڕوان‌و کاری چوونە ناوەوە لەرێگەی ئەوانەوە زۆر ئاسان بوو.

ئازیزان ئەوەی ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە قسەو ڕوداوی خیانەتکارێکی فەلەستینیە کە بیست‌و پێنج ساڵ لەگەڵ (دەزگا موساد)ی ئیسرائیلدا ئیشی کردووەو دوایی لەلایەن (دەزگای مەجدی) سەر بەبزوتنەوەی حەماسی ئیسلامیەوە ئاشکراکراوەو پەشیمانی دەربڕیوە.

سێیەم: بەشداری کارە سەربازییەکانی ئیسرائیلیمان ئەکرد لەکاتی هێرشبردندا بۆ سەر ماڵەکانی ئەندامانی (حەماس) بۆ نمونە: بۆ خۆم بەشداریم لەهێرش بردنە سەر ئەو ماڵانەی کە سەربازێکی (ئیسرائیلی)یان بەناوی (گۆناح..) شاردبۆوە لە (بێرم بالا) لە (ڕامەڵڵا) کردو لەکاتی هێرشەکەدا سێ سەربازی ئیسرائیلی کوژران، بەڵام باسیان نەکرا.

## قۆناغی شەشەمو دوا قۆناغی خیانەت لەساڵی ١٩٩٥- ١٩٩٦ تا گرتنم

لەم ماوەیەدا مەشقو ڕاهێنانێکی زۆرمان کرد لەنوسینگەی مخابەراتدا لەسەر چۆنیەتی (پەیوەندی کردن بەسەرۆك دەستەکانەوە) کە بۆ (ئیسرائیل) ئیشیان ئەکرد، بەتایبەتی لەناوچەی (أ) چونکە پەیوەندی کردن بەو دەستانەوە زۆر دژوار بوون لەژێر دەستەڵاتی ئیسرائیل دا نەبوون بۆ ئێمە زۆر ئاسان بوون ڕێکەوتنەکانی (ئۆسلۆ) ئەوەی تیابوو کە گیانی ئەو کەسانە بپارێزرێ کە کاریان بۆ ئیسرائیل کردووە.

بۆ دەستەڵاتی فەلەستینی بەهیچ جۆرێك نەبووە ئەو کەسانە بگرێت یا بەدواداچوونو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکات.

(عەرەفات) خۆی ئەمەی مۆرکردبوو! کە ئەوان (پێناسی) ئیسرائیلیان هەڵئەگرتو تەنانەت گرتنیشیان قەدەغە (ممنوع) بوو لەژێر هەر ناوێکدا بووایە.

## ئیشێکی تایبەت لەتورکیا

لەساڵی ١٩٩٣ منو (وای) بانگراین بۆ یەکێ لەسەربازگەکانو خولێکی مەشقکردنی زۆر پێشکەوتویان پێکردین کە تایبەت بو بە (هێزی تایبەت - قوە الخاصە) لەو خولەدا لەسەر (دەمانچە)یەك فێرکراین کە (٢٢) گوللەی ئەتەقاند کە گوللەکانی لەگوللەی دەمانچەی (٩) ملم گەورەتربوون، دوو جۆر بون، جۆرێکیان بەدەستی ڕاستو جۆرێکی تریان بەدەستی چەپ کە گیرمیەکیان بۆ کردبوو توند ئەکرا لەمەچەك کە زۆر بەهێز بوو بۆ ئەوەی لەکاتی تەقاندندا ڕات نەتەکێنێت.. ئەم دەمانچەیە بە (تاكو کۆ)ش تەقەی ئەکرد. دوای ئەم خولەش گواستراینەوە بۆ (تورکیا)و ناونیشانیان پێداین کە پەیوەندی بکەین بە (کەسێکەوە) کە کارمان بۆ ئاسان ئەکاو تێمان نەگەیەنێت کە ئیشمان چییە پێی، پێڕاگەیاندین کە ئیشەکەمان بریتییە لە (تیرۆرکردنی) یەکێك لەسەرکردە (خۆرئاواییەکان) کە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ عەرەبدا هەیەو خەڵکی (بەریتانیا)یە، ئەم ئیشە (١٠) دە ڕۆژی خایاند، شوێنەکەیمان زانیو بەنەخشەیەکی داڕێژراو کابرای (خۆرئاواییمان) لەناو سەیارەکەیدا تیرۆرکردو بەسەرکەوتوویی

کارەکەمان ئەنجامدا، هەمان رۆژ گەیشتینەوە ئیسرائیلو ئاهەنگێکی گەورەشیان بۆ گێراین.

## لە پاداشتی ئەم هەموو کارەدا ئیسرائیل چیان پێکردمو پاداشتیان چۆن دامەوە؟!

دوای ئەوەی لیمۆکە گوشراو فڕێ درایە تەنەکەی خۆڵی بەندیخانەوە لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٦ دا، (موساد) پێیان راگەیاندم کە ئەیانەوێت بمگرن و بمخەنە (بەندیخانە)وە تا لەنزیکەوە ئاگاداری ئەندامەکانی (حەماسی ئیسلامی)بم. خۆرەوشتی ئەوان وەربگرمو پەیوەندیان پێوە بکەم وەکو ئەندامێك، ئەمەش دوای ئەو (چوار هێرشە تۆڵەسەندنانەی کە بەشوێن شەهیدکردنی ئەندازیار.. یەحیا عەیاش)دا هاتبوو بە (موساد)م راگەیاند: هیچ پێویست ناکات من ئەم ئیشە بکەم، ئاشکرابونم زۆرە بەتایبەت من (دیندار) نیمو ناشتوانم وەکو ئەوان بکەمو لەژیانمدا نوێژم نەکردووە!؟

بەڵام ئارامیان کردمەوەو وتیان: چەند کەسێکی تریش کە (لەدەرەوە ئەمناسین) لەگەڵتا ئەنێرینە بەندیخانەوەو پێکەوەش کاربکەن بۆ خۆشت ئاسانترە.

هەوڵی زۆرم دا کە ئەم کارە بۆ من نەبێت، بەڵام بێئاکام بوو من چاك ئەمزانی کە من ناتوانم وەك ئەندامەکانی (حەماس) بم شتەکانی تر بەزووی فێربووم، بەڵام من کوڕی خێزانێك نەبووم بتوانم وەك ئەندامانی (حەماس) پەروەدە بم! لەو کاتانەدا هەستێکی نامۆو سەرسوڕهێنەر سەرسامی کردمو رووی تێکردم چەندەها خەیاڵ بەمێشکمدا هات دوای ئەو هەموو خزمەتە بە (جولەکە) سەرئەنجام بۆ بەندیخانە!!؟

ئەمە پاداشتی ئەم هەموو خزمەتە بوو کە پێشکەشم کردن، ئەمە (خەڵاتمە) ئەمە (سەرئەنجامی ناپاکی - خیانەتە)

زۆر لەحەماس ئەترسام، ئەوەی دەربارەی ئەوان کردبووم بەسبوو بۆ ئەو ترسەم.. هەستم بەنارەحەتیو دڵتەنگیو بێتاقەتییەکی زۆرو بێوێنە ئەکرد.. ئاخو حەسرەتو پەشیمانی بەخەیاڵمدا گوزەریان ئەکرد.

وەك لیمۆ ئاوەکەیان گوشیم.. لاوێتیم بۆیان سەرف کرد.. فڕێیان دامە بەر دەستی (حەماس) لەکوێش لەبەندینخانەدا!!

لەسەر داوای ئەوانو بۆ زانیاری بەهێز چوومە بەندینخانە.. دوای چەند رۆژێك هەستم ئەکرد چاوەکان بەدوامەوەنو ئاگایان لێمە.. وا دڵی خۆم ئەدایەوە کە ماوەی

بەندبوونەکەم کەمەو لە (سێ مانگ) تێناپەڕێت و ئەگەری ئاشکرا بوونم کەمە! دەستم کرد بە (شەو نوێژو قورئان خوێندن و ڕۆژوگرتن) دوورکەوتمەوە لەهەر هەڵسوکەوتێك جێی گومانی ئەوان بێت، هەوڵم ئەدا هەموو شتێك فێربم، دوای (مانگ و نیوێك) خرامە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوەی (دەستگای ئاسایشی حەماسە)وە کە بە (مەجد) بەکورتکراوەی دەناسرێت.

تەنها دوای (٤٠) ڕۆژ ئاشکرا بووم، دانم بەهەموو شتێکدا ناو چیرۆکی چارەکە سەدەیەك لەسیخوڕی و خیانەتم گێڕایەوە.. زۆر زۆر پەشیمانیم دەربڕی لەو هەموو ساڵەی کە خزمەتم بە (جوولەکە)ی داگیرکەر کردووەو خیانەتم بە (گەل - نیشتمان - ئاین)م کردووە.

هەموو خۆشییەکان هەموو ڕابواردنەکان هەموو گەشتەکان وەك خەیاڵ وابوون و تێپەڕین و تەنها پەشیمانی بووە هاوڕێم.. بەڵام چارم نەبوو، چونکە ئازادی و ویستی خۆمم لەدەست دابوو.

بەڕێزان وابزانم هەموو تێگەیشتن سەرئەنجامی خیانەت چی بوو؟!

سەرئەنجامی پارەپەرستی و ئارەزوبازی چی بوو؟

سەرئەنجامی پەروەردەی نادروستی باوك و خێزان چی بوو؟

ئاکامی بێگانەپەرستی چی بوو؟

ئاکامی هاوڕێی خراپ و کەسێتی روخاو چی بوو؟

ئەنجام، ئەی خاك، ئەی گەل، ئەی ئاین، ئەی ویژدان، پەشیمانیم لێقبوڵ بفەرموون.

**(خ)ی خیانەتکارو ناپاك بەخاك و نەتەوەو ئاین چۆن ئاشکرابوو؟**

دەربارەی ئاشکراکردنی (خ)ی ناپاك، بەرپرسی ئاسایشی حەماس، کە دەزگایەکە بەناوی (منظمة الجهاد والدعوه) بە (مجد) دەناسرێت دەگێڕێتەوە دەڵێ:

لەزنجیرەی گرتن و ڕاپێچکردنی گەنجان بەرەو زیندانەکان لەلایەن (ئیسرائیل)ەوە (خ) یەکێك بوو لەوانەی کە لەگەڵ لێشاوێك لەئەندامانی (حەماس)دا گەیشتە (زیندانخانەی مەجد)، لەم کاتی بەلێشاو گرتنەدا واتە ناردنی چەند کەسێك بەمەبەستی کارکردن بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل لەناو زیندانەکاندا، دەبێت زیندانیان زۆر بەئاگاو وریا بن پرسیار لەوانە بکرێن کە تازە دەخرێنە زیندانەوە، هەر لەگەڵ گەیشتنی (خ) دەستکرا بەپرسیارو لێکۆڵینەوە:

- ناوی چییە؟
- کێ ئەناسیت؟
- کەسە نزیکەکانی کێن؟
- ناسیاو خزمی کێن؟

بەڵێ بەم شێوەیە پرسیاری ئاراستە ئەکرێ ئەتوانرێت لەسەر زاری خۆی وەڵامی لێوەربگیرێت، دەبوایە لەدەرەوەی زیندان وەڵام بهاتایەتەوە لە (کۆنترۆڵی) دەرەوەی کردبوو تەنانەت نەیئەهێشت کەس سەردانی زیندانیش بکات.

کەواتە ئەبێت لەزاری گومان لێکراوەکەوە وەڵام وەربگیرێت.. ئەمانتوانی زانیاری تەواو لە (خ) وەربگرین تەنها ئەوە نەبێت لە:

(لەخێزانێکی رووخاوە، یەکێك لەخزمەکانی بەهۆی پەیوەندی بەکەتیبەکانی شەهید عزت الدین قسام)ەوە گیراوە، دەبێت تەنها لەخۆی نزیك ببینەوە، یەکێك لەرۆڵە زیرەك و لێهاتووەکانی دەزگای ئاسایشی حەماس) راسپێردرا کە لە (خ) نزیك ببێتەوە، بەجۆرێك کە نزیکییەکە نیشانەی تێڕامان نەبێت.

رۆژ دوای رۆژ زانیارییەکانی دەدایە دەستمان:

- ئەو بەکرێگیراوە لەدەرەوە نوێژی نەکردووە!
- بۆ ماوەی دوو ساڵ ژنی هەبووەو تەڵاقی داوە، ئێستا ژنی نیە؟
- تەمەنی ٤٠ ساڵە.
- رۆشتۆتە (ئوردن ـ لوبنان ـ سعودیە ـ تورکیا)!
- پەیوەندی نەبووە بەرێکخستنەکانی (حەماس)ەوە!
- ئێستا چۆن لەسەر (حەماس) زیندانی کراوە؟! لەزیندانیشدا لەژێر ئاڵای (حەماس)دا زیندانی دەکرێت نەك لەژێر ئاڵای لایەنێکی تر.
- لەدەرەوە نوێژی نەکردووە، ئێستا نوێژ دەکات!

ئەم زانیارییە سەرەتاییانە بۆ ئێمە بەس نەبوون بەمەرجێك ماوەی بەندکردنی ئەم بەکرێگیراوە کەم بوو.. دەبێت زوو بجوڵێین و پابەندی ئەو زاینارییە کەمانە بین، پلانێکمان دارشت کە بەیارمەتی خوا پلانەکەمان سەری گرت بەم جۆرە:

قۆناغی یەکەم: دەوروبەرو دراوسێی ئەم بەکرێگیراوەمان پشکنی بۆمان دەرکەوت کە پەیوەندی بەکەسانێکەوە هەیە کە لای ئێمە جێگەی گومانەو ئاڵۆزن، گەڕاین بەدوای

کەسێکدا لەهاورێکانی کەمتر زیرەك و لێهاتوو بێت.. گەنجێکی تەمەن بیست ساڵیمان دۆزییەوە، کەسێکی خۆمان کە زۆر لێهاتوو بوو بۆ (حەماس)و کەسیش نەیئەناسی لێی نزیك کەوتەوە قسە قسەی راکێشا تا بۆمان دەرکەوت: ئەم گەنجە بیست ساڵە کەسێکی رووخاوەو خوڕەوشتی نییە باری خێزانیش نالەبارەو خاوەنی کەسێتییەکی لاوازە، بەم جۆرە روخانی لەبەردەم ئاسایشدا ئاسانە.

ئەم کەسەی ئێمە وا دەربخات بۆ ئەم گەنجە کە هەردوکیان هاوشێوەن لەباری خوڕەوشتییەوە هەروەکو ئەوان ئەمیش کە کارێك و ناوی کەسێکی پێدراوە کە پەیوەندی پێوە بکات، بەڵام لەترسی (حەماس) ناوێرێت پەیوەندی پێوە بکات باشە، خێرا کوڕە گەنجە کە وتی: هیچ مەکە ناوی ئەو کەسە بدەرە من، من پەیوەندی پێوە ئەکەم و یارمەتیت دەدەم.

ئەویش ناوی لاوێکی پێشکەوتوی خۆمانی پێدا کە لەزیندانەکەدا نەناسرابوو.. هەردوکیان کۆبونەوە بەجۆرێك کە هەریەکەیان لە (تۆڕێکی) جیاوازدا کار دەکەن. ئەم گەنجە (٢٠) ساڵ زۆر نەزانانە باسی تۆڕەکەی خۆیانی بۆ تۆڕە بەمانا تازەکە کردو ئەندامەکانی هەڵدا کە یەکێکیان (خ)ی خیانەتکار بوو.

ئەم دوو تۆڕە لەسەر ئەوە رێککەوتن کاری ناشیرین و بەدڕەوشتی لەگەرماوی زیندانەکەدا ئەنجام بدەن، (خ)یش بەمەی زانی و لیکی بۆی جوڵاو بەیادی جاران ئارەزووبازی لەلا زیندوبۆوە.

لەکاتی نزیك بوونەوەی کارە ناشیرینەکە، ئەو لاوەی ئێمە راسپێدرا کە گرفتێك لەگەڵ یەکێکی تری ئەندامەکانا ئەنجام بدات، گرفتەکە رویداو هەردوو برانە بەردەم زیندانەکانی ترو لەبەرژەوەندی لاوەکەی خۆمان کێشەکە یەکلایی کرایەوەو ئەوی تری - ئەندامەکەی خۆمان - لەڕیزی ئەواندا تاوانبارکراو سزا درا، بەم کارە پەیوەندی نێوانیان توندوتۆڵتر بوو.

بەم شێوەیە فایلی گەنجە بیست ساڵە خیانەتکارەکە زیاتر پێگەیشت و زانیاری زیاتری درکاند دەربارەی (خ)و تۆڕەکەی خۆیان، لەم کاتەشدا کەسەکەی خۆمان زیاتر لە (خ) نزیك ئەبۆوە لەگەڵ کوڕە گەنجەکەی تردا رێککەوتن، کە نامەیەك فڕێبدەنە ناو (ئیدارە)ی بەڕێوەبەرێتی زیندانەکەو ئاگاداریان بکەن کە ئەم کوڕە گەنجە (٢٠) ساڵەیە لەژێر لێکۆڵینەوەی (حەماس)دایە.

(خ) بەمەی زانیو نەیهێشت، دەستی دەکرد بەقسەکردن، (حەماسو هەڕەشەکردن) هەر کاتێک یەکێك نزیك ئەبۆوە لەم گەنجە ئەو (ئیدارە)ی زیندانەکەی ئاگادار ئەکردەوەو نەیدەهێشت.

ئێستا چار چییە بۆ ئەم گرفتەمان هاتە ڕێگە؟! پێویستە پلانێکی تری بۆ دابڕێژرێت بۆ ڕزگاربوون لەم کارەی (خ) گەنجەکە هەرچی پێبوو لەماوەی (١٤) ڕۆژ لێیدەرهێنرا.

پاشان ئەم پلانە داڕێژرا.. هەموو زیندانەکانی کۆکرانەوە، ئەم گەنجە لەبەردەم هەموویاندا ڕاوەستێنرا وتمان:

ئەم گەنجە لەدەرەوەی بەندیخانە پەیوەندی بە (ئیسرائیل)ەوە هەبووە، بەڵام دواتر نەیویستووە ئیشیان لەگەڵ بکات گرتوویانەو سزایان داوە.. ئێستا لەزیندانەدا هیچ چالاکی بۆ ئەوان - ئیسرائیل - نییە، ئەم وتانە وەك ئاوێکی ساردی لەبیابانێکدا بدەی (خ) خیانەتکار گەشایەوە هاتەوە سەر خۆیو دڵنیابوو لەوەی کە هیچ گرفتێك نییە.

بەم شێوەیە ئەم گەنجەی ئێمە لەزیندانەکەدا بەئاسانی ئەجوڵاو داوێکیان دانا بۆ (خ) کە نەتوانێت لێی دەربچێت.. بەنەسپاییەکەوە ئەندامەکەی ئێمە چووە بن گوێی (خ) و چرپاندنی بەگوێیدا کە (نامەیەك لەژێر سەرینە)کەیدا دادەنێتو دەربارەی لێکۆڵینەوەکانی کە لەلایەن (حماس)ەوە لەگەڵیا کراوەو ئەو زانیارییانەی کە دانی پیاناوە، لەنامەکەدا هاتبوو: (من ناوی تۆم نەدرکاندووە مەترسە، بەڵام من لەژێر چاودێریدام.. نامەوێ کەس لێم نزیك ببێتەوەو پەیوەندیم پێوە بکات).

(خ) هاتە ئەم لاوە، ئەملاو لایەکی کردو نامەکەی لەژێر سەرینەکە دەرهێناو خوێندییەوە، زەردەخەنەیەکی کردو نامەکەی سوتاند.

دۆسییەی (خ) پێگەشتو ئیتر کات نەماوە دەبێت ڕاستی بدرکێنێت، کە قسەمان لەگەڵ کرد ناخلافگیر بوو.. ڕاچڵەکی.. لەسەرەتاوە نەچووە ژێر بار. باسی نامەکەو هەندێك شتی ترمان کرد کە هەمووی نەخشەی ئێمە بوو.. خۆی ئەگرتو خۆی نەئەیا بەدەستەوە.. ئەو پیاوێکی جەربەزەو بەتواناو مەشق پێکراو بوو، بەردەوام نکوڵی لەوە ئەکرد کە پەیوەندی هەبووبێت، زۆر وریاو زیرانە لەو بارەیەوە خۆی لادەدا.

بەڵام لەژێر فشاری جەستەییدا وردە وردە نەرم بوو! ئەو نەرم بوونەی بەهەند گیرا.. ئەو نەفەرەی کە خۆمان دامانابوو یەکەم جار هێنامانە ڕوو ئیتر بۆی دەرکەوت ئیشەکان نەخشە بۆ کێشراو بوون لەلایەن (حەماس)ەوە.

هەر لەیەکەم هەنگاوەوە بەشێوەیەکی زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ کارەکاندا کراوە.. بەتەواوی رووخاو دانی بەوەدا نا کە (پیاوی ئیسرائیلەو کاری هەواڵگیری کردووە لەماوەی (٤) سەعاتی یەکەمدا زۆر شتی درکاند، بەڵام لەم کاتەدا گرفتێکمان بۆ دروست بوو ئەویش ئەوە بوو: کە تەنها چوار کاتژمێر ماوە بۆ سەرژمێری بەیانیان.. نەبادا خۆی بگەیەنێتە کارگێڕی زیندانەکە پێمان راگەیاند کە دەبێت: لەکاتی سەرژمێریدا لەگەڵمان بمێنیتەوە.. ئەگینا (دوسیەکەی - فایل) دەنێرینە دەرەوە بۆ لای (حەماس) ئیتر خۆی دەیزانی ئەوە واتای چییە.. زۆر لە (حەماس) دەترساو خوای گەورە ترس‌و بیمێکی زۆری خستبووە دڵییەوە، رازی بوو بەوەی کە پێمان راگەیاند.

بەم شێوەیە بۆ ماوەی (یەکمانگ)ی رەبەق لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا کرد لەسەرەتاوە هەندێك زانیاری هەڵەو چەواشەکاری وتبوو، بەڵام لەگەڵ رۆشتنی کاتدا نەیتوانی چیتر بەرگری بکات‌و بەتەواوی داڕوخاو بەدوورودرێژی باسی پەیوەندی خۆی‌و ئیسرائیلی کرد بەو شێوەیەی کە خۆی گێڕایەوە رۆژی بەربوونی (خ) لەبەندیخانە لەبەردەم (مجاهیدانی حەماس)دا راوەستێنرا، دانی نا بەبەکرێگیراوی خۆیدا لەپێناو بەرژەوندی ئیسرائیل پەشیمانی نواندو داوای لێبوردنی کرد.. بەڵام پاش چی؟!

خوێنەری بەرێز هاوڕێی خۆشەویستم ئەمە تەنها چیرۆکێك نەبوو لەسەر کاری سیخوڕی (موساد) ئەمە راستیەکە دەربارەی ئەو هەموو تاوان‌و پلانە گڵاوانەی جوولەکە بەرامبەر ئیسلام‌و موسوڵمانان لەبەری دەگرێت‌و تا ئێستاو داهاتوش لەسەریان بەردەوام دەبێت، ئەمە وانەیەك بوو بۆ وریابون‌و تێگەیشتن لەسروشتی کاری دەزگا (سیخوڕیەکان) و (ئەوانەی جولەکە بەتایبەتی) بۆ زیاتر بەئاگابوون‌و پاراستنی ریزەکانمان روخاندنی ئەندامان‌و ژن‌و کچ‌و منداڵ‌و خزم‌و ناسیاو بۆ دروستکردنی درزێك‌و هاتنە ناوەوە، تەنانەت جگەرگۆشەکان‌و بازنەکانی فێرکردنی قورئانیشیان لەبیرنەکردووە بەو هیوایەی کە سودبەخش بووبێت بۆ هەمووتان‌و ئاگاداری کاروکردەوەتان بن.. وانەیەك بێت بۆ داهاتومان.. بۆ داهاتومان.

# دایــک

دایك: ئەو مرۆڤە ماندوو شەکەتو دڵپڕ ئەندێشەو حەسرەتەیە کە سات بە ساتو هەناسە بەهەناسە خۆی دەڕەنجێنێو خۆی دەسوتێنێت، مۆم ئاسا بۆ گەشەو پێگەیاندنی رۆڵەکەی بەخۆشیەوە، لەساتە خۆشەکانی تەمەنی منو تۆی خوێنەردا ئەو دڵو چاوو بیرو هۆشی دەگەشێتەوە بەترپەی دڵتو جوڵەی لاشەت لەحەوزی سکیا ئەو شاگەشکەو خۆشحاڵ دەبێت.

تا دێیتە بوون، پاش هەڵمژینی یەکەم هەناسەی سەر زەوی ئەو لەجاران زیاتری ناو سکی، سکی بۆت ئەسوتێت.. کام پارووەی خۆشە کام خواردنەی چێژدارە لەدەمی خۆی دەگرێتەوەو دەیخاتە ناو زاری تۆوە.. لەجیاتی یەك بانگکردنی دایە چەندین جار دەڵێت: گیان.. بەقوربانت بم.. واهاتم بەلاتەوە.. گیان!!

دایك: ئەو مرۆڤە خۆنەویستەیە کە لەگزنگی بەیانەوە بەیانێکی نوێتر دێنێتە بوون لەناهی قولایی دڵیەوە ئاهێکی گەشتر دەداتە ژین ئەزانی کێیە بەبێ دوو دڵی.. تۆییت.. منم.. ئەو مرۆڤانەن کە تەنها لەدایك بوونو خۆیان بەدایکیان دەناسێنن لەو ساتانەی دایك چاوەڕێی دەستی رۆڵەکەیەتی.. روو وەرنەگێڕین.. ئامان لەرویاندا..

خوای گەورە بەدەستەڵاتو بەبەزەیی فەرمانمان پێدەکات کە چاکەو چاکەخوازو بەوەفا بین بۆ باوانمان (**وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه وبالوالدين إحساناً**).

پاشان پێشەوای مرۆڤایەتیش (محمد) (درودی خوای لەسەر بێت)، لەوەڵامی پرسیارێکدا کە ئاراستەیان کرد، خۆشەویستی دایكو باوكو رۆڵەی بۆیان فەرموی: ئەوەی لەلای خوای گەورە زۆر خۆشەویستە، نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا، چاکەو خۆشەویستی دایكو باوك، پاشان جەنگین لەپێناوی رێگەی خواو بەرنامەکەیدا.

بەڵام سەد داخ و ئەفسوس و مەخابن نازانم من و هاوەڵانم چۆن دڵمان دێت پەڕەگوڵی دڵی پڕ هیوات بژاکێنین.. نا.. دڵنیابە.. نا.. تۆ هەموو ئەو شتە جوانانەی کە پێنوس لاوازە لەئاستت.. زمان بێگۆیە لەوەسفت.. بەڵام نازانم چۆن کاك (ئە) توانی رازی بێت دایکی بکاتە قوربانی حەزەکانی هاوسەرەکەی.. یان دایك بکەنە لاشەی بێگیان.. یان دایکی بکەنە رسوای رۆژگارو رووڕەشی زەمانە.. دایە گیان من دڵنیام هەموو کەسێکی خاوەن پەیامێکی پاکی ئاسمانی ناتوانێت ئەو کارەساتە بەسەر تۆ بهێنێت، ئەو کەسەی ئەمەی کرد تۆ بڵێی مرۆڤو خاوەن ویژدان بوبێت.. رەنگە بڕوا نەکەن کە خۆی دەدوێت و دەڵێت:

دایکم زۆر خۆشدەویست، براکانم ژنیان هێنابوو برا بچوك بووم لەسەر ماڵ مامەوە هەندێك سەروەت و سامانی باوکی کۆچکردووم لەلای دایکم بوو بەدڵ و گیان هەوڵی دەدا هاوسەرێکی ناوازەم بۆ هەڵبژێرێت.. بەڵام بەگوێیم نەکرد بۆ هەر یەکێکیان بیانویەکم دەدۆزییەوەو رەتم دەکردنەوە:

- ئەمە خاوەن بڕوانامە نییە، ئەمەیان باڵای زۆر بەرزە!
- ئەم کچە زۆر قەڵەوە بۆ من نابێت.
- ئەمەیان زۆر دەوڵەمەندە.
- ئەمیان زۆر قسە ڕەق و نالەبارە.
- ئەوە خزمە هەر نامەوێت.
- ئەوە تەمەنی لەخۆم زیاتر قسەی لێمەکەن.

لەم تەمەنەمدا برادەرێکم وتی: کچێکی رێکوپێك دراوسێمانە بۆ نایەیت بیبینی، شتی وام نەدیوە.

وتم: جا چۆن دەتوانم بیبینم؟!

وتی: لەرێگەی چونمان بۆ ماڵی خۆمان قسەی لەگەڵ ئەکەین.. تۆشی پێدەناسێنم یان لەرێگەی خێزانەکەمەوە بانگی ئەکەم و قسەی لەگەڵ بکە، زۆر بەکوێرانە دوای یەکەم بینین دڵم گرتی و حسابم بۆ کەس نەکرد گواستمەوەو بووە هاوسەری ژیانم، ئەمە یەکەم سەرپێچی دایکم بوو، پاش لەدایك بوونی منداڵی یەکەممان کێشەکان بەرەو ئاڵۆزی

دەڕۆیشت، ئەوەندەی من ئاگادار بووم دایکم زۆر ئافرەتێکی هێدیو لەسەرخۆو دیندار بوو، لەکاروباری ناو ماڵو ئیشو کاری نەخۆشییەکانی ئافرەتدا کارامە بوو.. لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی بەدڵی بووکەکەی بوایەو ئاواتی ئەو بوایە بۆی ئەهێنایە دی.. ئەو ساتانەی ئامۆژگاری خێزانمی ئەکرد ئاگاداربووم خێزانم بەسادەییو بێهەستی گوێی بۆ دەگرتو بەساردی بەڵێی بۆ دەکرد.

ڕۆژگارەکان تێپەڕینو دایکم هەر بەخۆشیو ئەویشی بەناخۆشی نازانم تەلیسمی ئافرەت بەهێز بوو یان نەبەکامیو بوودەڵی خۆم بوو.. دایکم زۆر لەلا سوك بوو.. دایکم وردە وردە دەچووە گۆشەی بیرچوونەوەوە.. منداڵی دووەممان هاتەبوون، دایکم وەك کچی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەکرد بەتایبەتی کە شارەزایی تەواوی لەمنداڵبوندا ـ مامانی ـ هەبوو، بەڵام خێزانم زۆر بەخوێن ساردییەوە دەجوڵایەوە تەنها یەکجار سوپاسو دەستخۆشی ئاڕاستە ناکرد.. ناو بەناو غیرەتی دایكو کوڕیم بۆی دەجولا.. ئەو ئەرکەی ئەو دەیکێشا بێوێنە بوو، زۆر جار دایکم دەیوت:

(ڕۆڵە گیان لەپێناوی تۆدا هەرچی بڵێیت دەیکەم با خێزانیشت خراپ بێت، بەڵام ڕۆڵە گیان دڵنیابە ئەمە ئێستا بۆ من ئاوایە لەدواڕۆژدا بۆ تۆش خراپتر دەبێت.. ڕۆڵە ئەمە خێر ناداتەوە.. جوان بیربکەرەوە).

هەندێك بابەتو پەرتوکم لەسەر ئافرەت خوێندبۆوە.. چەند فلیمێکم لەسەر خیانەتو ناپاکی پیاوو ژنم دیبوو.. لەهەندێکیان ڕازی بووم لەهەندێکیان دوو دڵبووم، ڕۆژگارەکان تا دەهاتن روو لەئێڵیو خیانەت دەبۆوە.. ئەوەی خێزانمی زۆر نیگەرانو بێزار دەکرد بوونی دایکم بوو لەو ماڵەدا زۆر هەوڵی دوور خستنەوەی دەدا .. زۆرجار رووبەڕووی دەیوت: بۆ ناچیتە لای کوڕەکانی ترت؟

دایکیشم دەیوت: ماڵ ماڵی خۆمە، گەر بەخۆتو مێردەکەتدا ڕانەبینی بڕۆن، باشە بڕۆن، خێزانم زۆر هەوڵی دوورخستنەوەی دەدا.. زۆر پلانو هەوڵی نابەجێی دەدا.. ئەمەندە سڕپیاو بووم نەمتوانی بڵێم: (وەك دایکم ماڵ ماڵی پیاوەو گەر پێت خۆشە فەرموو دانیشە گەر پێت ناخۆشە دەرگا واڵایە!).. هەندێك جار بیرم لەو دوو منداڵە

دەکـردەوە هەنـدێك جـار بـیرم لـەرابردووی خـۆمو داهـاتوش دەکـردەوە.. بـەڵام قـەت بەبیرمدا نەهات (تەڵاق) هاتبێتە فەرهەنگی کردارمەوە.

ئـەم ئافرەتـە وردە وردە کـاری لێکـردم.. لـەزۆر هەڵـسوکەوتو شـێوازی ئاخـاوتن دوورکەوتمەوە، ئەوانەی بـەلای منـەوە نـامۆ بـوون وردە وردە بونـە هـۆگرم.. دایکم بـەم کارانەم زۆر دڵگرانو بێتاقەت دەبوو.

رۆژێکیـان لەسـەر هـەموو مانـدوبونم لـەکارو کاسـبی هاتمـەوە خێـزانم زۆر نـارەزایی لـەدایکم کـردەوە.. زۆر خـۆی تـورە کـرد، چـومە ژورەکـەی دایکـم زۆر بـەرەقی دەمـم بەدەنگی بـەرزو وشـەی کاڵو سارد کـردەوە: دایـە ئـەزانی ئـەم ماڵـەت نـاخۆش کـردووە، تاکەی بیر لـەمنو خێزانم ناکەیتـەوە، عـەمری مـەرە پیرێکت گـەر مابێت بـۆ خـۆت بـۆ دانانیشی بەدەردی خۆتەوە گەر نان خرایە بەردەمت بیخۆ گەر نەشبو شوکری خوا بکە.

دایکم زۆر بـەهێمنی سـەیرێکی کـردمو بـەدوو چاوی گەشـەوە وتـی: رۆڵـە گیـان گـەر چویت بۆ بازاڕ سێ چوار کیلۆ شیری وشکم بۆ بێنەوە، ئیتر لەوەزیاتر من هیچ ئـەرکێکی ترم لەسەر تۆ نەماوە.. پیاوەتی خۆتت دۆڕاندووە.. رۆڵە گیـان ئـافرەت ئەوەنـدە ناهێنـێ بەهەشت لەژێر پێی مندایە.. بەڵام خێزانت ئاگری لەژێر پێدایە.

بەم قسەیەی دایکم بەشێك لەغیرەتی پیاوەتی منداڵیم جوڵا، بەڵام هیچ نەبوو، چەند شەوێك بەبێ پرسی دایکم لەماڵ دەچوینە دەر منداڵمان پێش خۆمـان دەدا، دەرگاکانمـان بەواڵایی بەجێدەهێشت.. کام خواردنەی خۆش بوو لەسەیرانگاو دوکانـە کەشـخە - راقـی یەکاندا نۆشمان ئەکرد.. جوان لەیادمـە رۆژێکیـان نەفـەرێك زیـادەم بـانگ کـرد خێـزانم بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئـەو نەفـەرە کەبابـە زیادەیـەت بۆچییە؟ زۆر بـەڕاستـی وتم: بـۆ ماڵەوە، بۆ دایکم!

وتی: چی بۆ دایکت.. گوناح نییە داکیت ئەو کەبابـە جوانـە خەسـار کـات یـان خۆمـان دەیخۆین یان لەگەڵمان نایەت بەرپیدا.. تێگەیشتی!؟

لەبڕیارەکەم پاشگەزبوومەوە.. خوێنەری سوما گـەش ئـەوەی تـۆم بـۆ هـیلاك کـردووە ئالێرەدا خۆی نواند.. ئێوارەیەك نانمان لەماڵ خوارد.. خێـزانم وەك رۆژو ساتـەکانی تـر

نەبوو.. زۆر بەخۆشی لەگەڵ دایکم جولایەوە، قسەی خۆشی بۆ کرد، دایکم بەلایەوە جێگەی سەرسامیو تێڕامان بوو دواجار وتی:

ئامۆژن ئەمشەو ئێمە دەچین بۆ گەڕان منداڵەکان نابەین! تۆ لەلایان بمێنەرەوەو ئاگات لێیان بێت.. بەلامەوە سەیر بوو تا ئەو ساتە هیچ بەرنامەیەکی چونە دەرەوەمان نەبو.. چوینە ژوورەکەی خۆم لێم پرسی: ئافرەت چونە دەرەوەی چی؟

وتی: قسە مەکە.. جوان گوێم بۆ شلکە بزانی چی ئەڵێم؟ وەك ئاژەڵێکی (یاری سێرك) لەبەردەمیا ئەرێیەکم بۆ کرد!

ئەمشەو دەڕۆینە دەر منداڵەکان بەجێدەهێڵین لەنیوەشەودا دێینەوە کارێکی سەرکەوتوانە ئەنجام دەدەم تەنها کارێك بەتۆ ئەسپێرم ئەوەش پشتگیری کردنە.

زۆرباشە دوای نان خواردن منداڵەکان نوستن.. خوا حافیزمان لەدایکم کرد.. گوێم لەشڵپەی ئەو جامە ئاوە بوو کە دایکم بۆ پارێزگاری سەفەرمان بەدوامانا لەدەرگای دەرەوە ڕشتی.. بەخۆشییەوە دورکەوتینەوە کلیلو پێویستی دەرگاکانمان پێبوو، نیوەشەوێکی درەنگ لەگەڕانو سەیرانو سەفای خۆمان بووینەوەو بەرەو ماڵ گەڕاینەوە زۆر بەهێمنیو بێخشپە خۆمانکرد بەماڵدا.. وتم: ئافرەت چی دەکەیت؟!

وتی: بێدەنگ بە! لەدایکت سەرگەردان تر!

بەهێمنی دەرگای ژوورەکەی کردەوە، خۆی گەیاندە (چێشتخانە)و من وەك هەستێکی نامۆ پێم بڵێ شتێك هات بەهزرمدا ــ لەشوێنی خۆم چەقیبوم چوومە ژووری منداڵەکان..

دوو منداڵەکەم لەقوڵایی خەوێکی زۆر خۆشدا بوون.. دایکم جوان خۆی داپۆشیبوو بەبەتانیەکەی، لەخەوێکی قوڵدا بوو.. تارمایی خێزانەکەم هاتە بەرچاو، بەڵام بریسکەیەکم بەدەستی راستیەوە دی، لێی وردبومەوە (چەقۆیەکی گەورەی تیژ) بوو، پیاوەتی لەکوێیت!! غیرەت ئاژەڵی دڕندە بتخوات.. لەسوچێکی ژوورەکەدا توند دەستیم گرت.. زاڵم.. ئەوە نیازی چیتە؟ ئەمە چییە بەدەستەوە؟

خێزانم چاوەکانی (ئەبڵەق) بوو بوون زەقەی ئەهات: دایکت لەناو ئەبەم بڕوانە چۆن لەتاریکی ئەم شەوەداو لەقوڵایی ئەو خەوە خۆشەدا بۆ هەتا هەتایی لەکۆڵتی دەکەمەوە.

بەهەموو هێزم خێزانەکەم راکێشایە ژوورێکی تر، زۆر قسەم لەگەڵ کرد،

- باشە ئافرەت بۆ هەر جارێك ئەچیتە ماڵی خزمانت دەبیتە دڕندە.

- تۆ دەتەوێت دایکم بکوژێتو منیش سەیرت کەم؟!

وتی: بەڵێ.. هاوکاریم بکە.. زەرمەر ناکەیت!!

وتم: ئەی گوناهی بەشانو شەوکەتی کێ؟

وتی: بەشانو شەوکەتی خۆم.. تۆ حەقت نەبێت گیانە!

وتم: حەیفە تۆ لەئافرەت بوی.. بۆ ئەومندە دژی ئافرەتی؟

وتی: ئەوە کێشەی خۆمە وازم لێبێنە.

وتم: دڵنیابە تۆش رۆژگارێك دێتە پێش دەبیتە خەسوو، ئافرەت تکات لێدەکەم کاری وا مەکە.. خێرت دەگا.. چیت ئەوێ بۆت ئەکەم.. کچێ ئافرەت حەیاما ئەچێت؟

وتی: تۆ هەقت نەبێت.. ئەمە کاری خۆمە. گێلەپیاو!

وتم: کچێ ئافرەت خۆ تۆ تەواویت.. دڵنیام نەخۆشی نەفسیت لەگەڵ نییە بۆ وات لێهات؟

وتی: کاتی قسەکردن نەما لاچۆ لەبەرچاوم با لەپێش دایکتەوە تۆش لەناون نەبەم، خۆت لایە دەی.

لەدڵی خۆمدا وتم: پێشینان راستیان وتووە سێ شت ئامانیان نییە (ئاو.. ئاگر.. ئافرەت).

ئەمە لەلای من وابوو، بەڵام دڵنیابن هەموی لاوازیو ناسکی خۆم بوو.. تا ئەم ساتەش بۆ تەنها جارێك چاوم لێسورنەکردبۆوە.. لێی تورە نەبوبووم.. زۆر رێزم دەگرت، بەڵام دڵنیاشم هەموو ئافرەتێك ئاوەها دڵرەقو ناڵەبار نییە. بەرێزەکەم لەگەڵ تەواوبوونی خەیاڵاتەکانم گەیشتمە سەر دایکم.. کە خێزانی دڵرەقم دی وا لەژێر چەقۆی تیژی بێرەحمی بزوو بەهێزی خێزانمدا خوێنی لاشەی لەتاریکی ئەو شەوو ژوورەدا فووارە دەکات.. خوایە گیان ئەمە خەوە.. خەیاڵە.. ئەتوت خەنجەر لەفەردە کا ئەیات، دایکم لەو خەوە قوڵەدا بەچەقۆی ئەو زاڵمە گیانی لەدەستدا، بەبێئەوەی ئەم ئافرەتە زاڵمە حەزی کردبێت چاوی بەچاوی بکەوێت.. هەر بەبەتانیەکەوە کاری خۆی کرد.. ئاخ..

ئاخ خۆزگە لەئافرەت نەبوومایە.. خۆزگە ژیان بەبێ ئافرەت دەگوزەرا.. بەڵێ بەرێزانم ئەمە دیمەنێك بوو تەنها پێنوسی لاواز دەتوانێت هەندێك لەو کارەساتەم لەیاد بەرێتەوە.. منی بێویژدان، منی دەستەمۆی حەزو ئارەزووی ژنەکەم بەهێمنی سەیری ئەو دیمەنە جەرگبڕەم ئەکرد.. ئەوەی خێزانم کردی هیچ دڵڕەقێ نایکرد.. هیلاك بوو.. چوم دەستیم گرت.

وتم: بەسە.. خوا ڕسوات کات.. ئەو ناحەقیەت بۆ کرد.. دایکم شایانی ئەوە بوو؟

چەقۆکەی بەجلە تازەکانی سڕیو هاتە لاوە..

وتی: ها.. ئاقڵو ژیر.. بەپێکەنینەوە.. ئەوە من بووم یا تۆ.. کێ هەیە دەستی بچێتە دایکی خۆی، تۆیەکی ئاژەڵو بێویژدان نەبێت؟

چاوم زەق بوو.. هەناسەم توندبوو.. سەرسامو حەیران.. خوا بتگرێت من بووم یا تۆ.. ئەزانی چی ئەڵێیت؟!

وتی: ئەوەی ناوێت.. کەر پیاو هەستە بابچین بیشارینەوە.. گێلە..

وتم: حەقی خۆتە.. بەڕاستی گێلو کەر پیاوم.. جا لەکوێ بەم نیوەشەوە.. ئەی بەچی وەیگوێزین..

وتی: خەمت نەبێت.. هەر ئێستا نا ئێستا سەیارەیەکی خزمم دێتو دەیبەینە قەراغ شار فرێی دەدەین.

وتم: بۆچی دایکم شایەنی فڕێدانە کچی باش.. کەم چاکەی لەگەڵ کردیت؟!

بەزەردەخەنەیەکەوە.. وتی: ئەوە رۆی با نەخشە بۆ داهاتو بکێشین گیانە.

منی دڵپڕ لەغەمو پەژارە.. ئەوی ئاسوودە.. ماڵێکی لەخوێن هەڵکشاو خێرا منداڵەکانم گواستەوە بۆ ژورێکی تر جێگەم بۆ چاککردن ئەویش زۆر بەخوێن ساردییەوە چاوی لەتەرمەکە بڕیبوو خوێن لەلاشەی دەهات.. چاوی بەرایی ناهات، بەتانیەکە لەسەر سەری لابدات!؟

لەم ساتەدا لەدەرگا درا.. دڵم وەخت بوو لەلێدان بکەوێت.. خێزانم خێرا دەرگای ئەو ژوورەی کلیلدا.. گڵۆپی ناو ژوورەکەی تری هەڵکرد.. گڵۆپی سەر دەرگاکەی هەڵکرد.. لەدڵی خۆیدا بەسایەقی مەوعید پێدراوی دەزانی بەرەو دەرگای مەدخەلەکە هەنگاوی

نا.. بەدڵخۆشییەوەو بەخۆبادان رۆشت.. خەریکی بوو مێشکم ئەتەقی.. هەستێکی زۆر نامۆی خۆش گوزەری دەکرد بەمێشکمدا.

دەرگای بەکلیل کردەوە.. شیشی دەرگای کردەوە.. گوێم لەهاوارێکی زۆر بەرز بوو.. قیژەش بەدوایدا.. خێرا خۆم گەیانده دەرگاکە لەدڵی خۆمداو لەو ساتە کەمەدا وتم: رەنگە پۆلیس.. یان..

لەگەڵ بینینی خێزانم کە دەستەکانی بەردەگاکەوە وشك بوبو وام زانی کارەبا گرتوویەتی لەگەڵ نزیك بوونەوەم منیش سەرسام بوم و لەجێگەی خۆم وشك بووم.

ئەزانن بۆچی؟!

بەڵێ هاوارزو نیازم، چونکە دایکم بوو دەم و چاوو ناوچەوانە نورانیەکەی لەبەر روناکی گڵۆپەکاندا دەبریسکانەوە کە ئێمەی لەم سەرسامیەدا دی.. بێدەنگی و ئەبڵقە بونی شڵەقاند.. وتی:

- ئەوە چییە؟! چی رویداوە؟ لێم هاتە پێش دەستی خستە سەرشانم: کوڕی شیرینم چی رویداوە.. منداڵەکان سەلامەتن.. خۆتان سەلامەتن؟! خێزانم تەنها هەناسەی توند لەسینەیدا پەنگی دەخواردەوە.. چاوەکانی بۆ دوور دەیانڕوانی.. هەر چۆنێك بوو هێزم دایە بەر خۆم.

وتم: سوپاس بۆ خوا.. دایە گیان تۆ سەلامەتیت ئەمە خەو نییە.. تۆ زیندوویت خێرا دەستە پیرەڵۆکەکانیم گرت و کێشم کرد بەدوای خۆمدا بۆ ژوورەوە بەبەردەم خێزانی خیانەتکارمدا کە هەر سەیری دەکردین.

رەنگە لەناخی خۆیدا وتبێتی: ئەوەی کوشتم کۆرپەیەکم بووبێت!

بەڵام نەخێر.. کە چوینە ڕاڕاوەکەوە خێرا هاوارم لەخێزانم کرد.. کوا.. وەرە کوا کلیلی دەرگاکە.. بەترسێکەوە هاتە پێش کلیلی دەرگاکەی لەژێر سوچێکی فەرشەکەدا دەرهانی و دایە دەستم.. بەخێرایی و بەشپرزەییەوە دەرگام کردەوە پەلاماری سویچی کارەبام دا.. هەرچی گڵۆپ لەو ژوورەدا بوو هەڵم کردن دایکم هەر بەسەرسامییەوە دەیڕوانیە هەڵسوکەوتی شێتانەم.. خێزانەکەم کە شانی دابوو بەدەرگای ئەو ژوورەوە

هەر کروکاس بوو وەك شێت تێیدەڕوانینو بە (خەو) یا (خەیاڵ) ی دەزانی.. لەپڕ بەهەردوو دەستم بەتانیەکەم لەسەر لاشەی شەلاڵی خوێن لادا.

بەبینینی تەرمەکە.. خێزانم زریکەیەکی کردو هات بەلادا.. بورایەوە.. ناحەقی نەبوو منیش سەرم سوڕماو حەپەسامو واقم وڕما..

هەردوو دەستم گرت بەسەرمەوە .. هاوارم کرد.. ئەمە چییە؟! دایکم زۆر ئەم رووداوەی بەلاوە سەیر بوو، سەرەتا وا تێگەیشت کە کەسێکی بێگانە ئەم کارەی ئەنجام دابێت.. هەناسەیەکی حەسرەتاوی هەڵکێشا.

لەخێزانم ڕوانی دایکم بەو سەیرەی من تێگەیشت کە کار لەکار ترازاوە، کچ دایکی خۆی کوشتووە!

دایکم پەلاماری ئەو تەرمە کەساسەی دا کە خێزانم بێگیانی کردبو وتی: رۆڵە گیان ئەمە خەوە یاڕاستی.. باشە بۆ ئەو (قەتڵەتان) کرد ئەنجامی چی؟ لەبەر چی؟ هەموو رووداوەکەم بۆ دایکم گێڕایەوە.. دایکم گوێی بەسنگی خەسومدا گرت.. بەڵام ئەو زاڵمەی کچی کوشتبوی‌و چەند سانێك بوو رۆحی پەپولە ئاسای لەو ناوەدا کۆچی کردبو.

لەدەنگە دەنگی ئێمە منداڵەکانمان بەخەبەر هاتن لەژوورەکەی ئەولا، نەمهێشت رووداوەکە ببینن.. لەو بۆساردو لەو دیمەنە دڵتەزێنەدا دەرچووین‌و چووینە ژوری چێشتخانە.. دایك‌و کچ مانەوە.. دایك‌و کوڕو کوڕەزا دەستمان کردە گێڕانەوەی رووداوەکە:

دایە گیان بەقوربانت بم.. خێرا ئەملاو لایم ماچ کرد.. لەچاوە کزەکانیم بەگەشی رووانی.. دایە گیان تۆ راستە دایکمی؟!

دایکم یەکەم قسەی بەهەناسەیەکی قوڵەوە وت: کێ ئەم تاوانەی ئەنجامداوە؟

خێرا وتم: کچەکەی.. بوکی بەڕێزت!

دایکم: خوا بیگرێت جا خراپەی چی بو بۆ وایکردووە؟!

لەم قسانەدا بوین خێزانم هاتە لامان بەلۆزە لۆز وەڵامی دایەوە: بۆ ئەوەی تۆ لەناوبەرم.. تۆ بخەمە گۆڕەوە.. تۆم لەبەرچاو ون ببێت! بەڵام دایکی خۆم لەناوبرد.. ئەی خوایە گیان چۆن خۆم کردە رووڕەشی ئەم دنیاو ئەو دنیاو خەڵکیش، تەکانێکم

دایە بەر خۆم، چوومە نزیکتر لەدایکم: دایە گیان دە بۆم وەگێڕە خۆ ئێمە کە ڕۆشتین ماڵمان بەسەر تۆدا بەجێهێشت!! ئەی بۆ لەماڵ نەبوویت؟ ئەیچۆن خەسوم گەیشتە ئێرە؟

ئەی تۆ چووی بۆ کوێ؟ دایە گیان خێرا وەڵامم بدەرەوە.. منداڵەکانمان لەدیمەن و وتەی ناحاڵی سەرنجیان دەدا.. بەبێ ئاگام سەیریان دەکردین..

دایکم هەناسەیەکی قوڵی خەمباری هەڵکێشاو وتی: نزیکی سەعاتێك ئەبو ئێوە ڕۆشتبون، لەدەرگاکە درا.. لەڕاستیدا بەمنێوە تێگەیشتم.. بەڵام کە دەرگام کردەوە خەسوت (ڕێ) خان بوو، بەپەلە هاتبوو بەشوێن مندا، وایزانی ئێوەش لەماڵن،

بەرەحمەت بێت وتی: باجی (سر)ی دراوسێمان بەمنداڵەوەیە خێرت ئەگا بەم شەوە دەستیان بەکەس ناگات، وەرە هاوکاریمان بکە منیش لەبەر منداڵەکان وتم: نایەم لەگەڵتا، چونکە منداڵەکان بەتەنیان و دایك و باوکیان لەماڵ نین.

وتی: من لەلایان ئەمێنمەوە تا تۆ دێیتەوە.. منیش خێرا پێویستییەکانم ئامادە کردو ڕۆشتم پاش تەواوبوونی کارەکەم و دڵنیابوون لەئاسودەیی (دایك و کۆرپەکە)ی هاتوومەتەوە، بەڵام خۆزگە ملم بشکایەو نەهاتمایەتەوە ئەم ڕووداوەم بەچاوم نەدیایە.. دەك خوا بتانگرێت، ڕویکردە خێزانەکەم وتی: کچی خۆم دایکت زۆر خۆش ئەویست، بەڵام بۆ من دوژمنبووی، دایکت لەلا بەرێز بوو کوڕەکەشم ڕێزی لێدەگرت.. بەڵام تۆی بێویژدان ئەو ناپاکیەت کرد ژیان و دنیا ئەوەندە ناهێنێ.. خۆت کردە پەند بۆ هەموو ئەو کەسانەی دڵڕەقانە دەجوڵێنەوە.. ڕۆڵە گیان (چاڵت) بۆ من هەڵکەند، بەڵام (دایکت خستە چاڵ).

دایکم لەنزیك من هەستا، چوو بەلەچکە بلورییەکەی سەری فرمێسکی چاوی خێزانی تاوانبارمی سڕی و وتی: گەردنت ئازا بێت چەندەت ئازار داوم.. وا ڕۆژ ئەبێتەوە خۆت ئامادە کە بۆ سزای ئەم دنیاو دوای دەرچونت لەم دنیاش خۆت ئامادەکە بۆ لێپرسینەوەو دادگای خوای گەورە.. ڕازی نابم کەس لەم ماڵەدا پشتگیرت بکات و بواری مانەوەت بدات.

تۆ زۆر ناپاکی.. ڕۆژێك دێت ئەو خیانەتە لەگەڵ مێردو منداڵ و منیشدا دوبارە بکەیتەوە، خیانەتکار.. کوڕم بەچاوی خۆت ناپاکیت بینی.. بویتە پیاو؟ بویتە پیاو!؟

بەڕێزەکەم چیرۆک‌و روداوی کوردەواری لەم بارەیەوە رویداوەو دەماو دەم رۆشتون وەك (باوك‌و بوك‌و دوو کوڕەکەی کە لەناش دێتەوە)، و هەردوو کوڕەکەی بەدەستی خۆی‌و بەنەشارەزایی‌و لەئەنجامی پەلەکردن‌و کورت بینیدا ئەنجام دەدات، بەلاّم هەر کەسێك کوێرانەو دوور لەپەیامی خواو بەئەقلّی کەسانی ترو بێئەزمون کار بکەن سەرئەنجام پەشیمانی‌و حەسرەت‌و سەرسامی یەخەی ئەگرێت.

لەکۆتاییدا داواکارم لەو خوشك‌و برا بەڕێزانەی لەئەزمونی خێزانداریيان زۆر بەوریاییەوە ئاگاداری خۆیان ببن.. ئەگەر ئەچونەتە کۆشکی خێزانداریيەوە بەوردی بزانە کێ ئەکەیتە هاوبەشی ژیانت‌و پەروەردەکای کۆرپەکانت تا لەداهاتووی تەمەنی کورتتدا تەنیاو پەشیمان نەبیت‌و ئەم دوعایەش بەدڵ‌و گیان بکەرە وێردی سەر زمانت.

**ربنا هب لنا من أزواجنا و ذريتنا قرة أعين واجعلنا للمتقين إماماً ( ٧٤ الفرقان )**

سەرکەوتوو و شادبن

# گەڕانەوەی
# سەحەری هونەرمەند

ن: یاسر فرحان

و: عبدالقادر علی

هونەرمەنـدی بـەناوبانگ (سـەحەر حەمـدی)یەکێکـە لـەو هونەرمەندانـەی کـە لـەم ماوەیەی دوایدا بەرگی ئاینی پۆشی-خاتو سەحەر حەمدی- خۆی باس لە ڕۆژگارو کارو خەمی دەکات :

زۆرم دەبیست کە فلانەی هونەرمەند وازی هێناوەو بـەرگی شـەرعی پۆشـیوە، مـن کـە خۆشم ئەو بەرگەم نـە دەپۆشـی پێمخۆش بـوو کـە خـەڵکی بیپۆشـن..شـەوان و ڕۆژم بـە کاری هونەرییەوە بەسەر دەبرد..ئەوانەی دەوروبەرم حەزیان ناکرد لەو جۆرە باسانە بدوێم!

زۆرم دەبیـسـت لـەگۆڤار و ڕۆژنامـەکان بڕێـك کـەس کـەخۆیان ئیفلاسـیان کردبـوو هێرشیان دەکردنە سەر..بەڵام ئەمانـە هـەر خۆڕاگر بـوون.قال تعالی"**ولا یخافون لومة لائم**".ئەو کۆمەڵە خوشکەی پێش من بەرگی شەرعیان پۆشیبوو کاتی خۆیـان بە وەڵام دانەوەی ئەوانەوە خەریك ناکرد:-

بیرم ئەکردەوە(ئەگەر ئەمانە دەستیان بـە بەرنامـەو بـاوەڕێکی زۆر ڕاسـت و پتـەوەوە نەبێت چۆن بەرگەی ئەم قسەساردانە دەگرن).

بۆیە هەر بەگەورە سەیرم دەکردن و بەڕێز بوون لەلام

پاش ماوەیەك دایکی (سەحەر) نەخۆش کەوت و لەسـەر جێگامایـەوە: ئـەمیش دایکـی بەجێ نەهێشت تا ئـەوە بـوو دایکی وەفـاتی کـرد.. بەشـداری کردنـی ڕێـوڕەسمی بـەخاك سپاردنی تەرمی دایکی (زەنگی وریا بوونەوە) بوو ، ئەی (سەحەر) بزانە تـۆی ئـادەمیزاد

مەبەست لە بوونت چییە؟!. خۆت مەکەرە بوکەشوشەو خەلکی کاتی بێنیشی خۆیانت پێبەسەربەرن! تا کەی خۆت ئەکەیتە مەعرمز بۆ پیاوانی سپلە...!

بیرکەرەوە تۆبەندەی خوایتامرۆڤی ... بەرێز و حورمەتی...

پاش ئەم سەرنجانە دیمەنی ژیانی پێشوی بەخێرایی وەك شریتێکی سینەما بەبەردەمیا تێدەپەڕێ شریتی چی؟! سەرتاپا گوناه... سەرپێچی... دوور لەخوا ژیانە. هەموو لەمێشکیدا ئەزرنگانەوە پاشان خۆی لەبیر کردو چووە سەر ژیانی هونەرمەندانی پێش خۆی، کوا ناویان؟ کوا جمهوریان؟ کوا سەروەتو سامانیان؟ لەم خۆشی ژیانە چیان بردە گۆڕەکەیانەوە؟ ئایا لە دە گەز کفنو دووگەز زەمین چییان پێبرا؟ بێگومان ئەگەر بتوانن لەگەلم بدوێن پێم دەلێن: "" ئامان ئاگات لەخۆت بێت لێرە جگە لەباوەڕو کردەوەی چاك هیچت فریاناکەوێت"

کاتێك کە گۆڕستانی جێدەهێشت بەم بیروبۆچونەوە هەنگاوی بەرەو مال دەنا..

یەکێك لەو کەسانەی کە لەپرسەی دایکیدا بەشداری گەرمو گوڕیان هەبوو خاتو (هالە الصافی) بوو، کە خۆی ماوەیەکە گەڕاوەتەوە ئێستا بەگەرمی بانگی خوشکانی هاوڕەگەزی دەکات بۆ راستە شەقامی رێگای خواناسین.

ئەمیش نهێنی دلی خۆی بۆ باسکرد، چەندە دوودلو بێتاقەتە بەو ژیانەی ئێستای پرسیاری لێکرد: کە رێگەچارەی بۆ دابنێت.ئەویش داوەتی کرد بۆ شوێنێك کە کۆمەلێك خوشك تیایا قورئان دەخوێننو فەرمودی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) راڤەدەکەنو لەئایین شارەزا دەبن.

سەحەر لەکاتی دیاریکراودا لەو جێگەیە ئامادەبوو، سەرنجی دا وا کۆمەلێکی زۆر لەو خوشکە هونەرمەندانە خەریکی قورئان خوێندنن، شەرمی دەکرد لەوەی چۆن تا ئێستا لەم کۆڕی زیکرو یادی خوایە بێبەش بووە!؟ ئارامی گرتو لەنزیکیانەوە دانیشتو دەستی کرد بەگفتوگۆو پەیفین لەگەلیان، هەرچی دروستکراو هەلبەستراو (شایعە)ی کۆمەلێك بوو دژ بەئەمان خستیەڕوو.

ئەوانیش بەهێواشیو بەهێمنیو بەووردی وەڵامیان دایەوەو یەکە بەیەکە بۆیان روونکردەوە، ئەم وەڵامانەی ئەوان بۆ ئەم هیچی نەهێشتەوە، ئەوە نەبێت کە ئەمیش رێگەی راستی ژیان بدۆزێتەوە.

پێش کۆتایی هاتنی دانیشتنەکە خۆی بەقەناعەتەوە پەیمانی دانێ کە بەندەیەکی گوێڕایەڵی خوا بێتو فەرمانەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات تا بەوپەڕی پاکیو راستی قۆناغی داهاتووی تەمەنی ببڕێت. بۆ سەلماندنی راستی هەڵوێستی خۆی هەرلەوێ پەیوەندی کرد بەئوتێلی (هلنان فلستینی) لەشاری (ئەسکەندەریە)یەو پێی راگەیاندن کە ئەو ئاهەنگەی کە بەنیازن سەری ساڵی زایینی بیگێڕن ئەم تازە بەشداری تیا ناکات!.

ئەوانی بەجێهێشت.. بەگریان خواحافیزی لەخوشکەکانی کرد.

لەڕێگا بەخێرایی رۆیی تا زوو بگاتە ماڵ.. دەستنوێژ بگرێتو بچێتە ژوورەکەی خۆی لەسەر بەرماڵ تێر بگری.. ئەسرینی پەشیمانی بڕێژێت.

ئەو رۆژەی کە نیازبوو لەئاهەنگی ئوتێلەکە بەشداری بکات لەماڵ هاتە دەر بەڵام بەبەرگێکی باڵاپۆشیو قورئانێکی بچوك بۆ ئامادەبونی وانەی (پەروەردەی ئیسلامی) لەمزگەوتەکەی (شێخ مەحمود خلیل الحصری).

بەمەش وازی نەهێنا خێرا خۆی ئامادە کرد بۆ سەفەری (عەمرە) بۆ (کەعبە)ی پیرۆز روگەی موسڵمانانو بۆ زیارەتی (شاری مەدینەو پێغەمبەر) درودی خوای لەسەربێت.. تا لەوێ تێر لەئاوی زەمزەم بخواتەوە.. لەو شوێنە پیرۆزەدا سەری بەندایەتیو پاکترین لاشەو بەرزترین ناوچەی بۆ خوا بخاتە سەر زەویو بەندایەتی خۆی دەرببڕێت. خوای گەورە تەوبەی ئەو و ئێمەش قبوڵ بفەرموێت.. هیدایەتی سەرجەم ئەو خوشكو برا بەڕێزانەش بدات کە حەز لەتەوبەو گەڕانەوەی یەکجاری دەکەن بەڵام مەخابن تا ئێستا نەگەشتوون پێمان چونکە (جوانیو دەنگیان) بۆتە دوژمنی ئەم دونیایان.

★ کتێبی : اسرار وراء حجاب الفنانات

# حەسرەتی باوکە شەهیدێک لە کۆڕەودا

کاتێك لاپەڕە ژەنگاوییەکانی کاروبارو فەرمانەکانی (پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی عەلمانی) هەڵدەدەینەوە لەهەموو رویەکەوە چەندین کارەساتی جەرگ بڕو ناخۆش‌و دڵتەزێن دێتە بەرچاومان لەعێراقدا بەگشتی‌و کوردستانی باشوریش بەتایبەتی.. ئەم حیزبە لەسەرەتای دروست بونیەوە دەبێت بزانین کە دامەزرێنەرەکەی کەسێکی دور لەپەیامی ئیسلام بوو.

توانی چەندین کاری ژێربەژێری بۆ دوژمنی عەرەب بکات‌و بەلێهاتوی خۆی خۆی بخاتە سەر کورسی (بەچکەو رۆڵەکانی) بەرەڵای وڵاتی (سوریا و عێراق) کرد.. چەندین کەس هاتنە ناوی حزبەکەیەوە.. گەشەیان کرد.. زۆربون..

سەرکردەی کۆماری عێراقیان لەناوبرد (دەستەڵاتی عێراقیان) گرتە دەست چەند کەسێکیان بونە سەرۆکی عێراق تاقیکرانەوە سەرکەوتو نەبون تا گەیشتە سەر (ئەحمەد حسن بکر)و پاشان (دێڵە دیکتاتۆر ـ صدام حسین)

زۆر بێشەرمانە چەندەها ناوی گەورەو بریقەداری لەخۆ دەنا، پرۆژەی خێری‌و حکومی بەناوی خۆیەوە دادەمەزراند.. تا ساڵی ١٩٨٠ وڵات هیچ هەنگاوێکی خێراو پێشکەوتوی لەبوارە جیاجیاکانی ژیاندا بەخۆوە نەبینی.. چارەنوسی جەنگێکی خوێناوی هاتە ئاراوە.. لەژێر دروشمی (وحدة ـ حرية ـ اشتراكية)دا کاریان دەکرد.. بۆ عێراق‌و عەرەب.. بەناو دۆستەکانی کە پەیمانی نهێنی هەبوو لەگەڵینا ئەمەیان بەهەلزانی.. زانیشیان عێراق دەبێت نەبێتە وڵاتێکی بەهێز، کردیانە مایەی ترس بۆ وڵاتانی دراوسێ.. لەولاشەوە مافی کورد ناوبەناو زیندو دەکرایەوەو باسی لێوە دەکرا بەپێی ویست‌و توانای خۆیان کاریان بۆ دەکرد، کورد لە فەرهەنگی ئەواندا میوان بو هیچی تر،

بەیانی ١١/ ئازار/ ١٩٧٠ هەنگاوێکی زیندو تازە بو بۆ کورد، بەڵام دەرزییەکی ژەهراوی بو بەدەستیانەوە لەچارەنوس و مێژوو داهاتوی کوردیان دا.. زۆر بێشەرمانە..

(شۆڕش دژی دەستەڵاتی بەعس) زیادی دەکرد کڵپەی دەسەند کپ دەکرایەوە.. پاش چەند ساڵێك هەڵدەگیرسایەوە.. لەژێر چەندین ناوی جیاجیادا..

دەستەڵاتدارانی بەعس بەم کارانە نیگەران دەبون.. ساڵی ١٩٨٠ شەڕ دژی ئێران دروستبوو لەسەر چی بو بۆچی؟!

ئاکام تەنها کوشتن و بڕین و کاولکاری وڵات بوو.. دەربەدەرکردنی خەڵکی بو لەهەمو ناوچە سنوریەکاندا.. لاشەی چەندین کوڕی گەنج لەو کەژو کێوان.. لەقەراغ ئاوو چەمدا بونە خۆراکی ماسی و دڕندەکان.. زۆر لاشەش تائێستاش لەزەوی (ئەلغام ڕێژدا) ماوەتەوە.. هەزارەها کەس بونە گۆڕی بەکۆمەڵ.. هەزارەها کەس بونە وێردی سەرزاری میدیاکانی جیهان.. بۆگەنی رژێمی دیکتاتۆر لەسایتەکانی ئەنتەرنێت رەواجی پەیدا کرد.. لاپەڕەکانی رۆژنامەو گۆڤارەکان بەشان و باڵ و بەکاری سەرۆکی عێراقدا هەڵیان دەدا.. کەروخا.. رێبازی کار لەگۆڕاندا بوو. نەوت و سامانی تری عێراق دەدرایە چەك و تەقەمەنی و میللەتیش سەرگەردان و خێر لەخۆ نەدیوو.. ئەو وڵاتانەی یارمەتی عێراقیان دەدا لەشەڕی (ئێران ـ عێراق)دا لەپاش نەمانی (میشێل ئەفلەق) تای تەرازوی ناوچەی ناوەڕاست لەبناغەوە گۆڕا.. عێراق کۆتایی بەجەنگ هانی لە ١٩٨٨/٨/٨ دا بەهەمو یاسایەك رازی بوو، درندانە کەوتە گیانی کوردەکان.. پاش ماوەیەك پەلاماری وڵاتێکی دراوسێی تری دا کە (کوێت) بو ساڵی ١٩٨٩/٨/٢ ئەم کارەش بەرنامەیەکی تری نوێ بوو زۆر شتی لەبانگراوندا هەبو.. هەموو وڵاتانی عەرەبی و ئەوروپی و رۆژئاوایی لێهاتنە هاوار.. چەندین داواکارییان دایە سەرۆکی عێراق.. چەند وتووێژێکیان لەگەڵدا سازکرد سەرزارەکی.. بەڵام لەژێر پەردەی سیاسەتەوە زۆر شت هەبو کە داهاتوو دیاری دەکرد.

بەبڕیارێکی چاوەڕواننەکراو ئاواتی چەند کەسێك هاتەدی.. فرمێسکی شادی بەچاوەکانیاندا هاتەخوار.. تاسەی غەریبی و دوری و چاوەڕوانیان شکا.. ئەویش گەڕانەوەی (ئەسیرەکان)ی جەنگی (١٠) ساڵە بو لەزیندانەکانی عێراق و ئێراندا

گەڕانەوە ناو خاووخێزانیان.. بو بەشایو زەماوەند لەو مالآنەدا کە دەبونەوە خاوەنی باوك.. مێرد، ئەوانیش چەند ناخۆشی کارەساتی دڵتەزێنو ئازارو ئەشکەنجەی ئەسیریان دەگێڕایەوە، وردە وردە بڕیارێکی تر هاتە ئاراوە کە هەڕەشەیەکی توندی لەدانیشتوانی عێراق دەکردو ولاتی بۆ چەند ساڵ پێش ۱۹۹۰ دەبردە دواوە، ئەویش (ئابلۆقەی ئابوری) بو لەسەر گەلی عێراق.. نەك (صدام حسین).

خەڵکی کەوتنە هەڵپەو پەلاماردانی کەرەسەی خۆراكو عەمارکردنی هێدهێدی نرخی پارەی عێراقی دابەزی دابەزی.. تا گەل رسواو داماوبێت..

(حکومەتی عێراقیو دەستەلاتدارانی) وەك گورگی برسی هەر رۆژەو قاچێکیان دەشکێنرا، بەلام بێشەرمانە لەشاشەی تەلەفزیۆنەوە بێعار ئاسا دەدوان کلێپەی راپەڕین لەخواروی عێراق تاوی سەند سەربازە کوردەکان بەچاوی خۆیان روخانی عێراقیان دەدی لەو ناوچانەدا دەهاتنەوە بۆمانیان دەگێڕایەوە.. ژمارەی سەربازە هەلاتوەکانو (هێزی فەوجە کوردەکان) بەچەکەوە بونەورەیێکی بەهێز بۆ دروست بونی راپەڕین لەکوردستاندا، حکومەتی عێراقی زۆر بێشەرمانە پاشگەزبۆوە لەبەڵێنو قسەکانی سوپای لەکوێتدا گێڕایەوە.

لوتی شکا.. لەجەنگی (گەردەلولی بیاباندا) دۆڕاو چەكو تەقەمەنی نەیتوانی کار بکات.. لەبەرەبەیانی ٥/ئازاری ۱۹۹۱ دا لەشارۆچەکەی رانیەوە راپەڕین سەری هەڵداو تاوی سەند.. لە ۷ ی ئازاردا رۆژی رزگاربونی سلێمانی هەڵهات.. بەچکە دیکتاتۆرەکان ئەژنۆیان کەوتە لەرزە چارەنوسیان کۆتایی هات خەڵکی داغ لەدڵ پەلاماری هەموانیان دا.. کەسیان توانای رزگاربونو راکردنیان نەبوو.. خەڵکی بەشادیو خۆشیەوە تێدەکۆشان.. چەکی چەکدارەکانی سەردەمی رژێم گولەکانی دەنا بەخۆیانەوە چەند بنوسین.. بدوێین کەمە.. لە (۹)ی ئازاردا شارەکانی (شەقلاوەو کۆیەو دەربەندیخان) رزگارکران.. رقی تورەی خەڵکی شاری قەلاو منارەشی گرتەوە لە (۱۱)ی ئازاردا ئەویش راپەڕینی سازکردو ئازادیو سەربەخۆی لەدایك بوو.. لە (١٤) ی مانگدا شاری بەفرو ولاتی کوردایەتی (دهۆك ئامێدی)یش راپەڕین، لە (۲۰) ئازاردا گەیشتنە ترۆپکەی راپەڕین بەرزگارکردنی کەرکوك (تاجی راپەڕین) ئەو شارە کوردییەی کە (دوکەڵو غازی

ژەهراوی بۆ دانیشتوانەکەی بو، نەوتو بەرهەمەکانی بۆ بێگانە) حکومەتی عێراقی تەنها ناوەڕاستی بەدەستەوە مایەوە، بەڵام.. (دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی) کەوتە مەترسییەوە.. سەرکردە کوردەکان گەڕانەوە کوردستان (ڕۆو فینە)ی رابردوو دورخرایەوە.. زۆر لەپڕدا بەرنامەی مانەوەی (صدام) لەتیاچونو لابردنەوە گۆڕا بۆ مانەوەی لەسەر کورسی دەستەڵات.. پەلاماری هەمو لایەکی وڵاتی دایەوە.. لەهەمان کاتدا سەرۆکی عێراقی چەندین تاوانی گەورە گەورەی لێدەرکەوت تا گەڕانەوەی بۆ کوردستان.. چەند لاوێکی بەتوانا بونە سوتەمەنی ئەو خەباتە خوێناوییە.

هێزی پێشمەرگەو خەڵکی کەرکوك بەردەوام بون هیچ گوێیان بەهەڕەشەی رژێم نەدەدا.. زۆر ئازایانە (جەژنی نەتەوەیی نەورۆز) یان کرد، بەڵام مەخابن ئەم ئاهەنگە ئازادییە درێژەی نەبو.. بەرنامەی باش پیادە نەکرا هەر کەس بۆ خۆی هەوڵی دەدا هەڵپەی دەکرد.. ئاگری بۆماڵی خۆی دەهێنایەوە..

حکومەت هێرشی بۆ هەمو پارێزگاکان هێنایەوە نزیکەی (٦) ملیۆن کەس ئاوارەی سنورەکان بون لەترسی سەربڕینو ئەتك کردنی ناموسیان هەر دەڕۆشتن.. لە (١٩٩١/٤/١) کۆڕەو دەستیپێکرد.. بەرەو چارەنوسی نادیار.. کە چەندین ساتی زۆر ناخۆش بوون لەبرسێتیو ساردو سەرماو هیلاکیو رەزالەتو ئائومێدیو روخانو کەوتنو هەستانەوە ئای کە رۆژگارێکی ناخۆش بوون، لێرەدا هەڵوێستەیەك دەکەمو دێمە سەر تاوانێکی گەورەی حکومەتی عێراقی کە دەرهەق بەهەمو کوردێك کردیو ئەم بنەماڵەیەش دێنمە قسەو تا لەزاری خۆیانەوە بەشێك لەنارەحەتیان بخەینە بەردەستتان کە رژێمی دور لەمرۆڤایەتی بەعسی عەلەنی کردویەتی..

کاك (عارف عبدالله چۆخماخ)ی خاوەنی دادە (جوانە)ی تەمەن (٢٠) ساڵ دەڵێت: ئەو شەوەی شار چۆڵی کرد بۆ بەیانیش خەڵك هەر کۆچیان بەرەو جێگەی نادیار دەکرد، منیش ئەندامانی خێزانەکەم ئاگادارکردەوە کە بەرەو ناوچە سنوریەکان بڕۆین، یەکێك لێرەو دوان لەرێگا ملماننا کەوتینە سەر رێگەی شارباژێر ئای لەو رۆژو ساتە ناخۆشانە یاخوا بڕواونەیەتەوە.. رۆشتین کچە گەورەکەمو دایکیو برایەکی لەماڵ مایەوە

بەمەبەستی گەڕانەوەمان بەدوایاندا.. بەڵام کە گەیشتنیە سەری ئەزمەڕ گەڕانەوەی چی!

هەر خەڵك بوو بەپێ دەڕۆی هەر سەیارە بو سەری نابو بەیەکەوە دەڕۆشتن، کەس ناوڕی بۆ دواخوی نادایەوە.. قریشکەی ژن و ژاڵ زریکەی منداڵ.. هاڕە هاڕی سەیارەی گەورە ئەم هەمو خەڵکە خۆیان پێوە هەڵواسی بو، ژنێ دەگریا دوان مات و سەرسام، چوار پیاو گێژو کاس.. ماڵ هەر دەڕۆی بۆ کوێ؟ ئەنجام؟ کەس هیچی نازانی.

دەنگی ئەو کۆمەڵە چەکدارەی ناو بازاڕی شارم لەگوێدا دەزرنگایەوە:

تانك و تۆپ و تەیارە

دەرماننا‌کات لەم شارە

بەڵام بەداخەوە لەپێش ئێمەوە رایان دەکرد، خەڵکی (کەرکوك، قەرەهەنجیر، چەمچەماڵ و ناوچەکانی تر) بەناژەڵ و پاتاڵەوە هەر دەڕۆشتن، ئەوەی سەیارەی هەبو باش بو، ئەوەی نەیبو وەك ئێمەبو،

ویستم بگەڕێمەوە بۆ ناو شارو دەستی کچەکەم و ئەوانەی ماون لەژن و کوڕو بەرو دراوسێ بگرم و بەرەو شوێنی نادیار بڕۆین.. چەند مەترێك هاتم، بەڵام بواری گەڕانەوە نەستەم بو، چونکە دو (هەلی کۆپتەر)ی رژێم بەئاسمانەوە دەگەڕان و چاودێریان دەکرد دو کوڕی گەنج یەکی (R.B.G) یەکیان پێوە نان دورکەوتنەوەو زۆر لەخەڵکەکە دەستخۆشیان لێکردن، بەڵام بەخێرای گەڕانەوەو کەوت[illegible] تەقەکردن لەو خەڵکە هەرچی هەبو پەرشو بڵاوبونەوە.. مەکینەیەکی تراکتۆر بەرکەوت، چەند سەر مەڕێکیشی کوژان منیش زۆر دورکەوتمەوە.. روداوێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بو.

پاش نیو سەعات گەڕامەوە ئەو ناوە خوێنێکی زۆر ڕژا بوو وتیان: چەند سەیارەیەك هەندێ لەبریندارەکانیان بردووە.. زۆر شت لەو ناوە بڵاوبوبۆوە.

خەڵکی هەنگاوی بەسەردا دەنان.. ئەو خەڵکە هیوادار بو خۆی بەسەڵتی راکات شتی بۆچی بو؟! ئای لەو ساتە ناخۆشانە!! بیرناچنەوە.. نەخێر.. هەرگیز ئەو دیمەنە قیامەتیەم لەیاد ناچێتەوە.. هەر کەسەو بۆ خۆی رایدەکرد.. هەر کەسەو خەمی خۆی بو یەکێك وتی: سوپای عێراق گەیشتنە ناو شار.. تا ئەتوانن خێرا بڕۆن واهاتن.

زۆربەی کات ئەو کچە (ئەنفال)[1] کراوانەم دەکەوتەوە یاد کە پیاوە دەوڵەمەندەکان کڕیبویانن لەبەعسیە فاشیەکانو خزمەتگوزاری خۆیانیان پێدەکردن.

دەموت: تۆ بڵێی ئەم کچەی منیش ئێستا لەماڵی چ سەرباز یا دەوڵەمەندێکی تردا کار بکات، غەمو پەژارەی ئێمە تەنها پێستو ئێسقانی هێشتبێتەوە.

سەربازێکی کورد لەسوپای عێراقدا لەجەنگی کەنداودا وتی: لەگەڵ چەند برادەرێکدا چوینە نا وڵاتی کوێتەوە، چومە ماڵە دەوڵەمەندێك سەیرم کرد چەند ئافرەتێك خزمەتکاری دەکەن.. سەرنجم دان یەکێکیانم ناسی هاتە لامەوە ناوی هێنام.. نایوم هانی.. باوەشمان کرد بەیەکدا دامانە هاڕەی گریان، پیاوە کوێتیەکە سەرسام بو وتی: ئەوە چییە؟

وتم: ئەمە خوشکمە.. چی ئەکات لای تۆ؟

وتی: من لەچەند سەربازێکی عێراقیم کڕیوەتەوە پێش ٣ ساڵ لەمەوبەر ئەوانەی جوانو گەنجن خزمەتم دەکەن.. داوام لێکرد دوای چەند وتووێژێك کە پێم ببەخشێتەوە.. ئەویش زۆر بەزەیی پێماندا هاتەوە بۆیە قسەکەی قبوڵ کردو بەرەو شاری سلێمانی گەڕاینەوە[2].

لەو ساڵو ساتانەدا تەنها رادیوی (گەلی کوردستان) هەبو ناو و ناونیشانی تەواوم دانێ.. پاش چەند جار بانگەواز نائومێدبوم.. گەڕام.. شار بەشار، شارۆچکە بەشارۆچکە "ئێران - رانیە، کەلار.." هەندێ گوندی تازە ئاوەدان کراوەم تەیر کرد.. چەند سەربازگەیەکی عەسکەریم بەسەرکردەوە.. هیچ سەرو سۆراغی نەبو، ناونیشانی هەندێ گۆڕیان دامێ کە کاتی ئاوارەبونەکە لەقەراغ جادەکان گیانیان سپاردبو خەڵکی خێرخواش کردبویانن بەژێر خاکەوە.. بەڵام کە سەرنجم دەدان هیچ ئەقڵم نایبڕی ئەمە گۆڕی کچی من بن.. بەهەمو گەڕانەوەیەکم بۆ ماڵەوە دەسڕی بەرباخەڵەکەم لەئەسرینی چاومدا دەخوسا.. چاوەڕوانیم زۆرکرد، هەر کە لەدەرگا دەدرا دڵم دادەخوڕپا ئێستا نا

---

[1] شاڵاوی بەناو ئەنفال: لە ١٩٨٨/٤/١٤ دەستی پێکرد بۆ ناوچەکانی قەرەداغو لەناوبردنی ئەو سەرکردایەتیەی (ی.ن.ك) لەو ناوچانەدا، بەتاڵان بردنی ئافرەتو منداڵو کوشتنی پەروانەکانو خاپورکردنی دێهاتەکانی.

[2] لەگەڕەکی شەهیدانی زەرگەتە لەشاری سلێمانی.

سـاتێکی تـر دیمـەنی کـچەکەم دێتـەوە بەرچـاو، بـەڵام بەداخـەوە.. ئـەو دەرناچـو.. بەکۆڵانەکاندا گوزەرم دەکرد لەجێگـەکانی جارانـدا دەهاتـە بەرچاوم.. زەردەخەنـەی بۆ ئەکردم.. لێی نزیك دەبومـەوە شـتێکی تـر دەردەچـوو.. زۆر خەفـەتم بـۆ ئـەخوارد.. زۆر خەیاڵاتی خراپم بۆ دروست ئەبو، رۆژێك لەبازاڕ ئافرەتێك وەستابو شتی دەکڕی بـاڵای.. بەرگی.. قژی.. هەمو لەش و لاری خۆی بو تێر تێر سەیرم کرد.. دڵم پاراو بـو.. ئۆخـەی (جوانە) ئەوەتۆی باوکی باوکەکەم لێیـچومە پێشەوە.. ئـەو سـەرگەرمی شت کـڕین بـو.. خەریك بو شاگەشکە دەبـوم دەسـتێکم دا بەشـانیاو بـانگم کـرد (جوانـە گیـان کـە ئـاوڕی دایەوە.. هەمو ئاوات و خۆشیەکانم بونە سەرابێك و تیاچون.. ئـافرەتێکی تـر بـو.. ناچار وتم ببورە کچی خۆم وامزای کچەکەی خۆمی!.. بوراوی خاڵە گیان.

بڕوا بکەن دەنگیشی هەمان دەنگ بو کە لەزاری کچەکەم دەهاتە دەر.

براکانیـشی لەهـەر شـوێنێك باسـی ئافرەتێکیـان بکردایـە دەچـون و بەدەسـتی بـەتاڵ دەگەڕانەوە.. هەر ماڵێك لەنێرانەوە یـا لەسنوری کوڕەوەوە بهاتنایەتـەوە بمناسینایە یـا نەمناسـینایە دەچـومە سـەردانیان هـەواڵی کـچەکەم لێدەپرسـین.. وێنەکـەیانم پیـشان دەدان.. ئاکام نەمانـدیوە! درۆی چیت بـۆ بکـەین.. بـەڵێ راسـتیان ئـەکرد.. زۆر سـەربازم لەرێگەی سەربازگەکان بەگیر ئەهانی: ئایا ئافرەتێکی لەم حاڵەو لەو رەنگەتان نەدیوە؟

وەڵام: نەخێر ئێمە کەس ناناسین.

یـانزە مـانگی رەبـەق تێپـەڕی، خـزم و کـەس و کار هـەواڵیان دەپرسـی، بـەڵام هـیچ سەروسۆراغێکی نەبو. رۆژێکیان بانگی نوێـژی (عەسـر) بـو خـۆم کـرد بەمزگـەوتی (مـلا عبـداللە) لـە (مجیـد بـەگ) دا: خوایـە گیـان کۆمـەکیم بکـەی لـەم تەنگـەژەو نارەحەتیـە رزگارم بکەیت بۆ خاتری ئەم بانگ و سەلایەت.. زۆرجارو ئەم جارەش نـزاو پاڕانـەوەکانم بەچاوی پڕ ئەسـرینی قەتیـسماوەوە بـو، ئـەم چـاوەڕوانی و دڵەڕاوکێ و گـەڕان و هەناسـە ساردییە هەر بەدەم خۆشە.. کزە لەجەرگمەوە ئەهات.

چومە سەر جێگای دەستنوێژ شتن.. نزای پێش دەسـتنوێژم خوێنـد: (**اللهم أغفـر لـي ذنبي ووسع لي في داري و بـارك لي في رزقي**).

دەستم کردە دەستنوێژ شتن.. پیاوێکی بەهەیبەت لەولامەوە بەچەند بەلوعەیەك دەست نوێژی ئەشت ئاگاداربوم سەعاتەکەی دەستی دانا لەسەر یەکێك لەتەختەی دانیشتنەکان، بەبینینی (سەعاتەکە) دڵم داخورپا سەرسامو ئەبڵەق مام.. بەلوعە ئاوەکەم بۆ نەگیرایەوە پەلاماری پیاوەکەم دا: وەرە زاڵم.. ئەم سەعاتەت لەکوێ بو؟

کابرا وەك لەبانێکی بەرز بەربێتەوە بەسەرسامییەکەوە سەیری دەکردم، تۆزێك هاتمەوە هۆشخۆم.. چاوەکانم پڕ بون لەئەسرین بەدەنگی نەرمو شەرمنەوە وتم: کاکە گیان.. دەستم بگرە زۆر چاوەڕوانی خاوەنی ئەم سەعاتەم.. لەکوێوە ئەم کاتژمێرەت دەستکەوتووە.. کوا خاوەنەکەی؟ زۆر جێگەی بەزەیی بوم، پیاوەکە وتی: بۆ وا عەودالی.. چیت لێقەوماوە؟!

بەقوڕگی پڕ گریانەوە.. دەستەکانم ئەلەرزین وتم: خاوەنی ئەم سەعاتە کێیە؟ تۆیت یا کەسانی تر.. زۆر لەسەرخۆ، خۆی پێناساندمو لەناکامدا وتی: برا جوانەکەم ئەم سەعاتە هی من نییەو چیرۆکەکەی دورە.. هیچ پێویست ناکات تۆ بزانیت.

وتم: چۆن نەزانم.. خاوەنی ئەم سەعاتە گەر تۆ نەبیت لەئەسلا ئەوە هی کچی منە.. کچی من خاوەنیەتی.. توخوا راستم پێبڵێ.

تێر سەیری چاوی پڕ ئەسرینی کردم.. لێم نزیك بۆوەو دەستی خستە سەرشانم هێزی قاچەکانم نەما لەعەرزەکەدا دانیشتم ئەویش لەگەڵم نزم بۆوە وتی: زۆر حەز ئەکەی بەسەرهاتو حیکایەتەکەی بزانیت؟ بەڕوخسارتا دیارە تۆ کەسێکی زۆر گرنگی بەخاوەنی ئەم (سەعاتە دەستی)یە دەدەیت!

وتم: ئەگەر خاوەنەکەی ئافرەتێك بێت ئەوە کچمە.. توخوا چی ئەزانی لەبارەیەوە راستم پێبڵێ.. پێیفرۆشتوی؟! دۆزیوەتەوە؟! چی ئەکا لای تۆ خێرا پێم بڵێ.. بەرچاوم تاریك بوو. لەساردی ئاوەکە هۆشخۆم هاتمەوە لەهەیوانی مزگەوتەکەدا، چەند پیاوێکی تر بەسەرسەرمەوەبون، تومەس بورابومەوەو لەو ناوە دوریان خستبومەوە.

(س): کاتی ئاوارە بونەکە ئێمەش وەك ئەو خەڵکە ڕێگەی نادیارمان گرتەبەر.. چەند سەیارەیەك بوین لەو کاتەدا بو کە دوو (هەلی کۆپتەر) قەسفیان لەخەڵك ئەکرد، لە (دۆڵەماین)ی پشت دەباشانەوە رۆژی ٤/٤ کاتێك گەیشتینە سەر جێگەی روداوەکە

(تراكتۆرێك) و چەند كەسێك بەركەوتبون، چەندین پیرومندالْو ژنو خەڵكی تر هاوارو زریكەیان بو، ئەیان وت رەنگە (كیمیاوی) تیابێت، بەلاّم باش بو تەنها قەسف بو.. سەرنجی برینداره‌كانمان دا سەیرمان كرد هەڵمان گرتنو خستمانە سەیارەكەی خۆمانەوە.. خاوەنی ئەم سەعاتەش كچێكی جوانی قیافەرێكبوو بریندار بو بو هاواری لەئێمە كرد: كاكەگیان توخوا.. خێرتان ئەگات لەرِاهی خوادا فریام كەون.. بەتەنهام.. منیش لەگەڵ خۆتان بەرن، زۆرمان بەزەیی پیا ئەهاتەوە.. هەڵمانگرتو خستمانە سەیارەكەی خۆمانەوە. زۆر دوعای خێری بۆ كردین.. زۆر سوپاسی كردین.. زۆر ئاقڵو وریا دیار بو. ناو سەیارەكە بو بوە خوێن.. گەیشتینە سەری ئەزمرِ ئەوەكانی خۆمان گیانیان سپاردو شەهیدبون، بەلاّم كچەكەی تر باش بو تا لەپێچەكانی ئەزمرِ هاتینە خوار، هەر قسەی بۆ ئەكردین، یەكێك لەقسەكانی وتی: تۆزێك ئاوم بدەنێ زۆرم تینوە.. ناچارم رۆژووەكەم بشكێنم[1].. تۆزێ ئاو، بەلاّم بەداخەوە نەمانوێرا ئاوی بدەینێ، چونكە بریندار بو، لەئاستی گوندی (سیتەك) لەقسەكردن كەوت تەنها هەناسەی دەدا.. بەئیشارەت هەر داوای ئاوی ئەكرد.. بەلاّم نەمانتوانی بوەستینو ئاوی بۆ بێنین.

ئەم سەعاتەی دامێ، پێم وت لەجیاتی پارە دادە گیان!؟

سەری راوەشاند.. تێگەیشتم بۆ ناونیشانە دەیڵێ.. لێم وەرگرتو لەبەر چاوی لەدەستم كرد.. زەردەخەنەیەكی بۆ كردم.. گەیشتینە ئاستی خانووە روخاوەكانی (زەردەبی) گیانی سپارد.. خوای گەورە پلەی شەهیدی بەنسیب كردبن، دیمەنەكەیان هەژاندمی، تاساندمیو تائێستاش لەژێر كاریگەرییەكەی دەرنەچووم، هاتین.. هاتین چەندەها سەیارە لەپێشمانەوە بو لەدوامانەوەش بەهەمان شێوە تا گەیشتینە پردەكەی (قەلاچۆن) هەستمان بەئاسودەیی كرد بەباشمان زانی لەنزیك جادەكە بیان كەین بەژێر خۆڵەوە.. بەڵێ لاماندا چاڵێكی گەورەمان دۆزییەوە هەر نۆ تەرمەكەمان راكێشانو هەندێك گڵی بەفرمێسكی باران تەرمان كردن بەسەردا.. لەناوی چەمەكە سەیارەكەمان شت.. لەپاش گەرانەوەمان بۆ شار دوای ئاوارەبونەكە ئێمە چوین تەرمەكانی خۆمان

[1] نزیكەی (١٦)ی مانگی رەمەزان بو.

دەرهێنایەوە ئەویش لەوێ ماوەتەوە.. ئەم کاتژمێرەش بۆدۆزینەوەی خاوەنی لەدەستم کردووەو پاراستوشمە.. بەبەردەوامی پرسیارم لەخەڵك ئەکرد لەکۆڕو کۆبونەوەو پرسەکاندا باسم دەکرد.. بەڵام کەس خاوەنی نەبو!

بەئاهێکی پڕ حەسرەتەوە وتم: ئەی من دنیا گەڕام.. دام بەرادیۆ.. بەشاراندا گەڕام کەس نەبو گەیشتمە ئێران.. قەڵادزێ.. رانیە، توشی چەندین کەس بوم.. ئەی تۆ لەم شارەدا نەبوی.. هەر نەت بیست؟

(س): من لەم شارەدا بوم، بەڵام ماشاالله شار بەحرەو منیش بەخەڵکی ئەم شارەم نازانی دەموت رەنگە خەڵکی شارۆچکەکانی دەوری سلێمانی بێت.

نەمتوانی زیاتر لەگەڵی بدوێم.. سەعاتەکەم لێوەرگرتو کاتێکم بۆ دانا کە ئەزیەت بکێشێتو بێت لەگەڵمانا بۆ دەرهێنانەوەی تەرمەکەو ئاسودەبونی رۆحی ئێمەش، نوێژ (عەسر)م کردو بەکۆمەڵێ غەم لەلایەكو ئاسودەیی لەلایەکی ترەوە ورده ورده بەرەو ماڵ بومەوە.. لەگەڵ چومە ژورێ هاوارێکی عەجیبم کرد خۆشم نەمتوانی دەنگم کپ بکەمەوە.. سەعاتەکەم پیشان ماڵو منداڵو براکانی دا سەرسام بون بەو دیمەنە.. یەکێك لەبراکانی وتی: بابە گیان (جوانە)ی خوشکمان شوکر ماوەو ئەتوانێت بێتەوە ناومان.

قوڕگم پڕ بو لەگریان جۆگەلەی ئەسرین تەقینەوە.. نە بابە گیان (جوانە) لەرۆژی ئاوارەبونەکەوە بەساروخی هەلی کۆپتەرەکانی بەعسی خوێنرێژ شەهید بووە، ماڵ بووە گریانو هەرا.. بەرو دراوسێ ماڵیان ئاوابێ دارژان بەسەرماندا هەواڵ دەماوم دەم رۆشت.. ئەو شەوە ماڵمان یەکێکی تری ناگرت، سەیارەی خزمانو بەرودراوسێ ئامادەکران بۆ رۆژی دوایی بەرەو گڵکۆکەی کەوتینە رێ.

کاك (س) لەدورەوە جێگەکەی پیشاندام.. نزیك بوینەوە ژنو پیاوێك لەبەر (ساترێك)[1] دا سەرقاڵی کاری کشتوکاڵی بون.. بەبینینی ئێمە سەرسام بون، خوا قوەت بونمان کردن.. پیاوەکە وتی ئەوە خێرە ئەم قەرەباڵغییە؟

---

[1] ساتر: بەعسی فاشی بۆ تەقەکردن لەسنورو سوپای ئێران ئەم ناوانەی کردبو بەجێگەی تۆپی گەورەو سەیارەی چەك هەڵگر، بۆ دیارنەبونیان بەشۆفڵ گڵی بەدەوردا هەڵدەدایەوە لەپاش تەواوبونی شەڕیش هەر ماونەتەوە.. ئێستاش زۆر ناوچە لێیماوە.

بەناهێکی تاساوەوە وتم: کچێکمان لەکاتی کۆڕەوەکەدا شەهیدبووەو لێرەدا شاردراوەتەوە، خوا ماڵی کاک (س) ئاوەدان کات جێگەکەی پێوتوینو ئێمەش هاتوین بیبەینەوە.

کابرا وتی: لەخەودا چەند جارێك روناکیم دیوە لەم ناوچەیەدا، بەڵام هەستم ناکرد تەرمی کچی شەهید کراوبێت.

هەمو کۆبوینەوە کاک (س) هاتە پێش لەبەر چاوی ئەو هەمو خزمو برادەرو ناسیاوانە هەمو روداوەکەی گێڕایەوە تا ئەم ساتەش خۆی پێنەگیرا.. گریا..ئێمەشی گریاند بەدەسرێ بەرباخەڵەکەی چاوەکانی سڕی وتی: سوپاس بۆ خوا دوای ئەم (١١) مانگە ئاسودەیی گەیشتەوە دڵی هەمو لایەکتان لەدو دڵیو دڵەڕاوکێو چاوەڕوانی رزگارتان بو، انشاالله جێگەی بەهەشت دەبێتو پلەی شەهیدی دەبێت خوای گەورەش پاداشتی دایكو باوكو خزمو کەسانی بداتەوە.. داوای (دووخاکە نازی) کرد.

دەستمان کردە هەڵدانەوەو لابردنی گڵەکەو لەبیری خۆمدا وتم بەبینینی جلوبەرگو ئێسقانەکانی دڵنیا دەبم.. تەرمەکەی دەرکەوت.. ژنو ژاڵ دایانە هاڕەی گریان ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشاین، دیمەنی لاشە تێك نەچونی (جوانە) بو رومەتەکانی ئاڵ.. تەرمەکەی نەرمو شل هیچ تێکنەچو بو بەتانیەکی بەسەرەوە بو.. ئەمە چ کەسێکە دوای ئەم (١١) مانگە وەك خۆی ماوەتەوە دەستم برد لەگەڵ برایەکیدا هەڵمان گرتو هانیمانە ئەم لاوە.. هێندەی تر سەرسام بوین کە دامانا خەڵکەکە ئەوەندەی تر سەرسام بون.. سەیری خۆم کرد جلەکانم هەموی بوبونە خوێن لەجێگەی زامو برینەکانیەوە (خوێنێکی جوانی گەش) رژایە سەر زەوی.. خستمانە ناو بەتانیەکەوەو خستمانە ناوی سەیارەکەوە تا دورکەوتینەوە چاوم بڕیبوە گۆڕەکەی.

سەیارەکان گەیشتنە ئەو جێگەیەی کاك (س) لەگەڵ خزمەکانی خۆیدا هەڵیان گرتبۆوە بەبریندارى وتی: بوەستن.. ئێمە لەم جێگەیە ئەم کچەمان هەڵگرتۆتەوەو سبحان الله چۆن خستومانەتە سەیارەکەوە پاش ئەم (١١) مانگەو ئەم هەمو گەرماو

سەرمایە وەك یەکەم خولەکە[1].. خوایە گیان ئاهو نزولەی ئەم کچەو هەمو شەهیدێکی ئەم کوردستان کاربەدەستانی زاڵمی بەعس رسواو سەرگەردانو جەرگ سوتاو بکەیت.. گەڕاینەوە شار.. لەشار چاوەڕوانمان بون ئەو خزمو کەسوکارانەمان، هەر بەو جلوبەرگو خوێنە گەشەوە، بەو زمانە بەڕۆژووەوە بەو لاشە نەرمو شلەوە لەگۆڕستانی (شێخ محمد هندی) بەخاکمان سپارد.. رۆژانی هەینی دایکیو پێنج براو چەند خزمەتێك سەردانی گۆڕەکەی ئەکەن.. منیش لەدوای هەمو نوێژەکان دوعای خێری بۆ دەکەمو خۆم بەغەدر لێکرو دەزانم دوعای رسوابون لە (ئەندامانو نزیکەکانی صدام) دەکەم.

بەڕێزەکەم.. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەفەرموێت: دوعای سێ کەس رەت بونەوەی نییە لەلای خوای گەورە خێرا گیر دەبێت: ١/ غەدر لێکراو ٢/ کەسێکی رۆژووان لەکاتی شکانی رۆژوەکەیدا ٣/ کەسێکی موسافر یان حاکمێکی عادل.

نزای کاك (عارف) و (س) گیرابوو، صەدام دو کوڕو کوڕەزاکەی کوژرانو بەچاوی خۆی تەرمەکانی بینی، بەڕسواییو شەرمەزاری لەکورسی حوکم دایانگرتو گرتیان[2].. لەنازو نیعمەتیماڵو منداڵو سامان بێبەش کرا، مێژوش نەفرەتی لێدەکات.. هیوادارین هیچ کەسێك بیر لە (ناپاکیو ستەمکاری) نەکاتەوە ئەسرینەکانمان بگۆڕین بۆ هاندانی پێشکەوتنو خزمەتی نەتەوەو ئاینو مرۆڤایەتیمان لەکوردستانی پاش هەڵبژاردندا و کۆتایی بەستەمو گەندەڵی بێت.

---

[1] حاجی رەحیمی عەلەروسی بێسەری دەڵێت: تالەپیزە بۆ باوکی گێڕایەوە کە رۆژێك چەتەیەکیان ئەکوژرێ لەناوچەی ئێران لەنزیك گوندی (قۆرخ)، ئەمانیش گۆڕی بۆ هەڵدەکەنن دەگەنە سەر گۆڕی ئافرەتێك کە هیچ تێکنەچووە لەشولاری زۆر سەرسام دەبن، ئیتر لەبەرپاکیو بێگەردی ئەو ئافرەتە ئەمانیش تەرمەکەی خۆیانو ئافرەتەکە دادەپۆشنو کە پرسیاردەکەن خەڵکی ئەو ناوە دەڵێن: سوپای روس ژنو ژاڵی ئەو ناوەی لەوێدا شەهیدکردونو بێگوناهن.

[2] * لە بەرواری ٢٠٠٣/٣/٩ هێرشی(هاوپەیمانان)بۆسەر عێراق دەستی پێکرد.

* لە بەرواری ٩ /٢٠٠٣/٤ پەیکەری صەدام لەمەیدانی فیردەوس روخێنرا.

* لە بەرواری ٢٠٠٣/١٢/١٣ لەچاڵێکدا صەدام دەستگیرکرا و بەرەوزیندان برا.

* لە بەرواری ٢٠٠٦/١٢/٢٨ لەیەکەم رۆژی جەژنی قوربان لەسێدارە درا.

# حەسرەتو پەشیمانی

## خۆشەویستی سەرتاسەری لەدوایە !

باوك: ئەو بونەوەرە زیندووەیە کە لەگەڵ دایکمانداو بەقەدەری خوای گەورە ئێمەیان هانیوەتە بوون، ئەمەش دوای چەندین تاڵیو سوێریو خۆشیو ناخۆشی ژیان.

دایك هەوڵی لەگەڵ داوین کە باوکی چاکمان بۆ هەڵبژێرێت، باوکیشمان پێش هاتنەبونمان خۆیان خستۆتە بیرکردنەوەو ئەندێشەوە تا هاوسەریان دایکی دڵسۆزو پەروەردەکاری چاك بێت بۆ رۆڵەکانیان.. چونکە ئەو منداڵە لەبەردەستی دایکدا گەشە دەکاتو دەبێتە ئەندامی کۆمەڵگا.. دەشبێتە گەورەترین سەرمایەی دینو دنیا بۆیان.

لەسەرەتای تەمەنی هاوسەریدا زۆر گەنج بیر لەمە دەکاتەوەو غەمی دەخوات، زۆر گەنجیش بەسادەیی بیری لێدەکاتەوە، بەڵام تا مەلەوان بیت لەژیانداو مامۆستای باشت هەبێت دەتوانیت شەپۆلەکانی بەپشو درێژی بیرکردنەوەی قوڵ ببڕیت نائومێد نابیت.

ئاسۆی روونو گەشت لێنزیك دەبێتەوە.. لەدواساتەکانی ژیانیشتدا کە ئاوڕ لەتەمەنی رابردووت دەدەیتەوە هەموو رۆژەکانو ساڵەکانی بەگەشی گوزەراوەو شادمانیت پێیان، بەڵێ دوو سۆما گەشەکەی خوێنەری دڵپڕ لەشادیو ئاوات ساتێك خۆت تاریك کە باهزرت بزرنگێتەوەو لەگەڵما وەرە بۆ سەفەرێك کە خەوە ئەرخەوانیەکان بەدەم کازیوەی سەرەتای تەمەنەوە دڵۆپە ئاورنگی تاریکی شەویان لێدەچۆڕێتەوە..

بەڵێ، دڵنیام ئێستا خۆتو هەستو ئەستت ئامادەی ئەو گەشتەیە، کە بەناسودەیی بۆ باوك هەوڵبدەین.. بۆ؟

چونکە تۆش دەبیتە باوك یان دایك یان..

لەدەرگا درا باوك وەك لەخەو راپەڕێت لەپاڵ زۆپا ئەوتیەکەدا هاواری لە (هیوا)ی کوڕی کرد کە منداڵێکی هەشت ساڵان بوو.

(ئادەی رۆڵە بزانە ئەو دەرگایە کێیە؟)

(هیوا) زۆر بەوریایی وتی: بەڵێ بابە گیان وانەچم!

دەرگای ژوورەکەی داخستەوەو چووە دەرەوە، دەرگای دەری دەرەوەی کردەوە پیاوێکی پیری بەساڵاچووی بینی.

وتی: فەرموو خاڵە چیت ئەوێ؟

پیاو: کاکە چکۆل ئەمە ماڵی کاك (نە)یە.

(هیوا): بەڵێ بەدڵنیاییەوە.. سەرێکی بۆ جوڵاند.. فەرموو چیت ئەوێ؟

پیاو: بەئەرك نەبێت بەباوکت بڵێ ئەگەر لەماڵەوەیە.

(هیوا): بەڵێ لەماڵەوەیە ئەی قابیلە بەم سەرمایە چوبێت بۆ کارکردن.

پیاو: ئافەرین.. بەقوربان پێیبڵێ باپیرە لەدەرگای دەرەوە داوای یارمەتی لەتۆ دەکات‌و دەڵێ: هیچ شك نابەم ئەمشەو لەسەری بنووم لەتە ڕاخەرێکم ـ فەرش یا بەتانی ـ بداتێ با لەسەر ئەرزی رووتی نەنووم، خێرت دەگا.. دەبچۆ پێیبڵێ!

هیوا: پیاوەکە بۆچی تۆ باوکی باوکمی!!

پیاو: بەڵێ بەقوربان تۆ کوڕەزامی.. باوکت لەم ماڵەی دەری کردووم.. رۆژێك کە منداڵ بوو من پەروەردەم کردو پێم گەیاند، بەڵام ئێستا ئەو دەری کردووم‌و بەخێوم ناکات!

فرمێسك لەچاوە کزەکانیا قەتیسم ماو..

هیوای زرنگیش بەهەستە ناسکەکەی زۆر پەژارەی لێخوارد، گەڕایەوە ژوورێ، بەباوکی وت: بابە گیان پیاوێکی پیر لەدەرگای دەرەوەیە داوای یارمەتی لەتۆ دەکات، دەڵێت باوکی باوکتم!..

باوك زۆر بەخوێن ساردانەو زۆر بەهێمنی سەیرێکی کوڕەکەی کردو وتی:

(ئا.. راست ئەکا.. لەو گیرفانەم "یەك دیناری ئاسنی" بۆ بەرەو بیدەرێ)

هیوا: ئاخر بابە ئەو داوای ڕاخەری کرد.. وتی لەسەری ئەنووم هیچ شك نابەم.

باوك: بەبێزارییەکەوە وتی: دە باشە رۆڵە گیان بچو لەژوورەکەی ئەولا بەڕەکۆنێکی لێیە بەدایکت بڵێ بیداتێ، یان دایکت بۆی بەرێت، خێراکە با ئەو کەوڵە کۆنە بێزارمان نەکا.. وەیش کە ئالەبارە.

هیوا بەنابەدڵی بەرەو ئەو ژوورە ڕۆیشت بێنەوەی بەدایکی بڵێ.. پاش ماوەیەکی زۆر هەر نەگەڕایەوە، باوك لەتەنیشت زۆپاکە هەستاو تا بزانێ (هیوا) بۆ نەگەڕایەوە.. بەهێواشی‌و بەبێ چرپە چووە ژوورەوە سەیر ئەکا وا (هیوا) بەچەقۆیەك ئەو بەڕەیە ئەکات بەدوو کەرتەوە.. نیوەیی کردووە لەبڕیندا..

باوك بەلایەوە جێگەی پرسیار ئەبێت، ئەڵێ: هیوا ئەوە خەریکی چیت بۆ وا لەو بەڕە شڕە ئەکەیت..

هیوا بەسەیرێکی پڕ واتاوەو بەهەناسەیەکی توندەوە ساکارانە وتی: بابەگیان ئەیکەم بەدوو کەرتەوە.

باوك: جا بۆ هەموی نادەیتێ پارچەکەی ترمان بۆچیە.. بیدەرێ.

هیوا: ئاخر بابەگیان بۆ ئەوت دەرکردووە بەم سەرمایە، نیوەی دەدەمێ، ڕۆژێك کە منیش گەورە بووم تۆ دەرئەکەم‌و نیوەکەی تری دەدەم بەتۆ.

باوك مێشکی کاسبوو.. خورپەیەك بەدڵی کەوت، لەم وەڵامە زۆر خەجاڵەت‌و شەرمەزار بوو. زەنگی خۆشی‌و ویژدانی لێیدا، بەدەست خۆی نەبوو باوەشی کرد بە (هیوا)دا بەسەرسامیەوە وتی:

بەسە.. کوڕم بەسمە بڕۆ بەباپیرەت بڵێ با بێتە ژوورەوە.. ئەمە ماڵی ئەوەو ماڵی کەسی تر نیە.. دە بڕۆ خێرا دەستی بگرە.

هیوا وتی: بابە گیان بۆ ئەگریت.. مەگری وەرە خۆت لەلای ئەو بگری‌و ئەو باپیرە داماوەم بهێنەرە ژوورەوە.. باشە بابەگیان.. گوناحە زۆری سەرمایە. دوایش هەقایەتی خۆشمان بۆ ئەکات.

بەڵێ بەرێزی خوێنەر دوو قۆڵی چوونە دەرەوە باوکی (هیوا) کە باوکی پیرو لاوازو سەرما بردەڵەی بەو ناڕەحەتی‌و زەلیلایە بینی بەهەموو هێزی باوەشی بەشان‌و ملی باوکیا کرد.

هیواش زۆر شادمانانەو بەخێرایی باوەشی بەملی هەردوکیانا کردو ئاشتبوونەوە، زۆر بەخۆشحاڵییەوە چوونە ژوورەوە..

# لەسایەی خواوە

بسم الله الرحمن الرحیم

ان الله یرزق من یشاء بغیر حساب

مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدریس" خوای گەورە مەقامی عالی کات " لە تەفسیری ئەم ئایەتە قورئانیەدا دەفەرموێت [1]:

بەڕاستی خودای تەعالا ڕۆزی ئەدات بەهەر کەسێ خواستی لێبێت، بەبێ چاوەڕێیی‌و ئومێدەواری ئەو کەسەو ئاگاداری ئەو.

ڕزق‌و ڕۆزی بۆ تۆ هەتیوی ڕووت‌و قووت

کێیە بیدا غەیری حەیی لایەمووت؟

خۆی سەبەبسازە لە بۆ بێ دەست‌وکەس

زەردەواڵە دیل ئەکا بۆ عەنکەبوت [2]

بێرەدەر بۆ ڕزقی پاکی خۆت، وەڵێ

دەرمەچۆ شەو بۆ دزی یا ڕاوو ڕووت

ڕزقی تۆ بۆ تۆیە بۆ کەس ناخورێت

بۆ بە ناهەق وا ئەڕێژی ئاوی ڕووت

بەچکە کوردی (شێخ سمایلی ) ژیاند

شیری سەرمەمکەی دەموکەی داری ڕووت

ناوی (قۆچالی ) بو ئەو ڕۆڵە کەوا

شیری پاکی بزنی کوڵ بۆی بوو بەقوت

---

[1] تەفسیری نامی بەرگی دووەم ل ٥٤ – ١٩٨٠ .

2 جالجالۆکە .

شان و قۆڵت تــاهەیە هەوڵــێ بـــــدە
تاقە حاتەم تۆش لەگەڵ ئەو بە بەجووت
بێ حسێبە ڕزقی ئەو بۆ گیانلـــــەبەر
بەحـــــرو بەڕو ئاسمانەکـــانی قووت
بەس ئەتۆش تـــــاهێزی هەستانت هەیە
هەستە خۆت مەمرێنە وەك ڕێوی سکووت
حەولی تــۆ فەرزە ئەگەر نـــا هەرخودا
ڕازیقە بۆ پـــادشاو بۆ پیـــاوی پـــووت

( شێخ سمایلی ) و ( قۆچالی ) مەبەست دوو ڕووداوی سەیرو واقیعیە یەکەمیان:

کۆمەڵێکی شێخ سمایلی لەکاتی شەڕو هەرایەکدا ڕەو دەکەن و ئەو ناوە بەجێدەهێڵن و دەڕۆن بەرێوە ژنێك دوو منداڵی دەبێت.

دوو مناڵەکەی پێ بەخێو ناکرێت، باوکیان ڕقی دادێت و لەپەستی و ناڕەحەتی و بێزاری خۆی یەکێکیان ئەخاتە کلۆری دارێکەوەو بەجێیدەهێڵێت.

بەڵام دڵی هەر بۆی دەسوتێ نەبادا لە زەویدا گیانلەبەرێك بیخوات ، دەڕۆن دەڕۆن پاش ماوەیەك کە شەڕو هەراکە تەواو دەبێت دەگەڕێنەوە قەدەری خودای گەورە وەها دەبێت بەو ڕێگەیەدا تێدەپەڕن.

کابرای باوکی منداڵەکە ئاگری جگەر هەڵیدەگرێ و دەکەوێتە دڵیەوە سەرێك لە کلۆرە دارە بدات.. ساخوایە مابێت....

نزیك دەبێتەوە لە دارەکەو دەچێتە پێشەوەو سەیری ناو کلۆرە دارەکە دەکات، سەرسام دەبێت بەو دیمەنە... ئەمە چ موعجیزەیەکە...

دەبینــێ منــاڵێکی ســاوا لــە کلـۆرە دارەکەدایــەو بــەدەم شــنەی شــەماڵەوە پێدەکــەنێ و جارجارەش شیری ( دەمووکە )ی دارەکـە دەکەوێتـە زاریـەوەو دەیخـوات... کـابرای بـاوکی لەم ڕووداوە خۆشە زۆر سوپاسی خوای گەورە دەکات کەمنداڵەکەی ئەم ماوەیـە دڕنـدەو گیانلەبەر نەیانخواردووە ، یان کەس نەیبردووە بەزیندووی ماوەتەوەو ژیاوە...

پڕ بەدڵ و گیان باوەشی پێیا دەکات و بەخۆشیەوە دەگەڕێنەوە.

دووەمیان: لە قەراغ چەمی (باوە جانی) لافاوێکی گەورە هەڵدەستێو چەند ماڵ بەرە وێران دەکاتو کەرەسەی خەڵکی ناو دەبات، لەناو ئەو کارەساتەدا بێشکەیەك بەمنداڵێکەوە بەر لافاوی ئاو دەکەوێت،

ناو بێشکەکە دانەماڵێو ئەیبات، تاماوەیەکی زۆر دوایی بەلقی دار بییەکەوە ئەگیرسێتەوە ، سەرنج بدە خاوەن باوەڕو دڵپڕ لە نوری خودا.. خودا چ کارێك بۆ ئەم کۆرپەیە ئەکات ..

بزنێکی کۆڵ فێردەبێ هەمو ڕۆژێ ئەچێتە لای بێشکەکەو خۆی شۆڕ دەکاتەوە بەسەریاو منداڵەکە تێرتێرگوانی بزنەکە دەمژێت تێر دەخوات،ماڵی خاوەن بزنەکە لە شوانەکە ئەکەونە گومانو دەڵێن: تۆ بزنەکەی ئێمە دەدۆشی .. ئێمە تەنها ئەو بزنەمان هەیە .. تۆش تەماع لەو دەکەی..

کابرای شوانەش ناچێتە ژێر ئەو باسە ناگای لەهیچ نیە، ڕۆژێکیان کابرای خاوەن بزن دەکەوێتە پەیجۆری باسەکەو دوورو نزیك شوێن بزنەکە دەکەوێت تادەگاتە قەراغ چەمەکە، دەبینێت بزنەکە لە مێگەلو شوانە جیادەبێتەوە.. وەك ئەوەی یەکێك بەری خۆی بداو لێیبخوڕێ.. بەرەو چەمەکە دەڕوات.. کاکی شوانیش بێخەبەرە.

کاتێك سەرنج لە بزنە کۆڵەکە دەدات دەچێتە ناو بێشەڵانەکەو ماوەیەك دەمێنێتەوە .... هەردیار نابێت..

کابرا بەدوایدا دەڕوات ئەو ڕووداوە سەیرە دەبینێو منداڵەکە گوانی پڕ شیری بزنەکە دەمژێت..

کە تەواو تێر بوو بزنەکە دەڕواتەوە ناو مێگەلەکەو ئەمیش کاکی شوان بانگ دەکاتو دەیکاتە شاهید ، منداڵەکە هەڵدەگرێتو دەیباتەوە ماڵەوە .. منداڵەکە گەورە دەبێتو دەبێتە پیاو ژنی بۆ دەهێنێو دەبێتە خاوەن منداڵو نەوە.

نەوەی کابرا گۆشتی بزنی کۆڵ لە خۆیان حەرام دەکەن واتە گۆشتی ئەو جۆرە بزنە ناخۆن ماشاء الله ...

باوکی وەستا ڕەوفی دێوانە وتی: ساڵی ١٩٥٧ کە لافاوەکەی سلێمانی ڕوویدا من لەناو شاربووم.. زەرەرو زیانێکی زۆر لە خەڵك کەوت.. ئەو کاتە ماڵو خانوو خیابانەکان سادەو ساکاربوونو بەرگەی تەوژمو لافاوی ناگرت.

هەموی بەرەو جوولەکانو لەوێوەوە بەرەو چەمی تانجەرۆ ڕۆیشتو ڕایماڵی من لەدەشتی قەراغ شارو نزیك (تانجەرۆ )باخی (وێنجەو سێپەرەم) کردبوو.

چوار ڕۆژ دوای ڕووداوەکە چووم بۆ سەرکشتوکاڵەکەمو هەموی بوبون بەژێر لافاوەوە بەلاّم ئەوەی سەرنجی منی زۆر ڕاکێشا، لانکەیەك بوو بەحسابی خۆم ووتم: ڕەنگە هیچی تیادا نەبێت بەلاّم کە چومە پێشەوەو سەرنجم دا منداڵێکی تێدابوو سەرەتا وامزانی مردووە بەلاّم زیاتر سەرنجم دا وهەستم ڕاگرت هەناسەی دەداو زیندو بو .. نەمردبوو.. لەگەڵ چەند پیاوێکی ئەو ناوە کە بۆ شت دەگەڕان هێنامەوەو یەکێك بوە خاوەنی.. ماشاء الله .

# مەرگی لە ناکاو

ڕۆژێکیان لە خزمەت مەلا ئیسماعیلی تەوەکەڵیدا بووم لە ماڵی خۆمان.. دوای باس‌و خواسی زۆر لەسەر ڕوداوی تازە بەسەرهاتی ڕابردوو لەدێر زەمانەوە لە کۆمەڵگەی کوردیماندا .. زۆر خۆشحاڵبوو بەبەرگی یەکەم‌و دووەمی ڕووداوە واقیعیەکان‌و بەڕێزیان چەند ڕووداوێکیان بۆ باس کردم.. هەندێکیانم بە جوان زانی بۆ ئەم بەرگە سەرەتا بەڕێزیان فەرموویان:

لە گوندی (عیساقاوە) کە لە نزیک سۆڵەی ئێرانە، سەر شیوی سەقز لێوەی دورنییە، کوێستانێکی عەجایبە، چەند ماڵێک کوڕەکانیان چوبونە خزمەتی سەربازی‌و بوبونە (پاسدار) قەدەری خوای گەورە وەها بوو تەنها کوڕی پیاوێکی گوندەکە هاتەوە.. ئەوانی تر بوونە سوتەمەنی شەڕی (ئێران - عیراق).

باوکی سەرباز بەدیداری کوڕەکەی شادبۆوە زۆر خۆشحاڵ بوو، بۆ بەیانی بڕیاری مەولو نامەی‌داو لەناو گاگەلەکەیدا (نۆبەنێکی بوغە)ی دیاریکرد بۆسەر بڕین‌و بەخشینەوەی بابەتی مەولویی..چەند پیاوێك نۆبەنەکەیان هێناو لە حەوشەی ماڵی سەربازدا قاچ‌و دەستیان بەستەوە دوای چەند پەلە قاژییەك بەهێزدایان بە زەویدا.. پیاوەکان زۆر ماندوو بوون کاکی سەربازیش تا ئەو کاتە لەسەر بانیژەکەوە سەیری ئەو دیمەنەی ئەکرد، هێزێکی شاراوە پاڵی پێوەنا بۆ هاوکاری کردنی باوکی خەڵکی ماندو قەسابەکە.

دایکی هاواری کرد: ڕۆڵە گیان بەشداری مەکە.. با ئەوان ماندوو بن تۆ دابنیشە..کوڕەکە وتی: دایە گیان با لەم خێرەدا بەشدار بم .. تۆزێك پارمەتیان ئەدەم..دایك دڵی خەبەری دابوو بۆ قەدەرێك بەڵام کوڕەکەی بێئاگا لە قەدەری ئیلاهی، بەچەند هەنگاوێك گەشتە ناو حەوشەکە بۆ پارمەتیدانیان باوکی زۆر خۆشحاڵبوو بە هاوکاری کوڕەکەی، کاکی قەساب بە قەمەکەی خۆی لەکەللەی نۆبەنەکە نزیك کردەوە، کە نۆبەن قەمەی بینی کەوتە پەلەپاقژەو خۆڕاپسکاندن.

کاکی سەرباز بەمەبەستی گرتنی پاشوی نۆبەن نزیك بۆوە بەڵام بەچ عەقڵی تۆ دەتوانی نۆبەنێکی یاخیو بوغە بگریت.. خۆی ئەیزانی پاشوی بەستراوەتەوە بەڵام قەدەر چی هێنا ڕەت بوونەوەی نییە لە چاوتروکانێکدا پاشۆی نۆبەنەکە کرایەوەو جووتەیەکی زۆر بەهێزی لەکاکی سەربازدا.. کاکی سەرباز بەوجووتەیەی نۆبەن هاویشتی سەر دڵی گرتوتاساو کەوت بە پشتا.. لەو شوێنەدا بەردێکی گەورە هەبوو پشتی سەری درا بەبەردەکەشدا.. جووتەی نۆبەنو زەبرەی سەری کاکی سەربازی بێگیان کرد..باوکی کوڕەو قەساب ڕقیان هەستاو قەمەیان هێنا بەملی نۆبەندا.. خوێن فیچقەی کرد..پاش دەرچوونی گیانی نۆبەن گەیشتنە سەرکوڕەکەیان تا ئەو کاتە وایان دەزانی بووراوەتەوەو لە هۆش خۆی چووە بەڵام بارودۆخەکە شێوەیەکی تری بوو، گریانو هاواری باوکی کوڕەو دایکی لەگەڵ سەدای نزمی (انا لله وانا اليه راجعون)ی خەڵکی ئەو ناوەدا ئاوێزان بوون، گۆشتی مەولوی کاکی سەرباز کرایە نانو چێشتی پرسەی سەربازەکە ئەمەیش وەك باقی گەنجانی دێکەیان کۆچی دوایی کرد، بەڵام لەدوو شوێنی جیاوازدا...

# نزای ڕیش سپیەکی نابینا

وەرز وەرزی بەهارە، زەوی و مرۆڤو گیانلەبەران تامەزرۆی باران بون، بەلام ئاسمان شین و چەندین پەڵە هەوری گەورە گەورە گوزەریان ئەکردو لە ئاستی شارو ناوچەکەمان دەرەوینەوە نابونە یەك دڵۆپ باران.
زۆر لە مرۆڤەکان نزاو پاڕانەوەیان بو.. هەندێکیان لەو مرۆڤانە زۆر لە دەرگی پەروەردگار دەلالانەوە بەلام باران کەم یان هەر هیچ نەباری ئەوە تەڕی بەهارە .. ئەرخەوان سورە.. وەرز ساردو کاتی شەستەو ڕەهێڵەو خوڕەمی بارانە بەلام خاك و خەڵك بەبێ باران ڕۆژگارەکان دەگوزەرێنن.
بەلاڕێیەکی ملەو ئاسۆو پالێکدا دەرۆیشتم خشپە خشپێ بەرگوێم کەوت پاش سلەمینەوە لە دەورو بەری خۆم وورد بومەوە سەرنجم دا لەگەڕ ـگەی پشت خۆمەوە کیسەلێکی گەورە دێتە خوارێ بۆ سەر ئەو جۆگەلەیەی من لە تەنیشتەوە دەرۆیشتم ، سەرنجی تەواوی کیسەڵەکەم دا سەرنجی زۆری جۆگەلە ناوەکەشم دا.. ڕێڕەوی هەردووکیانم وەرگرت و لە هزری خۆما وتم: ئەم گیانلەبەرە دەبێت بەم هەنگاوە بچوك و لەسەر خۆیانەی چەندین مەترە زەوی بڕیوە وبیری کردۆتەوە کەلەو نزیکانە جۆگەلە ئاوێك هەیە خۆر هەتاو تینوی کردوە وا دەمەو خۆر نشینە بەمەبەستی ئاو خواردنەوە هاتوەتە نزیکی جۆگەلەکە. کە منی بینی ئەسویستەیەکی کردو لە ڕۆیشتنەکەی وەستایەوە سەیرم کرد سەیری کردم.. دڵنیام ئەو نازانێت کە ئەم جۆگەلە ئاوە وشکی کردوە ئەوەندە کەوێك دەنوکی لێتەڕکات ئاوی تیانەماوە.. ئەی ئەبێت ئەم داماوە چۆن ئاوی دەستکەوێت؟
ئایا خوای گەورە بەزەیی دێتەوە بەم گژوگیاو گیانلەبەرانەدا!! خوایە گیان ئێمە خراپین بەلام بە خراپەی خۆمان لە گەڵماندا مەکەو بارانی ڕەحمەتی خۆتمان بۆ ببارێنە..
جۆگەلەو کەژو کێوەکان ئاودێر بکەی.زۆر سەرنجی کیسەڵەکەم دا .. لە دڵی خۆمدا وتم: (خوایە گیان ئەم داماوە زۆری تینووە زۆر بە ڕێگادا هاتووە.. دێتە سەر ئەم جۆگەلە

ئاوە.. دڵنیام کە ئاوی دەست ناکەوێت، خوای باڵا دەست بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنیو گیانلەبەران وەرزی خۆیان لێنەشێوێ..) کیسەڵەکە هەرسەنجی دەدامو لە شوێنی خۆی وەستابوو، ئای داماو بۆ ئاو دێت ئاویش نییە.. بۆچی خاکت بڕیوە گوناهی خەڵکیش تۆی گرتۆتەوە.. دە خوایە گیان بیکەیت بە خاتری پێغەمبەر(دروودی خوای لێبێت)و یارویاوەرانی بیکەیت بە خاتری نزاو پاڕانەوەی پیاو چاکان.. بیکەیت بە خاتری ئەم گیانلەبەرو گزو گیای هەردە لە هەوری پڕ بارانی خێرو خۆشی خۆت بەهارمان نەڕزاکێنیتو کەژو کێوەکانمان بە بارانی ڕەحمەتی خۆت بۆ بکەیتە سەوزەلانی.. مێشومردو بزوێنو مێرگەکانمان وشك نەکەن ..

دوای هەناسەیەکی قووڵ کیسەڵەکەم بەجێهێشت بۆ چەند ڕۆژێك دوای ئەم دیمەنە بەڕێز کاك ئومێدم بینی کە کابرایەکی زۆر خۆشەویستو دیندار بو لە جەستەیدا پایەکی نەمابوو کەم ئەندام بو، نارەحەتی باران نەبارینی باسکرد. بەڕێزیان وتیان: "انشاء الله دەبارێت" کاکە ئومێد لە قاپی خودا نائومێد نابین بەڵام چۆن ئەزانیت باران دەبارێت.. لە قسەکانتا دیارە کە شتێك دەزانیتو بەمن ناڵێی!

بەڕێزیان وتی: دڵنیام خوای گەورە دوای ئەم ماوە زۆرە کە باران نەباریوە بارانمان بۆ دەبارێنێ.

ئاخر خوا بتبەخشێت بە چیدا ئەزانی وادەی باران بارین نزیك بۆتەوە!!.. دوای تۆزێك ڕاماو وتی:

دوێنێ ئێوارە بەرەو مزگەوت ئەڕۆیشتم، مام ڕۆستەمم [3] بینی لەبەردەرگاکە کوڕەزاکانی لەسەر کورسییەك دایان نابو،

کە نزیك بومەوە سەرنجم دا دەگریاو دەپاڕایەوە.. منیش خۆم پێنەگیرا لێی نزیك بومەوە وتم: مامە ڕۆستەم سڵاوی خوات لێبێت.. تەندروسیت چۆنە؟

---

[3] مام ڕۆستەم کەسێکی بەتەمەنی نورانییە، تا توانای هەبوو سەردانی مزگەوتی دەکرد کەبەتەواوی پیر بوو توانای چاوەکانی نەماو نابینا بوو، هێزی بازو لاقەکانی نەما، ئێستا دەستی دەگرن بۆ ژوورەوە، بەڵام دەم بەیادی خواو ڕوو بەقیبلە فەرامۆش نەبوە. لە ماڵەوە ڕێزی جوانی لێدەگرن ئەگەرچی، لە مزگەوت دابڕاوە بەهۆی تەمەنەکەیەوە بەڵام زۆر خۆشەویستە لامان.

ئەویش وتی: بەقوربانەکەت بم زۆر باشم، سوپاس بۆ خوای گەورە.

بەلام چاوە نابیناکانی ئەسرینیان دەرشت، پێم وت: مامە ڕۆستەم ئەوە خێر وا خۆت نارەحەت کردووەو دەگریت، بە دەنگێکی نزم سەرم بردە پەنا گوێی‌و دڵنیا بووم لەوەی دەنگم دەبیستێ وتم: ئەگەر لەماڵەوە نارەحەتیان کردویت وەرە من لە خزمەتدام، ئەگەر ناساغی‌و گوێت پێنادەن هەر لە خزمەتدام.. ئەگەر شتی تریشە بابزانم چونکە گریانەکەت زۆر نائاساییە،

- بەرێزیان وتی: کاکە گیان تۆ کێیت؟
- وتم: مامە ڕۆستەم من ئومێدم .. ئومێد.
- کام ئومێد؟
- ئومێدی مزگەوت.. ئەو پیاوەی قاچێکم بە ئەلغام قرتاوە،
- ئانا.. ئەزانم .. کاکە ئومێد گیان گوێگرە جوان ئاگات لەلای من بێت‌و بزانە بۆچی ئەگریم.. بەخوا بۆ خزمەتکردنم ناگریم .. ڕێزی باشم لێدەگرن بە کوڕو بوک‌و کوڕەزاوە. لە هیچم کەم نییە زۆرباشم سوپاس بۆ خوای گەورە.

بەلام بۆ یەك شت ئەگریم‌و دەسەلاتم نییە تەنها گریان‌و پاڕانەوە کوڕوزانەوە نەبێت لە قاپی ڕەحمەتی خوای گەورە،

کاکە ئومێد بە ئومێدم خوای گەورە لەم ڕۆژە پیرۆزەدا لەم نزیك بانگ‌و قامەتی نوێژی شێوانەدا لەم بەندە نابینا ڕیش سپییە کەم توانایە بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە دوعام لێ قبوڵ بکات، ئەوە ماوەی چل شەوە لەم وەرزی بەهارەدا باران نەباریوە.. هیوادارم کە خوای گەورە بەزیی بە من‌و ئێوەو گیانلەبەرو کەژو کێودا بێتەوەو بارانی پڕ خێرو میهری خۆی ببارێنێ..

بە ساقەت بم هیچ نارەحەت نیم تەنها بۆ باران نەبێت خوایە گیان لە بەندەی قبوڵ بکە ئەم نزایە.. بارانمان بۆ ببارێنی‌و بە گوێرەی تاوان‌و نالەباری خۆمانمان لە گەڵ نەکەیت.

کە زانیم گریانەکەی بۆ بارانەو خوای گەورەش خاوەنیەتی دوعا خوازیم لێخواست‌و ڕۆیشتم.. لەدوای بانگ‌و پێش قامەت دوعای بە کوڵم کرد بۆ بارانی پڕ خێرو نازو نیعمەت، چونکە ئازیزان لەو ماوەی بانگ قامەتەدا هیچ پەردەیەك لە نێوان بەندەو خوای گەورەدا نامێنێ‌و دوعا گیرا دەبێت..

نوێژی شێوان بە ئەنجام گەیشتو خوای گەورە لێمانی وەرگرێت.. گەڕامەوە، مام ڕۆستەم لە جێگەکەی خۆی نەمابو بردبویانە ژوورەوە.

هیوایەکی گەش لە ناخو دەروونما هەبو.. کە دڵنیا بووم خوای گەورە نزای ڕیش سپیان ڕەتناکاتەوە.. بەڵێ،ئەوە وادەی چەند ڕۆژێکەو مانگ مانگی مەولودە.. وەرزی بەهارە.. بەلام چۆن یادی مەولودێکو چۆن بارانێکی وەرزی بەهار .. بە سێ ڕۆژو چوار ڕۆژ جارێك بارانێکی سەر تاسەری شارو کەژو کێوەکانی ئاودێر کردین..

زۆر سوپاس خوایە گیان، ئەگەر دڵی ئێمە خەوتبێت دڵی پیرە ئاقیبەت خێرەکانم بێدارە، ئەگەر چاوە گەشەکانی ئێمە بێناگاو بێ هەست بێت دڵی پیرە خێرخوازەکان هەستو نەستی پیرە نابیناکان بێدارە..

لەم ساتوکاتو وەرزو ڕۆژگارەدا بارانی رەحمەت بەردەوامە.. زۆر سوپاس بۆتۆ خوای گەورە، مرۆڤەکان سەرسەختن بەلام گیانلەبەرو کەژو کێوەکان بە زمانی حاڵی خۆیان داوای دوعای خێر بۆ هەموان دەکەن.

خوای بالا دەست زۆر سوپاس کە ئەم نیعمەتە جوانەت پێبەخشین.

لئن شکرتم لأزیدنکم ولئن کفرتم ان عذابی لشدید.

# ٤٠ شەو غەریبی

ئەو تەمەنەی خوای گەورە پێیبەخشیووین کەم یا زۆر ... ڕازی یان ناڕازی بین کامەران یان دڵتەنگ بین ژیان لە ئازارو مەینەتیدا زۆرێکی بەختەوەر کردووە زۆرێکیش ناڕازیو دڵپڕلەغەم..

دیاریکراوە لەلایەن خوای گەورەوە چی لە چارە نوست نوسرابێت ناتوانیت لێی زیادو کەم بکەیت..

لە کۆمەڵگەی کوردەواریماندا زۆر ڕووداو بەسەرهات بەر گوێمان کەوتون بە خۆشحاڵییەوە هەندێکیان دەکەینە میوانی لاپەڕە بێگەردەکانی ئەم بەشی سێیەمە بەو هیوایەی کەڵك و سودی باشی لێوەربگرن و ببێتە هۆی ڕازی کردنتان لەم بونەوەرەدا...

ڕۆژگارەکانی تەمەن چەند زۆر بن گرنگ ئەوەیە توانیبێتت کارێکی بە کەڵك و بەسودت تیابە ئەنجام گەیاند بێ ... زۆر کەس کەم تەمەنن بەڵام بە نەمری لە لاپەڕەکانی مێژوو ڕابوونی مرۆڤایەتیدا یاد دەکرێنەوە.. کەسانێك بوون ژیان تەمەنێکی فراوان و ڕۆژانی بەسەر بردووە بەڵام نەیتوانیوە مرۆڤایەتی... خوای گەورە ... مێژوو لە خۆیان ڕازی بکەن

بەڕێزەکەم ڕازیبە بەو تواناو تەمەن و ئەزمونەی هەتە دەتوانیت لە ئەزموونندا زیاد بکەیت بە (بیستن و بینین و خوێندنەوە...)

ئەوەی مەبەستمە بۆ ڕونکرنەوەی ئەم چەند پەیڤەم کاك (صدیق) بۆمان باس دەکات و دەبێژێت: لە دوا ساڵەکانی شەستەکاندا لە گوندەکەماندا پیاوێك هەبوو بە ناوی (مام ئەحمەد) شوانی گوندەکەمان بوو، خاوەنی ماڵ و منداڵ بوو وەرزی بەهار بوو... ئێوارەیەکیان مەڕو ماڵاتی گوندەکە هاتنەوە بەڵام مام ئەحمەد دیار نەبوو، سروشتی گوندەکەمان وابوو کە چەمێکی پڕ ئاو لە دووری گوندەکەمان هەبوو... کە ساڵانە بە بارانی وەرزی بەهار زیادی دەکرد، ئەو گوندانەی دەخستە مەترسیەوە کە لە قەراغ

چەمو ئاوبوون بەگشتی ماڵە زۆر نزیکەکان بەتایبەتی چونکە ئاستی ئاوی چەمەکە زیادی دەکردو لافاو دروست دەبوو.

ئەو ئێوارەیە مام ئەحمەد (یەکە یەکەو دوو دوو وسێ سێ) مەڕەکانی کردبووە ئەم بەری چەمەکە تائەم کارەی ئەنجامدابو چەمەکە بە تەواوی زۆر بوبو لافاو بە تین‌و بە گوڕبوبو..

مەڕو ماڵاتەکەی گوند تاکە تاکە دەهاتنەوە لە بانگی خەوتنان بەدواوە خێزانی مام ئەحمەد لە دەرگای ماڵی ئێمەیدا.. بانگی لە باوکم کرد..هەواڵەکەوا لە زاری ترازا کە (باوکی منداڵەکانی نەگەڕاوەتەوە) ئەم هەواڵە دایکم‌و باوکمی زۆر نیگەران کرد.. خێرا باوکم خۆی پێچایەوەو بەرەو هەیوانەکە ڕۆیشت ..هەرئەو کاتە چووبونە ماڵی چەند کەسێکی گوندەکەمان.. بارانی ئەو ڕۆژە زۆر زۆر بوو.. بەلام خۆشبەختانە لەکاتی بلاوبوونەوەو گەڕاندا خۆشی کردبۆوە، هەواڵ بەناو گوندەکەدا بلاوبوو (مامم ئەحمەد نەگەڕاوەتەوە چیبکەین.. چینەکەین.. با دەستبەکاربین)کوڕ گەل‌و پیاوانی مەلەوان‌و کەسانی بە ئەزمون چرا بێنن‌و بابڕۆین بۆ سەرچەم‌و بزانین چ باسە ... هەبێت‌و نەبێت مام ئەحمەد ئاو بردویەتی .. ئایا دەبێت ئەم هەواڵە ڕاست بێت؟؟

شەوگار درێژەی کێشا هەر خەڵکی ئاوایی هاوار هاواریان بو بۆ مام ئەحمەد زۆر گەڕابوون لەو جێگەیەی مام ئەحمەد مەڕەکانی لێەوەڕاندبو تا درێژی یەك کیلۆ مەترو نزیك بونەوەی بە چەند گوندێکی تر بە چەمەکەدا ڕۆیشتبون‌و هاواریان کردبوو گەڕابوون.. هیچ سۆراغێکیان نەکرد، بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە، بۆ بەیانی پیاوان شەکەت‌و ماندو هیلاك.. نانێکیان بە پەلە خواردو جل‌و بەرگەکانیان گۆڕی.. باوکم لە سەرماناو لە هیلاکی‌و برسێتیدا ڕەش داگەڕابوو.. دایکم پرسی:

پیاوەکە ئەبێت مام ئەحمەد چی بەسەر هاتبێ؟

باوکم کەمێك بێدەنگ بوو قومێکی لە پیاڵە چاکەی بەردەمی‌داو سەیرێکی هەمومانی کرد.. وتی: (ڕەنگە ئاو بردبێتی‌و خنکا بێت) دایکم لە پڕ ڕاچڵەکی‌و وتی: ئەیەڕۆ .. خۆماڵ‌و منداڵی ووردن، منیش بە زرنگی خۆم هەڵمدایە قسە وتم: بابە گیان ئەی بۆ تەرمەکەیتان نەهێناوەتەوە.. باوکم وتی: خوایگەورە خۆی دەزانێت لەچ کەنارێکدا لایداوە یان لە بنی چ گۆمێکدایە.. هەوڵدەدەین ئەمڕۆ بەبوون‌و نەبون بیدۆزینەوە..

برا گەورەکەم وتی: بابە گیان ئەبێ لە تاو گورگو دڕندە نەچوبێتە سەر دارو درەخت؟!
دایکم وتی: ڕۆڵە دارو درەختی چیو دڕندەی چی.
باوکم وتی .. نا بڕواناکەم..دەستی کرد بە لەبەر کردنی ئەو جلو بەرگانەی کە دایکم بۆی هێنابوە پێشەوە.. منیش چومە پێشەوە بۆنم بە جلو بەگەکانیەوە دەکرد.. بۆنی صابونو ئەسپونی لێدەهات .. ئای کەبۆنەکەی خۆش بوو!
باوکم لە دوا سەرنجیا وتی: ئەگەر لەسەر دارو درەخت بوایە بە بینینی ئێمە هاوار هاواری ئێمە لە درەختەکە دەهاتە خوارەوە..بەلام خوا دەزانێت چی بەسەر هاتووە ئەو ڕۆژە هەرکەسێك مەلەوان بوو.. هەرکەسێك ئازا بوو ڕۆڵی بەرچاوی بینی، چەند گوندێکی ئەو نزیکانە ئاگادار کرا بە ڕووداوەکە، هیچ سەرو سۆراغێکی نەبوو هێدی هێدی لە نزیك عەسرێکی درەنگا لافاو نیشتەوەو خەڵکەکەش زۆر بە پەرۆشەوە هەر دەگەڕانماڵەکان خواردنیان بۆ کەسەکانی خۆیان بردو بە هەواڵی دڵتەنگەوە گەڕانەوەکە مام ئەحمەد کەس نازانێت چی بەسەر هاتووە.. منداڵە بچوکەکانیشی هەر دەگریان.. داوای باوکیان دەکرد: بابە گیان تۆ لە کوێی؟! شەوەکەی دایکمو خوشکەکانم لەگەڵ چەند ئافرەتێکی تر چوینە ماڵی مام ئەحمەد ژنی هاوسەری وەك بارانی بەهار فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتەخوارێ. منداڵەکانیشی ماتو مەلولو کز دانیشتبون منیش چووم لەگەڵ منداڵەکانی دانیشتم لە پڕ پرسیارێك هات بە مێشکمداو وتم: دایە دایە دەبێت مام ئەحمەد ورچ نەیفڕاندبێت؟! هەمویان دەستیان کردە زەردەخەنەو دایکم وتی: ڕۆڵە ورچی چیو شتی چی!!.
وتم: ئەی بۆ نەنکم لە حیکایەتەکانیا دەیوت (ورچێك کچێکی بردووەو پاش چەند مانگێك دۆزیویانەتەوەو هێناویانەتەوەو ورچەکەشیان لەو ناوە دوور خستۆتەوە..)
وەك نیمچە قەناعەتێك فرمێسکەکانی ئەو ئافرەتەی کەم کردەوە.. بەلام زۆر جێگەی متمانە نەبوو.
هەفتەیەك بەسەر ئەم ڕووداوەدا گوزەری کرد.. ناچار بەڕێوڕەسمی کوردەواریو ئاینی پرسەیەکیان بۆ داناو خەڵکی بە چاوی میهرو سۆزەوە دەیانڕوانیە ماڵو منداڵی مام ئەحمەد.. ئەگەر مام ئەحمەد زیندو بوایە ئەوەندەی ڕزقو ڕۆزی بۆ نەئەبردنە ماڵەوە هێندەی کە خەڵکی یارمەتی دابوون .. بەلام مام ئەحمەد جێگەی لە ماڵو ئاوایدا دیاربو ئەوە ناخۆشترین ڕوداوی گوندەکەمان بوو.. لێرە دەوەستینو بە چەمو ڕوبارەکاندا

دەڕۆینە خوارەوە، کەچەندین گوندو ئاوایی لە نزیك ئەو ڕوبارە بون نزیکی عەسر بو لە دوورترین دێی ئەو چەمو ئاواییەی ئێمە هەواڵێك هات مزدەیەکی زۆر خۆشی بە ئاوایدا بڵاوکردەوە.. ئەوە نزیکی چل شەوە گوندەکەمان ماتە .. دڵیان پڕ غەم.. بەم هەواڵە هەمو خەڵك گەشایەوە..

دەزانن هەواڵەکە چی بوو پیاوێك بە سواری ئەسپێکەوە هات بۆ مزگەوت پاش سڵاوکردن وتی: ئایا ڕاستە ئێوە پیاوێکتان ئاو بردویەتی.. مامۆستای مزگەوتەکە وتی: بەڵێ ناوی مام ئەحمەدە تەمەنیشی زۆرە داماوە چل شەوە کەس نازانێت چی بەسەر هاتوە.. ئێمە لە پرسەی بوینەتەوە بۆچی پرسیار دەکەیت پیاوەکە وتی: با نوێژ بکەین‌و لە ماڵی یەکێکتان دادەنیشین‌و هەواڵەکەو ڕوداوەکەتان بۆ دەگێڕمەوە کە مام ئەحمەد زیندووەوا لە ماڵی ئێمەیە لە گوندی (م) ئەوەی ئەو باسی کرد بە دێژی ٣٠کم ئاو ڕای پێچابوو.. بەڵام چۆن نەمردبوو ئەوە خوای گەورە خۆی دەزانێت!.

هەواڵیان گەیاندە ماڵی مام ئەحمەد، ئاوایی وەك گوڵی ژاکاو گەشایەوە .. وام هەستکرد یەکەم ڕۆژی جەژنەو خەڵکی بەکامەرانیو زەردەخەنەو خۆشیەوە هەواڵەکەیان دەگەیاندە یەکتری کەسی واهەبوو هەواڵەکەشی بیستبو.. هەر بۆیان دەگێڕایەوە ئەو خەڵکە شادی لە ڕوخساری دەباری ئەو سوارە لە دوای نوێژی بەیانیەوە بە ڕێکەوتبو تا گەیشتە گوندەکەی ئێمە چەند کوڕێکی گەنج خێرا ئەسپەکەیان لێگرت.

چونە سەر حەوزی مزگەوت‌و دەستنوێژیان گرت. نوێژی عەسریان بە جەماعەت کرد مامۆستای ئاوایی وتی: مادەم ئەم هەواڵە ڕاستە هەموتان سوجدەی شوکر بەرن کە خوای گەورە ئەم کەسەی بەخشیەوە بە ماڵ‌و منداڵ‌و گوندەکەمان.

ئەو کەسانەی لە کەژو کێو کارکردن بون بە بیستنی ئەم هەواڵە گەیشتنەوە ناو دێ .. لە مزگەوت خڕبونەوە نیازیان بوو بچنە ماڵی ڕیش سپی گوندەکەمان.

بەڵام مامۆستا وتی هەر لەم جێگە پیرۆزەدا هەواڵەکەو ڕوداوەکەمان بۆ باس بکە.

پیاوەکە وتی: زیاتر لە مانگێکە من‌و پیاوێکی گوندەکەمان لای نیوەڕۆ بو چوینە سەر ئەو چەمەی بەلای زەوی‌و زارەکەماندا دەڕۆیشتە خوارێ بەمەبەستی دەست نوێژ هەڵگرتن پیاوەکەی هاوڕێم هاواری کرد ووتی: وەرە ئێرە سەیری ئەو لاشەیە بکە بەسەر ئەو دارەوەیە کاتێك چوینە پێشەوە سەرنجماندا ئەمە تەرمی پیاوێکە بەهەر حاڵێك بوهێنامانە وشکانی‌و ئاگرێکمان بۆ کردەوە، ئەمەش دوای ئەوە بوو کە گوێمان گرت 

بە دڵیدا بە ئاستەمەوە لیدەدا..چەند جارێك دەستمان نابە سەر سنگیا.. هیچ ئاوێکی وەهای تیا نەبو. جوان جوان گەرممان کردەوە.. لە قەراغی ئاگرەکە قۆریە چاکەمان دانابو چاکە دەمی کێشا یەك دوو پیاڵە چامان کرد بە دەمیەوە.. هەندێکی قوتداو برێکیشی بەدەمیدا هاتە خوارێ. گوێمان گرتەوە بە دڵیدا بە ئاسانی هەستمان بە لێدانی دڵی دەکرد.. خێرا لە ولاغێکمان ناو بردمانەوە بۆ ئاودێ..

ئەو شەوە تا بەیانی بەسەرە ئاگاداریمان دەکرد (شیرو شۆربا)مان دەکرد بە دەمیەوە.. دوای چەند سەعاتێك لە ڕۆژی دوایی چاوی هەڵهێناو بە تەواوی کەوتە خواردنو خواردنەوە، یەکەم قسە وتی: سوپاس بۆ خوا کە نەمردم.. ئەرێ کاکە گیان من لە کوێم ؟؟!!

ئێمە لە ناو خۆماندا وتمان با تۆزێك سەرخۆ بکەوێتەوە، لە جێگەیەکی زۆر گەرمو نەرمو خۆشدایت.

چاوەکانی لە یەك نایەوەو خەوی لێکەوت .. هەمو ئەو کەسانەی لە ئاواییەکەدا بوون ئەهاتنە سەردانیو سوپاس گوزارییان ئەکرد کە نەمردووە.

دوای چەند ڕۆژێك کەوتە گەڕانو ڕۆیشتن لە ناو ماڵەکەدا.. سوپاس بۆ خوای گەورە توانیمان وەك پێویست هاوکاری بکەین، ڕیش سپی گوندەکەمان زۆر حەزی ئەکرد بزانێ کێیەو چ کارەیە.. بەلام لە ڕووی هەڵناهات باسی بکات تا ڕۆژێکیان لێمان پرسی: ئەرێ کاکە گیان ناوت چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ چکارەیت؟..

ئەویش چاوەکانی پڕبوو لە ئەسرینو قەتیس مان بە قوڵی چۆغەکەی چاوەکانی سڕیو کەمێك مات بوو.. ئیتر وەلامی نەبوو.. ئێمەش وتمان شەڵلا ئەو پرسیارەمان لێنەکردایە..

دوای چەند ڕۆژێك وایلێهات دەیتوانی بێتە دەرەوە لە ماڵەوەو بە قاچی خۆی لە پلیکانەو پەیژەی بانیژەکەمان بێتە خوارێو بە ناو دێدا پیاسە بکات، چونکە تینی ئاوی چەمەکە قاچو دەستی زۆر ماندو کردبو لەسەرو ڕوخساریدا زۆر لە کەسێکی کارامەو دڵسۆز دەچوو .. ڕۆژێکی نیوەڕۆ لە گەڵ خۆمدا لە سەر زەویو زارەکەبوین بۆم باس کرد: کە چەند ڕۆژێکی زۆر لەمەوبەر تۆمان لە ناو ئەو چەمەدا دەرهێنایەوە.. ئەویش پاش کەمێك ڕامان لە ئاوەکە وتی: زۆر ڕاستە ئاو و ئاگر ئامانیان نیە، من ئێستا لە چ گوندێکم..

بۆم باس کرد .. دوای چەند خولە کێك وتی لە گوندی (...) بۆ گوندی ئێوە چەند دوورە.. چەند دوورە!!؟؟

وتم ئەوەی ڕاستی بێت زۆر دوورە ئەگەر بەیانی بڕۆین زۆر بە زویی نزیکی عەسر دەگەیتە جێ ئەویش بە سواری ولاغی باش ئەگینا بە پێ زۆری دەوێت..

ئەو ڕۆژە ناوی خۆیو گوندەکەیانو کارو کاسبیو ماڵو منداڵی پێوتم .. منیش بۆ ئێوارێ عەرزی ڕیش سپیم کرد، حاڵو ئەحواڵیم لێپرسی ڕیش سپی وتی: کاکە گیان تۆ ماڵو منداڵت هەیە ئێستا چاوەڕوانتن با بگەڕێین بیان دۆزینەوە تۆش بگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵو حاڵو کەسو کاری خۆت..

زۆر حەزی نەکرد بەلام لە ڕوخساریدا پرسیارێك دەخوێندرایەوە کە ئەویش ماندو بونی ئێمەی مەبەست بو.

بەلام بۆ ئەو کارە خێرییە خۆم ئامادەکردو گەیشتمە خزمەت بەڕێزتان..

هەمو فرمێسك لە چاوەکانیاندا قەتیسم مابوو لە پڕ چەند کەسێکمان دایانە هاڕەی گریانی خۆشی، ئەو شەوە لە ماڵی ڕیش سپی گوندمایەوە.. بڕیار درا کە چەند پیاوێك بچن بۆ بینینیو بە شێوەیەکی جوان بیهێننەوەو زۆر سوپاسی دانیشتوانو ئەو خەڵکە بکەین کە ئەرکو ماندوبونیان کێشاوە.

بەیانی زوو باوکم کابرای غەیرەو دوو کوڕی ڕیش سپی گوندەکەمانو چەند کەسێکی تر کەوتنە ڕێ بۆ هێنانەوەی مام ئەحمەد.

لە گوندەکە دەرچون چەند مەترێکیان بڕی بو گەیشتنە سەر کانیو ئاوێکی خۆش کە لە خوار ئاواییەکەمانەوە هەبوو، خێزانەکەی مام ئەحمەد بەپەلە بەڕاکردنو هەڵە داوان گەیشتە لایان زۆر داکۆکی کرد کە بڕوات لە گەڵیان.. بەلام بە بیانوی چەند کارو ڕێسایەك ڕازی بوو نەڕۆی لە گەڵیان پێش ئەم هەواڵە بە نیازبوون چلەی ماتەمینی بۆ بکەن بەلام خوای گەورە بارودۆخەکەی بە شێوەیەکی ترسازاند.

سوارەکان ڕۆیشتنو خێزانەکەی مام ئەحمەد نەگەڕایەوە ناو دێ هەرسەیری کردن دڵ ئارام نەبوو دڵی لە مشتیابو..دودڵو ڕاڕابوو.. تالە چاوی ون بون.. دەستی کردە گریان

باوکم گێڕایەوە: ئەو ڕۆژە دوای بانگی شێوان گەیشتنە ئاوایی (م)

سەگەلی گوندەکە لێمان وەڕین بەلام چوینە ناو گوندو لە ماڵی ڕیش سپی دابەزین.. بە پەلە خۆمان کرد بە ماڵی ڕیش سپیدا.. ئای لە خۆشیە.. ئای لەو شادییە.. مام

ئەحمەد دەستێك جلی پاك‌و خاوێنی لەبەردابوو پاك‌و خاوێن ڕیش تاشراو بە بینینمان گەشایەوە باوەشمان بەیەکتردا کردو هۆن هۆن فرمێسك بە چاوانماندا هاتە خوارێ.
سوپاس بۆ خوا مام ئەحمەد تۆ زیندویت.. ئەم ماوەیە خۆت لێکردین بە ئەستێرەکەی سیوەیل پاش پشویەکی کەم نانخورا و کەوتینە باس‌و خواسی یەکتری..
هەواڵی ساغ‌و سەلامەتی گوندەکەمانیان بۆ باسکردبوو. مام ئەحمەد دوای هەمو شتێك هەواڵی ماڵ‌و منداڵی پرسی.. سوپاس بۆخودا تەنها غەمیان تۆیە.
یەکێك لە پیاوانی گوندەکەمان وتی: مام ئەحمەد پرسەکەشت تەواو بو واهاتینە سەر چلەی ماتەمینی.. هەمو دەستیان کردە قاقای پێکەنین.
ئەمان زانی ئەو شەوگارە چۆن بوە نیوە شەو هەستمان بە ماندوێتی ڕێگا ناکرد..
بڕیار درا بەیانی زوو بگەڕێنەوە ناو گوندەکەمان‌و مام ئەحمەد درێژە بە ژیانی بدات زۆر زۆر سوپاسی خەڵکی گوندەکەمان کرد.. زۆر لە خۆبونەوە خۆشەویستیەکی پتەو لە نێوانماندا دروست بوو..
لە گوندەکەی خۆمانەوە چەند کەسێك بە پیرمانەوە هاتبون ئێمەش لەگەڵ چەند پیاوێکی ئەو گوندەدا بەرێکەوتین هاتین.. هاتین تا گەیشتینە یەك مام ئەحمەد هەر قسەی خۆشی بۆ ئەکردین‌و ئێمەش لە قاقای پێکەنینمان دەدا.. ناو بە ناو مام ئەحمەد مات ئەبوو.. دەمانپرسی چیتە مام ئەحمەد بیری لە چی ئەکەیتەوە؟.ئەویش دەیوت: لەو ساتانەی کە کەوتمە ناو ئاوی لافاوەکەوە تا ئەم ساتەی لەگەڵ ئێوەم.. کە ئاوەکە دایپێچام ئیتر هیوام بە ژیان نەما چونکە ئاوەکە زۆر بو.. دنیاش بەرەو شەوگار دەڕۆیشت زۆر پاڕامەوە.. زۆر لالامەوە.. بەڵام ئاو بواری هیچی نەدام.. تا لە ماڵی خانە خوێیەکەم خۆم بینیەوە گەیشتینە سەر کانی‌و ئاوێکی یەکجار خۆش‌و دڵگیر، مام ئەحمەد تاتوانی ئەملاولای هەمو ئەوخەڵکانەی ماچکرد کە لە دێکەی خۆمانەوە هاتبونە پێشوازی..
دیمەنەکە زۆر خۆشبو.. زۆر دڵگیرو سەرسام‌و هێمنیبوو. ئێمەش‌و ئەوانیش چایەکی عەسرانمان خواردەوە.. شوانێکی گوندێکی نزیکمان دەوڵەتی ئەلەوەڕاند بانگێکمان لێکرد کە بێت ئەم دیمەنە ببینێ‌و چایەکیشمان لەگەڵ بخواتەوە..
دوای بانگ‌و هاوار بەڵێیەکی کردو دەوڵەتەکەی لە پێش ئێمەوە بە گردو پاڵێکەوبون ڕایدا..

بەردێکی گەورە لەژێر قاچی مەردێکدا ترازاو هاتەخوارێ.. درا بە بەردێکی تردا بەجووت تلۆربونەوە، خێرا زانیمان ڕووی ئەو دوو بەردە گەورەیە بەرەولای کانیو ئێمەدێن هەریەکەو بەلایەکدا هەڵهاتین بەڵام (سبحان الله) مام ئەحمەد حەپەسابو.. توانای سەیرکردن نەبێت توانای هیچی نەمابو..هەرچەندە هاوارمان لێکرد نەیبیست لە ئاکامدا بەردێك دای بە پشتەملیاو بەردەکەی تردرا بە کەلەکەی چەپیدا تافریای کەوتین گیانی سپارد، هەرچەندە هاوارمان کردو هەڵمانگرتو دامان نا.. سودی نەبوو.. مام ئەحمەد وەفاتی کرد..

ئەو کەسەی یەکەم جار لە ئاوەکە دەربازی کردبو بۆ جارێکی تر گوێی گرتەوە بە دڵیاو پاش کەمێك سەری ڕاوەشاندو ووتی: انا لله وانا اليه راجعون.. مام ئەحمەد وەفاتی کرد..

بەڵێ بە گریانو نارەحەتیو دڵتەنگیەوە تەرمەکەیمان هێنایەوە ناودێو هەواڵەکە بەشێوەیەکی تر لە خەڵك گەیەنرایەوە..

خەڵکی بەتەمابوون بیکەن بە شاییو هەڵپەرکێ.. خەڵکی بەتەمابون جارێکی تر مام ئەحمەد بێتەوە بە شوانیان. ئای لە قەدەری خوای گەورە ئەو تەمەنەی پێبەخشییەوە تاببێتە جێگەی دەرسو عیبرەت بۆ ئەو کەسانەی کە بە خۆشی ڕۆژگارو تەمەنی درێژ لە خۆیان بایی نەبن.. ئەوچەند ڕۆژگارەی مابوو بەسەری بردو پاش تەواو بونی ئەجەلی بەو بەردانە هات.

لێرەدا ڕوداوێکی شاعیری کورد (مامۆستا زێوەر)[4]یش باس دەکەین دەڵێت: کاتێك کە بەرێوەبەری ناحیەی (پردێ)بوم، کۆمەڵێك ماسی گر بۆیان گێڕامەوە لەکاتی ماسی گرتندا لاشەیەکیان بەسەر ئاوەکەوە بینی کە چوین بە دەنگیوە دەرمان هێناو هێنامانە قەراغ ڕووبارەکە هێشتا مابووئاوی ناو سکیمان هەمو دەرکرد. دامان ناو پێمان وت: تۆ بچۆ لەبەر ئەو کەندەڵانەدا کە سێبەرە پشوو بدە تا کاتێك ئێوارە گەڕاینەوە لە گەڵ خۆماناندا دەتبەینەوە بۆ شار، بۆ ئێوارە کە گەڕاینەوە بینیمان کەندەڵانەکە ڕووخاوە بەسەریداو گیانی دەرچووە.

---

4 سۆمای دیدە / عادل شاسواری / بەرگی ٢ ل ٥٥٢

# خێرێکی کەم بۆ منێکی هەژار

هەندێك جار مرۆڤەکان کە بۆ خوای گەورە کاردەکەنو دەجەنگنو پاش ماوەیەك چەند کارێکی تر رووبەڕوویان دەبێتەوە.. لە دڵی خۆیاندا ڕەنگە بڵێن ئەمە بچوکترین پاداشتی خواییە!.

بۆیە دوای دەرئەنجام هەمو کات هەوڵدەدات بۆ کاری باشو خۆش کار بۆ دەوروبەر دەکات لە دوو سەرەوە قازانج دەبەخشێت.

ئەو کەسەی دەبەخشێت هەست بە ئاسودەیی دەکاتو ڕەنگە لە داهاتویەکی نزیکدا بێتەوە ڕێگەی.

ئەو کەسەی وەردەگرێت زۆر دڵخۆش دەبێتو کارێکی زۆر جوانی پێبە ئەنجام دەگەیەنێت.

کوردەواریش لە فەلسەفەیەکی جواندا وتویانە: "چاکە بکەو بیدە بە دەم ئاوەوە"

بۆ سەلماندنی ئەم خێرو بێرە وەرن لە گەڵم با لە بارودۆخی ڕابردودا لەگەڵ کاك (H) هەنگاو بنێین ماڵمان لە گەڕەکی (س) بوو لە شاری سلێمانی،

گرانیەکی زۆر زۆر ڕوی کردبوە ئەم شارە ڕوخسارەکانی ژاکاندبو، منیش خاوەن ماڵو منداڵ هیچم شك نابرد تەنهاو تەنها یەك (عەرەبانەی سێتایە)یی کە بە هێزو بازو ماسولکەی لاوازم پاڵم پێوە دەنا.

ڕۆژانە لە ناو شاری قەرەباڵغی و بێدەرەتانیدا بژێوی ماڵو منداڵم پەیدا دەکرد.. ڕۆژێك پارەی زۆر ڕۆژێك پارەی کەم ڕۆژێك بۆ نانە سکی ڕۆژێك بۆ کارێکی تر.

پێم خۆشە بزانن کە سێ کچو دوو کوڕو خۆمو خێزانم دەمانکردە حەوت سەر خێزانی سەرو پێچکە هەر بە هەرزەکاری سەریان کردبوم بە پەتەوە ماڵو سەروەتو سامانمان کەم بو.. بەڵام قەناعەتو خۆش گوزەرانی تاکە سەرمایەی خێرو خۆشیمان بوو.

خانویەکی بچوکمان گرتبو بە کرێ، بەبڕی ٢٥٠دیناری سویسری لە پیاوێکی بە قەناعەتو خاوەن بڕوای کامڵو پتەو. بەمانای کردەوەو هەمو وشە جوانەکانی پیاوەتی لێدەوەشایەوە.

دوو مانگ لە سەر یەك نەمتوانی تەنها نیوەی کرێیەکەیەکەشی بۆ دەستەبەرو ئامادە بکەم، ئای هەژاری ئاخ نەداریباری گرانیو نارەحەتی لە ناو شاردا کەمدەستیم چەندین کەرەسەی خواردنی لەبەرنامەی ئێمەی کەم دەرەتاندا سڕییەوە، سەرەتا برنجو ڕۆنو شەکرو چاو میوەش بەدوایاندا.

کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە ڕۆژ تا بانگی ئێوارە بە حاڵە حاڵو هەزار ڕەزالەت پارەی دوو کیلۆ ئاردو دەسکێ تەرە پیازم بۆ پەیدا دەکرا.

دەمبردەوە ماڵەوە زۆر بە قەناعەتو قسەی خۆشەوە بە عەلادینە شرەکەی خۆمان دەمانکردە کولێرەی بچوك بچوكو بە تەرەپیازەوە دەمانخوارد.

سروشتی ناوشار وایلێهات خەڵکی بۆ گەرم کردنەوەی خۆیان کەرەستەی ئاسنی گەورەو خشتی هیتەریان بەکار دەهێنا.. کاری کردە سەر (محاویلە)کانی گەرەكو ناو شار، کارەبا تا سەعاتێك دەبوو چەند کاتژمێرێك خۆی لێدەکردینە (هەنگوینی شەمەتلێنکە)..

کارەبا زۆر کەمبویەوە.. بۆیە نەداریو هەژاری ڕووی پێکردمە تەلەفزیۆنەکە، پاش کۆبونەوەیەکی داخراوی خێزانی قەناعەتمان لەلا دروست بو کە بیدەینە خۆراكو ژیانی دنیایی پێدەستەبەر بکەین.

بەڵێ بەیانی بردمە بازاڕو هەندێك خۆراکی کردو بڕێکم لێدایە کرێو هەوڵم دا زۆر شەرمەزاری خاوەن ماڵ نەبم..

ئێوارە کە سەرنجم دەدا شتێك لە ماڵەکەدا جێگەی چۆڵە.. کسپە لە دڵمەوە دەهات.. (بەڵام چیدەکەیت لە دەست نەبونی.. لە دەست هەژاریو لاتیو زەبونی) ئەو شەوە هەریەك لە لایەکەوە نوستین پاش ماوەیەك هەستم کرد زۆر شتی ماڵەکەم زیادەن.. خۆمانو منداڵ پێویستیمان بە کاری جوانکاری هەیە.. بۆیە لە (سەلاجەو فەرشو گەلێك کەرەستەی گرانبەها)مان گەیاندە بازاڕ، ژورەکانمان زۆر گەورەو فراوان بون..

لە جێگەی ئەوان بزێوی ژیان دەستەبەردەبوو.. جار بە جار ئاگە تروسکاییەکی گەش لە ناخی دەدام بە خۆم دەوت: تۆ بڵێی دنیا هەروا گرانی بێت.. تۆ بڵێی ژیان ئاسانکاریمان بۆ دروست نەکات.. ئای کە خۆش بو جارجارە خەوم بە ڕابردووە دەبینیو جار

جارەش ماتو کەساس دەبوم بۆ ئەم ژیانەو بۆ ئەم تەمەنە جوانەی کەوا بەزەلیلی گوزەر دەکات. سوتەمەنی پشتی پارەی دەشکاند سەر باقی ئەوەی کە زۆر نارەحەت دەستدەکەوت.

جارجارە دەهات بە مێشکمدا کە قەرز بکەم. باشە لە کێی بکەم.. ئەوا دەستم کەوت بەچی بیدەمەوە رۆژ رۆژی نەفسی نەفسیە، لە لایەکی تریشەوە من کەسم نییە لە دەرەوەی وڵات (خارج) تا هاوکاریم بکات رۆژگارەکان زۆر بە نارەحەتی گوزەریان دەکرد، خەمەکان دەرۆیشتن خەمی نوێ دەهاتە جێگەیان نالەباری باری سیاسیش هەرلە شلۆقی بو، میللەت بە گرانیو نەبونی رازی بوو لەو لاشەوە شەری ناوخۆو براکوژی وەك ساڵانی رابردوو زیندوکرایەوە، بەلام لە قالبی گوندەوەو دێ بەدێوە گۆرابو بۆ شار بەشار ناوچەی فراوان بە فراوان..

چەندین گەنج بە وەرەقەی (جاشایەتیوپاشایەتی) نەجاتیان بوبو بەلام (پاکورسی یا نەمان) کردنیە سوتەمەنی ئەو جەنگە خۆ کوژییە.. ئای رۆژگار زۆر نارەحەت دەرۆیت.. ئەمانە بونەتە شتێکی ئاسایی زۆر بە ئاسانی خومان پێوەگرت..

زستان بە خۆیو سەرماو سۆڵەوە خۆی پێچایەوەو بە مانگی ئازارو نیسان پێشوازیمان لە وەرزی بەهارو خۆشیو گەرمای هاوین کرد..

خوای گەورە ئەم بەندانەی خۆی باش دەناسێت.. نە بەرگەی سەرمای زستانو نە بەرگەی گەرمای هاوین ناگرن.. دەبێت لە وەرزی هاویندا سەرمای زستانمان بیربچێتەوە؟!

وەرزی گەرما کاتی پێگەیشتنی میوەکان لە دەرگای میللەتی هەژاریان دا زۆر بە گەرمی. ئەوەی مایەی نیگەرانی خێزانەکەم بوو، نەبونی سەلاجەو پانکەو موبەریدە بوو، پەنامان بۆ کەرەسە کۆنەکانی کوردەواری برد، بازاریان لە بازاردا گەرم بوو (باوەشێن، مەرکانە، تەرمۆزە،....)ئیتر شەوگارەکانی بەر ئاگردانو مقەڵی خەڵوزو زۆپای دار رۆیشتن شەووشەوگاری سەربان هاتنە پێشەوە.. قوربەسەر ئەو ماڵەی سەربانو حەوشەیان نەبووا؟

خوێنەری بەرێز رەنگە زمانی گێرانەوەی ژیانی هەژاریم سادەو ساکارو تارادەیەك لاواز بێت. بەلام ئاخ و زمان زۆر ماندوە زۆر نەبەکامە لە گێرانەوەی وەصفی ئەو رۆژگارە تاڵانەدا مەگەر لە هزرو هەستی مرۆڤی بە قەناعەتدا بمێنێتەوە، هەوڵیش دەدەم لە

ناخی کۆمەڵگەیەکی داماو سەرگەردانت حاڵی بکەم کە ڕۆژگارێك بوو گاڵتەی بە زۆر شت ئەهات کە ئەمڕۆ بۆتە ئەمری واقع، سروشتی ماڵەکەی ئێمە وەها هەڵکەوتبو ماڵمان سەرسوچی کۆڵانەکە بوو ماڵی کەم بەدەورمانەوە هەبوو ، شەوانی گەرما لە سەربان ئەگەر بارەش بیهێشتایە دەنوستین، یان دەرگاو پەنجەرەی ماڵمان والادەکردو لە ژوورەکاندا هەریەك لە لایەکەوە لە تاو بێکارەبایی‌و گەرماو برسێتی خەو دەبوە میوانی لاشەو دەماغمان،خەوەکانیشمان پڕبون لە هیلاکی‌و دەردەسەری‌و ناڕەحەتی، بەڵام وشەی ئینسان لە نسیانەوە هاتوە.. شتەکانی زۆر زوو بیردەچێتەوە.

بەیانی مەلا بانگدان وەك ڕۆژەکانی تر عەرەبانەکەم دەردەکرد لە خەم‌و خەفەتی ماڵ دەردەچوم ڕووم لە خەم‌و خەفەتی ناو بازاڕو دەردەسەری دەکرد، ئەو خەڵکەش لە من باشتر نەبون تەنها ئامانجم لە ئابوریدا پەیدا کردنی ئاردو کەمێك پێخوری ساکاربوو.

ئەم وەرزی بەهارو هاوینە ختوکەی خەڵکی دەدا بۆ چونە گەشت‌و سەیران لەو کەژو کێوو قەراغ چەم‌و ڕوبارانەئەو ڕۆژە شارتاڕادەیەك چۆڵی پێوە دیار بوو، ئەو ڕۆژە تەنها یەك دیناری ئاسنم دەستکەوت کەوتینە وتووێژ: باشە بەچیت بەم؟ کاك دینار تۆ چیدەکەیت؟ باشە واتۆم دایە یەك نانی بازاڕی ئەی چی بۆ ماڵەوە دەبەیتەوە، ئەگەر یەکێك بە کامێرایەکی ڤیدیۆ ئەم دیمەنەی تۆمار بکردایە ڕەنگە ببوایە هەوێنی چەندین فلیمی درێژ ئەگەر نوسەرێك ئاگاداری ئەم خەم هەڵڕشتنە بێت دەیکاتە چەندین وشەو دەبێتە ڕۆمانێك تا کۆتایی مرۆڤەکان.

لە ئاکامدا پیاوێکی هەژاری نەداری ڕیش سپی بەرامبەرم وەستاو داوای خێری کرد، چاوێکی سۆزم بە خۆمدا گێڕاو ماڵ‌و منداڵم وەك شریتێکی ڤیدیۆ بە خێرایی بروسکەیان بە مێشکم دا، باشە ئەم دینارە هەربۆ ئەم پیاوەکەم دەستە باشە.. خوایە گیان وامن بەخشیم بە خەزێنەی تۆ، تۆش خاوەنی ڕەحمەتی زۆری‌و لە خێرو شادی بێبەشمان نەکەیت کابرای پیری بەساڵاچوی ڕیش چەرمو بە خۆشحاڵییەوە پارەکەی وەرگرت‌و هەندێك نزای کرد، لە دوا وتەیدا وتی: ئەمە چەند ڕۆژێکە برسیم سوپاس بۆ خوا سفتاحم کرد.

لە ناخەوە هەستم بەئاسودەیی دەکرد، بەڵام ئەی چی بۆ ئەم شەوگارەی کەسێ ژەمی ڕۆژگاری بۆتە یەك ژەم‌و ژەمەکەش ڕەنگە ئەم شەو نەبێت،وەك لە خەوێکی خۆش ڕاپەڕم بە دەنگی بانگی عەسر بەهۆش خۆم هاتمەوە.. بەرەو مزگەوت پێم نا،

عەرەبانەکەم بە عەمودێکەوە بەستەوە.. چومە ژووری ...پاش تەواو بون ،روم لە بازاڕ کردەوە سەر ئەنجام ئەم ڕۆژە بە دەستی بەتاڵ بەرەو ماڵ گەڕامەوە. ئەو شەوە خۆمو ماڵو منداڵم بێشێو ماینەوە، زۆر ڕاستە (القناعە کنز لایوفنا) کچە بچکۆلەکەم وتی: بابە گیان ئەزانی دوێنێ شەو زۆر خۆش بوو وتم: بۆ بابە گیان شەوگار هەر شەوگارە،بە هێمنی وتی: دوێنێ شەو بۆنی کولێرەی سەر عەلادینەکە ئەم ژوورەی پڕکردبو، بەڵام ئەم شەو بۆنی هیچ ناکەم.. ئەمشەو برسیمەو دوێنێ شەو تێربوم.. بابە گیان بۆ نانت بۆ نەهێناینەوە؟!

نەمزانی چی وەڵامی ئەم کیژۆڵە دڵپڕ خەمو خەفەتی برسێتییە بدەمەوە، ناچار وتم: کیژە جوانەکەم ئەم شەو بنو پشت بە خوای گەورە ئێوارەی داهاتو بە تێری دەنویت، منداڵ زۆر هەست ناسکە وتی: بابە گیان تۆش وەك من برسیتە؟

بەناچاری وتم: ڕۆڵە گیان من هەمو ئەم ڕۆژگارە برسیم بوو.. ئەمەش شەوگارەکەیە.. قسەی زۆر لە نێوانماندا ڕوویدا.. کاتێکم زانی دەنگی نەما!! هەستم ڕاگرتو سەیرم کرد چاوە ماندوەکانی نوقمی خەوێکی خۆش بوبون.

منیش لە دوا ئاهما وتم: خوا ئەوە بگرێت نانو ئاوی لێگرتوینەتەوە.. ئەگەر ناحەقیمان لێدەکات خوای گەورە لێی قبوڵ نەکات..

نازانم چۆن منیش لە تاو برسێتیو بێکارەبایی و بێئاوی سارد چۆن خەوم لێکەوت بەڵام دیار بو شەکەتی ڕۆژگارو خەفەتی دنیا کاسی کردمو خەفەبوم.

نیوە شەو درەنگ بوو لەتەپەتەپی سەربان بەخەبەر هاتم، تا دەهات دەنگی تەپەی قاچیان نزیکتر دەبۆوە، لە پڕ ڕاچڵەکیمو شایەتمانێکم هێنا، کە زانیم ڕاستەو خەو نیە لە دڵی خۆما وتم: هەبێتو نەبێت بەم ناوەختە ئەمە تەپەی پێی دزە.. خوایە خێر.. جا بۆ نەیەن.. چیمان هەیە بیبەن؟! ئەوەی دۆزیانەوە خەڵاتیان بێت،کاتێکم زانی سێ کەسی دەمو چاو هەڵبەستراو جوان دەماغیان کردبو دووانیان کلاشینکۆفیان پێبوو یەکێکی تریان دەمانچە.

لێمان ڕاپەڕینو داوای پارەو ئاڵتونو کەرەسەی گرانبەهایان لێکردین.. هەمومانیان خستە سوچێکی دیواری ژورەکەوە.. ماڵو منداڵ ویستیان هاوار بکەنو بزریکێنن.. بەڵام میلیان لێڕاکێشاینو ورتەیان بڕین.

قەدەرێکی باش گەڕان هیچیان دەست نەکەوت، منیش لە ناخەوە چیرۆکی (قصة اللص والفقیر)م بیر کەوتەوە کە دزەکە لە نیوە شەودا هەڵی کوتایە سەر ماڵێکو ماڵەکە زۆر هەژاربون هەرچەندە گەڕا لە ماڵەکەدا هیچی دەست نەکەوت خاوەن ماڵ وتی: ببورە شەو کوت من بە ڕۆژی ڕوناك هیچ لەم ماڵەی خۆما نابینمەوە ئێستا کەسێکی نامۆی وەك تۆ بەم پەلە پەلەو بەم شەوە تاریکە چۆن شتت دەست دەکەوێت دزەکەش بە ڕوو زەردی بۆی هەڵهات.

ئەمانیش زۆر گەڕان هیچیان دەست نەکەوتسەرکردەکەیان ڕووی تێکردم کەڵتە کۆن کوا پارە.. کوا ئاڵتون.. کوا کەرەسەی گرانبەها.. لە کوێت قایم کردووه، منیش لە وەڵامدا وتم: براگیان لێتان هەڵەبوە بۆ ماڵی من هاتوون ئێمە زۆر هەژارین ڕوو لەو ماڵانە بکە کە تەنەکە خۆڵەکەیان پڕە لە پاشەڕۆکی ئێوارەیان.. قسەکانم تەواو نەکرد کچە بچکۆلەکەم بە کزۆڵەییەوە وتی: بابە گیان ئەمانە خواردنی خۆشیان بۆ هێناوین.. ڕووی کردە کابرای شەو کوت دوبارە وتی: خاڵە گیان من زۆرم برسییە.. ئێوارەش نانمان نەخواردوە.. هیچمان نییە بۆ ئازارمان ئەدەن ئێمە هەژارین.. گوناهین..پەلی کچەکەم ڕاکێشاو بێدەنگم کرد، لەو لاشەوە دایکی منداڵەکان بە وەڵامی چەند قسەیەك کەوتە قسەکردن، کاکە گیان خێرتان ئەگات گەڕمان لێلادەن.. خۆمان لە هەژاریو کەمدەستیدا دەناڵێنین ئێوەش سەر باقی ئەم هەمو گرانییە یەخەتان گرتووین، یەکێکیان نیازی شەڕی هەبو بەڵام سەرکردەکەیان وتی وازی لێبێنە.. دیارە ئێمە بە هەڵە هاتوین.

کەسەکەی تریان وتی: باشە وەك پارەو شتیان نییە کەرەسەی خواردن چیان هەیە هەندێك بەرین..

منیش وتم: کاکە گیان خاوەنی عەرەبانەیەکی سێتایەم.. بە هەزار کوێرەوەری چەند دینارێك پەیدا ئەکەم بۆ ئەو منداڵانە.. کرێچییم کەم دەستم.. ئەم ئێوارەیەش بەبێ شێو سەرمان ناوەتەوە.. عەیبە ئەگەر بڵێم چەند ڕۆژێکە ئاگر لە ماڵمان نەکراوەتەوە.. عەیبە ..بۆ قسە ناکەن.. ویژدانتان هەبێت بۆ وەکو گورگی برسی تێمان بەربون..

کچە بچکۆکەکەم لەگەڵ خوشکەکەی تری دەگریا، ڕوناکی لایتێکیان تێگرتین.. پاش کەمێك ئەوەی دەمانچەکەی بەدەستەوە بو بانگی یەکێکیانی کرد: وەرە پێشەوە کوڕە.. لە ماڵەکەی تر چیت دەست کەوت بیدەبەو دوو منداڵەئەویش دوای تۆزێك مینجە مینجو خاوە خاو ناچار دەستی کرد بەبەر باخەڵیاو هەندێك پارەی دایە دەست

کچەکانم..منیش لە دەستی کچەکانم گرتو دامەوە دەست خۆیانو وتم: پارەی ئێوەمان ناوێت با بەپاروی حەرام گۆش نەبن کەچی یەکێکیان وتی: بیگرە.. پارەی مامی خۆتە. ناچار زەردەخەنەیەکم کردو ڕازی بون.

لێیاندا ڕۆیشتن.. لەدوا سەرنجیان لە دوا هەنگاویاندا سەرکردەکەیان وتی: کاکە بەچی زەردەخەنەت کرد گاڵتەت بەچی هات؟

لە ئاکامدا وتم: کەسێك ڕۆحی زیندو بێتو بەزەیی بە منداڵی ئاوهادا بێتەوە حەیفە دزی بکات حەیفە کاری خراپ بکات.

شەو کوتەکە وتی: پیاو خۆی ماندو دەکات بەڵام حەیفە بۆ ئێوە نەبێت گەردنتان ئازا بێت.. ئەگەر پیاوبم بەسمە.

لە دەرگای دەرەوە ڕۆیشتن هاتمە لای منداڵەکانو پارەکەمان ژماردتەنها ٥٠٠ دیناری سویسری بو.. خوایە نەیبڕی بۆ ئێمە زۆر بوو..

(کە خودا دای ناڵێت کوڕی کێی).. هەمو گەشاینەوە، بڕیاری خواردنێکی خۆشمان دەرکرد..وتم: خوایە زۆر سوپاس گەر تۆ ڕزق بنێریت بە چەتەو دزیشدا بێت هەر دەینێریت.

سود وەرگیراوە لە دەفتەرەنامەی بەڕێز مامۆستا مستەفا حسەین میرەسورە

# دەریاو ئیمان‌و هەنگاو

بەڕێزان ئیمە مسافرین[5].. سەفەرێکی دوورو درێژ.. ڕێگەی تۆلان.. ڕێگایەك کەمیمان بڕیوە زۆری ماوە، ڕێگایەك لە جیهانی نەبوونەوە دەستی پێکرد ئەو کاتەی کە ئێمە هیچ نەبوین.
ئێمە ڕێبواری ڕێگەی عیشقین بەرەو بەهەشت کەوتوینەتەڕێ.. بەردەوامیش ڕێگە دەبڕین تا بەردەم بارەگای پەروەردگار.
ئەمە میهرجانی خودایە هاتوم بەم چەند پەیڤە ببەخشێ ئێمەو خوێنەرانی، خوایە گیان لێمان خۆشببە.. خوا گیان لەو دونیا نەیدەیتەوە بەڕووماندا.. خوایە گیان عاشقی دیارتین.
بەڕێزان دەبێت لە گوناه کردن دووربکەوینەوە.. چونکە گوناه کردن دەبێتە بێزارکردنی ڕۆح هاتوین مەڵحەمێکمان دەوێت کە ڕۆحمان تیمار بکات، بەڵێن دەدەین بە ئاوی ئیمان خۆمان بشۆین‌و نەگەڕێینەوە بۆ گوناهو جیهانی گوناه.
بەڕێزان لێرەدا دەمویست سێ خاڵ باس بکەمکە ئامۆژگاری خۆم بکەم پێش ئێوە..

١. پەیوەندی ئیمان.
٢. لێکچونی ئیمان "تشبیه"
٣. هەنگاو نان‌و چونە پێشەوە.

- ئیمان شتێکە نەبینراوە.. بۆ ئەوەی بیناسین دەبێت لێکچونی بۆ بکەین.. نمونەی بۆ بهێنینەوە.. زانایان چەند شتێکیان باس کردوە.

پەیوەندی ئیمان چییە؟
پەیوەندی عیلمی چییە؟جیاوازی بەدی دەکرێت لەم نێوانەدا:
پەیوەندی عیلمی چییە: ئەو پەیوەندییە کە لە نێوان مامۆستاو قوتابیدا هەیە.

---

[5] سود وەرگیراوە لە وتارێکی مامۆستا تەحسین حەمەغەریب .

لە نێوان دوکاندارو فرۆشیاردا هەیە، لە نێوان دکتۆرو نەخۆشدا هەیە.
پاش تەواو بونی ئیتر یەکتر ناناسنەوە، پەیوەندییەکی وشکە، دەتوانم بڵێم پەیوەندیەکی بەرژەوەندییە (مصلحە)بەڵام پەیوەندی ئیمانداران کە یەکتر بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئیتر برانەوەی نییە.

لەسەر بناغەی خۆشەویستی یەکترمان خۆشدەوێت، ئەو پەیوەندیە تەنها بڕوادار هەستی پێدەکەن، بە چاوی دڵ یەکتریان خۆش دەوێت.

– ئەوەی گرنگە بۆ ئیمانداران دەبێت بزانین چی دەکات.. چ کارێك دەکات.. بۆکێ دەیکات.. لەبەرچی دەیکات.. بە کام مەبەستو نییەت ئەنجامی دەدات.. لە کۆتایدا چ چێژێکی لێوەردەگرێت.. چ ناکامێکی دەبێت..

خواناسێك دەڵێت: ئەگەر هەزار جار قورئانت لەبەر بێت ئەبێت بزانیت بۆ لەبەرت کردوە، دەبێت وات لێبکات نەفست کافرنەبێت.. نەفس زۆر گرنگە هاورێیان.
بۆ نمونە: کاتێك نوێژ دەکەیت دەبێت بزانیت بۆ کێ سوجدە دەبەیت.. دەبێ بزانیت چی دەخەیتە سەر زەوی!
دەبێت ئەوە بخەیتە سەر زەوی کەلە نەفسدا هەیە، "رۆحو دڵو گیان"، سوجدە بەریت.
ئەو کاتە مرۆڤی ئیماندار.. بڕوادار بە پەیامی ئاسمانی هەست بە جوانییەکانی ئیمانو بەها بەرزەکانی دەکات.
پارێزگاری لە وتەو ڕەفتارو کردارو ئەمانەتو ئیرادەو حەق دەکات، دەتوانم بڵێم حساب بۆ هەستی بەرامبەر دەکات، حساب بۆ مێرولەیەکیش دەکاتو حەقی ناخوات.
کەسی بڕوادار (ئیماندار) وەك دەریایە..دەریا!! دەتوانیت سەرنج بدەیت بزانە وایەو هەستی پێدەکەیت.

- دەریا سیفەتێکی هەیە کە مردو ناگرێتە خۆی، ئەو ماسیانەی کە زیندون لە ناو ئاودا دەجولێن سەما دەکەن دەخۆن بەڵام کاتێك دەمرن دەریا نایانگرێتە خۆی فرێیان دەداتە دەرێ .. هەروەك چۆن لەناو دەریای ئیماندا کەسێك دەمێنێتەوە کە زیندوبێت.
- دەریا دەبێتە ڕۆحی ئەو شتانەی دەچنە ناوی دەریا، سەرنج بدە ئەو کەشتیو بەلەمانەی لە وشکانیدا ناجولێن بەڵام کەدەچنە دەریا دەیانجولێنێ، کە سێك مردوو بێت کە دێتە ناو ئیمانەوە رۆح دەچێت بە بەریانداو دەبن بە کەسێکیتر.. مرۆڤێکی جیاواز لە جارانی ڕابردو.

نمونە: کەسێك دزە درۆزنە.. داوێن خاوێن نییە.. خەڵکی لێی دەترسن بەڵام کە چوە بازنەی ئیمانەوە ئەو کردەوانە هەموی دەگۆڕێت.
یان گاڵتە بە باوکی دەکات لە دایکی دەدات براو خوشك گیریان خواردوە بە دەسیەوە.. کە بەتەوای هاتە بازنەی باوەڕەوە دەبێتە مرۆڤێکی جوانو نمونەیی. لە ڕابرونی ئیسلامدا چەندین کەسمان دیوە لە کۆمەڵگەی کوردیشماندا چەندین کەس ژیاون بەڵام ئەوانەی ئیمان کاری تێکردون، چەند ساڵیشە مردون، نەوەکانیان بە زیندوی یادیان دەکەنەوەو نەمرن.
- ماسی ناو دەریا ناخەوێت.. مرۆڤی ئیماندار ناخەوێت.. (ئەو خەوتنەی کە جەستەو لاشەی پشو ئیسراحەت دەکات. بەڵام رۆحی لەلای خودایە.
بەبەردەوامیو هەردەم ئاگای لەو کەسانەیە کە پێویستیان بەوە، ئەو هاوکارییان دەکات. نەداران.. کەم توانان..لانەوازن.. خوێندکارن.. ئەم پەرۆشیانە بە هێزو باوەڕەکەی بۆیان دەکۆشێت. چێژ لەو هاوکارییە وەردەگرێت.
- سیفەتێکی تر دەریا قەت پیس نابێت، پیسییەکان بە ئاو دەشۆرێنەوە بەڵام خۆی پیس نابێت، ئەو کەسانەی گوناهبارن دێنە ناو دەریای ئیمانەوە پاك دەبنەوە هەرچی گوناهیان هەیە دەشۆرێتەوەو پاك دەبێتەوە.
دەریا بەخشندەیە دەبەخشێت بەو شتانەی لە دەوروبەری هەن.. پاشانیش دەبەخشێت بەو شتانەی کە لە دورییەوە هەن، سەرنج بدە باران دەنێرێت بۆ ئەو شوێنە دورانەی کە پێویستن.. خۆی دەستی پێیان ناگات.
ئایا سەرنجت داوە مرۆڤی ئیماندار خێری هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دورن لێوەی.. نەك تەنها ئەوانەی کە لێوەی نزیکن.
کاتێك ئەو کەسە ئیماندار نییە خراپە خێریان هەر زۆر کەمە بۆ چواردەوریان ئازاری دایكو باوكو هاوسێکانیان کەسانیتر دەدەن.. بەڵام کە بونە بڕوادار زۆر دەگۆڕێنو هاوکاری یەکتر دەکەنو هەوڵ دەدەن سودو قازانجو خێریان بۆ دورترین کەسو شوێن بڕوات.
- ماسی لەناو ئاودا دەریا نابینێ؟
جوان ورد بەرەوە لەو ماسیانەی لە ناو ئاودا دەڕۆن ئاو نابینن.. کاتێك شتێك دەخەیتە ناو ئاوەکەوە هەموویان هەڵمەتی بۆ دەبەن، ئایا کەی چێژی ئاو دەکەن؟ کەی ئاو دەبینن؟

ئەو کاتەی کەلە ئاو دێنە دەرەوە هەوا خەریکە دەیان خنکێنێ ئەو ساتە دەزانێت ئاو چییە ئاو بۆ ئەو چەندە گرنگە ئەو کاتە مرۆڤی باوەڕدار دەزانێت باوەڕ (ئیمان) بۆ ئەو چەند گرنگە کاتێك هەست دەکات لەم کۆمەڵگەیە ئیمان نییە دابڕاوەو چۆتە دەرەوە (خارج) ئەو براو خوشکانەی خارج کە دڵیان زیندوە دەزانن ئیمان چییە!!!

نامە دەنێرنەوەو باسی گوزەرانی خۆیان دەکەن.. لە قسەکانیاندا دیارە داوای دوعای خێردەکەن.. ئەو کاتە بیر دەکەنەوە ئەو کاتە دەزانن چییان لە دەستداوە.. ئەو کاتە دەزانن دڵیان چییە (زمان پەردەی دڵە) وەك خواناسێك دەفەمویت: گەر پەردە بجوڵێت دەزانیت زمان چییە.

بەڕێزان ئەمە بۆ هەمو کەس نییە بۆ ئەوانەیە کە ڕۆحیان زیندوە. مەبەستیەتی خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش بێت، زۆرێکی باوەڕداریش ئەو ژینگەیەیان بینی.. ئەوە ئەبو خەونیان پێوە دەبینی ئێستا هاتونەتەوە درێژە بە ژیانێکی ئیمانیانە دەدەن.

- بەڕێزان ئەمەوێت تەنها یەك هەنگاو بنێین و زۆر بەجدی بێت و تەنها هەنگاو بنێین بە نەفسماندا و هیچی تر.

شێخی گەورەی سەمەرقەند کە شێخێکی ناودار بوە لە ئامۆژگاری و موحازەرەکانیا قەرەباڵغییەکی زۆری پێوە بوە، ڕۆژێك دەیەوێت بێتە ناو خەڵکەکەوە وتاریان بۆ بدات سیفەتی مزگەوتەکە واهابو دوو دەرگای هەبووە یەکێکیان لە دواوە ئەوی تریان لەلای محرابەکەوە، جەنابی شێخ کە دێتە ژوورێ هەنگاوێك دەنێت و کەسێکی تریش لە دەرگاکەی ترەوە دێتە ژورێ و ئەم قەرەباڵغییە دەبینێت و دەڵێت:

ڕەحمەتی خواتان لێبێت هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە هەنگاوێ بچێتە پێشێ.

کاتێك شێخ گوێی لەم قسەیە دەبێت دەگەڕێتەوە ناچێتە دوانگەکەوە خەڵکەکە بانگی دەکەن: یا شێخ بۆ ئەڕۆی، وەرە وتارەکەمان پێشکەش بکە..

جەنابی شێخ دەڵێت: وتارو ئامۆژگاری ئەمڕۆ ئەو وتەیە بو کە ئەو پیاوە فەرموی واتە هەرکەسێکتان لە ئاستی خۆیەوە یەك هەنگاو بچێتە پێشەوە لە هەمو بوارەکانی چاکەو خێرخوازیدا بەسیەتی.

شاعیرێك لە بەردەم خواناسێکدا دەفەرموێت: بۆ ئەوەی مرۆڤی ئیماندار بگاتە لای خوا دو هەنگاو بنێت یەکێکیان بە نەفسی خۆیداو ئەوی تریان بەرەو لای خودا بچێت.

خواناسەکە دەڵێت ئەو کەسە زۆری وت، تەنها یەك هەنگاو بنێو بەس.. هەنگاوێكو بڕیارێك پەشیمان بونەوەی تێدا نەبێتو نەگەڕێتەوە سەر خراپەکاری. هەنگاوێك ئیرادەی ئیمانی گەشەی تیا بکاتو بەرهەمبدات.

لە کۆتایدا هیوام وایە هەنگاو بنێنن بۆ پێشکەوتن.. بڕیارێك بدەین کە لە پێشەواکەمان بچین.

هەنگاوێك بێت بۆ خۆ چاکردنو دیوارێك بێت بۆ نەگەڕانەوە بۆ لای گوناهەکان. لە دەریای ئیماندا خۆمان زیندو بکەینەوە ببێتە رۆحی پاكو نەگەڕێتەوە بۆ لای گوناه.

دڵنیا بە هەرکاتێك ئەو هەنگاوەت نا هەست بە چێژ ئەکەیت، دڵنیابە کە ئەو بڕیارەت داواکارت تیاکرد هەست بە چێژی ئیمان دەکەیت.

هیوادارم رێز لە خۆت بگریت خوای گەورەش رێزدارت دەکات..

لە کۆتایی پەیفەکانمدا دەیڵێمەوە:

١. هەستت بە پەیوەندی ئیمانی کرد.

٢. چێژت لە تشبیهی دەریاو ئیمان وەرگرت.

٣. بڕیار دەدەیت هەنگاو بەرەو چونە پێشەوە بنێت.

کەواتە: دڵنیابە ئەندامێکی بە کەڵکی قوتابخانەکەی محمد (صلی الله علیە وسلم) دەبیت انشاء الله السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

# درێژەی نەخشەی کەنیسە بۆ گاورکردنی مسوڵمانان لە جیهاندا

لەدیمانەیەکی (اشواک کولن یانق)[6]

دیمانە/ئەیمن ابراهیم

و/ باوکی محمد

پ/ بەڕێز اشواک کولن یانق ڕۆڵی ئەو ڕێکخراوە خێرخوازیە ڕۆژئاواییانە چیە لە جیهانی ئیسلامی بە گشتیو ئەفریقا بە تایبەتی؟

- لە ڕاستیدا ئەوانە ڕێکخراوی کەنەسینو لە ژێر پەردەی ڕێکخراوە مرۆییەکاندا کار ئەکەن، بەڵام ناوەڕۆکی کارەکەیان بە گاورکردنی مسوڵمانانو دورخستنەوەیانە لە دینەکەیان بە چەندەها ڕێگەو شێوازی جیاواز.

پ/ ژمارەی ئەو ڕێکخراوانە چەندین کە کۆڕی کەن...ەی جیهانی بەڕێوەیان دەباتو چاودێریان دەکات؟

- سەر ژمێری کردنو ژماردنیان ئاسان نیە، بەڵام ئەتوانم بڵێم کە ژمارەیان لە چەندەها هەزار تێپەڕ ئەکات، تەنها لە سۆداندا ٥٠٠ ڕێکخراوی کەنەسی هەن کار بۆ کەنیسە ئەکەن.

پ / ڕێکخراوە کەنەسیەکان چۆن هەڵئەستن بە کاری بە گاورکردنی مسوڵمانان؟

- ڕێکخراوە کەنەسیەکان، یان ڕاستر بڵێین نەسرانیەکان، لە خۆوەو کوێرانە هەڵناسن بەو کارە، بەڵکو بەپێی نەخشەیەکی بۆ داڕێژراو ورد کارئەکەن، لێکۆڵینەوەی ئەو

---

[6] گۆڤاری المجتمع ژ ١٦٢٩

ولاتە یان ئەو شوێنە ئەكەن كە ئەیانەوێ كاری تیا بكەن، بەپێی ئەو نەخشانەی كە ئەو ئاینانەی كە تیایەتیو شوێن كەوتەی هەر ئاینێك، پەیوەست بونی خەڵكەكەی بە ئاینەكەیانەوە، پێویستی ئەو خەڵكە بە خزمەتگوزاریەكان وەك پارەو خواردنو تەندروستی خوێندنو خزمەتگوزارییەكانی تروە هۆكارەكانی بە گاور كردنیش زۆرن، بە پێی ئاینی ئەو كەسەی كە ئەیانەوێ بیكەن بە گاورو ئەندازەی وابەستە بونی بە ئاینەكەیەوە ئەگۆڕێت، ئەو كەسە چەندە پێویستی بە پارەو ماڵو یارمەتیو چارەسەركردنی باری گوزەرانو تەندروستی هەیە، بۆ نمونە: بێ دینەكان هیچ گرفتێكیان نیە لەوەی كە ببن بە گاور ئەگەر پێویستیەكانیان بۆ ئەنجام بدەن، بەڵام مسوڵمانەكان ئەوە رێكخراوە كەنەسیەكان لە دوو رووەوە كارئەكەن، یان كردنیان بە گاو ریان دورخستنەوەیان لە ئاینەكەیان ئەگەر نەبوون بە گاور، وەهۆكارەكانی بە گاوركردنی موسوڵمانان پلە پلەو قۆناغ قۆناغ ئەڕۆن لە گەڵیدا هەڵیئەنێنو ئیغرای ئەكەن بە زۆرشت.

پ / ئێوە چۆن كەسێكی مسوڵمانتان لە ئاینەكەی دور دەخستەوە؟

- ئەگەر پابەند بوایە بە دینەوە ئەوە لە رێگەی ئیغراكردنو هەواو ئارەزوەكانەوە (شهوات) ئەچینە ژورەوە، وەك پێدانی شوهرەتو ناوبانگو دەستەبەركردنی خوێندن یان پلەوپایە یان ئافرەت، یەكێك لە شارەزاكانمان بەردەوام هاوڕێیەتی دەكات، هەمو پێویستیەكی بۆ جێبەجێ دەكاتو بەردەوام لە گەڵیدا دەبێت بۆ شیكردنەوەو چارەسەركردنی گشت گرفتەكانی تا وای لێدێت دەبێتە كۆیلەی دەستی ئێمەو لە هەمو كارێكیدا دەگەڕێتەوە بۆ لامان، ئیتر وردە وردە لە گەڵیدا خەریك دەبین تاكو زۆر بە ئاسانی یان دەبێتە گاور دێتە ناو ئاینەكەوە، یان لە ئاینەكەی خۆی دور ئەكەوێتەوە باوەڕی پێی نامێنێ.

پ : ئەی ئەگەر لە هەندێ ولاتدا سەرنەوكەتنایە لە مەبەستەكانی خۆتانداو فەشەلتان بێنایە چیتان ئەكرد؟

- ئەگەر ئەوە سەری نەگرتایەو سەركەوتو نەبوینایە، ئەوە چەندها هۆكاری ترمان ئەگرتەبەر وەك زەخت كردنە سەر ئەو حكومەتانەی كە بە تەوجیهاتی كەنیسە نەئەڕۆیشتن بەوە كە لەرێگەی چەند ولاتێكی رۆژئاواییەوە ئەو حكومەتە ئاگادار ئەكرایەوە، وە تەهدیدیمان ئەكرد بە بڕینی ئەو یارمەتیو خزمەتگوزاریانەی

کەنەماندا بە گەلەکانیان.. ئەو خزمەتگوزاریانەی کە نەیان ئەتوانی وازیان لێبێنن‌و زۆر پێویستیان پێیبو یان ڕێگەی ترمان ئەگرتەبەر ئەویش دانانی جۆرێك لە گەمارۆی ئابوری لە سەریان یان دروستکردن‌و نانەوەی ئاژاوەی تایەفەگەری‌و ئاینی لە ناویاندا.

پ/ دەربارەی سەرچاوەی ئەو پارانەی کە کەنیسە دەستی دەکەوێت‌و ئەیبەخشێت چی هەیە؟

- لە ڕۆژئاوا بەپێی ئەو یاسایەی کە هەیە ڕێژەی ٥٪ هەمو ئەوانەی کە لەوێ کار ئەکەن ئەڕوات بۆ کەنیسەو ڕێکخراوە کەنیسەییەکان، ئەمە جگە لەوەی کە زۆربەی ئەو دامەزراوە ڕۆژئاواییانەی ئەفریقاو ئاسیا کەنەسین بە پلەی یەکەم، بە مانای ئەوەی کە پارەکانیان بۆ بەرژەوەندی کەنیسەو چالاکیەکانی کەنیسە ئەڕوات‌و کەنیسەش لەلای خۆیەوە بۆ چالاکی‌و کارەکانی خۆی بەکاریدێنێ، بە نمونە: کەنیسەی میسری زیاتر لە ١٠ هەزار قوتابی لە خواروی سۆدان لە خۆی گرتوەو پارمەتیان ئەدات، تا لە داهاتوودا ببنە قەشە یان شارەزا لە ئاینی ئەسرانیدا (مەسیحی).

پ / زانراوە کە زۆرێک پلەو پایەی کەنەسی بەرزت هەبووە، هەستت بەچ جۆرە ژیانێک کردوە لە ناویانداو چۆن ژیاویت؟

– ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکان بێ‌لێپرسینەوە پارەیان بۆ ئەرشتن‌و هەمو پێویستیەکیان بۆ دابین ئەکردن لە دوا مۆدێلی سەیارەو خانوی چاك‌و هەرچی پێویستیەکی ژیان بوو لەبەر دەستمانا بوو، سەفەرکردنمان بە سەرانسەری دنیا ئازادبوو پارەکەی دەدرا، لە خۆشی‌و ژیانێکی بێ وێنەدا بووین، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا بەردەوام هەستم بە بێزاری‌و دڵەڕاوکێی ئەکرد، هەستم ئەکرد کە ئەم کارانەی من ئەیکەم لەگەڵ سروشت‌و فیترەتی مندا ناگونجێن، قەت هەستم بە هێمنی‌و ئارامی دەروونی نەئەکرد.

پ /چۆن ئەم ژیانە خۆش‌و ڕابواردنەت وازلێهێناو بەرەو ئیسلام هاتی؟ چۆن قەناعەتت بە ئیسلام کرد؟

– سوپاس بۆ خوا ڕێگەی ڕاستم دۆزیەوەو هەمو خۆشی‌و شتەکانم بەجێهێشت بۆ کەنیسە، بە ڕاستی هەستم کرد تازە لە دایك بوم، دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٢ بومە

موسـوڵمانو ئیسلامم قبـوڵکرد ئـیتر تـەواو دەرونم کەوتـە ئـارامیو خۆشـیەوە لـە بـەراوردکردنی ئاینەکانـەوە لـە کاتێکـدا کـە دیراسـەی ماجـستێرم ئەخوێنـد بـەم دەرئەنجامانە هاتمە دەرەوە:

- قورئان ناوی نوسەری هەڵنەگرتوە وەك لە ئینجلەکانداو هەریەکە بە ناوێکەوەیە.
- قورئـان فـەرموودەی خـوای گەورەیـە، بـاس لـە ژیـانی پێغەمبـەران دەکات هـەر لـە گەورەمانەوە ئادەمەوە تاکو محمد صلی الله علیه وسلم.
- سـیرەو ژیـانی پێغەمبـەر دووپـاتی دەکاتـەوە کـە ئیـسلام یەکـەم ئـاینو دواتـرین ئاینیشە.

★ هـەمو پێغەمبـەران بانگەشـەی توحیـدو یەکتاپەرسـتیان کـردوە، ئەمـەش تـەنها لـە ئیسلامدا بەو شێوەیە ڕوون کراوەتەوە.

★ هەمو پێغەمبـەرێك گرنگیـەکی تایبـەتی هـەبوەو بـۆ گـەلێکی تایبـەت نێـراوە، بـەڵام پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەمو مرۆڤایەتیە بە گشتی ڕەوانەکراوە.

★ کتێبـە پێـشوەکانی تـر نـاتوانین جیـاوازی بکـەین لـە نێـوان (گوفتـاری خـواو گوفتـاری پێغەمبەرەکـەو گوفتـاری نوسـەرەکە)، هەرچـی نـەوە ئەمانخوێنـدەوە: یوحننـا وتـی، بەترەس وتی.. هەروەها بەڵام لە ئیسلامدا فەرموودەی خوا ڕوونـە کـە قورئـانی پیرۆزە، وە قسەی پێغەمبەریش ئاشکرایەو زانراوە، ژیانیـشی هـەموی نوسـراوەتەوە وون نـەبووە، زانایانی ئیسلامیش قسەکانیان ڕوونە( هیچ کام لـە فـەرمودەی خـواو پێغەمبـەرو قـسەی زانایان تێکەڵ بە یەکتری نابن) ئەمانە بەڵگەن لە سەر پاراستنی خوا بۆ ئەم دینە.

- ئیسلام دادپەروەریو یەکسانی تیایە بۆ هـەمو موسـوڵمانەکان بـەبێ جیـاوازی، بەڵام لە مەسیحیەتا یەکسانی نیە، من زۆر شت هەبوو جێگەی شـەرمم بـووە بـەهۆی ڕەنگـی پێـستم، چـونکە مـن شـەرمم بـە خـۆم ئەهاتـەوە لەبـەر ڕەش پێـستیم لـە بەرامبەر سپی پێستەکانا، سەرەڕای ئـەوەی کـە مـرۆڤ لـە مەسـیحیەتدا چـەند جـۆرو پلەیەکن، ڕەشەکان بۆ خۆیان نوێژ ئەکەن، سپی پێستەکان بۆ خۆیان، لە کەنیسەکانی ئەمریکادا ڕەش پێستەکان ناتوانن لە کەنیسەی سپی پێستەکاندا نوێژبکەن، وەزیـری

دەرەوەی ئـەمریکا (کـولن پـاول) ناتوانێـت بـچێتە کەنیـسەیەکی سـپی پێـستەکانو قسەیان بۆ بکات، بـەڵام لـە ئیـسلامدا ئـەم جیاکاریـە نیـە، هـەر کـەس زوتـر گەیـشتە مزگـەوت ئـەوە ڕیـزی پێـشەوەی بەرنەکـەوێت، مرۆڤـەکان لای خـوا یەکـسانن، زۆر ئاساییە ئەگەر ئیمامەکە سپی پێست بێت یان ڕەش پێست بێتو هیچ گرفتێك نیـە، بەڕێزترین کەس لای خوا ئەوەیـە تـەقواو خـوا ناسـی زیـاتر بێـت بێگوێدانـە زمـانو ڕەگەزو وڵات.

پ /چۆن کەنیسە هەواڵی ئیسلامەتی تۆیان پێگەیشت؟

- زۆر بێـزار بـون توشـی هەڵـچونێکی زۆر بـون، بەهـەمو شـێوەیەك هەوڵیانـدا کـە پەشـێمانم کەنـەوە لـە ئیـسلام، سـەرەتا بـە هـەڵنان‌و ئیغراکـردن، هـەمو شـتێکیان خستە پشتم تاکو پاشگەز ببمەوە پەیمانی زۆر شتیان پێدام، کۆمـەڵێك شـاندی زۆر لە ناوەو دەرەوەی سۆدان هاتن بۆلام‌و پاڵەپەستۆیەکی ئێجگار زۆریان کـردە سـەرم، بـەڵام کـەزانیان بێ‌سوودەو مـن بـە تـەواوی لـە ئیـسلام تێگەیـشتوم، ئـیتر کەوتنـە هەڕەشـە لێکـردنم بـە کوشـتن، تەنانـەت هەڕەشـەکە لـە قسەو گوفتـار تێپەڕانـدو ویستیان بە کردەوە جێبەجێی بکەن، تا ئیستەش چەند جارێك هەوڵی کوشـتنیان داوم، ئیستا من ناوێرم گەشت بکەم بۆ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ترسی ئەوەی نەوەك بمکوژن، هۆزەکەم بەردەوام بەرگریم لێنەکەن، لەو کاتەوە هاتوومەتەوە ناو ئیسلام هەست ئەکەم کەلە ژێر چاودێری و  پارێزگاری پەروەردگاردام، دڵنیـای تـەواوم بـۆ دروستبوە کە مردن‌و ژیان بە دەست خوایە، لەبەر ئەوە لە مـردن ناترسـم، ئـەوەی لـە پێنـاو بـەرگری لـە ئیـسلامەکەیدا بکوژرێ ئـەوە شـەهیدە، پاداشـتێکی گـەورەو نەبڕاوەی لای خوای گەورە هەیـە، بـەڵام گـاورو جولەکـە زۆر سـورن لەسـەر ژیـان‌و ژیانیان زۆر خۆش دەوێت، بەڵام مرۆڤی مسوڵمان ئاینەکەی لە ژیانی خۆی خۆشـتر ئەوێت‌و هەرچیەکی بەسەر بێت لە پێناویدا ڕازیە.

پ : دوای ئەوە کە موسوڵمان بویت چ نەخشەیەکت بۆ داهاتووکێشا؟

- هەندێ کتێبم نوسی لەوانە (بۆچی مـسوڵمان بـوم؟) وە کتێبێکیش لەسەر نـەرم‌و نیـانی سـەماحاتی ئیـسلام، دانەیـەکی تـریش لەسـەر (شـتە داهێنـراوەکـانی مەسیحیەتی نوێ)، وە ژیانی خۆمم تەرخانکرد بۆ بانگ کردنی نامـسوڵمانەکان بـۆ ئیـسلام، وەبەشـداری کردنـی کـردەوەیم بـە بەرهـەم لـە بنیادنـان‌و نوێکردنـەوەی

سۆداندا لە رێگەی رێکخراوی (یەکگرتنی ئیسلامی بۆ گەشە پێدانو ئاوەدانکردنەوەی سۆدان) کە خۆم سەرپەشتی ئەکەم.

پ / کتێبی ابۆچی مسوڵمان بوما گرنگترین ڕووداوەکانی چین؟

- بەراودێکم کردوە لە نێوان ئیسلامو ئاینەکانی تردا، دژایەتی نێوان ئەو ئاینانەی ترم روون کردۆتەوەو دەرم خستوە لە بەرامبەر جێگیربونی ئیسلام، بەراستی ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشامو پێی سەرسام بوون بەرنامەی میراتە لە ئیسلامدا کە بەچ شێوەیەکی رێكو دروست دانراوە، لە ئاینی جولەکەدا یاسای میرات هەیە، بەلاّم ناڕێكو پێکە ناتەواوی زۆر تیایەو دادپەروەرانە نیە، وە لە مەسیحیەتا یاسای میرات هەر نیە، بەلاّم ئیسلام بە شێوەیەکی زۆر ووردو رێكوپێك چارەسەری کردوە، تەنانەت هۆزی (الدینکا) کە من ئەگەڕێمەوە بۆی مەسیحین، چەندەها ساڵ کێشەی بەشکردنی میرات هەبوە لە نێوانیاندا، بەلاّم بە هۆی جێبەجێکردنی یاسای میرات لە ئیسلامدا بووە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکانیان ناکۆکی نێوانیان کۆتایی هات.

پ/ ژمارەی ئەوانە کە دوای مسوڵمان بونت شوێنت کەوتون چەندن؟

- بە فەزڵو رێزی خوای گەورە تاکو ئیستە ژمارەی ئەوانەی کە لە سەر دەستم مسوڵمان بوون گەیشتۆتە ١٥٠ هەزارکەس، هەروەها ٢٥٠٠ لە گەورە قەشەو رێبەرانی نەسرانی، کە هەمویان لە خوارووی سۆدانو لە شاخەکانی نۆبەو ناوچەی ئەنجسنان.

پ / چۆن قەناعەتت بەو ژمارە زۆرە کردوە کە بێنە ناو ئیسلامەوە؟

- زۆر ئاسانە کەوا بکەیت کە نامسوڵمانەکان قەناعەت بە ئیسلام بێنن، چونکە هیچ شتێکی وایان پێنیە، دوای ئەوە بۆم ڕوون کردونەتەوە کە ئیسلام ئاینێکە هیچ گومانێکی تیانیە، ئاینێکە خوا تایبەتیەکی پێداوەو هەر ئەو دینە لای خوایەو قبوڵەو وەردەگیرێت (ان الدین عند الله الاسلام). ﴿ال عمران ١٩﴾ وە دواندنو خیتابی بۆ هەمو مرۆڤایەتیە بەگشتی، ئاینێکە کە چارەسەری هەمو گرفتەکانی ژیان ئەکات، هەروەها هەڵساوم بە نوسینی چەندەها نامە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە مەسیح هەیەو ئەم شتانەم بۆ نوسیون .. خوا تەنیایەو هیچ

هاوەڵێکی نیە، وە خوا سێ بەش نیە بەڵکو تاكو تەنهایە. عیسا علیە السلام مرۆڤێکەو پێغەمبەرێکە، خوا ناردویەتی بۆ گەلەکەی، نە خوایەو نە کوڕی خواشە . . عیسا پێغەمبەری خوایە بۆ نەوەی ئیسرائیل بە تەنها، وە پێغەمبەرێك نیە بۆ گشتی مرۆڤایەتیو ئاینی نەسرانی تەنها بۆ نەوەی ئیسرائیل بووە، وە کوڕی خوا نیە هاتبێتە خوارێ بۆ ئەوەی هەڵبواسرێو ببێتە قوربانی لە پێناو تاوانەکانی مرۆڤو وە گەڕابێتەوە بۆ لای خواو لە لای ڕاستی باوکیەوە دانیشتبێ!! بەڵکو بەندەو پێغەمبەری خوایە.

پ / ئەی باشە هەواڵو بارودۆخی ناهەمواری مسوڵمانان بێزاریان نەکردیتو وای لێ نەکردی کە نەیەیتە ناو ئیسلامەوە؟

– بە ڕاستی واقم وڕما کە مسوڵمان بوم بینی مکە مسوڵمانانی ئیسلام لە ناو خۆیاندا جێبەجێی ناکەن، بە ڕاستی خوای گەورە دوو سەرچاوەی ڕاستو دروستی بۆ ژیانی مەدەنیو سیاسی داناوە کە ئەوانیش قورئانو سوننەتن، بەڵام بە داخەوە مسوڵمانەکان لە ژیانی خۆیاندا جێبەجێی ناکەنو فەرمانڕەوای پێناکەن وە حکومەتەکانیش لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا پابەند نین بە یاسای ئیسلام، لەبەر ئەوە لاوازی مسوڵمانان لە ئەنجامی دورکەوتنەوەیان لە ئاینەکەیانەوە دروستبوە، وە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دینەکەیان ئەوا بە هێز دەبنەوەو سەرکەوتوو دەبن.

پ/ حەز ئەکەین باسی هەندێ لەو چالاکییەمان بۆ بکەیت کە بەشداریت تیاکردوون دژی ئیسلام؟

– لە ساڵی ١٩٨١ کۆنگرەیەکی نهێنی لە بنکەی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لە ویلایەتی تەکساس گیرا، من یەکێك بووم لە ئەندامە کاراکانی ئەو کۆنگرەیە، دروشمەکەی بریتی بوو لە: "چۆن بەرەنگاری شەپۆلی ئیسلامی ببینەوە؟" لەوێدا وڵاتە ئیسلامیەکانمان جیاکردەوەو پۆلێنمان کردن بۆ ئەو وڵاتانەی کە زیاتر کاریگەری ئیسلامیان تیایەو پێشکەوتوترن وەك (میسرو عیراقو پاکستان)، وە وڵاتانێکیش کە زیاتر خۆشەویستی ئیسلامەتیان هەبێت وەك (ئێرانو ئەفغانستانو تاجکستانو شیشانو سودانو تشادو تورکیا).. کۆنگرەکە هەروڵاتەی بە تەنها خستە ژێر دیراسەو لێکۆڵینەوەی تایبەتەوە، لێکۆڵینەوەکەش بۆ ماوەی وەڵامدانەوەی پرسیاێکی گرنگ بوو ئەویش: چۆن بچینە ناو ئەو وڵاتانەوەو کار

بکەین بۆ بە گاور کردنیان؟ وە ئەگەر لەو مەبەستەمان سەرکەوتو نەبوین‌و توشی نسکۆ هاتین، ئەوا کەنیسە هەڵئەسێت بە نانەوەی ئاژاوەی ناوخۆیی، ئەمەش بە کرداری کەنیسە بە یارمەتی ولاتانی ڕۆژئاوا پێی هەڵساو سەرکەوتوبوون لەو خاڵەداو توانیان کە فیتنەو ئاژاوەی ناوخۆیی لە ئەفغانستاندا دروست بکەن‌و یارمەتی هەمو کۆمەڵە شەڕکەرەکانیان ئەدا تاکو دژایەتی یەکتری بکەن.. هەروەها لە ئێراندا هەوڵیاندا بۆ ئەوەی کە سوننەو شیعە بکەن بە گژیەکاو یەك نەگرن، وە ئەو تەم‌ومژو ناکۆکی‌و تایەفەگەرییەی کە لە ئێران‌و ولاتانی کەنداودا هەیە ئەنجامی هەوڵ‌و تەقەلای ئەو ڕێکخراوە کەنەسیانەیە، وە کاتێك هاتنە سۆدان بینیان کە ئیسلام ئاینی بەرچاو و بلاوە لە خواروی سودانا، سەیریان کرد کە سودان دراوسێی کۆمەڵێك ولاتی ئیسلامیەو کاریگەرییان هەیە لەسەر خەڵکەکە، فەرمانڕەوای ئەو کاتەی ئینگلیز هەڵسا بە دانانی یاسایەك بە ناوی "ناوچە کەفالەت کراوەکان" کە بە پێی ئەو یاسایە قەدەغە بوو خەڵکی سەروو بچێتە بەشی خواروو، وە خەڵکی خوارووش بڕوات بۆ ناوچەکانی تر، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن کە مەسیحیەت بە تەواوی لە خواروودا بلاو بکەنەوەو ئیسلامیان تیا ڕیشەکێش بکەن، ئەم یاسایە کاری پێئەکرا تا سەردەمی سەربەخۆی ١٩٥٦، وە ئەوەی ویستیان کردیان، ئێستاش کەنیسە هەمو هەوڵێکی ئەیەوێت کە لە دەسەلاتی ئیسلامی بدات لە سۆداندا، چونکە باوەڕی وایە کە بەرامبەر شەپۆلی تەنسیری وەستاوە.

پ /ئەی نەخشەی کەنیسە چی بوو بۆ ئەو ولاتانەی کە خسبونیە ژێر پۆلێنی پێشکەوتوتری ولاتەکان لەو کۆنگرەیەدا کە لە ساڵی ١٩٨١ بەسترابوو؟

- لەو ولاتانەی عیراق‌و میسرو پاکستان، ڕۆژئاوا بە ئیعازی کەنیسە خستنیە ژێر وردبینەوە تاکو بتوانێت حوکمیان بەسەردا بکات، ئەوەش لە ڕێگەی دروستکردنی گرفت‌و کێشەی ناوخۆیی لە لایەك‌و خولقانی ناکۆکی‌و شەڕو بێ متمانەیی لەگەڵ دراوسێکانیدا لەلایەکی ترەوە، مەبەستەکەش وەستان‌و پەککەوتنی پێشکەوتن‌و گەشەسەندنی زانستی‌و تەکنەلۆجی ئەو وولاتانە بو ئەویش لەبەر (خزمەتی قەوارەی زایۆنی)، وە بەتایبەت لە عیراقەوە، سەرانی داگیرکەری کۆنی عیراق بەریتانیا هاتن بۆ لای سەدام‌و بەپێی ئەو نەخشە کۆنانەی کە هی سەردەمی

داگیرکردنیان لایان مابۆوە، توانیان سەدام قەناعەت پێبکەن کە کوێت بەشێکە لە عیراق‌و پارێزگایەکی عێراقی بووە لە کۆندا هەڵیان نا تا لە سەر داگیرکردنی کویت سور بێت، ئەمریکاش دەورێکی زۆر گرنگی هەبوو لە هلنانی سەدامدا بۆ داگیرکردنی کوێت، ئیتر دوای ئەوەی سەدام دەستی گلا لە داگیرکردنی کوێت‌و بەوشێوەیەی کرد کە ئەمریکا ویستی، ئەمریکاش ڕێگەی بۆ خۆش بوو تا دەست بکاتە جێبەجێکردنی چەندەها سیناریۆ کە ئیستە لەبەر چاومانەوە هەندێکیان دەبینین.

پ /چ دەورێکت پێسپێراوە کە پێی هەڵسیت، وە ئەو لایەنانە چی بوون کە کارت لەگەڵ ئەکردن؟

- ڕاسپێری کۆنگرەکە ئەوەبوو کە پێویستە عیلمانیەکان بەکار بێنین بۆ کەم بونەوەو بەربەست کردن لە ئیسلامیەکان لە جیهانی ئیسلامدا، ئەویش لە ڕێگەی پاڵپشتیکردن‌و یارمەتیدانی کۆمەڵە عیلمانیەکان، وە پاڵەپەستۆ کردنە سەر یەکێك لە وولاتە ئیسلامیەکان کە سەرانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە گرتوخانەکاندا توند بکات، تەنانەت کار بگاتە ئەوەش کە سەرانیان لە ناوبەرن‌و تەسفیەیان بکەن .. جا لەم بوارەدا دەوری من کورت کرابۆوە لەوەی لە واسیتە بم لە نێوان کەنیسەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا تاکو بتوانین یارمەتی عیلمانیەکان بدەین دژی ئیسلام، هەستام بە گەیاندنی بڕی ملیۆنێك‌و ۸۰۰ هەزار دولار لە کەنیسەی هۆڵەندیەوە لە شاری ئەمستردام بۆ کەنیسەی میسر تاکو بەسەر سەرانی عیلمانی میسردا بیبەخشن بۆ ئەوەی کە ئیسلامیەکان بگرن‌و ئەگەر پێویستیشی کرد تەسفیەی لاشەییان بکەن، بە تایبەت بەرامبەر کۆمەڵی برایانی مسوڵمان (الاخوان المسلمون) ئەم پارەیەش لە نێوان ساڵەکانی (۱۹۹٦ - ۱۹۹۸) تەسلیمم کردووە، ئینجا یەك لە دوای یەك ڕاپۆرتەکانمان پێئەگەیشت، وە ئەو کۆمەڵانەش کە ئەم کارانەیان ئەنجام ئەدا هیچ کامیان بەوی تریان نە ئەزانی.

پ /کێ بوون ئەو کەس‌و لایەنانەی کە لەو کۆنگرەیەدا بەشداربوون؟

- نوێنەری کەنیسەی وڵاتە عەرەبیەکان‌و ئیسلامیەکان، وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، تەوەرەی کاری کۆنگرەکەش بریتی بوو لەوەی کە چۆن کەنیسە بتوانێت زاڵبێت بەسەر وڵاتە عەرەبی‌و ئیسلامیەکانداو کاریان تیا بکات‌یان لەژێر پەردەیی

پارمەتی دانی مرۆیی، یان ئەگەر لەو ڕێگەیەوە ئەگەر بەروبومی نەبوو لە ڕێی پاڵەپەستۆکردنە سەر حکومەتەکان وەك باسمکرد.

پ / ئایا وا نابینیت کە ئەم قسانەی تۆ ئەیکەیت پڕ مەترسی بن بۆتو ژیانت بخەنە مەترسیی مردنەوە؟

- بەڵێ هەست بەوە ئەکەمو ئەزانم، بەڵام ویستم کە چەند نهێنیەکی کەنیسە کە لە دوتۆیی لاپەڕە شاراوەکانی خۆیاندایە دژی ئیسلام ئاشکرایان بکەم، بە تایبەت دوای ئەوەی کە بومە مسوڵمان هیچ لە مردن ناترسم بە تایبەت ئەگەر بەرگری بێت لەم ئاینە پیرۆزە.

پ/ کام وڵاتی عەرەبیو ئیسلام ڕێکخراوو بانگەوازە بەگاورکردنەکانی تێدایە؟

- زۆربەی وولاتە عەرەبیو ئیسلامیەکان شەپۆلی بەهێزی بە گاور کردن گرتویەتیەوە، بۆ هەر وولاتێك بەرنامەی تایبەتیان هەیە، ڕۆژئاوا ئەتوانێت چەندێك کەنیسەی بوێت لەو وولاتانەدا دروستی بکات، ئەویش لە ڕێی چەندەها شێوازو هۆکاری جیا جیاوە.

پ/ لە چوار چێوەی ئەوەی کە ناو ئەبرێت بە (ئیرهابی نێودەوڵەتی) دیارە کەوا نەخشەیەک هەیە بۆ لێدانی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان ... سیناریوی ئەم نەخشەیە چۆن ئەبینیت؟

- پەرەسەندنو زیادبونی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان کەنیسەی بێزارو بێتاقەت کردبوو، لەبەر ئەوە هەڵساون بە ئەنجامدانی چەند بەرنامەیەك بۆ نەمانی کاری خێرخوازی ئیسلامی لەوانە:

- ئاراستەکردنی وڵاتە ئیسلامیەکانو ئاگادارکردنەوەیان بە نەهێشتنو بن برکردنی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان.

- کارکردن بەهەمو شێوەیەك بۆ ڕاوەستانو پەکخستنی ڕێکخراوە خێرخوازە ئیسلامیەکان. تاکو گۆڕەپانەکە چۆڵ ببێت بۆ ڕێکخراوە کەنەسیەکانو بتوانن بە ئارەزوی خۆیان هەرچی ئەیانەوێت بیکەن.

- پەرەپێدان‌و گەشەپێکردنی ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکان کە لە ژێر پەردەی ڕێکخراو مرۆییەکاندا کار ئەکەن، تاکو هەڵسن بە کاری سیخوڕی‌و هەواڵنێری‌و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو وڵاتانەی کە کاریان تیا ئەکەن.
- وە ئەگەر کەنیسە سەرنەکەوت لەوەدا هەرەسی هێنا، ئەوە هەندێ لە شوێن کەوتوە هەڵقە لەگوێکانی خۆی بە کار دێنێ لە دروستکردنی‌و هەڵگیرساندنی فیتنەو ئاژاوەی ئەهلی ناوخۆیی، تاکو ئاسایش‌و هێمنی تێك بچێت ببێتە هۆی دەست تێوەردانی وولاتە ڕۆژئاواییەکان.

پ/چ پەیامێکت هەیە کە پێت خۆش بێت بیگەیەنیت بە مسوڵمانان؟

- بۆ خوشك و برا مسوڵمانەکانم ئەڵێم: خوای گەورە نیعمەت‌و بەختەوەری ڕشتوە بەسەرتاندا بەم ئیسلامە دور مەکەونەوە لێی‌و کەموکوڕی تیامەکەن، چونکە بە ڕاستی ڕۆژئاوای مەسیحی هەمو مەبەستێکی لە ناوبردن‌و پوکانەوەی ئیسلامە، ئەم ئیسلامەش گەورەترین دەسمایەو سەروەری ئێمەیە، ئەگەر ئیسلامتان لە ژیانی خۆتاندا جێبەجێکرد ئەوە بە هێز ئەبن‌و ڕۆژئاوا لێتان ئەترسێت، تەنها ئەوەی کە لەسەرتانە ئەوەیە کە گرنگی بدەن بە زانست‌و زانیاری تا بتوانن بنەمایەکی پتەوو بەهێز دروست بکەن‌و بتوانن بە شێوەیەکی ماددی‌و مەعنەوی بەرەنگاری ئەو هەمو هێرشە ببنەوە کە ڕوو بەڕووی خۆتان‌و ئاینەکەتان ئەبێتەوە، وە بە بیروڕای من ئەگەر مسوڵمانەکان ١٠٪ لە ئاینەکەیان جێبەجێ بکەن، ئەوە زاڵ ئەبن بەسەر ڕۆژئاوادا وە زۆربەی گرفتەکانمان ئەبڕێ، دەی چۆن ئەبێت ئەگەر هەمو ئیسلام جێبەجێ بکەین!

# سەرباقی چاکەکاری

هەندێ پیاوەتی لەم دونیای فانیەدا دەبێتە ناپیاوی، پیاو ناچار ئەبێت نەیکات، ڕۆژێك لەگەڵ کابرایەکی سایەق بەڕێگەیەکدا ڕۆشتین و سەیارەکەمان جێگەی چەند کەسێکیتر دەبۆوە، بەلاّم لەڕێگە هەرکەسێك دەستی ڕادەگرت، ئەم سایەقە وەلاّمی نەدانەوەو گیفەی ئەکرد بەلایاندا، خۆم پێنەگیرا.. وتم:

خۆ جێگەمان زۆرە بۆ ئەو نەفەرانە هەڵناگریت.. هیچ نەبێت قازانجێکی مادی ئەکەی ئەمەسەرباقی خێرەکەی، یان هەر ئەتوانی بەخێر سەریان بخەیت،

سەیرێکی کردم و وتی: خێر.. ئەو خێرو بێرەم لەخوا ئەوێت..

وتم: کاکە گیان تۆ هەنگاوی بۆ بنێ ئەوسا داوای خێرو چاکە لەپەروەردگار بکە.

وتی وادیارە تۆ شارەزانیت بەخەڵکی ئەم سەر ڕێگاو بانانە.. ئەمانە شایستەی خێرو پیاوەتی نین لەگەڵیاننا بکەم.. درێژەی نەدەمینێ بەم ڕوداوە ڕازی کردم کەلەسەری ئەڕۆموتی:

کاکە ،لەم ڕۆژانەدا برادەرێکمان لۆرییەکی گەورەی پێدەبێت دەڕوات بۆ هێنانی چەوولم لەو غەسالانەی نزیك دەربەند،

لەڕێگا دو کوڕی گەنج دەستی لێڕادەگرن، ئەمیش لەدڵی خۆیدا دەڵێ: خۆمن هەر ئەڕۆم بۆ سوار نەبم.. سواریان ئەکاو لەڕێگا دوای نیو سەعاتیەکێکیان هاواریان لێهەڵئەستێ و دەڵێ: بۆ خاتری خوا ڕابگرە، ئەو هاوڕێیەم مرد.. توخوا سەیارەکە ڕابگرە کاکە گیان.

سایەقەکەش لۆرییەکەی ڕادەگرێ و بەپەیژەی قەراغی گەلابەکەدا سەرئەکەوێ کەتەماشا ئەکات لەناو لۆرییەکەدا کوڕەکەی ڕەفیقی تاساوەبرادەرەکەشی بەپێڵاوەکانی مارێکی گەورەی کوشتووە.. ئەمە چی یە؟! لەکوێوە ئەم مارە بۆتان هات.، خێرا خۆی ئەخاتە ناو گەلابەکەوە،

کوڕەکەی هاوڕێی دەڵێت: هەردوکمان ڕاکشابوین، ئەم هاوڕێیەم چاوی چووە خەو منیش سەیری ئاسمانم ئەکرد.. لەئاسمانەوە هەڵۆیەك مارێکی بەقاچەوە بوو.. ئەم مارەی

ئەیبینی لەناستی ئێمە لەقاچەکانی بەربۆوە کەوتە ناو گەلابەکەوە.. لەگەڵ کەوتنە خوارەوە پێوەدانی بەهاورێکەمەوە یەك بوو.منیش خێرا راپەریمو بەپێلاوەکانم کوشتم،. سایەق لۆریەکە وتی تانەو کاتەش هەڵۆکە بەئاسمانەوە دەسوڕایەوە.
خێرا کورەکەمان لە لۆرییەکە داگرتو فریاکەوتنی سەرەتایمان بۆ کرد، بەلام بەداخەوەکوڕە گەنجەکە وەفاتی کرد ئەو برادەرە سایەق لۆرییە درایە دادگا.. ئەمە دوای گرتنو نارەحەتی، بەلام ئەو کوڕەی ترو مارەکەو جێگە برینی کوڕە مردووە توانیان قەناعەت بەماڵی مردوەکە بکەنو سایەق لۆری ئازاد کرا..
سەیرکە.. کاکی خاوەن لۆری حەزی لەخێر کرد، کوڕە گەنجەکان حەزیان لەکاسبی کرد، مارەکەش لەو ئاسمانەوە نەبووە نسیبی ئەو هەڵۆیەبەنسیبی ئەو کوڕە گەنجە بو هەرچی لەلای خواوە بێت خۆشە. ﴿انا الله وانا الیە راجعون﴾ .. ﴿کل من علیها فان﴾

# پشتیوان بەخوای باڵا دەست

ئەو مرۆڤانەی دوێنێ گوزەریان کرد لەسەر ئەم ئەستێرە گەشەی زەوییە ئەمڕۆ دوعای خێریان ئاراستە دەکەین کاتێك ئێمەش ئەمڕۆمان بەجێهێشت نێوەی سبەینێو دۆسیەی ئاگاداری کارو کردەوامان بنو لە دوعاو نزای خێر لە یادمان مەکەن.. چونکە ئەوانەی دوێنێ بۆ نزاو پاڕانەوەی باوانیان هاتنەبونو بەهەوڵو ماندوبونی خۆیان ژیانیان گوزراندو بونە هۆکاری کۆڵنەدانو کاری جوانو ڕەنگین لە دینو دنیادا.
بەڵێ نوێژەکانیان.. دوعاو پاڕانەوەی دوای نوێژەکان.. کاری جوانو شایستە.. یارمەتی هەژاران بە سەروەتو سامانەکەیان.. هاوکاریو بەدەمەوە چونی هەمو مرۆڤێك.....
ئەگەر بیر لە خۆت بکەیتەوە لە مەبەستی داهاتوم تێدەگەیت، ئایا هیچ کاتێك توشی نارەحەتی بێئومێدی نەبوی لە کاروباری ڕۆژانەی تەمەنی کورتی ژیاندا.. بەدڵنیاییەوە توشبوی بەڵام ئایا وازت هێناوەو کۆڵتداوە؟ یان بەردەوام بوی بۆ گەیشتن بەو هیوایەی کە لەو کارەتا هەوڵت بۆداوە.
نمونە: ڕوت لە فەرمانگەیەك کردووە، کارەکەت بۆ نەکراوە، بێهیوا بوی بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژەیان یان ڕۆژانی ڕابردو کاری چاکەت ئەنجامداوە لەو لاوە کەسێك یان ناسیاوێکی نزیك دوای چاکو چۆنی هاوکاری کردویتو کارەکەت سەرکەوتو بووە.
یان زۆر کات لە نمرەی قوتابخانە نا ئومێدو دڵ ڕەقبوی بەڵام مانگی داهاتو یان مامۆستا پرسیارەکانی خۆش بووە یان هۆکاری سەعی کردنو کۆششی ئاسان بووە.. یان هیوایەکی گەش بومتە هۆکاری سەرکەوتنو پلەیەکی زۆر باش لە مانگی ڕابردوو ئەگەر خراپتربوی بەکارو کردەوەی خۆتا بچۆرەوە.. ئەزانی تەنگەژەکە لە کویادایە بۆیە سەرکەوتونەبوی، لە ساڵانی ڕابردودا مرۆڤەکان زۆر هاوکاری یەکتریان ئەکرد... زۆر بەدەم یەکەوە بون لەکارو کردەوەی ڕۆژگاردا.. خوای گەورەش قەناعەتی پێبەخشیون خوای باڵا دەست بەلادان لە بەڵاو نارەحەتی دنیا بە دوری کردون..

مەلا شێخ سەعیدی تەوەکەلی دەفەرموێت:
لەشاری بانەوە بەرەو گوندی تەوەکەڵ دەگەڕامەوە، کەرێکم پێبو پێنج تەنەکە ناردم لێنابو.. دنیا هەورو هەڵاو بارانـاوی بـو وەرزی زسـتان بـو زەوی وشـکی تیـا نـەمابو، لەبـەرکانی ناڵەشـکێنە نزیـك گونـدی نێـزەڕۆ کەرەکـەم لـەو قـوڕو چـڵپاوەدا کـەوت و هەرچەندم کرد نەمتوانی ڕزگاری بکەم و بـەرز بێتـەوە، ناچار بارەکەم لێکردەوەو لەو لاوە دامنـا، گوێدرێژەکـەم هەسـتانەوەو هاتمـە ئـەم لاوە تۆزێـك سـەیری دنیـام کـرد تـا کەسـێك پەیـدا بێـت و هاوکـاریم بکـات بـۆ بارکردنـەوەی بـەڵام ئێـوارە درەنگـان بـوو.. گوریس و کەرەسەکانم لە گوێرێژەکە کردەوە ناردەکانم جوان داپۆشـی تـا بـەیانی بێمـەوە بـۆی و بیانبەمـەوە لەگەڵ کەسێکی‌تردا چونکە لـە توانامانـەبو باریـان بکەمـەوە، زۆربـە نائومێدی کەرەکەم پێش خۆمداو چەند هەنگاوێ دورکەوتمـەوە بـەرەو مـاڵ بڕۆمـەوە... زۆریشم مابو بۆ ماڵەوە لە دڵدا هەر داوای دوعاو یارمەتی یەزدانیم ئـەکرد، بـۆ هاوکاری ڕۆیشتم چەند هەنگاوێکی ترو کاتێکم زانـی یـەکێك بـانگی کـردم: شـێخ سـەعید.. شـێخ سەعید ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ وەرە بایارمەتیت بدەم، کاتێك ئاوڕم دایەوە پیاوێکی نەناس بوو. بەلامەوە سەیر بـو ئـەو مـن دەناسـێ و مـن ئـەو ناناسـم بڕیـاری هاوکاری کردنیـدام زۆربەخۆشی و بەتوانای ئـەوەوە گەڕامـەوە بەهـەردوکمان بـارە ناردەکـەمان بـارکردو زۆر بەخێرایی گوریس و قەیاسەی توندکردو چووە ئەو دیو گوێدرێژەکەوە وتی:
شێخ سەعید قەیاسەکە بکێشەو توندی بکە، قەیاسەکەم توند کـردو سـەرم هـەڵبڕی پیـاو دیار نەما.. هەرچەند گەڕام بۆ جێ پێکانی دیار نـەبو... بـار بارکرایـەوە.. خـوای گـەورە ئـەو زاتـەی نـاردو هاوکـاری کـردم و بەخۆشـییەوە بـەرەو مـاڵ گەڕامـەوەو لـەو کـارو تەنگەژەیە ڕزگارم بوو، دڵنیابوم کە خوای گەورە ئەو زاتەی نارد بۆ هاوکاریم لـەو کـات و سات و ئێوارە درەنگەدا.. سوپاس بۆ خوا ...(خارق العادة) .

# هیمەت بەرزی بۆ منی ئافرەت
# پاداشتی ئەبێ چی بێ؟!

لەگەڵ دەست بەرز کردنەوەم بۆ دوعای خێر، ئەسرین بە گۆناما دێتە خوارێ بۆ ئەو خوشکە بەڕێزەو خوشکانی هاوشێوەی ئەوحەزم کرد لە نزیکەوە ئاشناتان بکەم بەو تەنگ و چەڵەمەو گیرو گیرفتانەی کە ڕۆژانە دێتە ڕێگەی ئەو خوشك و دایکە بەڕێزانەی کە بەهۆی باڵاپۆشیانەوە.

کە بەهۆی خۆداپۆشین و خۆپاراستن لە سەیری کەسانی گورگ و ڕێوی ئاساوە توشیان دەبێت، ئەمانە خۆیان بۆ خوای گەورەو پەیامەکەی ئیسلام و مرۆڤایەتی یەکلایی کردۆتەوە.. بەڵام بەچکەو شاگردەکانی ئیبلسی ئەفرەت لێکراو لە بۆسەو زاڵگەکاندان بۆ بریندارکردن و شێواندنی کەسایەتی بەرزو پیرۆزی جوانیان کە لە بەرزترین بەهای مرۆڤایەتیدا خۆیان دەبیننەوە.

ئەوە ماوەی چەند ساڵێکە هاوسەری (R)ی مێردم و ببومە خاوەنی دوو کوڕی جوانکیلە کەم کەم و ئەختە ئەختە نوێژەکانم ئەنجامدەدا، ئەگەر دڵم بە هەزاری یان کەسێکی لانەواز بسوتایە بە گوێرەی توانا هاوکاریم ئەکرد،

لە ماڵی باوانم کەمێك لە پەیامی پیرۆزی مرۆڤایەتی ئاشنا کرابوم بەڵام وەڵامی چەندین و چەندانی ترم لێببونە تەنگ و چەڵەمەو گرێ کوێرە..

ئەوەی بیرم لێنەکردبۆوە لە سەرەتایی ژیانی هاوسەریمەوەو قسەمان لێنەکردبوو باسی دینداری بوو.. هاوسەرەکەم دەیویست:

نان و چێشتی گەرم و ئامادە لە کاتی ژەمەکاندا، بەخێرهاتنی میوان و جوان بەڕێکردنیان، خاوێنی ماڵ و جل و بەرگ، خزمەتی هاوسەرو منداڵەکان، چونە دەرەوە بۆ گەشت و گەڕان، ئەو عەلاگانەی کە دەیهێنانەوە بە جوانی بخرێتە بەردەستیان، ڕاگرتنی دڵی دایك و باوك و هاوسێکان و....

بەڵام لەناو هەمویاندا پابەند نەبون بەیاسای شەرع غیابی هەبوو، خۆی دیاربوو کە هاوسەرم لە بنەماڵەو کەسایەتی دینداری تۆکمەو خواپەرستدا گەشەی نەکردبوووبالای بەرزو کاری باش‌و بڕوانامە لە گیرفان قایم کراو زۆربەی هیواو ئاواتی ئەوو من‌و کچانی تریشبوو،

لە مانگی ڕەمەزان لەگەڵ خەسو خەزورم مانگی پیرۆزمان پیرۆز ڕادەگرت‌و بەو کەناڵە لاوازەی تەلەفزیۆنی کەرکوك هەندێك شت فێردەبووین‌و وامان دەزانی ئیسلام‌و ئیسلامەتی ئەوەندەیەو تەواو،لە هاوڕێ‌و ناسیاوانەوە هەندێك نهێنی ئاین ئاشنابوین بەڵام کەم‌و کەم ئەزموون بوین هاوسەرم تامی تامی خواردنەکانی پێدەکردم..

لەگەڵ تەواو بونە مانگی ڕەمەزاندا (سەرپۆش‌و تەسبیح‌و بەرماڵ‌و....) خوا حافیزیان دەکرد.. ئەگەر یەکێك باسی لە شەشەلان بکردایە خەسوم دەیوت: (ڕەمەزانمان بە ڕویەکی جوانەوە گرت، نۆرەی شەشەلانمانە)..

ئەمانە درێژەی هەبوو هیچ گرفتێکمان نەبوو تەنهاو تەنها بەسادەیی ئاینمان گرتبو..وەرزی هاوین بوو بەکارێك ڕۆیشتمە دەرەوەو لەسەر شەقامی (برایم پاشا) بەرەو خەستەخانەی شیرەکە هەنگاوم دەنا جل‌و بەرگەکانم زۆر سەرنج ڕاکێش بوون.

تازە مۆدێلی تەنورەی کورت‌و فەتحەی دواوە داهاتبۆوە، منیش لێم کردبو.. بەلای دوو پیاودا ڕابوردم.. هەستم کرد کە زۆر سەرنجم دەدەن.. ئەو فەتحەیەی دواوە زۆرێك لە ڕانەکانی دەردەخست.. ئەمە کورتیەکەی سەرباربێت..

هەنگاوەکانم خێراتر کردو دوو پیاوەکەش بەدوامدا هاتن.. ئەوەندە لێم نزیك بوبونەوە خەریك بوو دەستیان دەگەیشتە سەر پشتم.. بەوە باشبوو خێرا خۆم کرد بە دەرگای خەستەخانەکەدا، هەستم ڕاگرت کە ڕزگارم بووە،دوای کارو کردەوەکانم هەستم بە بێزاری کرد بەڵام ئاسایی بو لەلام.. بۆ نانی نیوەڕۆ هاوسەرەکەم گەڕایەوەو لە بازاڕ وەك هەندێك ڕۆژ نانی خواردبوو.

منداڵەکانم فێری نیوەڕۆ خەو کردبوو، نانیان خواردو بەخۆمەوە چوینە دەریای خەوەوە نازانم چەند بوو خەوم لێکەوتبوو لە هاوارو ناڵەی‌و گریانی خۆم بەخەبەر هاتم..

خەسوم لە ژوورەکەی ئەولا هاتەلام.. منی بینی بەو حاڵە ناڵەبارەوەو هەمو گیانم شەلاڵی ئارەق بوبو، ڕەنگی بزڕکاو هەناسەی توندو هیلاك.. لە ڕوخسارما دیاربو.

پرسی: ئەوە چییە کچم.. ئەوە بۆ وات لێهاتووە!! چیبووە!!
هێزم دایە بەر خۆمو وتم: خەوێکی زۆر ناخۆشم بینی..
خەسوم بە سەرسامییەوە وتی: خەوی چی.. بۆ خەو وا لە ئینسان ئەکات.. یا الله .. یا الله
..

تۆزێك سەرخۆم هاتمەوەو لێوانێ ئاوم خواردەوە.. تەنگە نەفەسیو هەناسە سوارییەکەم کەم بۆوە بە لارۆ لارۆ چومە بەر ئاوێنە درێژەکەی ژووری میوانو سەیرێکی دەمەو چاو قۆڵو قاچەکانم کرد.. بڕوام نەکرد.. جوان دەستم هێنا بە هەمو لاشەما تەواوە ئەمە خەوبو.. یاخوا کەس خەوی وا ناخۆش نەبینێ.
تێر خەو نەبوبوم حەزم ئەکرد بنومەوە بەڵام نەموێرا، هەستم نەکرد ڕاکێشاوم بە هەمان شێوە لە دیمەنی یەکەمی خەوەکەم ڕاچڵەکیمو بەئاگا هاتمەوە.. ئیتر نەموێرا چاوم لەیەك بنێمەوە. ئای!! کە ناخۆش بو .. چومە دەرەوە لەو ژورەدا، لە هەیوانەو حەوشەکە تۆزێك سەیری دیمەنی ئەوناوەم کرد.
وەك زەنگێك لێبدەیت.. بە ئاگا هاتمەوە.. چومە ئەرماوەکەو دەستنوێژێکم گرتو ئەوە یەکەم نوێژ بوو لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە کە ئەنجامەدا.. وا ڕاهاتبوم کە لە نوێژ دەبومەوە یەکسەر لە چکەکەم لەسەرم دەکردەوە قژم خاو دەکردەوە نەبادا دەقی لەچکەکەی گرتبێ.. بەڵام ئەم جارە بە پێچەوانەوە هیچ حەزم ناکرد لەچکەکەم لەسەر بکەمەوە.. بەو بەرگە نوێژییەوە سەعات پێنجی لای عەسر میوانێکمان هات.. کە لە ئاینو باوەڕدا فاڵ بوبوو، خۆی بە ئیماندارێکی زۆر باش دەزانی.. بە ڕاستی واشبوو..
لە حاڵەتی نامۆیی خۆم دووامو لە نوکەوە خەوەکەم بۆ گێڕایەوە ..
ئەویش وتی: بۆم باس بکەرەوە..
بە شەرمێکەوە وەك یەکەم جار دەستم کردەوە بە گێڕانەوەی.. هەرچیم دیبو باسمکرد: لە خەونەکەمدا بە ڕێگادا گوزەرم دەکرد هەستم کرد قاچو قۆڵو ڕانەکانم تەڕبون.. دەمو چاو شانو ملم ئەکزێنەوە.. هەستم بە بۆنی ناخۆش دەکرد، لە پڕ سەرنجم لە دەستو قۆڵم دا سەیر ئەکەم هەموی بوە بە دڵۆپە ئاو بڵقە ئاوی زەردی ناشرینی پڕ لە کێمو جەراعەتو خوێنو پیسی.
دڵم داخورپا.. بەڵام کە سەیرم کرد ڕانو قاچەکانیشم بە هەمان شێوە بونەتە یەك پارچە گۆشتی دارزیوی بۆگەنی پیس.. دڵۆپ دڵۆپ ئاو بە ڕانو ئەژنۆکانمدا دێتە

خواریێو ئەو پیسیو جەراعەتە دەچێتە ناو پێلاوەکانمو لەگەڵ خۆڵی شەقامەکە بە جێدەمێنێ.. لە سەر شۆستەی قەراغ شەقامەکە جێگە پێم بە جێدەماو ووردە ووردە هەستم بە کرمو دارزینو داخوران دەکرد،لە خەونەکەما زۆر دڵتەنگ بوم هەستم بەوە ناکرد واقعی نەبێت، بەڵکو زۆر لە واقعیو راستی بوو، زۆر ئەترسام زۆر دڵتەنگ بوم.. زۆر لە خۆم بێزارو شەرمەزار بوم. هاتە دڵمەوە سەردانی دکتۆرێك بکەم .. بەڵام پاش کەمێك پەشیمان بومەوە، بەڵام ئایا دەبو بەو حاڵەوە هەنگاو بنێم.. دەبو لەم داخورانو کێمو جەراعەتو پیسیەدا ژیانی سادەیی رۆژانە بەسەر ببەم یان دەبو بە دوای چارسەرێکدا بگەرێم، لەو خەوە ترسناكو خەمبارو ناخۆشەدا لە دورەوە هەستم بە کانیو ئاوێكو سێبەری خۆش کردو هاتە دڵمەوە بچمە سەریو تۆزێك خۆم دابشۆمو پاکژ ببمەوە..

بەڵام چەند هەنگاوم ئەناو بەرەو رووی دەرۆیشتم ئەو دورتر دەبۆوە، ناچار بە زەلیلیو بە ئێشو ئازارو ماندو بونو لاشەی پیسەوە لە جێگەی خۆم وشك بومو نەمتوانی جوڵە بکەم .. زۆر نیگەران بوم، زۆر ماندو شەکەت بوم.. بەڵام چارەسەرم نەبوو لە دورەوە ئافرەتێکی رێكو پێکی دینداری هاوسێمانم دەبینی لەسەر ئەو کانیو ئاوە بەڵام من منێکی دارزاو نەخۆش هێزی پاکانم نەبوو.. زۆر گریام .. زۆر نارەحەت بوم .. زۆر شڵەژام.. زۆرو زۆری تر هەستم بە ئێشو ئازاری جەستەو لاشەم ئەکرد.. زۆر پەشێمان بومەوە لەو حاڵەتەی رۆژانەیەم.. بڕیارم دا کە بۆ چارەسەر بگەرێم بۆ دەرمانو دەرمانخانەی پاکیزەیی بگەرێم..

بەو ئێشو ئازارو کێمو جەراعەتو ئاوو زڵ زڵەیەوە کە لەلاشەم دەچۆڕا بە خەبەر هاتم.. هەمو گیانم دەلەرزی هەمو هەستو ئەستێکم تاسابون.. لە نێوان ترسو بیمدا گوزەرم دەکرد.. تا نیو سەعات دوای بە ئاگا بونەوەش هەستم بە بێزاریو کاسی دەکردەوە.

کەزانیم خەو بو راستی نەبو زۆر کامەران بوم.. زۆر خۆشحاڵ بوم بڕیارم دا کە هەوڵبدەم لەو (سەیرکردنی نامەحرەمانە) خۆم بپارێزمو هەوڵبدەم بگەمە ئەو ئافرەتو خەڵکانەی کە لەسەر کانیو ئاوە خۆشەکە بون..

ئیتر بڕیارمدا بڕیارێك کە گەڕانەوەو پەشیمان بونەوەی تیا نەبێتو بڕیارێك گەر تەنها ماوەمەتەوە کاری بۆ بکەم.. ماندو شەکەت ببم.. کۆڵنەدەم.

ئەمە بۆ ئەو کاتەو بۆ دوای ئەو تاسانە ئاسایی بوو بەڵام لە واقعو کاری جدیدا ئایا کۆڵدانو ڕوخان ئاکامی دەبێت؟

یان خۆڕاگریو هەستانەوە ئاکامی گەشی دەبێت؟

ئەمەی باسمکرد نەقەڵەمو نەهەستو زمانو چاو ناتوانێت یەك چرکەی ئەو هەمو ناخۆشیانە چارەسەر بکات.. ئای کە نارەحەتو ناخۆشبو.. دڵنیام ناتوانن بۆ ساتێکی ناخۆشی، خۆشی دروستبکەن.. بڕیارێك کە توشی ئەو خەوە ناخۆشەو ئەو ئاکامە نارەحەتە نەبمەوە.. بڕیارێك کە گەڕانەوەی تیا نەبێتو دوای هەمو نارەحەتی وناخۆشیەك خۆشی بەدوادا بێت.

خزمە نزیکەکەم وتی: بزانە چ گوناهێکت ئەنجامداوە یان بە نیازی چ تاوانێکیت، خوای گەورە ئاگاداری کردویتەوە..

ئەو زۆری پێخۆش بوو کە کەسانی من ئاسا بۆ لای پەیامی خوداییو خزمەتی مرۆڤایەتی هەنگاو خێرا بنێن.. بەڵام داوام کرد کە هاوکاریم بکاتو بە دڵو گیان ئاگای لێم بێتو دەستم لێبەرنەدات تادەگەمە توانایەك لەسەر پاکانی خۆم پاکی بپارێزمو لەومرزی بەهارو گوڵو گوڵزاری ژیاندا شکۆفەو نۆبەرەی میوە جوانەکانی سەرەتای ژیانی گەش بەگەشی نۆش بکەمو ئاورنگو شەونمەکانی سەرپەڕەی دڵە ژاکاوەکەم لە مانگە شەوی ڕوناکدا بریسکە دروست بکاتو بۆ گزنگی بەیان پێبکەنێو لە خۆرەتاوی چێشتەنگاو دا بون بە هەڵمی ئاسمانی بێگەردی شین بەرز بێتەوەو لەگەڵ هەورە سپیو پاکەکاندا بۆ زەوی وشكو ڕەق هەڵگەڕاوەکان ببێتە بارانی جوانو زەوی وشكو بێرون بژێنێتەوە.. ئەم ژیانەوەیە ماندوبونو کارو کردەوەو خۆڕاگری زۆری پێویست بوو.. زۆری دەویست.

خوا پاداشتی بداتەوە لە سەرەتاوە وردە وردە ئاشنای کردم بە ژیانی پێشەوای مرۆڤایەتیو هەمو تاڵو سوێرییەکانی شاری مەککەو سەرکەوتنو کۆڵنەدانی یارانی، لەگەڵ تەواوبونی هەمو وانەیەکدا دەیفەرموو: دەبێت بڕیاربدەی سەرکەوتو بیتو نەڕوخێی ئەوسا بەری ڕەنج دەبێتە گەنج..

جاری وەها هەبوو من دەچومە سەردانی بەدزی باوکی منداڵەکانو خەسومەوە.. لەوێ وانەیەکی تری بۆ دانام کە چۆنیەتی خوێندنی قورئانی پیرۆزیو ڕاستو دروستی..

لەگەڵ کامڵ بونی ئەو وانە خۆشەدا دەروازەیەکی زۆر جوان کە نهێنی بوو دەکرایەوە.. شارەزا دەبوم ئێوارەیەکیان باوکی منداڵەکان هاتەوە .. زۆر بە خۆشیو شادییەوە بەرەو ڕوی چومو ئەو عەلاگانەی بە دەستیەوە بو بە خۆشحاڵییەوە لێم وەرگرتو لەگەڵ دانیشتنی ئاوی فێنکم بۆ هێنا.. پاشان قسەی خۆشو وتو وێژ دروست بوو.. کەیف خۆش بو.. بەڵام لە پڕ نەوچەوانی دابەیەکداو سەرەتا بەکەمی توڕەیی خۆی دەرخست پاشان کەزانی خەریکە عینادی لەگەڵ دەکەم بە تەواوی توڕەبوو..

- ئەم لەچکە چییە بەسەرتەوە!؟ ئەی کوا ماکسیە قۆڵ کورتەکەت؟!

- (R) گیان توخوا وازم لێبێنەو باساتەکانی تەمەنم بە خوا لە خۆ ڕازیکردنەوە بەسەربەرم..

بە گاڵتە جارییەکەوە پێکەنیو وتی: زۆر جوانە.. خۆت کردە پاپراخو پاش ئەم تەمەنەکەمەی ژیانت بویتە پیرێژن.. جاری تەمەنت سەرەتایە.. بۆخۆت وەها لێدەکەیت!!

دوای تۆزێك بێدەنگی وتم: ئەوەی تۆ دەتەوێت بە زیادەوە بۆت ئەنجام دەدەم بەڵام خێرت دەگا دەرگای دینداریم لێمەگرە.. دەنگم گۆڕا .. خەریك بو بگریم .. وازم لێبێنە.

وتی: باشە بۆ زوو گۆڕایی ئێمە مەرجی زەواجمان وەها نەبوو.

- (R) گیان ئەوەی من دەزانم تۆ گاڵتەت پێدێت .. من تازە هەست دەکەم چۆن بژیم.. پاش کەمێك بێدەنگی

- وتی: با ئارەزوی خۆت بێت.. بەڵام دڵنیام ئەم گڕو کفە تاسەر نابێت.

ئەمە ڕێگەی خۆشکرد بۆ پەروەردەی منداڵەکانم بە (ئایەتو کردەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم) ڕۆژانە دەستم کردە لەبەرکردنی بەرگی باڵاپۆشیو خۆشارەزا کردن بە ئاین.. وام ئەزانی هەرگیز لەم شارو سەر زەویەدا نەژیاوم .. ڕۆژانە شتی تازەم بەرگوێ دەکەوت ..

مامۆستاکەم کە خزمەکەمان بوو بە گەرمو گوڕی من خۆشحاڵ بوو، هەندێك کتێبی بۆ دیاری کردم بۆ خوێندنەوە کە زۆر سودمەندبو.

ڕۆژێك دراوسێکەمان وتی: گەر ئەتەوێت شارەزایت زیاتر بێت گوێ لە ڕادیوێ بگرەو لەو بەرنامانەی تینوێتی عیشقی ئیلاهیت دەشکێنێو شارەزات دەکات بە بیری ئیسلامەتی..

ئەو ساڵانە هەمو شتێك گران بوو (پیل) هەروەها.. کارەبا کەم بو ڕادیۆکەم بۆ ئەم کارە خێرییە بەکارهێنا.. لە بازاڕو هەندێ خەرجی زیادەم گرتەوەو ئەو بۆشاییانەم پڕکردەوە، خەسوم بە کردەوەی من قەڵس بو.. بەڵام خەزورم زۆر خۆشحاڵ دەبوم.
خۆشەویستی خەزورم تا دەهات زیادی دەکردو بەربەرەکانی خەسوم بە پێچەوانەوە ..
خەسوم کاری تازەی لە (R) ی مێردم کرد..
کەوتە سزادانی دەرونیو ڕابواردن بە بەرگو کردارو وتەکانم .. خۆی هیچ خواپەرستی ناکرد.. هەرچەندە دەمویست قسەی خێری بۆ بکەم تورە دەبوو.
وردە وردە چونە دەرەوەو بازاڕو ماڵی خزمان لەگەڵ ئەودا کەوتە پەراوێزەوە کە دەمپرسی بۆ لەگەڵت نەیەم.
دەیوت: بەباڵا پۆشی من تۆ نابەم.. بچۆرەوە دۆخی جاران چیت حەز لێیە بۆت ئەنجام دەدەم.
بە هیمەت بەرزییەوە دەموت: خۆشی خوا لە خۆڕازی کردن لە گەشتو سەیرانەکان بە تامترە.
نیوە شەوێکیان زۆری بۆ هێنامو ناچار گریێ دڵی خۆم بۆ کردەوەو هەرچی ڕویدابو لە خەوەکەوە تا ئەم چرکە ساتە بۆم باسکرد.
کە تەواو بوم قاقایەکی لێداو وتی: شەوی هەزار خەوی وەها ببینم قەت کارم لێناکاتو زۆر ئاساییە.
وتم: ڕاست دەکەی بۆ دڵو تواناى تۆ ئاساییە بەڵام بۆ من جیاوازە.. ئەمە لە لایەك و لەلایەکی ترەوە من بۆ ئەبێت خۆم بکەمە مەعرەز بۆ خەڵكو بۆ تۆش ماکسیەکی کاڵەوە بوو ئەی بۆ پێچەوانەی نەکەمەوە..
من ئەوە نازانم دەرەوەو ڕواڵەتی جوانم دەوێت. تورەبو پشتی تێکردم خۆی کرد بە خەوتوو.
نزیك نوێژی بەیانی بوو دەستنوێژم هەڵگرتو دورکات نوێژم کردو زۆر پاڕامەوە دوای ئەوە نوێژی بەیانیم ئەنجامدا.
سەلامم دایەوە ئەو نزاو ویردانەی فێرکرابوم خوێندم.. هەستم کرد دەستێك هاتە سەرشانم سەرم هەڵبڕی (R)بوو.. بە نەرمی وتی: شەوێکی تر جێگەی تۆ لەم ژوورەدا نیە هۆڵەکەو هیچی تر .. کەوای وت زۆر ئاسایی بو بەلامەوە

وتم: من پەیامم خۆشدەوێت.. دوای ئەویش تۆ .. حەز ناکەم لەم ناڕەحەتیەدا بەجێت بهێڵم ..ئەو زۆر بەلایەوە زۆر ساکارو سادە بو.

بۆ بەیانی ئافرەتەکەی خزمم هات.. کاتێکم زانی خەسوم کە لە قاتی خوارەوە بو هاتە سەرەوە بۆ لامان و ناوچەوانی دابو بەیەکداو هەزار قسەی ناشرینی کرد.. لە ناکامدا خزمەکەمان وتی:

ئەمە تۆ بەلا خۆی سەرت سپیەو چەند ساڵە دینداری دەکەیت و ئاواش دەدوێت..

بۆ خۆت ئاقیبەت شەڕ دەکەیت.. بۆ خەرمانی خۆت دەسوتێنی..

توڕەتر بو خەسوم وتی: خوا ئەزانی چیتان لە ژێر سەردایە.. ئەگینا هەر لە دێر زەمانەوە ئێمە نوێژو ڕۆژوی خۆمان کردووەو وەکو ئێوەش نەبوین، ئەزانم بە تەمای چین.. قوڕتان بەسەر.. بەخوا خوا ڕیسواتان دەکات..

پاش چەند قسەیەك سودی نەبوو.. بە قادرمەکاندا ڕۆیشتە خوارەوە. ئێمەش وانەی خۆمان خوێند مانگی ڕەمەزان هاتە پێش و زۆر بە جوانی خۆم بۆ سازدا..

بەڵام سزایەك کە درام لەلایەن باوکی مندالەکانەوە..(دەبێت لەم ژوورەدا گڵۆپ هەڵنەکەیت ئێمە خەومان لێدەزڕێت)

سروشتی شاری سلێمانی زستانی سارد بوو ئەو ساڵانە.. لە کاتی پارشێودا کارەباش دەبڕاو بە تاریکی پارشێوم ئەنجام دەدا.. لە ژورێکی ترو بەو ساردو سەرمایە.

سەرەتا وا گوزەرا.. بەتەنها لەبەردەم چرای دیوارکۆدا بە تانیەکم لە خۆمەوە دەپێچاو ڕووەو قیبلە دەستم دەکردە خوێندنی قورئانی پیرۆزو تا تەواو بونی ئەو جوزئە.. ئەمە کاری من بوو بەڵام لە ناخەوە زۆر ئاسودە بوم.

باوکی مندالەکان بەیانیان و نیوەڕوان دەبو خواردنی خۆشی بۆ ئامادەبکەم، ئەمەش تەنهاوەك سزایەکی دەرونی من و هیچی تر.. بەڵام من باکم نەبو.

سزایەکی تر خۆی دەرخست بۆ ئەوەی وەك پێویست بە ڕۆژو نەبم و پارشێو نەکەم و نەتوانم قورئان بخوێنم ئەوەش زیادکردنی کاری ژن و مێردایەتیمان بوو.

بەڵام بۆ ئەم کارەش ئامادەکاری تەواوم ئەنجام دەداو لەگەڵ بانگی بەیانیدا دەستم دەکرد بە کاری خودا پەرستی خۆم ئەگەرچی ئاوەکەش سارد بوایە دەمتوانی کاری خۆمی پێبکەم.. شەوانی قەدر هاتە پێش و بۆ زیندو ڕاگرتنی ئەو شەوە جوانانە بە تەنها لە ژورێکی تاریکی ساردا شەوەکانم زیندو دەکردەوە بە قورئان خوێندن و تەسبیحات و

نوێژو خوا پەرستی توانیم کاری باش بکەم ئەگەرچی ڕۆژگارەکەی ماندو بونی خۆم دەحەساندەوە بەوەی کە مێردەکەم لە ماڵ نەبو خێرا منداڵم دەگوڕی بۆ قوتابخانەو خۆشم ئەو ڕۆژانەی دەوامی رەسمیم هەبوایە دەچومە سەر کارەکەم توانیم لە ماوەی ئەو ڕەمەزانەدا کاریگەری لەسەر خوشکانی هاوکارم لە کارەکەمدا دروست بکەم‌و بومە جێگەی متمانەوەو چەندین دوعاو پاڕانەوەو بابەتی فیقهیم بۆ باس دەکردن سەبارەت بە ژیان‌و ژیاریان لە ئاینی ئیسلامداو مامەڵەی چاك لەگەڵ مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا.

بەڕێزان سزا دەرونییەکان زیادیان کردو سزای جەستەیش بووە سەربار(لێدان، قژ ڕاکێشان، شەق..) کار گەیشتە تەڵاق.. چەکی پیاوی بێئیرادەو ڕوخاو ڕاکردو لە واقع‌و هیچ لە بار نەبوو ڕۆژێکیان خەسوم‌و خەزورم‌و (R)و منداڵەکانم بەیەکەوە دانیشاند وتم:

ئەگەر ئێوە ڕێگەی دینداری لە من دەگرن ئەوە ئامادەم بە تەڵاق وەرگرتن ئەگەر مانەوەم بە سزا بێت ئەوە خۆتان چاوەڕوانی ئاکامەکەی بکەن.

تا ئەو کاتە خەزورم ئاگاداری هیچ نەبوو.. لە نوکەوە بەبێ شەرم‌و پەردە هەمویم بۆ باسکرد،

خەسوم وتی: (R) هەقیەتی .. دەستی خۆش بێ ئەی ژنی بۆ خۆشی خۆی نەهێناوە.

خەزورم گۆڕەکەی پڕ لە نور بێت‌و لەدەنگم ڕۆحیانەتی پاکی ڕانەچڵەکێ هەستایە سەرپێ‌و وتی: دوعای خێر بۆ ئەو دایك‌و باوکەی ئەمەیان هێناوەتەبون.. سەر شۆڕی بۆ دایك‌و باوکی تۆ (R) گیان..

چۆن تۆ ئەو کارانەت ئەنجامداوە.. خۆتۆ موسڵمانی‌و لە وڵاتی کافراندا ناژیت..زۆر قسەی توندو تیژیدا بەسەرو پۆتەلاکی خەسوم‌و (R)دا.. هەردوکیان سەریان داخستبوو.

هاتە پێشەوەو ناوچەوانی ماچکردم‌و منیش توند دەستیم گوشی‌و ماچم کرد.. بەسەر شۆڕی خەسوم ڕۆیشتە خوارەوەو (R) چوبەلای کارەکەیەوە.

ناخۆشیەکان کەم کەمە ڕەوینەوە.. هەمو کات دوعای خێرم بۆ مێردەکەم‌و کەسانی دڵڕەق دەکرد.. لە ماوەی ئەو ڕەمەزانەدا زۆر چومە پێشەوە.. زۆر شارەزایم پەیداکرد چەند سورەتێکی کورتم بە منداڵەکانم لەبەرکرد.. هەرکاتێك سورەتەکەیان لەبەردەکرد دەمپرسی ئارەزوی چیتانە لە خواردن بۆتان ئامادە دەکەم.

ماوەیەك باوکی منداڵەکانم بێکار بونو لە کاری یەکەمجار نـەماو شـەریکەکەی جیـابۆوە. بەڵام قەدەری خوا وەهابو پیاوێکی تر بـووە شـەریکی سێ یـەکیو زۆری خـۆش دەویـست هـەموکات بـۆ نوێـژە جەماعەتـەکان پـێش خـۆی دەدا.. چـونکە مـەرجی یەکـەمیان لـە شەریکی نەفەوتاندنی نوێژەکان بو.

پاش ماوەیەك هاوسەرم گۆڕاو کەم کەمە پرسی شەرعی لێدەکردمو سوپاسـی خـوام کـرد کـە دوعـاو نزاکـانم گیرابـون.. خـوای گـەورەش بـە دڵـی ئـەو منـداڵێکی جوانکیلـەی پێبەخشین، مەوسیمی حەج هاتە پێشو بە قەد قوڵی دەریاو زەریاکان حەزم لە زیارەتی کەعبـەو مەدینـە بـو بـەڵام توانـام نـەبو ڕۆژانـە لـە وێنـەی (کەعبـە و مەدینـە) ورد دەبومەوە.. خزمێکمان تەشریفی برد بۆ حەج.. دوعاو سـەلامم بـۆ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) نارد بەو هیوایەی پەیوەندی ڕۆحی هەبێت.. کردمە واجب بەسـەر خۆمـەوە هەمو ڕۆژێ زیاتر لە (١٠٠) سەڵاواتم لە گیانی پاکی پێشەوایی مرۆڤایەتی دەدا.. ئەوانەی حاجیان دەیان وت دەموتو دەموتەوە.

نۆمینـەی حاجیـان لەگـەڵ دەسـتە خوشکانی دەوامو بـەرو دراوسـێدا بـە زینـدوی ڕامـان گرتو یەکتریمان بۆ پارشێو بە ئاگا دەهێنا.

لە کۆتا ڕۆژی نۆمینـەی حاجیانـدا (R)ی مێـردم ڕۆژی عارەفـەی گـرتو بـەو کـارەی زۆر زۆر دڵخۆش بووم، لەم کاتـەدا وتـەی پیـاو چاکێکم بـیر کەوتـەوە کـە لـە بـارەی هـاوڕێوە دەیوت: هاوڕێ هەیـە وەك (هـەوا) هـەموکات پێویـستە، هاوڕێ هەیـە وەك (ئـاو) چـەند جارێك پێویـستە لـە ڕۆژێکـدا، هـاوڕێ هەیـە وەك (دەرمـان) هەنـدێ جار پێویـستە لـە تەمەندا هاوڕێی وەهاش هەیە وەك (دەرد) وایە هەتا لێی دوربیت کەمە.

جـەژنی قوربـان زۆرم هەوڵـدا قوربـانی بکـەم بـەڵام توانـای ماددی زۆرم نـەبو بۆیـە بـە دەغیلەی منداڵەکانو پاشەکەوتی خۆمو بڕێـك پارمـەتی خـەزورم توانیمـان بـە زینـدوی ئەم یادەش ڕابگرینو (R)م نارد بۆ مەیانەکەو دوای ماندو بونێکی زۆرو هەستکردن بـە خێرو چاکە، بەرانێکی گەورەی جوانی هێناو کردمانە قوربـانی.. ئـای لـەو سـاتە ڕۆحیـە جوانانە زۆر خۆشحاڵ بوم بە هەمو کارێکی دینـداریو خۆم لە خراپەی نـەفسو ئـارەزوو دەپاراست..

حاجیان هاتنەوە.. وەك ئێستا نـەبوو بـە تـەنها (٤) سـەعات بگەنـەوە شـاری سلێمانی لە

ڕێگەی نێرانەوە دوای مانگو نیوێك گەڕانەوە.. نوێنەرانی کورد بۆ ئەو جێگە پیرۆزە.. یاخوا بە خێر بێنەوە.

پاش چەند ڕۆژێك خۆمو منداڵەکانم ئامادەکرد بچینە خزمەت ئەو خزمە نزیکەمان کە سەفەری حەجی کردبوو.. لە خۆ ئامادەکردندا بوین.. بەڕێزیان لە دەرگایاندا.. کوڕە گەورەکەم چو دەرگای لێکردەوە..

دەمو چاوێکی نورانی ڕویەکی گەش هاتە سەرەوە تێر تێر یەکترمان ماچکردو دوعاو سەلامی مێردەکەیو حاجیانی هاوڕێیانی پێگەیاندم ..

دیاری دایەدەستی منداڵەکانم.. سەرم سوڕما.. بۆچی تۆ هاتوی ئێمە بەتەمابوین بێینە خزمەتت..

ئەویش لە درێژەی قسەکانیدا وتی: بە قوربان تۆ جێتکردبوو ئەم ماوەی ڕابردووە!!

بەسەر سوڕمانەوە وتم: بۆ چی بووە؟

بەڕێزیان وتی: ئەوەندە من ئاگاداربوم ئەوەندە من خەریکی جێبەجێکردنی فەرزو سونەتەکانی حەج بوم تۆ یان لە پێشمەوە بوی یان لە تەنیشتمەوە یان لە دوامەوە بوی.. دڵنیام تۆ بویت.

بە پێکەنینێکەوەو لە دڵدا بە خۆشحاڵیەوە وتم: بزانە کێ بووە شێوەی لە من چووە ئەگینا من هەرلە شارابومو حەجی چی بە قوربانت بم..

ئەو هەر سور بو لەسەر قسەکەیو دەیوت: هەرتۆ بویت ڕوحیانەتت حەجی کردووە.. لە کۆتایدا خوا حافیزەی کردو ڕۆیشت منیش زیاتر خۆشەویستی پەیامو ڕۆحیانەتی پاکم بۆ دەرکەوت خۆم دڵنیا کردەوە کە خوای گەورە هەمو ئەرکو ماندوبونو ئیرادە بە هێزیو بەندایەتیەکانی لێوەرگرتومو ئێستاش دوعای خێر بۆ هەمو ئەو خوشكو دایکانە دەکەم کە چوار دەورەکەیان لەگەڵیانا خراپن.. بەڵام کۆڵنەدەرن ئیمانو دینداری چێژو بەهاو پاداشتی تایبەتی هەیە.. خەم خۆری بۆ ئەو خوشكو دایکانەی خۆیان دەکەنە پێشانگاو بە پێشکەوتنی لاشەیی ئەزانن بەڵام دڵنیام لە ناخو ڕۆشنبیریدا ڕووخاون، ئەمە مشتێ بوو لە خەرواری تاڵی ژیانی ئیمانیمو کێوێ بوو لە سەرکەوتنی بێسنور.. سەرکەوتنیش هەر لەخواوەیە.

# لە ئامۆژگارییەکانی کاک ئەحمەد شێخ

پیاوێکی شەربەت فرۆش لەشاری سلێمانیدا دەچێتە خزمەتی کاک ئەحمەد شێخو عەرزی ئەکات:

(قوربان شەربەتی مێوژ دروست ئەکەمو ئەیفرۆشم زۆر پاکە... زۆرچاکە زۆر خەستو بێ غەشە..ئاوی بە ئەندازەی پێویست تێئەکەم.. بەڵام بازاڕم کەمە لە چاو دراوسێ دوکانێکما کە ئەو بە پێچەوانەی منەوەیە: ئاوی زۆری تێدەکات.. پاکو خاوێنی ناپارێزێ... دەست بە دەستنوێژ نییە... بەڵام بازاڕی لە من گەرمترە.. سەرفیاتی زۆرترە.. قازانجی زۆریش ئەکات...)

کاک ئەحمەد ئەفەرموێ: جا نیازت چییە؟

کابرای کاسب دەڵێ: قوربان هاتوم منیش وەك ئەوی لێبکەم.. تا بازاڕم گەرم ببێت، جەنابی شێخ ئەفەرموێ:

ئەکەی وای لێبکەی کەم و ئەختێ بژی چاکترە لەوە. کابرا ڕازی نابێت چەند جارێك ئەچێتە لای دواجار کاك ئەحمەد ئەفەرموێ: ئاکامی باش نابێت.. کەیفی خۆتە.. چینەکەی بیکە.. بەڵام پەشیمان ئەبێتەوە.. لە کاتێکی تردا سەردانم بکە.کابرا دەڕواتو لەو خراپتر دەست دەکاتە کارکردن..ئاوی زۆر.. پۆخڵی لە دروستکرندا..بازاڕی زۆر.. سەرفیاتی چاك پاش مانگێك دەچێتەوە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ و بە دڵێکی خۆشەوە دادەنیشێ و پرسیاری لێدەکات:

بازاڕت.. کارت.. سەرفیات.. لە وەڵامدا کابرا دەڵێت:

زۆر باشە.. بازاڕم گەرمە.. پارەی باشم دەستدەکەوێت.. لە کابرا باشترە بازاڕو دوکانم.. کاك ئەحمەدی شێخ ئەفەرموێ: ئەی پارەکەی چۆنە.. لەچیدا خەرجی ئەکەی کابرا دەڵێت:

وەڵلاهی پارەی باشم دەست ئەکەوێ، بەڵام نازانم لە چیدا خەرجی ئەکەم.. بەرەکەتی نییە.. زۆرە بەڵام جێگە ناگرێت بە پێچەوانەی جارانەوە.. جاران پارەی کەم بەڵام بەرەکەتی زۆر.. پارەی کەم بەڵام لەشساغو سەلامەت بەماڵو منداڵو لاشەی خۆما.. پارەی کەم.. بەڵام قەناعەتو مورتاحی...

کاك ئەحمەدی شێخ ئەفەرموێت: ئەوە ئاکامی پارەی حەرامە.. کاری چاکە بەرەکەتی تێدەکەوێت..

کاری پاكو خاوێنو دڵسۆزی گەر پارەو بەرامبەری کەم بو بەڵام خوای گەورە لەو لاوە لە زۆر نارەحەتیو دەردو بەڵا بە دوورت ئەکات.. ئەگەر توشیشت بو ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانت.

کابرا بڕیاریدا بگەڕێتەوە سەر کارو ڕەوشی جاران .. چونکە کاری خێر پڕ بەرەکەتە .

# خەمی چۆلەکەو نیگای ئێمە ....

ڕێگای دوورو درێژی شارەکان[7] بە سەیارەی خۆش ڕەو چەندین کاژێری پیادەی بووەتە خولەکی کەم.. بەڵام یاسایەك لە نێوان شوفێرو سەرنشینەکاندا هەیە لەو ڕێگایەدا پیادە ئەکرێت ئەویش لادانە لەنێوان ئەو ڕێگایەدا دابەزینی خەڵکەکەیە بۆ پشوودانو حەوانەوە خواردنی نانو چاییو تازە کردنەوەی دەسنوێژو ئەگەر کاتی نوێژبوو لە یەکێك لە ژوورەکانی ئەو چێشتخانەیەدا کە تەرخانکراوە بۆ نوێژو نوێژەکەیان دەخوێنن.

ئەمە لەنێوان شارەکانی گەشتو سەفەربەباشی بەرچاودەکەوێت.

ئێمەش لە سەیارەکەدا گۆج بووین هێندە دانیشتین لە لادانی سەیارەکە بۆ یەکێك لەو چێشتخانانە دڵخۆش بووین..

پاش کەمێك هەمومان دابەزینو هەرکەسێك بەلایەکدا ڕۆیشتین پاش پێنج خولەکێك لەناو هۆڵی چێشتخانەکەدا هەمو بەرەو ڕووی یەکتر لە سەر کورسی مێز گردبووینەوە کاکی شاگرد داواکاری هەمومانی بەدەنگی بەرز گەیاندە کاکی سەر چێشتخانەکەو پاش کەمێك خزمەت بابەتە داواکراوەکە لە خواردن بە گەرمو گوڕیو ئاوی ساردەوە گەشتە بەردەستمان..

پاش سوپاس گوزاری خوای گەورە لەسەر نازو نیعمەتەکان چوینە بەر ئاوێنەو سەر دەستشۆرەکە بە سابونە بۆنخۆشەکەی سەر دەستشۆرەکە چەوری دەستمان ڕامالی، بەرەو مێزێکی تر ڕۆیشتین بۆ چایی خواردنەوە، پاش خواردنەوەی چایی گەیشتینە لای کاکی پارەوەرگر، سەرمان قەبلاندو یەکی چیلکەیەکمان بەدەستەوە گرت بۆ ددان پاککردنەوەی لە چاوەڕوانی کاکی سایەقو چەند سەرنشیندا بووین.

---

[7] لە مسافرخانە (مطعم) نزیك میانە ئەمیش نزیکە لە زەنجانەوە لە ئێران .

دیمەنێکی زۆر سەیر سەرنجی هەمومانی بۆلای خۆی ڕاکێشا چۆلەکەیەکی زۆر جوان لەسەر گلۆپی سەر پەنجەرەی چێشتخانەکە بوو لە جیکە جیکیو باڵە تەپێ سەرمان سورما.. بێچوەکانی دەستیان کرد بە ملە قووتێو لە هێلانەکەیاندا خۆیان چکۆلە کردەوە، چۆلەکەکە هەڵفڕی دەستپێکرد لە ئێمە نزیك بۆوە .. زۆر بەلامانەوە سەیر بوو لە ئێمە دوور کەوتەوە بەرەو سوچێکی دیوارەکە ڕۆیشت کە سەرنجماندا بەدووری چەند مەترێك مارێك سەری دەرهێناو بە نیازە بەرەو هێلانەی چۆلەکەکە بکشێت،چۆلەکەکە زۆر هەوڵی دا تا یارمەتی بدەین بەلام ئێمە حەزمان بەسەیرکردنی ئەو جەنگە دەکرد ئای کامیان سەردەکەون ؟!

پاش چەند خولەکێك ئێمە هیچ یارمەتی چۆلەکەکەمان نەدا مارەکەش تەنها مەترێکی مابوو بۆ هێلانەکەو خواردنی بێچوی چۆلەکەکە،چۆلەکەکە فڕیو لە ئێمە نائومێد بو دوورکەوتەوە، لە خەیاڵی خۆماندا وتمان ڕەنگە چۆلەکەیەکی تر بهێنێت لەگەڵ خۆی بۆ هاوکاری بەلام وانەبوو پاش چەند چرکەیەك زۆر بە خێرایی گەڕایەوە مارەکە تەنها دوو بستی مابوو دەمی کردبۆوە بۆ بێچوەکان، خاوەن مسافرخانەکە وتی: ئەوە کەس غیرەتی نییە ئەو مارە بکوژێ پەلاماری دارێکی درێژی ئەستوری درێژی دا، بەلام ئێمە نەمان هێشت ڕازیمان کرد بە هاوکاری نەکردنییان .

مارەکە بێئاگا بوو لە هەوڵی چۆلەکەکە..چۆلەکەکە بە دەنوکە بچوکەکەی دڕکە زەردەیەکی گەورەیی پێبوو لەگەڵ دەمکردنەوەی مارەکە بۆ قەپالگرتن لە بێچووەکانو قوتدانیان چۆلەکەکە زۆر بەخێرایی دڕکە زەردەکەی خستە ناو زاری مارەکەوە مارەکەش دەمی داخستو هەستی بە ئازاری دڕکە زەردەکە کرد زۆر بە خێرایی کەوتە خوارەوە..

ئێمەش بەو دارە گەورەیە بەربووینە لاشەی مارە ئاساوەکەو بێگیانمانکرد.

چۆلەکەکەش لە نارەحەتیەکی گەورە بە قودرەتی پەروەردگارو هێزی مێشکو بیری، خۆیو بێچوەکانی لە دوژمنی گەورە ڕزگارکرد.. زۆر بە ئاسوودەیی چۆوە سەر هێلانەکەی بێچوەکانی بە سەرکەوتنی دایکیان شادمان بوونو لە ژێر باڵی دایکیانەوە تەماشایان دەکردین.

بەڵێ ئازیزان ئەمە جەنگێکی دەستەو یەخە بوو لە نێوان زاڵمو بێتاواندا .. ئەمە ململانێیەکە بۆ مانەوە (الصراع من أجل البقاء) چۆلەکەکە لە ئێمە نائومێد بوو

بەڵام بە پشت ئەستوری عەقڵی و توانایەکی زۆر کەم توانی سەرکەوێت بەسەر دوژمنێکی سەر سەختدا.. کە چەندین هێلانەی تری خواردبوو ئەم جارەش بۆی سەرنەچوو بەمەرگی خۆی گەیشت و ئێمە کردمانە پەندێکی زۆر باش بۆ ژیانی خۆمان.
هیوادارم ئێوەش بیکەنە پەندێکی زۆر باش کە ئیتر بەهیوای کەس نەبین بۆ هاوکاریمان و ڕزگارکردنمان لە دوژمن تەنها ڕەنج و ماندوو بونی خۆمان نەبێت ، هیچ فریامان ناکەوێت بابیر بکەینەوە، شاعیرێك دەفەرموێت:

لەدنیادا پشت بەهیچ کەس مەبەستە
ئەوەی مایەی ژیانە هێزی دەستە
کەدەستت بوو هەمو کەس دۆست و کەستە
قسە و باسیان وەکو ماستاوی خەستە.

دەبا ئێمەش دەست بدەینە دەست پشت بەکەسی تر نەبەستین تەنها خوای گەورە نەبێت

# دوو دایکی دڵڕەق

بە ڕەحمەت بێت نەنکم هەمو جارێك كە زۆرمان بۆ دەهێنا چیرۆكو حکایەتمان بۆ باس بکا چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە، لە دوایدا دەمانگوت چیرۆکێکی تریش، ئەویش دڵی ناشکاندینو دەهاتە سەر باسی ئەو ئافرەتەی کە مێردەکەی نەمابوو، تەنها سێ کوڕی بچوکی لە مێردەکەی بۆ بەجێمابوو لە گوندێکی ئەو شاربازێڕە، کوڕە گەورەکەی بەتەمەن ١٣ساڵ بو شوانی مێگەلی ئاوایی بو، کوڕە ناونجیەکەی تەمەن ١٠ساڵ بو شوانی بەرغەلو کارژۆلە بو کوڕە چکۆلەکەی زۆر ئالودەی دایکی بو، ناو بەناو لەگەڵ مندالانی ئاواییو شوانی قەلو مریشك بوو، تەمەن هەشت سالانە بو.
ڕۆژگارێك تێپەڕیو دایك کەلکەڵەی شوکردن کەوتە سەریو لە ئاواییەکەدا پیاوێك هاتە داوای، بەلام خەمێك لە دڵیدا بو، ئەویش منداڵەکانی بون، بەلام نەبونیو ناڕەحەتی ڕۆژگارو ئارەزووی خۆشی زۆرجار لەم دوودڵیو ڕاراییە دەیپچڕاند .. بەدزی منداڵەکانیەوە شوی کردو ڕۆژگار وەك ئێستا نەبو شاییو زەماوەندی بۆ بکرێ.. دوای دەرچوونی مەڕو مالاتی ئاواییو دوورکەوتنەوەی بەرغەلیش، کوڕە بچوکەکەی لەگەڵ منالان چوە دەرێ .. ڕۆژگار زۆر بەزوی تێپەڕی، ژنە چووە مالی مێردی تازەو منداڵەکانی لە بیر چۆوە..بۆ ئێوارە کوڕەکانی هاتنەوە سەیری مالیان کرد دایکیان لەماڵ نیە، بانگی دایکیان کرد وەلام نەبو چونە ژوورێ.. بانگی دایکیان کرد: دایە.. دایکە گیان.. دایکە تۆ لەکوێی.. بۆ وەلام نادەیتەوە خۆت مەشارەوە ئەوە ئێمە هاتوینەوە.. وەرە باوەشمان بکەو نانی گەرم بخەرە بەردەستمان.. کوڕە بچوکەکەی ووتی: من لە نیوەڕۆوە هیچم نەخواردووە.. دایکم لەماڵ نیە.. زۆر گەڕام لەماڵ نییە ! ژنی دراوسێکەیان کاسەیەك خواردنی بۆ هێنانو چراکەی بۆ داگیرساندنو نانی بۆ ئامادە کردن.. کوڕە گەورە ١٣ساڵەکەی وتی: دادە هەمین گیان ئەوە دایکمان لەکوێیە .. بۆ کوێ چووە.. خۆ بەیانی نەیووت بۆ کوێ ئەچم؟! قوڕگی پڕبوو لەگریان، کوڕەکەی‌تری وتی:

ڕەنگە لەسەردان بێت! ژنی دراوسێیان وتی: نانەکەتان بخۆن بۆتان باس دەکەم..کوڕە بچوکەکەی وتی: چیمان بۆ باس دەکەی.. خۆ دایکمان وەك باوکمان نەمردووە .. ژنە بەدڵی خەمەوە نانەکەی دەرخواردانو پاشان وتیان: دەتوخوا پێمان بڵێ‌ادادە هەمین وتی: لەم دێیەدا دایکتان شوی کردۆتەوە بە (فلان) کەس، توخوا پێتان ناخۆش نەبێ ئەم قسەیەی کرد منداڵان دەستیان کردە گریانو زاری.. هاوار هاوار زۆر گریان زۆر بێتاقەت بون، بەلآم خۆگریانیان نەگەیشتە ئەو پەڕی دێ..ئەوشەوە کەس نەبو چرایان بۆ داگیرسێنێ ... جێگەی نەرم و نۆڵیان بۆ ڕاخات،بە دەم گریانو شینو واوەیلاوە هەریەکەو لە لایەکەوە خەویان لێکەوت لە نیوە شەودا دایك دوای ماندوبونی زۆر لەلای مێردەکە.. بیری منداڵەکانی کەوتەوە مێردەکەی کردە خەوو بە خێرایی بەرەو ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە .. کە سەیری کرد هەر منداڵەو لە لایەکەوە کەوتووە. جێگەی بۆ هەرسێکیان داخستو هەرسێکیانی بردە سەر جێگەی خۆیو دایپۆشینو ماچێکی لە بچوکەکەیان کردو گەڕایەوە...

بەم شێوەیە.. چەند شەوێك بەردەوام بوو.. ناچار مێردەکەی دەریکردو بەڕوی زەردەوە هاتەوە لای منداڵەکانیو لەو کارە پەشیمان بۆوە..

لەگەڵ تەواو بونی چیرۆکەکەدا دڵمان پڕ دەبو لە گریانو فرمێسك دەزایە چاوەکانمانەوە بۆ ئەو دیمەنە ناخۆشەی منداڵەکان کە دایکیان بە جێیهێشتبون .. ئەمە تێپەڕیو ڕۆژگارەکان هەنگاویان نا.. ئافرەتێکی نزیکمان مێردەکەی بە نەخۆشی کتوپڕ گیانی سپارد.. دو کچی جوانکیلەی لە پاش بەجێما.. خێزانەکەی زۆر بێتاقەت بوو.. سکی هەبوو پاش چەند مانگێ کچێکی تریشی بوو،خزمو ناسیاو بەرو دراوسێو خێرخوازان زۆر یارمەتیان دەدان، ئافرەتە ڕوی سپی بێت لەسەریان دانیشت بچوکەکەیان تەمەنی گەیشتە شەش ساڵانو هەمویان باڵایان بەرز بۆوە هەر جارێك کەسێکی خێر خواز خێری بکردایە بەشێکم بۆ ئەو منداڵە جوانکیلانە دەبرد، هەمو جارێك دوعای خێریان بۆ خێرخوازەکە دەکرد، ئافرەتەکە هەمو جارێك کە دەکەوتە قسە کردن دەیوت: من چییان لێبکەم ئەگەر یەکێکیان کوڕ بوایە کارێکم پێدەکرد بەلآم من چی بڵێم !!

پیاوێکی هاوسێیان ماڵی ئاوا بێت زۆر هاوکاری دەکردنو ئامۆژگاری دایکیانو منداڵەکانی دەکرد، لە دەزگا خێرخوازییەکان ناوی نوسین بەلآم بەختی خۆیان هیچیان بۆ

دەرنەچوو. لەماوەی ڕابردوودا بەرگوێم کەوت کە بەنیازە شو بکاتەوە.. ئەم درۆیە بو بە ڕاست.. سەربەهەوێ شوی کرد، منداڵی سەرو پێچکەی بەجێهێشتن و ڕۆیشت.

پیاوێکی دراوسێیان بە سەیارەکەی منداڵەکانی دەبرد بۆ قوتابخانەو دوای تەواو بون دەهاتنەوە ماڵەکەی خۆیان و هەواری خاڵی، بەڵام ئەم پیاوە خێرخوازە بە سەیارەکەی ئەم سێ کچە جوانکیلەیەی دەبردەوە ماڵی پوری و بەم شێوەیە دەگوزەران..

منداڵێکی ناوی دەرچو لە دەزگای خێرخوازی بە موچەی مانگانە، کچە گەورەکەشی لە قۆناغی ناوەندیدا بەم هەمو خەم خەفەتەوە سەرقاڵی تاقیکرنەوەی سەری ساڵ بو.. کچە ناوەنجییەکەشی بە چاوی پڕ ئەسرینەوە چاوەڕوانی ڕۆژگارێکی ڕونە.. بەڵام لەلای کێ.. لە کوێوە؟؟

بەڕێزان ئایا دەبێت چارەنوسی ئەم سێ کچە جوانکیلەیە بەچی بگات،ئایا ئەم ئافرەتە بیری ناکەوتەوە کە هەمو جارێك مامۆستای ئاینی پێی دەفەرمو: کچە باشەکەم ئەم سێ منداڵە پێبگەیەنە .. بە چاکی و ڕێك و پێکی.. خەڵکی هاوکاریت دەکات و لە بەهەشتی بەریندا لە شانی پێغەمبەری مەزنەوە دەبێت،چونکە پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت فەرمویەتی: (من و ئافرەتی خاوەن منداڵی بێباوك شان بە شانم لەگەڵ دەکات بۆ چونە بە هەشت) .. بەڵام خۆ خراپی نەکردووە شوی کردۆتەوە.. لەلایەکی ترەوە دەبوایە سەرەتا ڕێگە چارەیەك بۆ منداڵ و چارەنوسیان دیاری بکات.

لە کۆتایدا خوای گەورە یەکی کەس ناخات ئایا ئەم ئافرەتەش بە ئاکامی چیرۆکی یەکەم دەگات یان نا؟ ئەوە ئێوە زیندو منی خاوەن خەمی بێکۆتا مردوو چاوەڕوانی ئاکامین.

خوای گەورە پاداشتی هەمو ئەو کەسانە بداتەوە کە یارمەتی بێباوکان دەدەن .. خوای گەورە پاداشتی هەمو ئەو دایکە دڵسۆزانەش بداتەوە کە تەمەنی جوانیان بە خشیوەتە کۆرپەی ئەمرۆ ئەوەی دوا ڕۆژ کە بە پەروەردەیەکی دروست گۆشیان دەکەن .. سەرکەوتو بن انشاء الله .

# دوعای ستەم لێکراو

چەندە لە تاوانەکانی ڕابردوی بەعس بدوێین کەمەو هیچمان نەدرکاندووە ئاسودەیی بۆ ئەمڕۆ تیا بێت، بەعس ئەو پارتە بو بۆ بوژانەوەی شتێك هاتو شتێکی تری پێئەنجامدرا.

بەعس کۆمەڵێ کاری نامرۆڤانەی کرد، پێویستە وانەو پەندی لێوەربگرینو بە خۆمانو خزمو هاوڕێو شارو شالیارو دەسەڵاتەکانی ئەمڕۆ بڵێین کارو فەرمانەکانی ئەو دوبارە نەکەنەوە گۆرانی بە باڵای پاساو کردەوەکانیان نەڵێن.. ڕاستە بەعس کاری خراپی کرد ئایا چ وانەیەکمان لێوەرگرت؟

ئایا ئازادی دابو بە تاکەکانی کۆمەڵگە؟ ئایا نرخی مرۆڤی وەك مرۆڤ دەگرتو ئاسودەیی هەبو؟

ئایا هەرچی لە حزبو لەژێر دەستیا نەبوایە وەك مرۆڤو کەسی خزمەتکاری کۆمەڵگە سەیری دەکرد زەربی سفری پڕبەها دەکرا؟ ئایا کردەوەی ئەو ڕەنگی نەداوەتەوە لە ئێمەدا.. ئایا کردارەکانی بەعس بە کوردی پیادە ناکەین؟

بەعس زۆری کرد تا هاتە سەر تەختەی حوکمڕانیو بەئارەزوی خۆی حوکمی کرد لە چاكو خراپ بەڵام چونکە حزبەکەی خراپەی زۆر بو ئێستا لە ڕیسوایی قەفەسی دادگای بەردەمی مرۆڤو ڕۆژگاری مێژوو بە زەلیلی ڕاگیراوە.. ئاهو نزولەی خەڵکی بێدەسەڵات

ئێستا ئەوانی بێدەسەڵات نەکردووە؟؟ ئەی هۆزەکەم هاوڕێو هاوسێو سەرکردەکانم..

هەوڵتان دا هاتن.. جوان پەروەردەمان کەن.. ستەمان لێمەکەن بە هەمو شێوەیەك تا نەبنە تەواوکەری کاری پیاو خراپان.. جوان بمانژێنن با لە قەفەسی مێژودا بە کزۆڵی نەبینرێنەوە.. ئەمە پاسای ژیانە.

هەوڵبدە.. سەردەکەوی.. تاوان مەکە.. سەرکەوتو شاد دەبیت.. گەر وانەبوی هەرەس چاوەڕێتە..

لە ناوەڕۆکی تاوانێکی بچوکی بەعس دورت ناخەمەوە سالّی ۱۹۹۱ بوو هەمو خەلکی بە ماڵو منداڵو شرو شیتالیانەوە لە سنوری (ئێران تورکیا) توند بون.
لەو لاشەوە چەند گەنجێك لە ولاتی (سعودیەو کوێت) دوو راپرسیان لێوەرگیرا.. کە دیلی جەنگ بون.

١. ئایا دەچنە ولاتی خۆتان عێراق؟
٢. ئایا لێرە دەمێننەوەو درێژە بە ژیان دەدەن یان دەچنە هەندەران و ئەمریکا؟

هەندێك بریار یەکەمیان هەڵبژارد، هەندێکیش بریارو راپرسی دووەم. بەلام کەس ئاکامی نازانی.
کاك (فەیسەڵ کوڕی مام رەحمانی نارنجلە) بریاری گەڕانەوەیدا بۆ خاکی عێراق و شادبونەوە بە خاکی کوردستان و کەس و کارەکەی.
فەیسەڵ بێئاگا لە خاکی کوردستان و راپەڕین ئاوارەبون، لە رێگەی بەغدادەوە گەڕایەوە شاری سلێمانی، بەلام شاری چی و ولاتی چی؟
لەگەڵ داغڵ بون بە شار چۆڵەوانی و سەربازەکان پێشوازیان لێکرد، سەربازەکانی رژێم کەبە ترس و لەرزەوە بە ناو شاردا دەگەڕان و هاتو چۆیان دەکرد، هەواڵی ئاوارەبونی خەلکی شاریان بە فەیسەڵ راگەیاند.
کاری رۆژانەی سەربازەکان شکاندن و برینی ئەو دوکان و شوێنە گشتیانە بوو کە سەرچاوەی خواردەمەنی و کەرەستەی جوان جوان بون.. خەلکێکی ناو شار گەر لە دلەوە بە کردەوە تورە ببوایە ئەوا خراپیان بەسەر دەهات..
فەیسەڵ هاتەوە ماڵی خۆیان ماڵ چۆڵ و هۆڵ.. گەڕەك چۆڵەوانی.. نایزانی چی بکات بە پیاسەو گەڕان چوە ماڵی خزمەکانی ئەوانیش چۆڵەوانی و دەرگایان کلیل دابوو رۆیشتبون دوا نیوەڕۆیەکی چوە ماڵی پوری لە یەکێك لە ماڵەکانی (شێخ محی الدین) تەنها پوری و مێردی پورەکەی کە زۆر بەتەمەن و پیر بون لە ماڵ بەجێما بون.. پوری بە گەڕانەوەی فەیسەڵ زۆر خۆشحاڵ بوو ماوەی چەند رۆژی لەوێ مایەوە،
بەلام بریاریدا کە بچێت بەدوای ماڵی باوکیاو لە ناوچەی هەورامان بیاندۆزێتەوە..
رۆژگارەکان تێپەڕین و ماڵی باوکی فەیسەڵ گەڕانەوە.. بەلام فەیسەلیان لە گەڵ نەبوو..
هیچ ئاگایەکیان لە فەیسەڵ نەبوو، رۆژێك حاجی رەحمان سەردانی ماڵی خوشکەکەی کرد لەوێ باسی فەیسەڵ و گەڕانەوەی هاتە پێشەوە، باسی لێوەکرا..

رەحمانی باوکی سەرسام بوو چۆن فەیسەڵ گەڕاوەتەوەو ئەم نەیبینیوە؟!
پوری زۆر بە جوانی بارودۆخەکەی بۆ باسکرد.. کە فەیسەڵ نیازی درێژەدان بە ژیانی لە ناو کەس و کاردا زۆر پێخۆشتر بووە وەك لە ژیانی هەندەران و غەریبی و غوربەت.
کێچ کەوتە کەوڵی مام رەحمان و هەرچەندە دەیپرسی سەرو سۆراغی فەیسەڵ نەبوو، بڕیاری دا بچێت بۆ (لیواو فەصیل)و شتەکانی بەڵکو ئەمە خوایە، فەیسەڵ گەڕابێتەوە عەسکەری.
رۆژێکی دیاریکرد.. بەجل و بەرگی کوردییەوە بەرەو کەرکوك رۆیشت لەوێ رەوانەی شاری بەغدادیان کرد.. بۆ یەکێك لە سەربازگەکان (معسکرات).
لەوێ ئامر لیواو چەند عەسکەرێکی پلەدار پێشوازیان لێکرد. پێیان ڕاگەیاند کە فەیسەڵ فیراری کردووەو نەگەڕاوەتەوە خزمەتی سەربازی ..هەر لەویا بۆی دەرکەوت کە فەیسەڵ بە دەستی سەربازەکان کوژراوە.. بۆیە رەحمانی جەرگسوتاو بڕیاری گەڕانەوەی دا..
بەڵام ئامر لیوا وتی: ئادەی دوو عەسکەر بەو جێبەوازە بگەیەننە شوێنێك لەوی بیکوژن.
ئەم فەرمانە بۆ ئەوان ئاسان بوو جێبەجێ کردنی ئاسان بوو، بەڵام بۆ مام رەحمانی جەرگسوتاوی غەریبی لانەواز زۆر نارەحەت بوو.. چاوەڕوانی مەرگ زۆر گرانە..دوو سەرباز بە جێبێکی واز لە بەیانی سەعات هەشتەوە بەڕێکەوت بەرەو بیابانی چۆڵ و کاکی بە کاکی نزیك عەسرێ گەیشتن..
مام رەحمانیان دابەزاند.. سەربازەکان وتیان: لە ڕاهی خوادا ناتکوژین.. بۆ خۆت لێرەوە برۆ..ڕاستە نەیانکوشتم.. بەڵام منێکی ناوچەی هەورامان لەم بیابانە چۆڵ و هۆڵ و بێئاو وبێنان ئاکام و سەرئەنجامم چی دەبێت؟! ئەوان گەڕانەوە بە گاڵتە جاڕییەوە وتیان: مع السلامە ..
لە دڵی خۆما زۆر بەزەیم بە خۆما هاتەوە.. زۆر دلگران بوم بۆیە وتم:
خوایە گیان .. من بەندەی تۆم تۆ خوای بە رەحم و بە توانای.. من زوڵمم لێکراوەو تۆش خاوەنی هەموو شتێکی.. لەم چۆڵەوانیەدا.. لەم نارەحەتی و بێتوانایییەدا بگەیتە فریام.. هەنگاوم نا.. هەنگاوم نا.. زۆر ماندو بووم.. نامزانی بەرەو کوێ بڕۆم بۆ کوێوە رێگە بگرمە بەر.. تەنها بەرێرەوی جێبەکەدا گەڕامەوە..

بارەشی ناو بیابانو گەرماو نارەحەتی ئەم وەرزی هاوینە.. هەمو شتەکانیان لول دەکرد.. لە پڕ کێوێك لە لم دروست دەبوو پاش کەمێك تەخت دەبوو.. باکەی زۆر گەرمو نارەت بوو.

هەر ڕۆیشتم هەر ڕۆیشتم تاریك داهات.. گریام .. گریام ..زۆر گریام.. پاڕامەوە بە تەیموم دەستنوێژم گرت..

مشکی یەکەی سەرم داگرتو بلاوم کردەوەو دامخستو بە مەزندەی عەقلی خۆم روم لە (قیبلە) کرد چەند ڕکات نوێژێکم خوێند.. ئای کە تامی ئەو نوێژانە شیرین بوو..

ئای خەمو پەژارەشم چەند زۆر بوو.. برسێتیو تینوێتی بونە میوانم..ترسو خەم هاوڕێم بون..

ئەو بڕیارەی سەربازە دڵ ڕەقەکان دابویان کوشتنێکی هێمنانەی من بوو.. مردن هەنگاو هەنگاو بەرەو ڕوم دەهاتو منیش لێی نزیك دەبومەوە..

بەلام هەرچەندەم توانی زیکرو فیکرو تەسبیحاتم کرد.. دوعا دوای دوعا.. هەرچیمزانی دەمخوێند..

باشە ئەبێ کەسێك لەم چۆڵەوانیە فریام بکەوێت؟!

لە دورەوە تروسکاییو روناکیم بەدی کرد.. ئەوە چییە!!

تا دەهات نزیك دەبۆوە چەند مەترێکم مابو بیگەمێ بۆم دەرکەوت (تراکتۆری جوتە) عەنتەرێکی تازە کوڕێکی گەنج دیاربو بە جامانەکەی دەماخێکی کردبو، جوان سەرو گوێلاکی خۆی پێچابوو..

دەستم لێڕاگرت.. لێیپاڕامەوە بەم زمانە کوردییەی خۆم کە لە ڕاهی خودا لە ناوەدانیم نزیك بکاتەوە..

هەرچۆنێك بوو ڕازی بوو بەسەر ئامازەی بۆکردم کە لە دوا خۆیەوە سواری تراکتۆرەکە ببم.. ئەی سوپاس بۆ تۆ خوایە..

ئەو ماوە دورو درێژە ڕۆیشتین ڕۆیشتین ناوبەناو دوعام دەکردو جار جار پرسیارم لێدەکرد .. بەلام ئەو سەیرێکی دەکردمو هیچ قسەی ناکرد..

ئەو فرە فرەی مەکینەکە لەلام دەنگێکی زۆر خۆش بوو.. ئاوزێك بوو کە جارێکی تر هیواو ئاواتی بۆ دروستکردم بەرامبەر بە ژیانو گەڕانەوەم.. یەك وشە چییە ئەم

سایەقە نەیدرکاند (وەلا کەلیمە) ماوەی چەند سەعاتێك بە خێرایی تراکتۆر ڕۆیشتین..
لە دورەوە ئاوەدانیم بەدیکرد.. زۆر زۆر بوون..
مەکینەکە وەستا منیش دابەزریم‌و زۆر سوپاسم کرد.. پشتم کردە مەکینەکەو ڕووەو ئاوەدانی ملمنا.. هەموی چەند چرکەیەکی نەخایاند ئاوڕم دایەوە باوەڕبکەن .. باوەڕ بکەن.. ئەگەر باوڕیش ناکەن کەیفی خۆتانە ئەو مەکینە زلە .. ئەو دەنگە زلە دیار نەماو بزر بوو..
کێشام بەسەری خۆماو هاوارم کرد.. خوایە گیان زۆر سوپاس ئەو فەزڵەت پێبەخشیم.. زۆر سوپاس خوایە.. بۆم دەرکەوت ئەو کارەی کابرای تراکتۆر لەگەل من کردی تەنها فریشتەی فریاد رەسبوو.. خوای گەورە بۆ ڕزگاری من ناردبوی (خەواریق بو هیچیتر) پاش چەند سەعاتێك لە نیوە شەو گەیشتمە ئاوەدانی‌و لە ماڵێکی عەرەب لامداو حاڵ‌و مەسەلەکەم بۆ گێڕانەوە..
کابرای عەرەب زۆر نیگەران بوو بۆ بەیانی گەیاندمیە ناو شاری بەغدادو سواری سەیارەی سلێمانی کردم‌و بەرەو شار گەڕامەوە..لە ناو هەمو گەلێکدا مرۆڤی خراپ هەیە.. با هەمویان وەك یەك سەیر نەکەین.
ئیتر بۆم دەرکەوت خوای گەورە چۆن فریای ستەم لێکراو دەکەوێت ئەگەر مرۆڤەکان بە پاکی‌و بە جوانی داوا لە خوای خۆیان بکەن.. بۆم دەرکەوت خوای بەخشندە جارێکی تر ژیانی بە منی جگەرسوتاو بەخشییەوە.
لەگەڵ تەواو بونی هەمو سەربوردەکەدا بەلاچکی مشکیەکەی سەری چاوە پڕ فرمێسکەکانی دەسڕی‌و دەیوت: خوای گەورە حەقی ئەو هەمو ستەم لێکراوانە بستێنی.
ئەمڕۆ سەدام جەرگی سوتاو.. سەرگەردان لە بەرزترین پلەی خۆش گوزەرانیەوە بۆ نزمترین ژیانی بەندی‌و ڕیسوایی.. بۆ بەردەم ناحەقییەکانی خۆی کاردەکات..
بەڵام بەداخەوە مام رەحمان نەماوەو وەفاتی کردووە.. پێویستە ستەمکاران بە کارەکانی خۆیاندا بچنەوە.. چاوی رەحم‌و سۆزیان لە ژێر دەستەکانیان بێت لە هەر جێگەیەك هەن..

زۆر سوپاس بۆ برای بەرێزم کاک (غیدان قادر).

# مەرکەزەکەی چوارتا چی بەسەر هات!

حەقی قەدەری ئیلاهیم نییە، ئەگەر خوا شتێکی لە چارەنوس نوسی دەبێت بێتەدی، چەند خولەکێکیتر درەنگتر لە ماڵ بهاتمایەدەر وەك ئێستام لێناهات، یان ئەگەر رۆژی دواتر بوایە شێوازەکەم دەگۆڕا، ئەمە خەیاڵو بۆچونی هەرزەکاری ئەو ساڵانەم بوو.

بەڵام ئێستا تێدەگەم کە هەمو ئەگەرەکان بە دەستی خوای گەورەیە، لە ماڵ بومایە، لە هەردو کەژوکێو بومایە یان لە بەرەکانی جەنگ یان پێشمەرگەی دێرین دەبوایە ئەم رووداوەی ئێستام هەر بەسەر بهاتایە زۆر سوپاسی خوای گەورەش دەکەم کە وەك ئەو خەڵکەی ترم بەسەرنەهات، کە کەس لاشەیانی نەدۆزییەوە یان بە گوێنی پارچەیان کۆکرایەوە..

بۆ ئەم یادەورییە تاڵە بۆ سی ساڵ دەگەڕێمەوە دواوەو چاوەکانم لێکدەنێم هزری خۆم لە شلەقان دەردەکەم، بۆ ئەو ساڵ یادە ناخۆشە دەدوێم، حەز ئەکەن هاوڕێم بن؟!؟لەم قەزا گەورەیەدا تەنها یەك بنکەی پۆلیس هەبو، گرتن‌و گواستنەوە لەم قەزای چوارتایەدا دەگوزەرا هەمو فەرمانگە حکومیەکان لێرە کارەکانیان ڕادەپەڕاندو سەرچاوەو گەڕانەوەی دەرچونەکان‌و دەهاتنەوە ئێرەو ئێرەش بنکەی یەکەمی بو،خەڵکێکی زۆر لەم قەزایە دەژیان چەندەها گوندو ناوچەو ناحیە دەهاتنەوەو سەربە چوارتا بون، رۆژدەبۆوە لە هەمو ئاوایەکانەوە بگرە لە شاری سلێمانیشەوە فەرمانبەرو هێزی خاوەن بازو کارو پیشە بەرەو چوارتا دەهاتن گرنگی تایبەتی پێدرابو لە دێر زەمانەوە، ئەو کاتە خوێندکاری سێیەمی ناوەندی بوم، چەند ساڵێك بو لە قوتابخانە دەمخوێندو هیوایەکی گەورەم بۆ خۆم دیاریکردبوو، بەڵام ئایا ئەم هیواو ئاواتانەم لەدوای ئەم کارەساتە ڕوخان‌و تیاچون‌و نەمان یا بون بە ئیرادەیەکی زۆر پتەوتر بۆ ژیانی ئێستام لەگەڵم بن بۆ ئەم گەشتە کورتەی تەمەنم.

دنیام زۆر خۆش دەویست خۆشەویستی خاکەکەم لە خۆشەویستی ژاکاوی گەنجانە لەلا بەبەهاتر بو، هەر بەو عیشقەوە بەرەو دەروازەی خوێندگا دەڕۆیشتم، کەش و هەوا بەنیسبەت ئەم شارۆچکەیەوە بەهارێکی ناسك و جوان بوو، هەرچەند ئەم ساڵیادەم لێدەر دەکەوێت بارێکی نائاسایی دەرونیم لەلا دروست دەبێت، بەڵام ئیرادەی بەهێز، هێزدارم دەکات. بەرواری (١٩٧٧/٤/٦) بوو ئاخ.. ئاخ لەو چرکە ساتانەی ئاخ؟!

کاتژمێر (٧,٢٥) دەقیقەی سەرلە بەیانی بوو لە دەرگایماڵەکەمان هاتمە دەرێ و کتێبەکانم بە دەستەوە بو بەرەو ناوەندی چوارتا بە چاوی پڕ ئومێدو هەناسەی بەهارییەوە هەنگاوم دەنا.. ئەو زرمەیەی لە دوری چەند مەترێکەوە بەر گوێم کەوت تاساندمی و هێزەکە زۆر بەهێزتر بوو لە توانای منێکی لاوی خوێن گەرم.

بەرچاوم تاریك بوئازارێکی زۆر لە تاسییەوە بردم و لە هۆش خۆم چوم..

خەڵکی دەڵێن لە ماوەی یەك چرکەدا دوو بینای کۆنکرێتی حکومی خاپوربون ئایا ئەمە چۆن ڕویدا لەو بەیانەدا لەو سەرەتای کارو فرمانەدا چی ڕویدا خەڵکی شارۆچکەی چوارتا لە دوکەڵێکی ڕەشی زۆر بەو لاوە سەرەتا هیچیان نەبینی، پاشان وردە چەوو کەرەستەی بیناکان لە ئاسمانەوە دەهاتنەوە سەر زەوی ئای لەو هەواڵە ناخۆشە درا بە گوێی خەڵکیدا.. هەرخەڵك بوو خۆی دەشاردەوە هەندێکیش بەرەو سەرچاوەی تەقینەوەکە ڕایان دەکرد.. لە هەمو دێهاتەکانی ئەم شارۆچکەیەوە دەنگەکە بیسترا پاشان دوکەڵەکەشی دەرکەوت.

پاش چارەکە سەعاتێك دنیا ڕوناك بۆوە دوکەڵەکە تۆزێك هێواش بۆوە ئاسمانی چوارتا بووە هەورێکی ڕەش لە دوکەڵ..

ئای کە ناخۆش بوو.. یاخوا ئەو ڕۆژە وەك ڕۆیشت نەگەڕێتەوە، شارو شارۆچکەکەمان ڕوداوی وەها بە خۆیەوە نەبینێتەوە ئەمە چۆن ڕویدا؟ قوربانیەکانی چەند کەس بون؟ پەندو ئامۆژگاری بۆ ئێمە چیبو؟ ئەی کێ بەم کاری تەقینەوەیە هەستا؟

ئایا بەڕێزتان چۆن دەدوێن و چیتان بەسەرهات؟

ئایا خەڵکی چۆن باسی ئەم ڕووداوە ناخۆشە دەکەن؟

ئایا ئێستا ئەم جێگەیە چۆڵە یان حکومەتی عیراقی بینای کردەوە؟ ئایا قەرەبو درایە زیان لێکەوتوان؟

ئەم پرسیارانەو چەندانی تر لە بەڕێزیان دەکەین کە لە سەرەتاوە بۆمان دواوە ئەو کەسە ئازیزەش جەنابی کاك (کەمال جلال مستەفا)یە کە تەنها کەس بوە لە چوارتادا کەم ئەندام بوبە هۆی لە دەستدانی قاچی ڕاستیەوە ئەو بەیانیە کەوتمە ڕێگا تازە خەڵکی وردە وردە بەرەو فرمان دەڕۆیشتن، چەند پیاوێکم لێوە نزیك بوو کە دەنگی تەقینەوەکە هات ئەوان خۆیان دابە زەویداو من فریا نەکەوتم.. کاتێك هۆش خۆم هاتمەوە چەند ڕۆژێك بەسەر ڕوداوەکە ڕابردوو لە خەستەخانەی جامیعەکە لەسەر قەرەوێڵەیەك خۆم بینیەوە باوكو براو مامو خاڵو کەسوکارم لە دەورم بون.. بە چاوی فرمێسکاوییەوە بۆیان دەڕوانیم، زۆر نیگەران بوم چاوەکانم لێك نایەوەو لە خەوێکی قوڵدا ڕۆچوم،زرمەو ناڵەی تەقینەوەکە لە مێشکما دەنگی دەدایەوە.. تا ئەو کاتەش نەمزانی چیبو چی نەبو، پاش نیوەڕۆ بە ئاگا هاتمەوە.. لە بەیانی زیاتر خزمو کەسوکارم لە دەوربون.. بەسەلامەتی من هەندێکیان سەرسام بون، بەڕێزەکەم تا ئەو کاتەش ئازارم زۆر بو بەڵام نامزانی چیم بەسەرهاتووە، دەمپرسی بۆ داخدارن؟؟ بۆ وا فرمێسك دەبارێنن خۆ من زۆر باشم چی ڕویداوە؟!!

لای ئێوارەکەی دکتۆرەکان هاتن بۆ تەداویو تیمارکردنم.. دانەیەکیان زۆر دڵخۆشی دامەوە زۆر بە جوانی باسی قەزاو قەدەری ئیلاهیو کاریگەری دەوروبەری بۆ کردم.. پاشان کەوتە تیمارکردنی لاشەم، هەستێکی نامۆ لە ناخمدا سەری هەڵدا.. ئەم دکتۆرە بۆ هێندە بە دەوری قاچمادێت، خۆم پێنەگیراو لە پڕ تاوم دایە بەرخۆمو سەیرم کرد.. ئای لەو دیمەنە.. ئای لەو نارەحەتییەی بەسەر مندا هات.. ئای گەنجێتیم فەوتا.. هیواو ئاواتەکانی ڕابردوم بونە سەرابێكو پوکانەوە.. کوا.. لە کوێیە.. چی بەسەر هاتو ڕانو قاچ.. ئەی هاوار.. بۆ وام لێهات باوكو براو دکتۆرەکان زۆر بە نارەحەت هێوریان کردمەوە، تێیان گەیاندم: دەبێت خۆ ڕاگربیت لەبەر خوادا.. سوپاس بۆ خوا بەس نییە زیندویت.. سوپاس بۆ خوا بەس نییە هەردو قاچت نیە، سوپاس بۆ خوا بەس نییە وەك کەسانی تر لاشەتیان تەسلیم بە خاك نەکردوە!! زۆر گریام.. زۆر نارەحەت بوم.. زۆر زۆر بێهیوا بوم لە ژیان.. ئای چیم بەسەرهات!! تازە ناتوانم وەك جاران بەناو زەویو کەژو کێو وبەراوەکاندا بە ئارەزوی خۆم گوزەر بکەم! تازە ناتوانم لە هاوڕێکانم دابڕام !! ئەوان یارییە جۆراو جۆرەکان ئەکەنو بەقاچەکانیان ڕادەکەن، بەڵام من تەنها خەمو خەفەتو حەسرەت.. خوایە گیان شوکرم بەبەشت.

ئای بەرێزان لەو ساتانە چەند ناخۆش بون!!
شەویَ تۆزێك هۆش خۆم هاتمەوە.. بەناچاری سەبوری خۆمدا.. داوام لە باوکم کردکە درێژەی ڕوداوەکەم بۆ وەگێڕێت، ئەگەر چی ئازاریشم زۆر بوئەویش دڵی نەشکاندم وتی: لەگەڵ زرمەی تەقینەوەکەدا پارچە بلۆکێك لە قاچی داویت‌و بردویەتی یان پارچە ئاسن‌و شتی تر بوبێت،
مەرکەزەکەی پشت ماڵی خۆمان تەقیوەتەوە.. زۆربەی خەڵکەکەی دەڵێن: ٢٠ صندوق تەقەمەنی (T.N.T) هاتبو بۆ مەرکەزەکەو لەوێوە بۆ ڕێگاوبانەکان دائیرەی ئیشغال بەکاری بهێنێت، بەڵام ئەو ڕۆژە کە ڕێکەوتی شەممە تەقیوەتەوەو مەرکەزەکەو فەرمانگەیەکی نزیك خۆی خاپور کردووە.
باشە بابە گیان کێ ئەم تەقینەوەی ئەنجامداوە؟
ڕۆڵە گیان کەس نایزانێ بەڵام بۆچونەکان زۆرن گوایە دەڵێن: ڕەنگە ئەم موادە خۆی گەرمی بەرکەوتوەو تەقیوەتەوە،
هەندێکیش ئەڵێن: ڕەنگە حەرەسەکە بەمەترسی نەزانیبێ فتکە جگەرەی تێفرێداوەو تەقیوەتەوە.
هەندێکیش ئەڵێن: پێش تەقینەوەکە دەنگی تەنها یەك فیشەك هاتووە.
هەندێکیش ئەڵێن: ڕەنگە تەوقیت کرابێت ، بەڵام لە کاتی ئیدامەدا تەقیوەتەوە.
ڕۆڵە گیان سوپاس بۆ خوا کە ئاوا دەرچویت ئەوانەی لە ناو سجنەکەو لەناو فەرمانگەکەو دەرەوەی فەرمانگەکەدابون هەمویان کەس نەیتوانیوە پارچەشیان بدۆزرێتەوە.. پارچە پارچەو هەپرون بە هەپرون بون.
لە قسەکانی باوکم سەرم قورس بو، بەرچاوم تاریك بوو، بە فێنکی ئاوی دەستی دکتۆرەکان هۆش خۆم هاتمەوە.. شەوگار چەند سەعاتێکی لێڕۆیشتبو، بە بێناگای ڕابردبوو. باوکم بە خەفەت‌و پەژارەوە وتی: بەڵێن بێت ئیتر هیچت لەو کارەساتە بۆ نەگێڕمەوە. شەوگار بەدەم ئازارو نارەحەتیەوە چرکەکانیان دەبونە سەعات‌و سەعاتەکانی دەبونە ساڵ. لە مەلا بانگداندا تۆزێك چاوم گەرم کرد.. ئەو حەپ‌و دەرزیانە کاریان تێکردم‌و چومە دەریای بێخودی‌و بێهۆشییەوە.
ئای نیعمەتی لەش ساغی چەند خۆشی ئیمامی مزگەوتی چوارتا هاتە سەردانم کە دۆستێکی نزیك باوك‌و مام بو ئەمەش کاتی (مواجە)بو بەرێزیان مەوعیزەی

خۆشیان خوێندەوە لەوانە کە زۆر کاری تێکردم (نیعمتان مغبون فیهما کثیر من الناس الصحة والفراغ) ئەوەی مرۆڤەکان بێئاگان‌و هەستی پێناکەن دوو نیعمەتی گەورەن کە (لەش ساغی‌و کاتی بە تاڵییە) بە ڕاستی جوانی فەرموو پێغەمبەری بەهەزاران درودو سەلام بۆ گیانی پاکی. بەڵێ: بەڵێ تا ئەم ساتانەش گەنجێکی سەرمەست‌و خوێن گەرم بوم هەستم بە نیعمەتی لەش ساغی نەکردبو. قسەو بیرو بۆ چونم زۆر جیاواز لە جاران گۆڕا..

لەدوای ئەوان مامۆستا نجم الدین کە ئەو کاتە (مطبق) بو لە قوتابخانەی سەرەتایی چوارتاو خزمی نزیکم بو وتی: کاکە کەمال گیان بە تەما بوم بچم بۆ قوتابخانە لە پاش تەقینەوەکە بە چەند خولەکێ هاتمە دەرەوەو بەرەو مەرکەزەکە ڕامکرد بەلام سەرنجمدا تۆ کەوتبوی حاڵت زۆر خراپ بوو پەلامارم دایت‌و ویستم هاوکاریت کەم بەلام بەپەلەو هەڵەداوان باوکت پەیدابو... خێرا رامکرد سەیارەیەکی جێبم بۆ هێنایت‌و خستمانیتە ناوی‌و بەرەو شار هێنامانی، خوا هەڵناگرێ دکتۆرەکان خێرا هاوکارییان کردین بارودۆخی چوارتا کەوتە ناناساییەوە هەرچی خەڵکی لەو ناوە هەبو وەك پەروانەی دەوری شەمع پەلەقاژەیان بوو نایانزانی بۆ کوێ ڕابکەن خەڵکی تریش بە ئەرکی سەرشانیان هەستان‌و بە (گوێنی پارچەی لاشەکانیان) کۆدەکردەوە.. بڕوا بکە دەڵێن دەرگای مەرکەزەکە کە زیاتر لە سێ مەتر پانی‌و بەرزی بوو هەڵیداوە بۆ نزیك خمانی کە پێی دەڵێن (پاتاران)، ئەم قسەو باسانە سەریان کاس دەکردم.. خۆزگە ئەوەندەیان قسە ناکرد! پیاوێکی تر وتی: حەرەسی سەبانەکە بەبەتانی‌و پێخەفەوە لولی کردووەو لە خوار چوارتاوە بە دوری کیلۆمەترێك دۆزیویانەتەوە، نرکەو ناڵەو گورو تینی لەوەدانەبو باس بکرێت..

زۆرم لە خۆم کرد بۆ پرسیارێك: باشە ئەی ئەو پۆلیسانەی کە لە مەرکەزەکەیابون، ئەی ئەو سجنانەی کە بە تەمابەن بەرببن.. ئایا چارەنوسیان ونبو؟

باوکم وتی: ڕۆژێ پێشتر دوو کوڕو باوکێکیان خستە سجنەوە کە خەڵکی (مامە خلان) بون چونکە شەڕیان کردبو بە هیوابون لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێت، بەلام کەس پارچەی نەدۆزینەوە سێ پیاوی (باسنێ)ی تیابوو کارو باریان تەواو بوبو کە ڕۆژی پێنج شەممە بەربین بەلام مدیر لەوێ نەبو بۆیان ئیمزا بکات خستیانە ڕۆژی شەممە

ئەو کاتەبەردەبن ئەمانیش کەس یەك پارچەی لێنەدۆزینەوەناى نسیب لەکوێوە هاتیو لەکوێ ژیایتو لە کوێ وەفاتت کردو بەچی تیاچویت!!

ماوەیەکی زۆر لە خەستەخانە مامەوە.. هەمو کەسێك سەردانی دەکردم .. هەمویان دڵخۆشیان ئەدامەوە، هەریەکەو قسەیەکی تازەی پێبو لەسەر ڕوداوە دڵ تەزێنەکە کاك عوسمان کە ئێستا برین پێچەو وتی: لێپرسراوی ئەمن پیاوێکی عەرەبی باش بو ناوی (عەبد) بو بەیانی هەستا بو خۆی بگۆڕێ کاتێکیزانی بوبە دووری ١٠٠ مەتر لەسەر جادەکە بە پێوە خۆی بینی بۆوەو هیچی لێنەهاتبو بەڵام هاوەڵە ئەمنەکانی زۆر خراپ بون هەمویان تیاچونو مردن کارە چاکەکانیو ڕەوشتی جوانی لە مردن ڕزگاری کردو خراپی هاوەڵەکانی تیاچون بو.

لەدوا ڕۆژی خەستەخانەدا زۆر سوپاسی دکتۆر موزەمیدو پاسەوانەکانو کارگوزارەکانم کرد بەرەو چوارتا گەڕاینەوە.. بەهەمو نزیکبونەوەیەك چرکە ساتەکانی کارەساتەکەم یاد ئەکەوتەوە.. جار جارەش سەرنجی خۆم ئەدا تازە نابمەوە بە گەنجەکەی جاران بەڵام سەبوریو غیرەتم بۆ خۆم دروست دەکردو بەس نییە وەك ئەو هەمو کەسە منیش تیانەچوم!!

ئای چەکی تەقەمەنی نەفرەتت لێبێ بۆ چییان هێنایتو چیت بەسەرمان هێنا، چەند ڕۆژێك لە ماڵ مامەوە.. دەستە دەستە ژنو منداڵو خەڵکی سەردانیان دەکردم، بە دیداریان شاد دەبوم بە ڕۆیشتنیان غەمبار دەبوم،دوو دار شەقیان بۆ هێنام، بە دیمەنێك زۆر ناڕەحەت بوم، برا بچوکەکەم جوتێ پێڵاوی بۆ هێنامە پێشەوە تالە پێی بکەمو بەرەو جێگەی ڕووداوەکە تۆزێك بجوڵێم.. دایکم دەستی کردە گریان کەمال گیان دەك کوێر بومایەو تۆم ئاوا نەدیایە.. تاکی چەپم لەپێ کردو بە سەری دارشەقەکەم تاکە پێڵاوەکەی قاچی ڕاستم دورخستەوەو لەو کاتەوە ماڵئاوایم لە تاکی ڕاستی پێڵاوکرد..

هێدی هێدی ئەو ماوەیەی بە چەند چرکەیەك جاران دەمبڕی بە دوو قاچەکانم، ئێستا بە ناڕەحەتیو بە زەلیلی بە چەند خولەکێو دوای ماندوبونێکی زۆر دەمتوانی بیبڕم..

لەدوای ئەو هەمو ڕۆژەش هەستم بە لەش داهێزراویو شەکەتیو کاسیو ماندوبون دەکرد.

هەنگاو هەنگاو لە جێگەی کارەساتەکە نزیك دەبومەوە.. سات بە سات لێدانی دڵو دڵە خورپەم زیادی دەکرد.. بۆ نازانم..

لە نزیك شوێنی ڕوداوەکە دانیشتمو تێر سەرنجی ئەو ناوەمدا.. پێش چەند ڕۆژێك ئێرە چی بو ئێستا چی بەسەر هاتوە،دنیا ئاوا یەتو ئاواش کۆتایی دێت.. دنیا پڕ لە خۆشییە بەڵام یەك ناخۆشی هەموی دەشواتەوە.

کاك عوسمان لە تەنیشتم دانیشتو وتی: ئەو ڕۆژە ٨ پۆلیس ٢ کارگوزار ، ٧ ئەمن، ٥ سجنو ٢ هاوڵاتی تیاچون ئیتر لەو ساتەوە بڕیارم دا لە ژیاندا کۆشش بکەمو یەکەمنەندامی ئەبمە جێگەی بەزەیی خەڵکی.. ئەو ساڵە باری دەرونیم زۆر خراپ بوو.. بەڵام دەسەڵات چییە..

حکومەتی ئەو کاتەی عیراق هاوکاری کردم .. بە بەخشینی سەیارەیەك بۆ کەمئەندامیم بە نرخێکی زۆر کەم پلەکانی خوێندنم بەسەرکەوتوی بڕیو بە نانی خۆم گەیشتم ڕۆژی یەکەم لە فەرمانگەی چوارتا بە فەرمانبەر دامەزرام .. زۆر لە فەرمانبەرەکانی خەڵکی شارو شوێنەکانی تربون .. پاش ماوەیەك کۆشکی خێزانیم پێکەوەنا..

هیواو ئاواتی گەورەم بۆ خۆم دروستکرد، پیاو چاکانو ڕاستگۆیانم کردە سەرمەشقی خۆم ئێستا دوای ئەو هەمو ساڵانەو دوای ئەو هەمو شەڕو شۆڕەی (ئێرانو عیراق) گەڕاومەتەوە شارۆچکەکەی خۆمو لەگەڵ هاوسەرو منداڵە خۆشەویستەکانماو لەگەڵ خزمو کەسو کارو هاوڕێیانما ژیانی سادەو ساکار بەسەردەبەین .. بەڵام بە بینینی ئەو جێگایە ئەو چرکە ساتانەم هەر بیر دەکەوێتەوە ئەگەر چی حکومەتی عیراقی پاش ماوەیەکی کەم بیناو کۆشکی تری تیا دروستکرد قەرەبوی زیانەکەی دایەوە بەڵام هەڵەیەك بو کرا .. کێ کردی .. کەس نەیزانی ئاکامەکەی زیاترە لە ٢٤ قوربانی گیانیو چەندین لایەنی مادی .. هیوادارم ئێوەش بۆ ژیان دڵخۆش بنو کۆڵنەدەربن بەرامبەر هەمو نائارامیو کەوتنێ چۆك دانەدەن خۆراگرو ماندو نەناسو هیمەت بەرزبن تا بەبەرزی یاد بکرێنەوە سوپاس بۆ هاوسۆزیتان.

# بەشدار بە لەم پڕۆژەیەدا

ئەوکاتەی بەڵێنی بەلفۆر لە ساڵی ۱۹۱۷ دەرچوو، هەمو وڵاتانی ئەوروپی پێشوازیان لێکرد.. کە دەوڵەتێکی گەورەی یەکگرتو بۆ جولەکە (یەهودی) دابمەزرێنن لەسەر خاکی عەرەبو دروستکردنی چقڵێك بۆ جیهانی ئیسلامی.. هەمو جولەکەکان ئاواتو ئامانجیان هاتنەدی ئەو ڕۆژە بووئەمە خەونی چەند ساڵەی جولەکە بو لە هەمو جیهاندا بە پەرتەوازەیو دابڕ دابڕی نەمێنێتەوە ئیتر هەر جێگەیەکە مەبەست نیە!

بەڵام ئەوروپا بۆ دورخستنەوەی ترسنۆکیو ئاژاوە گێڕی جوەکان زۆر خۆشحاڵ بوو بەو جێگەو ڕێگەیە.

بڕیارەکە وا هاتە بون کە بەهەمو لایەك پیتاك کۆبکرێتەوە.. هاوکاری دەستگیرۆی بەهەمو شێوەیەك بۆ یەکخستنەوەی کەسایەتی جولەکە لەم جێگایەدا..

چەندین نمونەو بابەتی بەپێزو چەسپاویان دروستکردو کاریان بۆ کرد کە بۆ خەڵکی جیهان بسەلمێ کە ئەم فەلەستینە موڵكو خاکی چەند ساڵەی جولەکەیەو عەرەبو ئیسلام غەدریان لێکردونو شاربەدەرو ئاوارەیان کردون...

قسە زۆر کراوە لەسەر جولەکەو ڕێگەو شوێنو پرۆتۆکۆلەکانیان..یەکێك لەو پڕوپاگەندانە یارمەتیانەی کاری بۆ کرا وشەی (پیپسی) بو.

سەرەتا وشەی (PEPSI) لە چییەوە هاتوە، کە کارگەی جولەکەیەك بوە.

| | | |
|---|---|---|
| ببەخشە | ادفع | P پەی |
| هەمو | کل | E ئێڤری |
| بچوکترین عوملەی بریتانی | پنس | P پنس |
| بۆرزگاربونی | لکی تنقذ | S تو سەیف |
| جولەکە (ئیسرائیل) | اسرائیل | I اسرائیل |

بە کورتی:

- پارە ببەخشە ئەگەر (پنسێکیش) بووە بۆ ڕزگاربونی جولەکە لەو خەڵکەیەیان گەیاند کە دەبێت هەمو هاوکاری جولەکەو بەنامەکەی بکەن..

لێرەدا بابەتێك دێنمە خزمەتتان کە دەشێت ئێمەی مسوڵمان .. کورد .. لارەمل.. وانەی لێوەربگرین بۆ هەمو ساتەکانی ژیانی ڕۆژانەو ساڵانەمان تا بیر لە داهاتوی نەتەوەی خۆمان .. ژیانی نائاسودەیی خۆمان بکەینەوە..

وەك خۆی ڕوداوەکە باس دەکەم دوای خۆی بڕیار بدە کە چیبکەیت؟! لە بەریتانیاوە کاغەزێکیان دامێ کە بیگەیەنمە دەستی یەکێك لە ملیارلەرەکانی ئەمریکا لە کیشوەری ئەمریکا بۆ وەرگرتنی پارەو پولی زۆر بۆ دامەزراندنی (حکومەتی جولەکە) ئیسرائیل لە فەلەستیندا...

ئەو نامەیەی من دەمگەیاند، سەدان نامەی تری لەبەر نوسرابۆوە بۆ هەمو دەوڵەمەندەکانی جیهان...

ڕۆژی دیاریکراو نامەکەم وەرگرت، ئەدرەسی دەوڵەمەندەکەش بەهەمان شێوە.پاش چەند ڕۆژێك گەیشتمە دەرگای ماڵی دەوڵەمەندەکە، هەواڵم پرسی لە ماڵ نەبوو ناونیشانی نوسینگەکەیان دامێ .. لەگەڵ کۆمپانیاو دامو دەزگاکەیدا..بڕیارمدا بچمە نوسینگەکەی ..دوای ماندو بونێکی زۆرو ئارەقکردنەوەو شەکەتیو برسێتی زۆر گەیشتمە نوسینگەکەی،لە دەرگای نوسینگەکەی چومە ژووری دوای ڕۆژباشو هەواڵ پرسین پشویەکم دا.. دەستی برد جگەرەیەکی بۆ ڕاگرتم.. لێم وەرگرت.. دەستم برد بۆ شقارتەکە دایبگرسێنم..

دەنکە شقارتەیەکم دەرهێناو ویستم ئاگری بدەم... بەلام دەستی گرتمو شقارتەکەی لەسەر مێزەکە پێدانامەوە.. بە جگەرەکەی خۆی جگەرەکەی بۆ من داگیرساند،پاش هەندێ گفتوگۆ .. لە دڵی خۆمدا: وتم ئەی هەرەس بە ماڵم بۆلای یەکێکی باشیان ناردوم.. بەخوا ڕەزیلە.. لەوە ئەچێ کەس سودی لێوەرنەگرێت،باش وایە هیچ قسە نەکەمو بە ڕێگەی خۆما بگەڕێمەوە .. ئەمە بۆ دەنکە شقارتەیەك ئاوا بێت ئەی بۆ پارەو پارمەتی جولەکە .. ئەوە هەر هیچ .. پاش کەمێك پرسی:کاکە بۆچی هاتوی؟تۆزێ شپرزەبوم پاشان وتم: هیچ .. بۆ هیچ .. تەنها لە ئەوروپاوە هاتومەتە سەردانی تۆ! ئیتر دوبارەی نەکردەوە..

بەڵام لە دڵی خۆمدا وتمەوە: خۆ من تەنها ڕاسپاردەم.. تۆ بڵێی بمکوژێت..وەڵڵا نامەکەی دەدەمەدەست..پاش تۆزێك تێڕوانین وتم: بەڕێزتان لەم شارە ئەژین و ئەم نامەیەش بۆ ئێوە هاتووە..

نامەکەم دایە دەست.. لەگەڵ چاوگێڕانی بەدێڕی نوسراوەکەدا.. من لە خۆم بێزار دەبوم بەڵام هیوایەکی گەورەم هەبو ئەم نا ئەو..لەگەڵ تەواوبونی نامەکە.. نامەکەی قەدکردو دەستی کرد بە چەکمەجەی مێزەکەیدا،لەدڵی خۆمدا وتم: خۆت ئامادەبکە بۆ دوو فیشەکی دەمانچەو تەواو..

بەڵام وانەبو.. نەخێر .. چەند وەرەقەیەکی دەرهێنا کە چەکی بانق بو.. خستیە بەر دەستم وتی: بە پێنوسەکەت چەندەتان پێویستە بنوسە.. بەچەند کارتان مەیسەر دەبێت بنوسە،زۆر سەرسام بوم!! ئەمە چییە؟ ئێستا چۆنەو تۆزێك لەمەو پێش چۆنبو؟!

لە خەیاڵی خۆمدا وتم: ڕەنگە پێم ڕابوێرێ.. گاڵتەجاڕی بێت بەلایەوە ئەوەندەی لە تواناو بیرمدا بوو نوسیم نزیکەی (٤٠٠٠) دۆلارم نوسی.. لێی وەرگرتم سەیری کرد،لە خەیاڵی خۆمدا وتم: ئێستا قاقایەك لێدەدات و بەشەقێك دەمکاتە دەرەوە. بەڵام ئەم بۆ چونەشم هەڵەبوو..

قەڵەمەکەی لە دەست وەرگرتم و کردی بە دوو ئەوەندە واتە ٨٠٠٠ هەشت هەزار دۆلار.

زۆر سەرسام بوم.. پاش کەمێك وتی: بچۆ لە بانك وەریبگرەو سڵاوم بگەیەنە بە هەمو هاوڕێ و هاوکارانت..چەکەکەم هەلگرت و سوپاسم کرد.. هاتمە دەرەوە لەگەڵم هات و بەڕێی کردم ... لە دوا قسەیدا وتی: هەرچیەکتان پێویست بو لە خزمەتاندام..

بەڵام ئەوەی لە دڵی مندا بو بەگرێ هەروتم..

کای بەڕێز دوو شت زۆر سەرسامی کردم!!

وتی: بفەرمو.. چیبون؟

وتم: بۆ نەتهێشتنەو جگەرەیە بەم شقارتەیە دابگیرسێنم، ئەمە یەك، دووەم بۆ ئەوەندە پارەی زیادت بۆ نوسیم؟!

لە وەڵامدا قسەیەکی زۆر جوانی کرد وتی: ئەو شقارتەیە هیچ جێگەو سودی نەبوو، کە بە جگەرەکەی من داتگیرساند هەرکارەکە سەری نەگرت جێبەجێ نەبو؟!

وتم: با جێبەجێ بوو. وتم: ئەی ئەم هەمو پارەیە؟!

وتی: ئەمە بۆ کارێکی گەورەو پرۆژەیەکی گرنگە بە چەندە بەشداریم ئێستا هەر بە کەمی ئەزانم‌و جێگەیەکی دەگرێت‌و لە داهاتودا سودی دەبێت، بەڵام ئەو دەنکە شقارتەیە هیچ جێگەیەکی ناگرت‌و سودی نابوو..بۆیە بۆ پرۆژەو کاری لەو جۆرە سەرم پێوە نییە..خوا حافیزەم لێکردو گەڕامەوە..ئێمە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا چەندین کار ئەنجام دەدەین سودی نییەو هیچ بەلاشمانەوە گرنگ نییە..

لەو لاشەوە چەندین پرۆژەو کاری جوان‌و مرۆڤ دۆستانەو کورد پەروەرانەو ئیسلام خوازانەو خێرخوازانە هەیە.. هاوکاری ناکەین‌و دەستی یارمەتی بۆ درێژ ناکەین.. یان بە هیچ هەنگاوێ بەرەو ڕوی ناچین‌و لە پاساوی خۆ گێل کردنەوە لە خۆمانی دوور نەخەینەوە تا ئەکەوێتە گۆشەی ڕەزیلی‌و نەفامی‌و لارەملییەوە بەرەو وڵاتانی خاوەن ئەزمەن‌و کارو کاسبی دەڕۆین‌و هاواری هاوکاریمان بۆیان بەرز ئەبێتەوە..

دەناوڕ بدەرەوەو بیر بکەرەوە بزانە وەهایە.. یان نا.. دەستگیرۆیی چەند قوتابیت کردووە بەلانی (مادی‌و مەعنەوی) بۆ تەواوکردنی خوێندن، یارمەتی چەند بێباوك‌و بێوەژنت داوە کە هەست بە کەم پارەیی نەکات، ئایا یارمەتی چەند خاوەن قەڵەمتداوە بۆ هاتنە بونی پرۆژەی جوانی گەش کە خزمەت بەنەتەوە بکات.. ئایاو چەندین ئایای تر.. بیرت نەچێ چەندین پارەو پولت بە خۆڕایی ڕۆیشتوە لە کارو کردەوەو خۆراکی بێئاکامدا.. لە کۆتایدا چیرۆك‌و ئاکامی کەسێکی تورکیان بیردەخەمەوە کە لە کۆتایی ساڵەکانی نەوەدا لە شارەکەی خۆیاندا کە زۆر پێویستیان بە مزگەوتێ بو مزگەوتێکی دروستکردخەڵکەکە لێیا پرسی بەچی ئەم مزگەوتەت دروستکرد؟

لە وەڵامدا وتی: حەزم لە هەرشتێ کرد بێ کەمێکم لێکرپوەو ئەوەکەی تری (پارەکەی) خستومەتە دەغیلەکەو ناوم ناوە گریمان خواردم.یان هەر لێم نەخواردوەو پارەکەیم لاداوە.. پاش چەند ساڵێك پارەکەم زۆر بو بەهاوکاری چەند کەسێکی تر کردم بەم پرۆژە خێرییە..لە کۆتاییدا دەبا هەمومان سود لە کەرسەیەك وەربگرین‌و زیادەڕەوی تیانەکەین بە پێی پێوست کاربکەین‌و ئاکامی جوانمان هەبێت..خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (كلوا واشربوا ولاتسرفوا ان الله لايحب المسرفين)

ماڵەکەت بە لۆکسێ ڕوناکە.. یان بە چرایەك یان بە گڵۆپێکی شەحن بەڵام کە کارەبا هاتەوە مەچۆ (١٠ - ١٥) گڵۆپ دابگرسێنی .. وریا بە .. کاری جوان ئاکامی جوان دەبێت،

٤٠. کارێك بکە جێگە بگرێ کارێ مەکە ڕێگە بگرێ.

# لە ئاکامی بەخشیندا ئەوین هاتەبون!

ئایا بەخشین دەردو بەلا دور نەخاتەوە؟ ئایا دەستت تێنەچێ لە باشترین شتی خۆت خێرێ بۆ خۆت بکەیت؟

کاك عبدول مایاوایی کە تەمەنێکی لە فەرمانگەی ئاگرکوژێنەوەی سلێمانیو چوارتاو پێنجوێنو بازیان بەسەر بردووە بەرێزیان لە ئێوارە پیاسەیەکدا بە تامەزرۆییەوە ئەم رووداوە واقعییە پەند ئامێزەی بۆ باسکردم.

لەم چەند رۆژی رابردوەدا بە مەبەستی وەرگرتنی زەوی میری بە ناوی فەرمانگەکەمانەوە چوینە لای ئەندازیارەکەو ژمارەمان لە (٥) کەسێك دادەبوین کە کارمان لەلای جەنابی ئەندازیار دیاریکردنی سنورو جێگەی زەوییەکان بوو.

سەرەتا وتی: بانانێك بخۆینو ئینجا برۆین،لەم کاتەدا هەریەکەو داوای شیشێ یان دوانمان کرد لە جگەر... گۆشت...بۆمان هات.

یەکێك لە هاورێکانمان داوای دو ئەوەندەی لە ئێمە زیاتری کرد.. تا نانەکەمان بۆئامادەبو.

وتی: تا ئەتوانن بخۆن هیچ درێغی لە نەفسی خۆتان مەکەن خوای گەورە ناردویەتیو بڕیویەتیەوە بۆمان.

هەڵمدایەو وتم: بەگوێرەی تواناو تەمەنو گیرفان درێغی ناکەین هەرشتێکیش نسیبی ئێمە بێت هەردەبێت.

لە نانخواردن بوینەوە.. کاکی ئەندازیار زۆر هەوڵیدا کە پارەکەی ئێمەش بدات بەڵام نەمانهێشت ئەویش نەیهێشت پارەی بۆ بدەین.

ئەو ڕێگەیەی بۆی دەچوین تۆزێك دور بو لە دەرەوەی شار بوو، لە ناو سەیارەکەدا کە تێپەڕدەبو بەناو شەقامی قەرەباڵغو تاساویدا .. کاکی خاوەن قسەی یەکەم جار وتی: بخۆینو نەخۆین خوای گەورە بڕیویەتیەوە ئەوە نسیبمانەو ڕەزیلی ناوێ پاش ماوەیەك کەوتە گێڕانەوەی حاڵی خۆیو وتی:

ماوەیەکی زۆر بوو دکتۆرو دکتۆرم ئەکرد.. ئەم بەڕێزانە بە ئارەزی خۆیان گەدەی منیان کردبوو جێگەی تاقیکردنەوەی دەرمانی کیمیاییو بە چاك نەبونم سەریان سوڕدەما.

دواجار ڕووم لە بەغداد کرد.. دوای پشکنینو دانانی چارەسەرو دەرچونی شیکاری پزیشکەکان بۆیان دەرکەوت توشی (شێرپەنجەی کۆلۆن) بوم.

بە بیستنی ئەم هەواڵە وزەو تواناو هێزم نەما.. بڕوا بفەرمون نامتوانی قاچ بەرز بکەمەوە بۆ سواربونی سەیارەکەم.. زۆر ناڕەحەت بوم .. هەرچیم دەخوارد دەبوە هەژدیهاو دەچوە سکمەوە.. بەڕێزان ئەوەی ئازاری نەچەشتبێ نازانێ ئازار چەند ناخۆشە.. ئەوەی هەواڵی ناخۆشی بە هەمو شێوەیەك نەبیستبێ نازانێ چەند ناخۆشە!!

بەرەو شار گەڕامەوە.. سات بە سات چرکە بە چرکە هەستم بە دابەزینی کێشم دەکردو زۆر ناڕەحەت بووم.. ئەوەی بۆ من نوسرابو بیخۆم تەنها چەند دەنکە حەپێكو بابەتی شلەمەنی بەبێ چەوریو بابەتی تر، ئەمە سەروەتو سامانەکەمە، ئەمەماڵو منداڵەکەمە .. هەموی ناتوانن تەنها یەك چرکە سات ناخۆشیو ئەخۆشیم لێدور بخەنەوە .. ئەمە هێزی لاوازی منەو هێزی بە هێزم لەگەڵ بەفرەکەی پارتوایەوە.. بەڵێ ڕۆیشتو نەما.

ئەو پارە مۆڵەی هەمبو ئەو خواردنە خۆشانەی دروستدەکران هەموی بونە قائمەی (خراپە نەیخۆی)! (یوم لا ینفع مال و لا بنون الا من اتی الله بقلب سلیم) چاو بە ئەشكو دڵپڕ غەمو دەستەو ئەژنۆ.. زەردو زەعیفو کەفتەکار بە ئازارەوە ئەتلامەوە.

خزمو کەسو کارو ناسیاوان دەستە دەستە دەهاتنە سەردانم، بەڵام هیچیان نەیانتوانی یەك زەڕە لە ئازارەکانم کەم بکەنەوە.

بەو ئازارو ناخۆشیەوە سوار سەیارەکەم بومو خۆم گەیاندە مەیانی حەیوانەکەو دوو سەر بەرانی قەڵەوی باشم کڕیو لەگەڵ قەسابێکدا هاتینەوە..

لە حەوشەی ماڵەوەماندا هەردوکیانم کردە خێری مەولوی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم ) بە نیازی کەمبونەوەی ئازارو ناڕەحەتی، لەو ڕۆژگارانەشدا خواردنی گۆشت تاسق بوو نەبو دەگمەن بو. دانەیەکیان بۆ بەرو دراوسێو ئەوی تریان بۆ ئەو ماڵە هەژارانەی کە لێمەوە دوربون هەمو بۆنی گۆشت مەستی کردن.. هەمو مربون لە خواردنی گۆشتی تازەی برژاو.. تەنها منێکی ئەخۆشی سەرەتا ناوی نەبێت .. لەو لاوە بەگزیەوە قاپێ

(کاستەر)یان بۆ هێنام‌و بە قێزو بێز خواردم، هەندێك سەرنجم لە هەڵپەو ڕاکەیانداو ئاهێکم هەڵکێشا چومە ژورەکەی خۆم‌و بەدەم ئێش‌و ئازارەوە خۆمدا بەزەویدا .. لەو پسولەی دکتۆرانە وردبومەوەو سەرنجم دەدان کە (شێرپەنجەی منیان دەسەلماند).

چەند ڕۆژێکی تر ئەم ژورە خاڵیە لە تۆی ئاوسك ئاگراوی .. چەند ڕۆژێکیتر ئەم ماڵە تەنها یادی قسەو هەڵسوکەوتی تۆ دەکەنەوەو ساڵێکی تر ئەم ڕۆژگارە کەس تۆی بیر نەماوە.چاوەڕوانی زۆر ناخۆشە .. لەوەش ناخۆشتر چاوەڕوانی مەرگ. لە دورەوە سەرنجم لە وێنەی لاوێتیم دەداو شیعرەکەی (هەردی)م بیر دەکەوتەوە کە دەڵێ:

به سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم

شریتی عومری ڕابردووم وەکو خەو دێتە بەرچاوم

دەم بە زیکرو دڵ بە فیکرەوە لە خەوێکی قوڵ ڕۆچوم .. ئەتوت چەند ساڵێکە خەو لە چاوەکانم تۆراوە.. ئەوە ماوەیەکی زۆرە بە دڵی خۆم تێر خەو نەبوم.

لە مەستی خەو خەواڵوبونم سەمەرەیەکی سەیر بوو.. بەهەر حاڵ قوڵبومەوە لە خەودا .. لە ماڵ‌و مناڵ دابڕام‌و ئەوانیش بێئاگا لە من..

نازانم چەند بو خەوم لێکەوتبوو!! نازانم بڕوا ئەکەن یان نا؟! نازانم ئەمە یەکەم جاربو ئەو کەسە .. ئەو دیمەنە.. ئەو خۆشیە ببینم..

لە چۆڵەوانیەکدا بە تەنها دانیشتبوم یەکێك سێبەرەکەی هات بەسەرماو لە دواوە هەستم بە خشپەی قاچەکانی کرد.. بە بێ هیوای‌و نارەحەتیەکەوە سەرێکم هەڵبڕی.. پیاوێکی سەرتاپا سپی نورانی جوان‌و بە هەیبەت بانگی کردم .. بە ئازارەوە وتم: بەڵێ قوربان چی ئەفەرموی.دەستی خستە سەر شانم بە دەستەکەی تری دوو دەنك خورمای دامێ فەرموی: بیخۆ.. لێم وەرگرەو بیخۆ.

منیش بە گومان و ترسەوە وتم: قوربان سەرەتا بابزانم جەنابتان کێن؟

پاشان من لە خواردنی شلەمەنی زیاتر هیچیترم بۆ باش نییە.. قورگم پڕ بولە گریان‌و وتم: من سەرەتانمە.. ئەمە خراپە بۆ من.

فەرموی: من خۆشەویستەکەی تۆم کە چەند هەزارێکت لەبەر خاتری خواو من تێرکردو خۆشی کەوتە ماڵیانەوە .. من چارەسازی تۆم.. ئەمە بخۆو خوات لەگەڵ.

لە دەستی پیرۆزیم وەرگرت‌و خواردم .. هەردوو دەنکە خورماکەم خوارد، لە دڵدا وتم: نۆخەی ئەمە پێغەمبەرەکەمە ئاگای لێمە. کاتێك سەرم هەڵبڕی جەمالی جوانیان

دیارنەماو ڕۆیشتن.. پاش ماوەیەك لەخەو بەخەبەرهاتم .. هەستم کرد باری لەشم سوك بووە، (الحمدلله)م کرد.. زۆر لەش ساغ دیاربوم بەکەسم نەوت خێرا چومە سەر دەستشۆرەکەو دەستنوێژم گرتو لە سوپاس گوزاریدا چەند ڕکاتێك نوێژم خوێند، تامی ئەو نوێژانە زۆر خۆش بوە هەستم بە برسێتی کرد .. هاوارم لە ماڵو منداڵ کرد: گێلاس .. هەتاو.. مناڵان وەرن ئیشم پێتانە.. وەرن..خێرا هەمویان هاتنە بەردەممو وتیان فەرمو: بەقوربانتان بم هەرئێستا بچن کیلۆیەك خورمای بێناوکم بۆ بکڕنو بۆم بکەنە خورماو ڕۆن.

دایکی مناڵەکان وتی: پیاوەکە بۆ تۆ خراپە.. خۆ تێك نەچوی.. تۆ نەخۆشی!

وتم: ئەزانم .. بەڵام شیفام بە خورما هاتوە خێرا بڕۆن.

بە گومانەوە سەیریان ئەکرد.. بەدوو دڵیەو ڕۆیشتن.

پاش ماوەیەك تاوەیەك خورماو ڕۆنیان خستە بەردەمم.. ئای کە خۆش بو سەرەتا کەوچکێکم لێخواردو تا ئەوان سەرنجیان ئەدام من تاوە خورماو ڕۆنەکەم تەواو کرد.

خێزانەکەم وتی: ئەزانی ئەمری بۆیە بێ دڵی خۆت ناکەیت..

بە پێکەنینەوە وتم: دڵنیابە چاك بومەتەوە.. دڵنیابە شیفام بۆ هات..

جاران نابو لە شلەمەنی زیاتر بخۆم بەڵام ئێستا دەتوانم یەك مریشك یەك ڕانی بەرخ بە تەنها بخۆم..

زۆر بە خۆشیەوە خەوەکەم بۆ گێڕانەوە.. هەمو ماڵو منداڵ پەلاماریان دامو دەستو ڕومەتو لاشەیان کردمە جێگەی ماچو خۆشی چۆن کەوتە ماڵی هەزارانەوە خۆشی وەها زیاتریش کەوتە ماڵی ئێمەوە.

لەو ڕۆژەوە کردومەتە بەرنامە بەیانیان بە ناشتا کەوچکێك بنێشتە تاڵو پاشان هەنگوینو ڕەشکەو خورما بەدوایەکدا دەخۆم..

نوێژەکان بە جەماعەت ئەنجام دەدەم لە هەر جێگەیەك بم .. دوعای خێر بۆ ئەو کەسانەش ئەکەم کە گرفتاری نەخۆشین.. بابە ماڵو سەروەتەکەیان نەخۆشیو نارەحەتی لە خۆیان دور بخەنەوە .. تا دەتوانن ببەخشن تا لەش لاساغو هیمەت بەرزبن.. ئەوەتا کە ئەمبینن، ستایش بۆ پەروەردگاری پیرۆز.

# تەمەنی کورت... میوانداریيەکی کورت

مانگی پێنج بوو وەك ئارەزومەندانی شارەکەمان رومان کردە سەیرانگای دوکان..
لەبەر فەرمبالغیو زۆری سەیارە نەگەیشتینە سەر سەیرانگای دوکانو لە فەشقۆلی لاماندا دەستمان کردە یاریو شەڕە ئاو و تۆپ تۆپێن..
پاش خواردنی ژەمی یەکەم روم لە ماڵو منداڵەکەم کردو پارمەتیم لێوەرگرت کە ئوتومبێلەکەم بشۆم.. ئەوانیش بە ئارەزو خۆیان جەوی خۆیان وەرگرنو ئاگاداری خۆشیان بن چومە فەراغ ئاوەکەی فەشکۆلیو دەستم کردە سەیارە شتن.. نیوەی سەیارەکەم شۆرد.. کاتێکم زانی زۆر لەسەرو ئێمەوەو لەوبەر ئاوەکەوە هاوار هاوار پەیدا بو هەرخەڵك بو ڕای ئەکردو هاواری لە خەڵکی فەراغ ئاوەکە ئەکرد..
منیش سەرم هەڵبڕی بزانم ئەم دەنگە دەنگو هاوار هاوارە چییە.
کەسەرنجمدا منداڵێکی سێ ساڵانە لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا سەرو بن ئەکاو ئاو بەرەو خوار ئەیهێنێ..
لەمنەوە دور بوو بەڵام خۆم پێنەگیرا.. خۆم خستە ناو ئاوەکەوە بەمەلە کردن بەرەو ڕوی ئاراستەی منداڵە ڕۆیشتم.. خوای گەورە پارمەتی دامو گرتمەوە.. لەوبەر ئاوەکەوە بوبە چەپڵە لێدانو دەستخۆشی.. هێنامەوە لای سەیارەکەی خۆمو خەڵك بەسەرما دابارین.. فریاکەوتنی سەرەتایم بۆ ئەنجامداو دەستم نایە سنگیا.. هەندێك ئاو هاتە دەرێو منداڵەکە چاوی کردەوە.. خێرا خستمە ناو سەیارەکەمو بەخۆشییەوە بردمەوە بۆلای دایکیو باوکی کەلەو بەرەوە وەك باڵدار باڵیان لێپەیدا بوبو.زۆر خۆشحاڵبوم کە توانیم ئەو منداڵە لە خنکان ڕزگار بکەمو بە پشتیوانی خوای ویستی خوای گەورە ئەو تەمەنە کورتە بکەمەوە میوانی دایەو بابەی..
لەسەر پردەکەی دوکان پەڕیمەوەو سەرەو خوار بردمەوەوە ئەو بەر ئاوەکەو گەیاندمەوە دەستی دایەو بابەی.
دایەو بابەی نایانزانی بەچ شێوەیەكو بەچ زمانێ سوپاسم بکەنو بەڵام قەدەری خوای گەورە وەها بو.. کە ئەم شەرەفە بە من ببڕێ.. ئەو منداڵە تاقانەیەیان ڕزگاری بوو.

ویستم بگەڕێمەوە..بەڵام دایكو باوكی منداڵەكە زۆر پێداگیریان كردو درو ئاسایی تێم ئالآن كە نابێ بڕۆم تانانی نیوەڕۆیان لەگەڵدا نەخۆم..

ناو بەناو خەڵكی لەوێوە گوزەریان ئەكردو سەیری منیان ئەكرد كە ئەو منداڵەم ڕزگار كردبوو لە مردنو ژیانی گەشایەوە، دایەو بابەی تەنها ئەو منداڵەیان هەبو، نانیان ئامادەكردو بەدەم قسەی خۆشو باسی ڕابردوەوە كەوتنە گفتوگۆ كردنو نانیان بۆ منداڵە تاقانەكەیان دانا.. بەڵام منداڵەكە زۆر بەشێوەیەكی نائاسای سەیری منو دایكو باوكی ئەكرد.

چا خورایەوەو زۆر سوپاسم كردن بۆ ئەو میواندارییەو ئەوانیش زۆر سوپاسی منیان كرد بۆ ئەو خزمەتو هاوكارییە كردمن ئەمە زیاد لە كاژێرێكی خایاند .

سوار سەیارەكەم بومەوەو لەبەر ئەوەی سەیارەیەكی تر تازە هاتبو وەستا بو پێشی گرتبوم ناچار كەزانیم پاشم بەتاڵە هێواش هێواش بەگم داناو چومە دواوە.. بەڵام لەپڕ هاوار بەرز بۆوە.. هۆپ... هۆپ.. لێتدا بوەستە..

سەرم لێشێوا خێرا تر چومە دواوەو وەستام.. لەپڕ وتیان: دابەزە دابەزە كە دابەزیم ئای خوای گەورە چ ببینم..! ئای لەو كارەساتە ..! ئای لەو ڕووزەردییە..! ئای لەو خەفەتە گەورەیە..!

ئەزانن چی ڕویدا..! ئەو منداڵەی دو سەعات لەمەوپێش لە مردنو خنكان ڕزگارم كرد بەتایەی سەیارەكەم گیانی سپارد..لەكاتی بەگدانانەدا من نەمزانی بو لە دوا سەیارەكەمەوەیە..

بو بەگریانو شینو شەپۆڕ.. خەڵكی سەرسام بون.. كەسێك منداڵێكی لە مردن ڕزگار كردو پاش ماوەیەكی كەم كوشتی..

دایكو باوكی منداڵەكە وتیان: هەرچی خوا بیكات ئەبێ ببێ.. ئێمە نەمان ویست ئاو بیكوژێ سەیارە كوشتی..

بەخەفەتو نارەحەتیەوە بەرەو شار گەڕاینەوە.. ماڵی باوكی منداڵەكە ئاوا بێ بەخشیانم لەو كێشەیەدا بەڵام بڕوا بكەن لەو ساتەوە تا ئەم كاتەش توشی چەندین نەخۆشی دەرونی بوم.. نازانم چۆن لە ئاست ئەو ماڵە سەر هەڵبڕم ئەمە ئاكامی یارمەتی بو.. ئەمە ئاكامی شۆفێری بو.. ئەمە ئاكامی سەیران بو.. ئەمە ئاكامی قەدەری ئیلاهی بو هیچی تر.. خوای گەورە هەرئەوەندەی بەخشی بوو بەدایكو باوكی.

# جگەرە کێشان .. گیان کێشان

٣١/٥ی هەمو ساڵێك یادی لەناوبردنو هاندان بۆ وازهێنان لە جگەرە کێشان دێتە ئاراوەو باسو خواسی گەرمو گوڕو بەرنامەی تێرو تەسەل بۆ ساز دەکرێتو لە کەناڵو گۆڤارو ڕۆژنامەکانەوە بانگەشەی خراپیو دەردو ئازارو مەینەتیەکانی دەناڵێننو هاوارو ڕازو گلەیی دەکەن.. بۆتە جێگەی نیگەرانی چەندین کەس لە کۆمەڵگە جۆر بە جۆرەکاندا بە گشتیو لە کۆمەڵگەی کوردەواری بە تایبەتی بەڵام کە سەرنج دەدەیت لە کارو کردەوەی دوژمنەکانی مرۆڤایەتی، ئەمڕۆ هەرزانترینو باشترینو بە قازانجی زۆر دەست دەکەوێت..

لە هەمو ئەمریکاو ئەوروپاو وڵاتانی دنیادا گرانترین شتە بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو جیهانی ئیسلامیدا هەرزانترین شتەو بەئاسانی دەست هەمو کەسێك دەکەوێت، لە بەرگو جوانیو پێچانەوەیدا.. باڵایە..بێوێنەیە ڕۆژانەش ڕیکلامو بانگەشەی بە جوانترین شێوە بۆ دەکرێت، لە قەراغ ڕووبارەکان لە ناو ڕەوە ئەسپەکانی (مالیبۆرو کاوبویدا .......) لە جێگەکانی بازرگانی. بەڵام هەموی کەرەسەی کوشتنو لە ناوبردنی مرۆڤەکانە بە شێوەیەکی هێمنو لەسەرخۆ پاش چەند ساڵێك دەبێتە هاوکارو دروستبونی چەندین نەخۆشی کە گیرۆدەن پێوەی.

سەرەتا ئەم تۆو گیا نەعلەتیە لە ئەمریکا دۆزراوەتەوە.. پاشان چووە ئەوروپاو کاری بۆ کرا، جەندرمەکانی عوسمانی لە خواردنیا چالاك بون بەڵام بە شێوەی (نێرگەلەو سەبیلو دارجگەرە) تۆوەکەی هاتە کوردستانو بڵاوبۆوە.. کارگەو کار ئاسانی بۆکراو ساڵانە لە دێهاتەکانی کوردستانەوە بە تایبەتی (سلێمانی) پلەیەکی باشی بە دەست هێنا لە هەمو جۆرەکانی بە تایبەتی توتن (سامسۆن) بەڵام سوپاس بۆ خوا وا ئێستا لە شاری سلێمانیو دێهاتەکانی لەبەر بەرزبونەوەی بژێوی ژیان گرنگی نەماوەو کاری بۆناکرێت.. ئەمانە هەموی لەلایەك..

له ماوەی سێ سەد ساڵ لەمەو پێش كتێبێك دانرا لەلایەن خواناسی كوردەوەكە (محمد عبد الرسول البرزنجی) بو بە ناوی (مخرج المنباك .. فی تحریم التنباك) بە هەموو شێوەیەك حەرامی كرد، بەڵام گەنجان و بەچكە شێخ و مەلاكان دانیان بەم حەرامیەدانەناو بە (مكروهیان) باسدەكرد.

بەڵام هەر شتێك ببێتە هۆی مردن و نەخۆش خستن و مرۆڤو كەسەكان لە شەریعەتدا حەرامەو دەچێتە بابی (قەتڵەوە)لە ناوشارو بازاڕە جیهانیەكاندا ئیشی بۆ دەكرێ و كراوە.. جۆرەها شێوەو ناوازەیی لە پاكەت و جگەرەدا هەیە زۆر هەرزان.. ئەی دەپرسم قورسی و بارستایی كارتۆنی جگەرە بەو نرخە هەرزانە ناتوانن ئامێری پێشكەوتوی باش بنێرن؟!

بەڵام نەخێر بڤەیەو لاوان بەنج كردن چاكەو باشەیە.

- زاناكان لەو بڕوایەدان و تاقیان كردۆتەوە كە بڕی ئەو ڕێژەیی نیكۆتینەی لە ناو تەنها یەك جگەرەدایە بە سرنج بگیرێ و بكرێتە چاوی (سەگ)ەوە پاش چەند خولەكێك دەتۆپێ.

- كاك حسێن وتی: ئەسپێكمان هەبوو توشی نەخۆشی هات و گیانی دەداو ناتۆپی.. زۆر بەزەیم پیاهاتەوەو كوڕە گەورەكەم چو دكتۆری بەیتەری هێنایەسەر، پاش فەحسكردن وتی: هیچ دەرمانێك نییە بۆ چاكبونەوەی.

وتم: ئاخر ئەزانم بەڵام بەلامەوە گوناهە بەم شێوەیە بمێنێتەوەو ڕۆحی دەرناچێت..

وتی: ئێستا دەرزیەكی بۆ ئەكەم گیانی دەرئەچێت.

دەرزییەكەی بۆ كردو پاش ماوەیەك گیانی دەرچوو، منیش ئەو دەرزییەم زۆر بەلاوە سەیر بو وتم: دكتۆر گیان پێكهاتەی ئەو دەرزیە چی بو وازو ئەو گیاندارەی تۆپاند؟

دكتۆر وتی: ئەو قەدو دەمارەی لە گەڵای توتنا هەیە ئێوە دەیبینن و دەیچێنن بەكار دەهێنرێت بۆ ئەو دەرمانە، واتە ئەو دەرزییە لە توتن دروست دەكرێت و مرۆڤیش ئاوا دەكوژێت بەڵام ڕونكراوەتەوە تا زۆر بە هێمنی لەناویان ببات.

ئەم قسەو باسە بوو بە خولیای مێشكم ڕۆژێكیان لەسەر زەرعات بوین لەلای خاڵم ئەم باسەم باسكرد..

كابرایەكی كرێكار وتی: زۆر ڕاستە ئەو خڵتەی دارجگەرەیە بكەیتە دەمی هەرگیانلەبەرێكی خاوەن ژەهرەوە دەیكوژێت.. بە تایبەتی مار.لەنان و چا خواردنی

پشوی عەسرابوین خالّم رەشمارێکی گەورەی گرت.. وتی: با ئەو کردارە تاقی بکەینەوەو بزانین وایە؟!
یەکێك لە کرێکارەکان چو دارجگەرەی پیاوێکی هێنا کە لە سەرو ئێمەوە خەریکی پاراو کردن بوو، دارجگەرەکەیان بە چیلکەیەکی باریك پاککردەوەو هەمو خڵتەکەیان کردە دەمی مارەکەوە .. پاش ماوەیەك سەرنجماندا مارەکە کەوتە خۆبادان‌و هەڵبەز هەڵبەز، هەموی (١٠) خولەکی نەبرد مارەکە تۆپی..
جا بزانە برای بەڕێزم خوشکی جگەرەکێش خۆت بە دوربگرە لە زیان‌و ناڕەحەتیەکانی جگەرە.
- ئەگێڕنەوە ژنێك‌و پیاوێك دەبێتە دەمەبۆڵەیان کە خەڵکی تێدەگەن ئەمە کورتەکەیەتی:
ژنەکە دەیوت: ئەو پارەیەی ڕۆژانە مێردەکەم دەیدات بە جگەرە، منیش بە هێندەی ئەو برە پارەی لێوەردەگرم، لە ماوەی ئەم ساڵەدا بووە بە (١،٧٥٠)دیناری سویسری بۆ نمونە، ئەو هەمو ڕۆژێ ئەو پارەیەی بە جگەرە سوتاندو هیچ سودی نەبووە منیش کۆم کردۆتەوە ئێستا باوکی منداڵەکانم دەڵێ: بیدە بە پێویستی ماڵەکە.
منیش ئامادەم بیسوتێنم یان ئەوەتا ئەویش واز لە سوتاندنی پارەکەی دەهێنێ یان ((لە جگەرە کێشان)) بەڵێ پیاوەکە غیرەت گرتی‌و ئیرادەی خۆی بەهێزکردو وازی لە جگەرە کێشان هێنا.
جگەرە کێشان ئارەزوی خواردن کەم دەکاتەوە، بۆری سی‌و هەناو وردە وردە دادەڕزێنێ‌و مرۆڤەکان وشك‌و ڕەق‌و قڵخن‌و بۆن خڵتە جگەرەو دان زەردو بۆگەن‌و گیرفان لاواز دەکات هاوڕێ‌و هاوکارانی توشی ناڕەحەتی‌و دەردەسەری دەکات..
نمونەیەکی زیندوی تر: لەگەڵ برایەکم لە یەك ماڵدا دەژیاین ئێستا هەردوکمان جیاین.. خاوەن ماڵ‌و منداڵ لە تەمەنی شەشی سەرەتای‌و قۆناغی ناوەندی بەتەواوی فێری جگەرەکێشان بوو، بەلاّم منیش لەو کارە دور کەوتمەوەو هەر لە خۆمەوە حەزم بە جگەرەکێشان ناکرد.. لە ناخەوە مرۆڤەکان بە کێشانی جگەرە هەست بە فیزو گەورەیی دەکەن.. بەلاّم ئاکامی خراپ دەبێت.
ئەو ڕۆژانەیەی لە قۆناغی ناوەندی‌و دواناوەندیدا وەرمان دەگرت لە ماڵەوە.. ئەو بە جگەرەو من بە کتێب خەرجمان ئەکرد.. ئەمە سەر باقی ترس‌و لەرزی ماڵەوەو باوکم.

تەمەنی تا ئێستا هێناوە، من خاوەنی کتێبخانەو پێنوس.. ئەویش خاوەنی قورگو سنگی خلتاوی‌و دان زەردی، بەیانی وەها هەیە لە کۆکەی ئەو بە ئاگادێین.
کە دەچێتە ماڵەکە بۆنی جگەرەو دوکەڵو تەپڵەکی فیلتەراوی پێشوازیت دەکات ئەگەر بڕواش ناکەیت‌و وەرە ژورەکەی من .. بۆنی خۆش‌و رەفەی پڕ کتێبی جۆراو جۆرو زانیاری بە کەڵکی بێمنەت لە پێشوازیتایە.. کە هەمویان خۆراکی مێشکن..
خوان نەخواستە هەر حاڵەتێکی خراپ بێتە پێش دەتوانیت بە پارەی کتێبەکان لەو قەیرانی ئابورییە ڕزگارت بێت بەڵام ئەو کوا مایەو تەندروستی!؟
زۆر لە براو خوشکی ئازیز سەربوردەی خۆیان دەگێڕنەوە کە هەمو هۆکارەکەی بۆ برادەری خراپ دەگێڕنەوە لە تەمەنی هەرزەکاریدا کە توشبون. بەڵام خۆیان ئامادەیی خراپیان هەیە.. بۆیە هاوەڵی هاوڕێی خراپ دەکەن.
- باوکم‌و مامم لە تەمەنی منداڵیانەوە جگەرەکێش بوون، ئەو ساڵانەی مرۆڤەکان لە کوردستانی عیراقدا کۆبونی خۆراکی وەردەگرت بۆ نەگبەتی جۆرەها پاکەت‌و جگەرەشی لەگەڵ بوو کە هۆکار بو بۆ بەردەوامی کەسەکان.
پاش شەڕی ئێران عیراق‌و گرانی ئەو پاکەت‌و جگەرانەو نەمانی بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەمانە هاتە خەیاڵیان کەواز لە جگەرە بهێنن.. سوپاس بۆ خوا ئیرادەی بە هێزکردن لە ساڵی ١٩٨٤ وە تا ئەم کاتەش جگەرەیان نەکێشاوەو چەندەها تاڵ‌و سوێری ڕۆژگاریشیان چەشتووە بەڵام چۆکیان بە جگەرە داداوەو کەم کەمیش ئارەزووی دەکەن بەڵام بەڵێنێکیان داوە کە گەڕانەوەی تیانەبێت‌و تەندروستیان زۆر باشیشە سوپاس بۆ خواو مژدەش بێت لە هەمو کەسانی جگەرەکێش.
- زەمەنێك دوکاندار بوم لە هەمو جۆرە پێویستی مرۆڤو گەڕەکم لەلا بوو لە ناویاندا جگەرە. پاش ماوەیەك لە پرسیارو وەڵام ، وەڵام (حەرام) دەبوو.
ناچار وازم لە فرۆشتنی هێناو بۆ ماوەیەك .. کڕیارەکانم کە هەندێکیان جگەرەکێش بوون پێیان خۆش بوو هەندێکیان پێیان ناخۆش بوو .. ڕۆژێك یەکێکیان وتی: ئەگەر بە ئاسانی دەستنەکەوێت خەڵکیش هێندە بە ئاسانی نایکێشێ..بڕاوا بکەن لە زۆر شتی ترداو بابەتی تردا ئەو قازانجەم دەستدەکەوت کە لە جگەرەی جاران دەمکرد.. بەڵام بە فرۆشتنی دڵئارام‌و ئاسودە نەبوم..

دواجار دوکانەکەم لابردو کۆتایم بە دوکانداری هێنا.. بەڵام خوای گەورە بە شێوەیەکی تر ڕزقت دەدا برای فرۆشیار.. گەر تۆ ئیرادەت بە هێزبێت.

مامۆستا شێخ ڕەوفی تیماری وتی: ئەو ساڵەی کە لە ناو هەمو برایاندا ڕاگەیەنرا کە جگەرە بە کڕین و فرۆشتنی بە هەمو شێوەیەك حەرامە.. لە گوندەکەی خۆمان لە تیماری قەرەداغ بڕیارماندا ئیتر توتن نەکەین و وازی لێبهێنین.. ئەو ساڵە هانی هەمو خەڵکم دا کە توتن نەکەن و زەویەکانیان بکەن بە تەماتە..

خوای گەورە بەرەکەتی خستە کارەکەمان و کاتێك تەماتەی ناوچەی ئێمە پێگەیی بۆ خوارووی عێراق دەڕۆی هەمو پلاسکۆیەکی چوار قات و شەش قاتی ساڵانی تر نرخی دەکرد.. ئیتر لەو ساڵەوە ئێمە ماڵئاوایمان لە توتن کردن کردو زەوییە جوانەکانمان بە دەم زیکرو فیکرەوە دەکەینە کشتوکاڵی حەڵاڵ و زوڵاڵ و قازانجی دینی و دنیایشمان لێوەی دەستدەکەوێت.

برای بەڕێزم هیوادارم کەمێك ئیرادەو قەناعەتت لەلادروست بوبێ چونکە هەر تکە بارانەو یەکدەگرن و دەبنە جۆگەلە ئاو دەبنە ڕوبارێ دەبنە ئاوی بەنداوەکان و کارەباو ڕوناکی لێ دروستدەکرێت بۆ مرۆڤەکان.. ئەو ئیرادەکەمەت ببوژێنەوەو زیادی بکەو بتوانە کار لە خەڵکیش بکەیت بۆ وازهێنان لە جگەرەو بابەتە خراپەکانی کە مرۆڤ توشی لاوازی و نەخۆشی دەکات.

ڕۆژێك ڕێگام کەوتە دێیەکی بچوکی چەند ماڵی لە خوار چوارتاوە نزیك قەڵاچوڵانی کۆن ئەو گوندەش (سامان) بوو. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام جگەرە خۆریان نەبوو .. تەپڵەکی جگەرەشیان نەبوو هەر میوانێکی جگەرەکێشیش بچوایە دایان نەدەکرد.. پێشوازییان لێنەدەکرد .

خۆ خەڵەتاندنە .. کە دەرمانی خەم و خەفەت و ئاسودەیی بێت.

چۆن هەوڵ بدەین خۆمان لە جگەرەکێشان ڕزگار بکەین؟!

١. هەوڵدان بۆ ئارەزوو مەنیەك.

٢. خۆ خەریك کردن بە کارێکەوە (گەڕان ، مۆسیقا، یاری)

٣. سەرنجدان و سەردانی دیمەنی ئاوازە.

٤. خەریك کردنی دەستەکانت بە کارێکەوە(گوڵەبەڕۆژە خواردن، موبایل ، تەسبیح، خوێندنەوە......).

٥. دورکەوتنەوە لە کەسانی جگەرەکێش..
٦. بیرکردنەوە لە ئاکامی خراپی ئەو کارە خراپە بۆ داهاتو.
٧. لەدوای سەرکەوتن هەست بە شانازیو بەختەوەری دەکەین.
٨. بیزارنەبون لە هەڵچونە دەرونیەکان، گەشبینبە بە ئاکامە چاکەکە.
٩. کەم کەم هێواش‌و ناو بە ناو دەستت پێکردووە بە هەمان شێوە کۆتایی پێبهێنە، جگەرەکەش هێندە بەهێز نییە خۆت بۆ ڕانەگیری لە ئاستیاو ئیرادەت لاواز بێت.. ئیرادەت بەهێز بکە.
١٠. پەلە نەکردن‌و نەڕوخان‌و ورە بەرنەدان لە ئاکامی کارە جوانەکەت.

إنشاء الله سەرکەوتو دەبین لە دورکەوتنەوەو لە زیان‌و خراپەکاری جگەرەکێشان.

# مەقامێکی جوان و شایستە

لە کۆمەڵگەی کوردەواریمان لایەنی ئیمانی و ئیسلامەتی بە زۆربەی کارەکانمانەوە دیارەو لە دڵدا نیەت بۆ خوایەو لەبەر خاتری خۆشەویستی خوای باڵادەست کاری جوان ئەنجامدەدرێت لە ژیانی کوردەواریدا مرۆڤەکان زۆر حەز بە بەخێوکردنی ئاژەڵ و پاتاڵ و گیانلەبەری جوان و کێوی دەکەن.

ئەم کارەش ئێستا لە ژیان و کۆتایی سەدەی پێشکەوتن و ئینتەرنێت دا خۆی بینیوەتەوە لەو کارانەش بەخێوکردنی (کەو، سەگ، کەناری، ماسی، بەرخ، مەیمەن، کۆتر، مریشکی کوردو جۆری جیاوازو دەگمەن ئاژەڵی ڕەسەن ........)

هەمو ئەمانە بەهاو نرخی جیاوازیان هەیە لەلای کەسەکان بۆ مەبەستی جیاواز بەخێویان دەکەن خزمەتیان دەکەن.. ئیتر ئایا وەك پێویست خزمەتدەکرێن یان نا..

ئەوە خاوەنەکانیان دەزانن لایەکیترەوە ئایا وەك پێویست ڕادەگرێن و کاریان پێدەکرێت ئەمەشیان جودایە. کەسانێك لە ماڵەکانیان جێگەو شوێنی تایبەتیان بۆ دیاریکردون..

بەبێ گوێدانە هەمو ئارەزووەکانی ئەو گیانلەبەرە، کەو، ئایا ڕازیت بە ژیانی لارەملی و دیلی ناو قەفەس؟! کە ڕۆژانێك بووە بە ئازادی لە دیمەنە جوانەکاندا دەتقاسپاند ئاوت دەخواردەوەو بە دڵی خۆت گیات دەخوارد گیانلەبەری بچوك ژەمە خواردنەکانت بو..

بە دڵنیاییەوە هەمومان دەزانین ئەو ژیانە شایستە نیە بەو گیانلەبەرە ڕۆح سوك و نازدارە.

ئایا ژیانی ماسی هەموی برتییە لەو ناو شوشە چەند سانتیمەترییەداو بڕوات و بجوڵێت و مەلە بکات؟

بە دڵنیایی و وەڵامی بێگومانەوە حەزی دەکرد بەسەربەستی لە جێگەو ڕێگەی بێسنوردا بژیایە.

ئایا بەڕێزت وەك پێویست ژیانی خۆت مسۆگەر کردووە تا ژیانی ئەو مسۆگەر بکەیت دەومرە بابزانین پلەو مەقامی کێ بە هۆی گیانلەبەرانەوە بەرز دەبێتەوەو ئایا کێش پلەو مەقامی نەوی دەبێت.. باڵندەکە .. گیانلەبەرەکە شەکوای حاڵی خۆی لە مرۆڤەکە

دەکات ئازیزەکەم دادە (پیرۆز) لە دانیشتنێکی سەرکانی بۆ ژیانی گوندەکەی خۆیان باسکرد وتی:

ئەوە چەند ڕۆژێکە، دادە حەلاو کۆچی دوایی کردووەو چۆتە جێگەو ڕێگەی خۆی، دوێنی شەو خەوێکی زۆر سەیرم پێوەبینی..

هەر ئافرەتەو بە شێوەیەك لەسەر بەردەکانی سەرکانی گوێیان بۆ قسەو گێڕانەوەی خەوەکەی دادە پیرۆز شلکرد بوو، بە گیان ڕۆح ئامادەییان دەنواند..

ئەریّ ڕۆڵە گیان ئەوەندی من بینیم زۆر سەیر بو.. دادە حەلاو لە جێگەو مەقامێکی زۆر جوانو شایستەدا دانیشتبوو تا بڵێی ڕەنگو ڕوخساری بە هەیبەت بو، لە مەقامیدا هاتە خوارو لە من نزیك بۆوە.. منیش لە خەونەکەمدا هەستم دەکردو دەمزانی کە (دادە حەلاو) لە دنیا دەرچووە.

بەڵام بڕوام ناکرد لەو شوێنە خۆشەدابێت پاش چاكو چۆنیو ئەحواڵپرسین وتم: دادە حەلاو گیان وەزعت چۆنە.. لە دنیا زۆر ماندوبویت، ئایا ئەمڕۆ دڵشادی؟!

بەڕێزیان وتی: هەر زۆر بەختیارو دڵشادم ئەوەی من بیرم لێناکردەوە ڕویدا ئەوەی هەمو خەمی من بوو زۆر سادەو ساکاربون.. چونکە پلەی دینداریم خراپ نەبو..

لە خەوەکەمدا وتی: ئەو نوێژو تاعەتەکەمانەو ئەو هەمو نیعمەتە جوانانەی لای ئێمەیە توانیوتە لەو جێگەیەت نزیك بکاتەوە؟

وتی: خواپەرستی بە ئامادەبونی ڕۆحو لاشەوە چێژی تایبەتی هەیەو خاوەنەکەی هەستی پێدەکات خواپەرستی ڕواڵەتو عادەتی بەروبومی وەك ئەستێرەو دەریایە، هەمو بە غیلی بە یەکتردەبەنو هیچیشیان بە هیچیان ناگەن.

پلەی خواپەرستی جیاوازە دادە پیرۆز گیان، ئەو تیشکی خۆرە لە دنیای ڕابردوی منی دادەو ئێستا حزوری نییە، هەرچی گیانلەبەرو گژوگیاو خاكو ئاو هەیە هەریەکەیان بە شێوەی جیاواز سودمەند دەبن لێوەی.. دەبنە مایەی ئەو خۆش گوزەرانییە منیش یەکێك بوم لەو کەسانەی بەبەردەوامی کاری چاکەو باشە ئەنجامدەدا.

بەڵام هیچیان بە ئەندازەی پارمەتی گیانلەبەرێك مەقامی شکۆداری بڵند نەکردمەوە..

ئەویش ئەگەر حەزدەکەی بۆتی باسکەم ئەمە بوو:

ڕۆژێك دوای چێشتەنگاو بو دوای هەندێك کارو باری ناوماڵ دەستم کردە کۆکردنەوەی

(سیرێز) کەشك‌و دانانیان لەسەر نانە شانە کەو ئامادەی کەم بۆ بەر تیشکی خۆر تا ببێتە کەشکێکی رەق‌و نایاب.

ئەو هەیوانەی منی لێدانیشتبوم لە دوری چەند هەنگاوێکەوە کەوێکمان هەبو لە قەفەسدا بو ناو بەناو دەنگی لێوەدەهات‌و چینگە کرکێی لە قەفەسەکە دەکرد. ناو بەناو سەیرێکی یەکترمان دەکرد، بە سەیرکردن‌و سەرنجەکانی‌و بە زمانی حاڵ داوای خۆراکی دەکرد،منیش هات بە خەیاڵمدا کەشکێکم بۆ هەڵدایە بەردەمی.. لە قەفەزەکەوە ملی درێژکردو کلۆ کەشکەکەی بەچەند دەنوکێك خواردو لە چنگە کرکێ کەوت. بەلارە ملیەوە لە قەفەسەکەشدا کوشمەڵەی کرد پاش تەواو بونی کەشکەکە رۆیشتم بەلای کارو فرمانی خۆمەوە.. لە رۆژی کێشانەو پێوانەی سەرەتای کارمنمان.. ئەو دیمەنەیان پیشاندام‌و رۆحیانەتی ئەو کەوەو ئەو نیعمەتە جوانە، داوای ئەم مەقامەیان بۆ کردم ..هیچیان نەبونە مایەی نارەحەتیم ئەوە بووە هۆی شانازی من‌و ئیتر گەیشتمە خۆش گوزەرانیەکەوە.. کە ئاواتم دەخواست زیاتر یارمەتیم بدایە .

بەڵێ بەرێزان خێرو چاکە چەند بە کەمی بزانیت لەلای خوای گەورە بە نرخ‌و بەهای جیاواز سەیر دەکرێت، زۆرکاریش هەیە گەورەیە، بەزۆری دەزانیت بەڵام نییەتی تیا جیاوازە سەیر دەکرێت، لە مێژووی ژیانی پیاو چاکاندا بەزەیی هاتنەوە بە گیانلەبەراندا زۆر باسکراوە هەموی دەبێت من‌و تۆی رێبواری سەر ئەم ئەستێرە گەرۆکە بە گەرۆکی‌و سادەیی وەرینەگرین.

دەبێت لە کاری جدیدابین.. وانەزانین کەس نەماوە پێویستی بە لایەنی مادی ئەبێت.. خۆ ئەگەر واهاتە بون .. ئەوە دڵنیابە خەڵکانێك هەن پێویستیان بە خێرو چاکەی ئێمە هەیە بەڵام خێرو چاکەیە لە رۆحەماندوەکانیان بە کاریبهێنی ئەم رۆژگارو دنیا گەرییەوە لاوازیکردون‌و من‌و تۆش هەمومان لە تواناو هزرمان زەکاتی قسە بدەین ئەو کەسانە لە لایەنی روحییەوە پایەداربکەین وا مەزانە خەڵکی هەمو تێرو تۆخە بڕوابکە گەر هەموشیان نەبن زۆریان لاوازو نەبەکامن لە زۆر لایەنی ئەدەبی‌و ئەخلاقی‌و کۆمەڵایەتی‌و هاوسۆزی بۆ یەکتر.. بڕوا بکە هەرچی زۆر ماندو بوو بۆ مادەو دنیای مادی دڵنیابە زۆر لاواز دەبێت لە پلەی باوەڕو دینداریدا.. دەبڕیاربدە لە کامیان بیت دەبڕیاربدە بۆ ژیان‌و ئاین بە گەرمی بۆ باوەڕو ژیانی نەبڕاوەی دوایی کاربکەیت .

لە دواساتدا ئەو فەرمودەیەت دەهێنمەوە یاد پێکهاتووە لە دوو دیمەن‌و

پێشەوایی مرۆڤایەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ئافرەتێك خرایە دۆزەخەوە چونکە پشیلەیەکی بەند کرد نەیهێشت بچێتە دەرەوەو خواردن بۆ خۆی پەیدا بکات لە ئاکامدا پشیلەکە بە برسێتی گیانی سپارد، پیاوێك خرایە بەهەشتەوە بەوەی لە ناو بیرێکدا ئاوی خواردەوە کاتێك هاتەوەسەری لە دورەوە چاوی لێبوو (سەگێك) لە تاو تینویەتی حالی پەرێشانەو لوت لە خۆڵەوە دەدات، ئەم پیاوەش دابەزییە ناو بیرەکەوەو پێلاوەکەی پڕکرد لە ئاو بە ددانەکانی گرتیو بە چنگە کرێ هاتەدەری و چەند جاری ئەمەی کرد تا گیانلەبەرەکەی لە خنکاندن و تینویەتی رزگارکرد.

لە دوا قسەدا دەڵێین ئەگەر حەز دەکەیت خەڵك و خوات لێڕازی بێت ئیتر لە هەرچ شوێن و جێگایەکی کاردایت (ئەهلی یا حکومی) با وەك تیشکی خۆر بەسود بیت.. با خۆشی و چاکەو چاکە خوازی کاری تۆ بێت.. بانییەتت لەسەرو هەموویانەوە خوا لە خۆ رازیکردن بێت،دڵنیابە حەزت لە کاری خێرودەبێت و هەست بە ئاسودەیی رۆحت ئەکەیت ... کامەرانبن.. خوای گەورە یارو یاوەری هەمولایەك بێت انشاء الله .

# چوار ماڵی هەژار چۆن دەوڵەمەندبون؟

دو شەو تێپەڕی بو بەسەر یادی مەولودی پێشەوای مرۆڤایەتی دا لە یەکێك لە شوێنە گشتییەکان بە ئامادەیی چەندین برای بەڕێزو بە ئەدەبو ڕوگەش‌و خوێن گەرم، دڵپڕ لە نوری ئەو یادە، لە خزمەت مامۆستای ئازیزو بەڕێزو خۆشەویست (کاك پێشڕەو).. چەندین بابەت‌و لایەنی خەیری (ئیفاق) بەخشینی بۆ باسکردین، ئەوەی زۆر منی بۆ لای خۆی‌و تامو چێژی لایەنە ڕۆحیەکە ڕاکێشا ئەم چەمکە بوو کە : چۆن خێر بکەین؟ بەکێ خێرو زەکات‌و بەرات بدەین؟ نیەت‌و هەست‌و ئەستمان لە کاردا بێت؟ ئاکامی ئەو خێرو خێراتە چۆن دەبینیتەوە؟ ئایا لە دوای پەیڤەکانمدا ئارەزوو دەکەیت چۆن بیت؟

خۆ زۆر ئاسانە چەند هەنگاوێك بۆ دواوە بنێین‌و لە خۆ ئامادەکردنمدا بین بۆ بازدانێکی بە گوڕو بڕینی چەند مەترێك بۆ گەیشتنی بە لیقایەکی خۆشگوزەرانی ئەوە لە سەدەی بیست‌و یەکدا گوزەر دەکەین، ئایا سەدەی بیستت کردە تۆوێکی سەوز بوو لەم سەدە نوێیەدا بتوانیت بیدرویتەوە ماڵ‌و حاڵ‌و دەرو دراوسێ‌و گەدەتی لێتێرکەیت.

ڕۆژێك پیاوێکی دانیشتوی یەکێك لە دەرەوەی ئەم شارە هاتە لام‌و داوایکرد چەمکی زەکات‌و ماڵ بەخشین بزانێت ئارەزوی خێری هەبو بۆچەندین کەس.. بەڵام پاش چەند قسەیەك حەزمکرد ئەم قسەیەی بۆ بکەم:

+ ئایا لە ناوچەی ئێوەدا چەند کەس نەدارە؟؟!

+ شوکر هەموبان باشن‌و هەندێکیشیان مام ناوەندن‌و چەند کەسێکی کەمیان زۆر حاڵیان خراپە.

+ باشە براکەم بڕۆرەوە جوان جوان سەرنج بدە بزانە چەندەیان زۆر موستەحەقی زەکاتن!؟

پاش ماوەی چەند ڕۆژێك هاتەوەو وتی: دڵنیام مامۆستا گیان چوارماڵ.. ئەم چوارماڵەی لەلای خۆم ناونوسم کردون زۆر شایستەی خێرو زەکاتن هیچ شك نابەن.. زۆر لاوازن دڵنیام لە لاوازیدا لەسەرویل ئەڕۆن.

زۆر باشە ئەو زەکاتەی هەتە بەشی کەسی تری لێمەدە.. هەموی دابەش بکە بەسەر ئەو چوار ماڵە زۆر هەژارەدا..

بابەت کۆن بوو لەلای من ئەو ڕۆژگارانەو ئەو ڕەمەزانەو ئەو ساڵە گوزەریان کرد.. پاش ساڵێکی تر لە ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزاندا بو، ئەم پیاوە خاوەن دارایيە هاتەوە لام.. ئەملاولای ماچکردم.. ئەمناسییەوە بەڵام خۆی پێناساندمەوە دوای ڕێزو سوپاسو دوعای خێری وتی: مامۆستای گەنج کوڕی دڵپڕ لە نور بە ڕاستی فێری خێرو چەمکی زەکاتت کردم..

- ئەوەی پار کردم، ڕێنمونی جەنابتان بو بابۆت باسبکەم ئەمساڵیش نیەتی ئاوا کارێکی ترم هەیە..

پار ئەو ڕێگەیەی تۆ بۆت باسکردم بە کارم هێنا، چوار ماڵە هەژارەکە یەکی ١٢٠٠٠٠ دیناری سویسری[8] یان بەرکەوت .. کەوای وت یەکسەر وتم: ماشاء الله ئەوەندەت زەکات هەبووە؟!

بەڵێ مامۆستا گیان، بەڵام ئەوەی جێگەی دەستخۆشییە بۆ بەڕێزتان ئەمەیە، ئەم ساڵ نامەیەکم بۆ ئەو چوار ماڵە نوسیو داوام لێکردن کە حاڵو ئەحواڵی خۆتانم بۆ بنوسنو تا یارمەتی ئەمساڵتان بدەم..

ماڵیان ئاوەدان بێت دەتوانم بڵێم چەند لاپەڕەیەك هەر دوعای خێرو چاکە خوازی بوو پاشان هەرچوار یان بەبێ ئاگاداری یەکتر نوسیبویان (ئەو پارەیەی پاری تۆ، ئەو زەکاتەی پاری تۆ، هێندە دەوڵەمەندی کردین، هێندە پۆشتەو پەرداخی کردین، ئەمساڵ لە ماڵەکەمان زەکات دەردەکەین، تا لەبەرەکەتی زەکات بێبەش نەبین..) وتم: ماشاء الله چەند جوان بەرهەمی‌داوە.. ماشاء الله لەو زەکاتو نییەتە.

8. ١٢٠,٠٠٠ ★ ١٥٠ = ١٧,٠٠٠,٠٠٠ چاپی نوێ.

ئەمە چەمکی زەکاتە، نەك ئەوەی (٢٠)دینار بۆ ٢٠ کەس یان دەکەس دادەنێیت، دو ژەم برسی دەبێتەوە.. ئەم ساڵ باشەو ساڵی داهاتو خراپ دەبێتەوە پێشەوای مرۆڤایەتی دەفەرموێت: کابرایەك هاتە لامو داوای خێری لێکردم منیش کە سەرنجمدا زۆر بە گوڕو بەتین دیاربوو، وتم: ئەتوانیت بچیت لەو کەژو کێوە داربڕی بیهێنەوە ناو شارو بیفرۆشە بە پارەکەی پێداویستی خۆت ئامادەبکەیت؟

بە ئیرادەیەکی بەرزەوە وتی: ئامادەم زۆر حەزیش دەکەم بەڵام کەرەسەی داربڕینو گواستنەوەیم نییە؟

پێشەوای مرۆڤایەتی صلی الله علیه وسلم: هەر خێرا تەورو گوریسی بۆ بۆ ئامادەکردو فەرموی: ئەمە کەرەسەی کارکردن فەرمو بڕۆ بەلای کارتەوە..

پاش ماوەیەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: پیاوەکەی بینیەوە فەرموی: حاڵو کارو ژیان چۆنەو چۆن دەگوزەرێت؟

پیاوە هەژارەکە وتی: ئێستا زۆر باشەمو لە پاشەکەوتی خۆمو ماڵو منداڵم خێریش دەکەم.

وتەیەکی گەلی سینی هەیە دەڵێت: ئەگەر هەژارت تێرکرد بە ژەمێك خواردنی ماسی، لە جیاتی ئەوەی ژەمێك ماسی بدەیتیو پاش ماوەیەکی تر برسی بۆوە قولاپێکی ماسی گرتنی بدەریو فێری ماسی گرتنی بکە با خۆی کاری خۆی بکات.

بەکورتی: مەترسە لە ماڵ کەمبونەوە.. خوا داویەتیو خوای گەورەش پڕ بەرەکەتی ئەکات.

# نییەتی پاک لە چاوەڕوانی باراندا..

زۆرجار زۆر ساڵ لە سەرەتای وەرزی باران بارینەوە یا لە کۆتاییەوە باران بارین دوادەکەوێت.

دانیشتوانی ناوچەکانی کوردستانو کوردەواری مەترسییان لێدەنیشت..چەندەها پرسیار لە زاریان دەترازێ، چەندین بیرو بۆچونی سەیر بە مێشکیاندا ڕادەبورێ، جارجارەش پەنا دەبەنەبەر قسەو باسی دور لە سونەتی خوایی‌و پێغەمبەرو سروشتی ژیان یەکێك دەڵێ:

- ئەمساڵ باران نەبارێت لە برساندا دەمرین.
- جا بۆ ببارێت مەڕو مێگەل‌و خەلەو خەرمانەکەم.. چیم هەیە؟
- جا بۆ نەبارێت سروشت‌و دیمەنی کوردستان ڕازاوە دەبێت.
- ئەی بۆ ڕازاوە بێت تا خەڵکی کاری دوور لە یاسایی خوای تیا پیادە بکەن.
- خوایە گیان بارانی ڕەحمەت بکەیتە دیاری زەوی.. لەبەر خۆمان نا، لەبەر گژو گیاو دارو درەخت.. مارو مێروو.. زیندەوەران‌و بێزمانان.. خوایە گیان داکەیتە لێزمەی باران بۆ فەقیرو هەژاران‌و لانەوازان..
- با منداڵان ڕۆحیانەت پاکەکان داوا لە خوا بکەن تابارانی ڕەحمەتی ببارێ.
- بچن بۆ هەورامان با ئەوانە داوای باران بکەن.
- با نوێژە بارانە بکەین.. مامۆستا ڕابەرمانە پێشمان بکەوە.
- ئەیەڕۆ ئێمەش نوێژە بارانە بکەین.. جا کە بانوی ماڵ چی لەسەرە..

لە کۆتایی ئەم چەند دێرو سەرنج‌و بۆ چونانەوە دەڵێم:

ئایا بۆچی ئەم کارو گفتارانەش ئەنجام دەدەین بەڵام باران نابارێت؟

گەر دەتەوێت شارەزا بیت لە حیکمەتی باران نەبارین لە وەرزو کات‌و ساتی خۆیدا وەرە چاوودڵ‌و هەست‌و هۆشت لە گەڵما بەرێکەو با شۆڕببێتەوە بۆ ڕابردوو تا گوزەرێك بۆ لای کۆچکردو مەلا (مستەفای کەناروێ) بکەین.

چی هێناوەتە سەر ئەرزی واقع بەڕێز کاك قادری مەلا مستەفای کەناروێ دەڵێت:
ساڵ درەنگی کرد خەڵکی لە چاوەڕوانی باراندا دەژیان هەڵسان و دانیشتنیان هەمو کۆڕو کۆبونەوەیەکیان تەنها باس بوو لە نە بارینی باران و خەمێکی زۆر دایگرتبون. زۆر نارەحەت ژیان و ڕۆژگارەکانیان دەگوزەراند.
زۆر داواکاری بارانیان کرد.. دوعاو پاڕانەوەیان زۆر دەکرد لە کات و ناکات و ساتەکانی ناسکیدا.. بەڵام هەور بەری ئاسمانی ناگرت کەس ئومێدی ئەوەی ناکرد باران ببارێ.. هەوڵەکان بەردەوام بون بەڵام ئاکام نەباری..
خەڵکەکە بە کردارو گفتار سەلماندیان کە هەمو بێ ڕەحمەت و یارمەتی خوا ناژین و نابێت..
ڕۆژێك خەڵکی گوند زۆریان بۆ باوکم هانی کە دەبێت (نوێژە بارانە) بکەین تا بارانی پڕخێرو بەرەکەت و جوانیمان بۆ بباریێ، مامۆستا لە وەڵامدا وتی:
داواکار لە پەروەردگار دەکەن کە خێرو بەرەکەت و باران بباریێ بەڵام چییتان بۆ ئامادەکردوە؟! تەنها قسەو هیچی تر ئەی کوا کردەوەو ئادابی داواکردنی باران بارین!
خەڵکەکە زۆر لە عیشق و دیداری باراندا چاوەڕوانیان کرد بو ماندو شەکەت وتیان: مامۆستا چیبکەین.. چیمان دەسەڵاتە.. ئێمە نەزان و تۆ ڕابەر.. فریامان بکەوە.. تا ڕزگار بین لەم دەردەسەرییە..
مامۆستا وتی: ئایا هەرچیەکم وت گوێڕایەڵیم دەکەن؟
ڕیش سپی گوند وتی: جا مامۆستا گیان هەرچیەکت فەرمو بێ گوێڕایەڵیمان کردوی و کەم تەرخەمیمان نەنواندوە.
مامۆستا: ئەم جارە زۆر جیاوازترە لە جارەکانی تر.
هەمویان وتیان: ئامادەین هەرچی دەڵێیت.. تەنها تۆ خێرو خۆشی ئێمەت ئەوێ.
مەلا مستەفا دوای تۆزێك تێڕامان وتی: دەمەوێ ئەمشەو هەرچی تەکالیفی شەرعی لەسەرە لە پیاوان لە مزگەوت کۆببێتەوەو دوانەکەوێت.
بەڵێ دوای نوێژی خەوتنان هەرچی داربەدەستی گوندە لە مزگەوت چاوەڕوانی وتەو فەرمانی مامۆستا بون..
مامۆستا یەك چاوی بەناودا گێڕان.. هەمویان ئادەبوون.. دوای سوپاس و ستایشی پەروەردگارو درووود بۆ گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی، فەرموی:

برایانی ئازیزم کۆبونەوەو ئامادەبونی هەموتان لەم جێگەو شوێنە پیرۆزەدا بۆ کارێکی گرنگە گەر بەدەمییەوە نەچین‌و خەمی نەخۆین مەترسی گەورەی لێدەکەوێتەوە.. ئەویش ووشکە ساڵییە بۆ درێژە نەکێشانی ئەو رووداوەو تورەنەبونی خوای گەورە وسەر کەوتنمان لەم تاقیکردنەوەیەدا دەبێت گوێڕایەڵی داواکارییەکانم بن، دەبێت بەڵێن بدەن کە بەگەرمییەوە هاوکاریم دەکەن‌و خاوخلیچکی ناکەن..

هەمو بەڵێنیاندا بە کردەوە بەجۆش‌و خرۆشەوە بە ماڵو گیان ئامادەبن.. دڵنیاش بون نایان زانی داواکارییەکان چییە، بەڵام لەکارو کردەوەی مامۆستا دڵنیابون بۆیە بەڵێنیاندا مامۆستا مستەفا وتی: هەمو پیاوان دەبێت بەڵێن بدەن کەم تەرخەمی لە نوێژە فەرزەکاندا نەکەن لە هەرجێگەیەك کاتی بانگ هات نوێژەکان ئەنجام بدەن هەمو رازین!؟ دانیشتوان بەپەرۆشەوە وتیان: رازین..

رۆژی پێنج شەممە هەموتان بەرۆژوبن کە رۆژوی سوننەتە ئێوارەکەی دوعای زۆر بکەن.هەمو ئامادەن بەڵێ بەسەر چاو.

برایان چونکە هەمو بەیەکەوە دەژین بێگومان حەقمان کەوتۆتە لای یەکتر، لەم جێگەیە ناچینە دەر تاگەردنی یەکتر ئازا نەکەین، گەر شتی ماڵییە دەبێت تاسبەینێ ئەم کاتانە درابێتەوە، دڵتان لەئاستی یەکتر پاك بوبێتەوە... رازین!؟ بەڵێ هەمورازین..

وەك رۆژی جەژن ئەملاولای یەکتریان ماچکردو بەدڵێکی سافەوە گەردنی یەکیان ئازادکرد.. مامۆستا چەندین وتەی جوان‌و هێنانەوەی بەڵگەی شەرعی بۆ باسکردن..

برایان دەبێت خوشکان‌و خێزانەکانتان بەهەمان شێوەو دەستور ئامادەبن ئایا رازین..

بەڵێ بەسەرچاو ئێمەش هەمو خوشك‌و براین‌و پارێزگاری ئەرکی سەرشانمانە.

بۆ ئێوارەی داهاتو دوای نوێژی خەوتنان خوشکان‌و دایکان لە مزگەوت ئامادەبون.. مامۆستا چەندین بابەت‌و بەڵگەی شەرعی‌و رۆڵی ئافرەتی لەتەك پیاودا بۆ باسکردن (مەلێك بە یەك باڵ نافڕێ).

هەمو گەردنی یەکتریان ئازاکرد بەڵام مامۆستا وتی: ئەبێت گەردنی پیاوو مێردو براکانتان ئازاکەن.. نابێت کەستان حەقتان لای کەستان مابێت..

بەرێزەکەم.. مرۆڤی سالانی رابردو پاك‌و بێگەردو هەستی ئاینی لەکارو کردەوەیاندا رەنگیدابۆوە.. بونی مامۆستایەك لەگوندێکدا نیشانەی ئەو پەڕی پێشکەوتن بوو.

بۆ بەیانی منداڵان بوکە بەبارانێیان سازدا لە مەراسمێکدا هەرچیان زانی بەدنیا بێگەردەکەی خۆیانو داواکاری ڕازو نیازی خەڵکی وتیانو نواندیان.

هەیارانو مەیاران          یاخوا داکاتە باران

بۆ فەقیرو هەژاران

بوکە بە بسارانێ          سەعاتی جسارانێ

ئاوی بن دەغلانێ          هەیارانو مەیاران

یاخوا داکاتە باران          بۆ فەقیرو هەژاران

چاڵی گەنم پڕ بێ          گوڵی گەنم خرپیبێ

هەیارانو مەیاران          یاخوا داکاتە باران

بۆ ئێمەو بۆ هەژاران

منداڵان لە گوێزو خورماو دانەوێڵەو نوقڵو پارە پڕ گیرفانیان بو، هەموشیان لە ئاو هەڵکشان، پیاوانو ژنانی گوند ئێوارە مانگی ڕەمەزان ئاسا بە دەمی پڕ دوعای خێرەوە ڕۆژویان شکاند کەس بێفرمانی نەکرد.

بۆ نیوەڕۆی دوای هەینیو دوعاو پاڕانەوەی زۆرو بە ئامادەبونی هەمویان چونەوە ماڵو نانی نیوەڕۆیان خوارد.. باران هەر نەباری هەر نەباری.

مامۆستا بۆ جارێکیتر خەڵکی هەمو کۆکردەوە پێی ڕگەیاندن.. کێ لە توانایدا هەیە ئاژەڵێکبکاتە خێر بهێنێو لە گەڵمانا بێت.. کێ لە توانایدا نییە با خۆی ئامادە بێئەمە خێرێکە بۆ هەموانە..(ئەزیران مێوگەر ساڵانە بیبڕی بۆ ساڵی داهاتوی زیاتر ترێ دەدات.. خێر تا زیاتری لێبکەین زیاتر زیاد دەکاتو دەبێتە لابردنی بەڵاو ناڕەحەتی).

مەلا مستەفا لە ئاوایی دەرچو بۆ نوێژە بارانەو سەربڕینی حەیوانەکەی، خەڵکی کە مەلایان بەم شێوەیە بینی هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە ئامادە بو هەندێکیان بە دەستی بەتاڵو هەندێکیان بە سەرێك (بزنو مەڕو نۆبەن جوانەگا...) بەرەو پشتی ئاوایی کەناروێ ڕۆیشتن.. ئای لەو دیمەنە ئیمانیەو ئای لەو دەرونە پاکژەو بۆ خواو مرۆڤ زیانە.. بەنێتێکی پاکەوە نوێژە بارانەیان ئەنجامداو پاش دوعاو پاڕانەوەی تایبەت.. مامۆستا قوڵی هەڵماڵیو نیەتی لێهانیو حەیوانی خۆی کردە خێریباران بارین هەرکەسەو لە ئاستی خۆیەوە خێری خۆی کرد، هەمو ئاژەڵەکانیان کەوڵکرد. گۆشتەکەی

پارچە پارچە کرا.. هەوری ڕەش بەری ئاسمانی ئەو ناوچەیەی گرت.لە خۆشیاندا خەڵکی هەمو خۆشی لە ڕوخساریان دەباری باران وردە وردە دایکرد..

مامۆستا وتی: ڕەحمەتی خواتان لێبێت کەس بۆ بن دارو پاسار نەڕوات.. باهەمو لە باراندا بخوسێین.

کەس دەست هەڵنەگرێ خوای گەورە دوعاو نزاو خێرەکەی لێقبوڵکردین..گۆشتی حەیوانەکە پارچە پارچە کرا خوێنو ئاوی باران تێکەڵ بوو پلەی گەرما نزم بۆوە..

خەڵکەکە بەتەواوی هیلاك بون، هەر ماڵەو بەزیادەوە بەشە گۆشتی خێری خۆی بەرکەوت. ئەوەی زیاد بو دایانە کوڕێکی گەنجی بە توانا.. سواری وولاغێکیان کردوڕەوانەی گوندێکی دراوسێیان کرد، بە مەبەستی بەشداری بون لەو خێرو خۆشییەدا. هەمو بەخۆشیو شادی لە کۆکردنەوەو پاککردنەوەی ئەو ناوەدابەشداربون، ئەو کەسە بەرێزەی گۆشتەکەی برد بۆ دێکەی هاوسێیان گەڕایەوە.. مامۆستا پرسی: خێر بووا زوو گەڕایتەوە!؟

کوڕە لاو: مامۆستا گیان لە نیوەی ڕێگا پیاوێکی ئەو گوندەم توشبو ئەوانیش ئێمە ئاسا هەستاون بە خێرو خۆشی بۆ( بارانی ڕەحمەت) بەشی ئێمەیان ناردووە، ئێمەش بەشی خۆمان ناردوە، لە ڕێگا گۆڕیمانەوە هاتمەوە.

مامۆستا بە بیستنی ئەم وتانە فرمێسکی خۆشیو دڵۆپی باران بەڕیشی پیرۆزیا جۆگەلەیان بەست پاشان وتی: سوێند بێت نایەتەوە ناو دێ بڕۆ بیدە بە خەڵکی گوندێکی تر تا نەیکەیتە خێر نەیەیتەوە ئەو ئێوارەیە ماڵ نەبو بۆنو هاڵاوی گۆشتی کوڵاوو برژاو لە ماڵیانەوە تێکەڵ بە باران نەبوبێت.

خوێنەری ئازیز.. گەر ویستمان خوای گەورە دەرگای سۆزو ڕەحممان لێبکاتەوە دەبێت نیەتەکان یەکبن، لاشەو ناخ خاوێن بن داواو سۆز بێتە ئەرزی واقع ئەو کاتە خوای باڵا دەست دەرگای خۆیمان بۆ دەکاتەوە.. پێغەمبەری گەورەشمان (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (انما الأعمال بالنیات وانما لكل امرء مانوی....) یان (من لایرحم الناس لایرحم الله).منیش لە چاوەڕوانی بارانی پڕ خۆشیدام بۆ ئەم زەوییە وشکەو گژوگیاو زیندەوەران خوایە گیان لە خۆشییەکانی ئەرزو ئاسمان بێبەشمان نەکەیت امین... امین. الحمد الله رب العالمین.

# خێزانێکی بەخشندە

لەم هەناسەی بەختەوەرییەدا ئەم خێزانە خێرخوازە باسدەکەم بۆ بەڕێزتان کە چۆن خۆی ڕاهێناوە لەسەر بەخشین.. کە چۆن خێزانەکەی فێری بەخشین کردوە، کە چۆن منداڵە ناسك و نازدارەکانی بە پارەی حەڵاڵ و بە شێوەی جوان ئاداب داداوەبە چەمکە پڕ واتا جوانەکانی بەخشین .. هیوادارم چاویان لێبکەین و ئێمەش کاری جدی بۆ بکەین.

ئەوە چەند ڕۆژێکە لەم لاولا بانگەشە دەکرێت بۆ خێرو خێرخوازی ئەو من و تۆ ڕەنگە بە خەیاڵماندا نەهاتبێت هەست و ویژدانی نەجولاندبین بەڵام ناخ و هەست و بیری ئەم خێزانەی هەژاند.. ئای بەخشندەی.. ئای خۆشە کەسێك دڵخۆش بکەی کە چاوەڕێی خێرە و سوپاس گوزارە.

برایەك لەگەڵ هاوسەرەکەی و دوو منداڵی بچوکی نازداریان پێبو هاتن بەرەو سندوقی بەخشین من سەرنجم دەدان.. من لە هەندێك کەس ورد دەبومەوە سەرنجیان ڕادەکێشام، ئەمەش یەکێك بو لەو دیمەنانە..

پیاوەکە چوە سەرسندوقی خێرو چی لە تواناو گیرفانیدا هەبو بەخشی، هاوسەرەکەی لەلایەکی ترەوە چوە لای سندوقی ئافرەتان شتی زۆر جوان و دەگمەنی خۆی بەخشی، ئەو کەسەی کە لەسەر سندوقەکە بوو سەرسام بو وتی: دادە گیان یەکجار خۆت مەخەرە نارەحەتیەوە، ئەی چی بۆ خۆت؟ خۆ ڕەنگە ئەو کەسەی سندوقەکەی بۆ دانراوە تەنها مەبەستی جولاندنی لایەنی بەخشینی من و تۆ بوبێت.ئافرەتە خوا پەرستەکە وتی: من بە نێوەی نادەم من بە خوایەکی دەدەم کە دەیناسم و دەیپەرستم من بە خوای بەخشندەی دەبەخشم.

لەو لاوە دوو منداڵە نازدارەکەیان هاتنە سەرمێزی نزیك سندوقەکەوە یەکی عەلاگەیەکی ڕەشیان پێبو زۆر لەسەر خۆو بە جوانی کردیانەوە یەکی دەغیلەیەکی بچوکی خۆیان پێ بوو ئەویشیان کردەوەو هەڵیان ڕشتە سەرمێزەکە.. ئاخر بەڕێزان

منداڵ دەغیلەی زۆر لاخۆشەویستە بە دڵو گیان لە دەمی خۆی دەگرێتەوەو دەیخاتە ناو ئەو سندوقە بچوکەوە.

پاش ژمارەکردنی، ژماردمان یەکی ٤٠٠ دیناری سویسری بوو ئەوەی سەرنجی منی زۆر ڕاکێشا ئەو دوو منداڵە جوانو نازدارو هەست ناسکە بون کە دوای دورکەوتنەوە لە مێزەکە هیچ ئاوڕێکیان بۆ پارەکەو دەغیلەکەیان نەدایەوە.

منداڵ تایبەتمەندی ڕەوشتو ڕەوشی وەهایە کەشتێکی خۆش بوێت گەر دایتیو ڕۆیشت ئاوڕێکی بۆ دەداتەوە.. دڵی لەلای ئەو کەرەسەو شتەیە کەداویەتی بە تۆ بەڵام ئەم دو منداڵەی هێندە جوان پەروەردەکرابون کە زۆر سادە و ساکاربون.

پارەکەیان بەخشیو بیریان لە لەدەستچونیان نەکردەوە.

ئێمە ئەمڕۆ خێر دەکەین دەبەخشین بەڵام بە بێگار بە ناڕەحەت بە ناخۆشی دەزانین..

لەو لاشەوە پارەیەکی زۆرت دەستدەکەوێت لە ڕێگەی کارتی موبایلو کەرەسەی سەردەمی نوێوە خەرجی دەکەیت هەر بەخۆشت نازانیو سادەو ساکارە بەلاتەوە..

ئەزیەت نەبێت هێندەمەدەرە گەشتو سەیرانو کەرەسەی کات بە فیڕۆدان نیو ئەوەندە بکەرە خێرو بەسەر یەکەوە بیدە دەستی کەسێك کە چاوەڕێی خێرو خێراتە..

لە کەرەسەیەکیش ببەخشەکە خۆت خۆشت دەوێت کەرەسەیەك بدەرە خەڵکی کە لە خۆت زیادنەبێتو جێگەی گرتبێت واتە (تاقمە قەنەفەو بۆفیو ڕاخەر) دەدەیتە کەسێك کە لەلای خۆت جێگەی گرتوەو زیادە..

هیوادارم لە بەهاو نرخی بە خشین گەیشتبینو بتوانین هەنگاوی خێری بۆ بنێین ئاگامان لە کەسانی پێش خۆمانەوە بێت تەماشای ژیانی داهاتوش بکەین سەنگین بین انشاء الله.

# پێغەمبەرﷺ لە خەوی بێخودی شاعیردا

مامۆستا مەلا مەحمود بێخود (١٢٩٨ – ١٣٧٥ك) دەڵێت: شەوێکیان لە خۆشەویستی سەرداری مرۆڤایەتی دەستم کردە دانان و نوسینەوەی قەصیدەیەك کە بۆ ئەوزاتە دەریای مەحەبەتی شەپۆل دەدات لە ناخمدا زۆرم وشەی جوان و پڕ واتام بە دوایەکدا ڕیزکرد.. بەڵام ماندو بون و کەم کەرەسەی و سەریەشە نەیهێشت قەصیدەکە بێنمە پایان هەروا بە قامیش و مەرەکەب و کاغەزەوە خستمە ژور سەرم و نوستم...

بۆ بەیانی چومە سەر حەوزێ بۆ گرتنی دەست نوێژ بەڕەحمەت بێت مامۆستا عبدالله لەژوور سەرمەوە وەستاو فەرموی(بێخود.. پێم بڵێ ئەمشەو چیت کرد.. چ کارێکت ئەنجامداوە زۆر خێر بوبێ..))

منیش سەرم هێناو سەرم برد هیچم شك نەبرد کەشایستەی وەڵامەکەی بەڕێزیان بێت بۆیە لەوەڵامیا عەرزم کرد: قوربان هیچ کارێکم نەکردووە.. بۆ دەپرسی بەڕێزیان دووبارەی کردەوە: باش بیر بکەرەوە بزانە چ کارێکت کردووە زۆر خێر بوە ئەو کاتە بیرم لە قەصیدەکە کردەوە و وتم: قوربان ئەم شەو قەصیدەیەکم لەخۆشەویستی ڕەسولی نازدار دانا..

قسەکەم تەواو نەکرد بەڕێزیان فەرموویان: بەڵام قەصیدەکەت تەواو نەکرد.. وانیە..؟!)) سەرم سوڕما.. ئەم چۆن ئەزانێ ئەمە تەنها نهێنی نێوان خۆم خوای گەورەیە.. )) بەڵێ بەڕاست و دروستی وتم:

قوربان سەرم ژانی دەکرد.. هیلاك و شەکەت.. نەمتوانی کۆتایی پێبهێنم.. فەرمویان: تەواوە.. ئەمە ناوەرۆکی خەوەکەیە.. پاشان بەڕێزیان وتیان:ئەمشەو لەخەوما تۆ بێخود لەچۆڵەوانیەکدا وەستابوی وردە وردە هەنگاوت دەنا بەرەو کەسێك ئەویش وردە وردە هەنگاوی دەنا بەرەو تۆ کەنزیك بۆوە بەنوری جەمالی و هەیبەت و هەیبەت زانیم ئەمە ڕەسول اللەیە زۆر لەیەکتر نزیك بونەوە.. هەر ئەوەندەی مابو دەست بکەنە ملی یەك

بـەڵام تـۆ وەسـتایتو ئـەویش وەسـتا.. هـەنگاوەکان کۆتاییـان هـاتو منـیش خۆزگـەم دەخواست بگەنە ئامێزی یەکتر بەڵام ئەو لەئامێز گرتنە دروست نەبو.. خەبـەرم بـۆوە.. ئـای بێخـود خۆزگـە قەصـیدەکەت تـەواو ئـەکرد ئەوسـا لەخەونەکەمـدا لـەئامێزی خۆشەویـستی خۆشەویـسترین کەسـی سـەرزەویدا ئەمبینیتـەوە..) خەومکـەی ڕای چـڵەکاندم بۆیـە دوای نوێـژی بـەیانی دانیـشتم قەصـیدەکەم تـەواو کـرد، ئێـستا ئـەو موناجاتو قەصـیدەیە زیـاتر لـە (٦) لاپـەڕەی دیوانەکـەی گرتۆتـەوە. لەکۆتایـدا بـەڕێزی خوێنەر بەهەمو لایەکمان خۆشەویـستی ئـەو زاتـە لـەدڵمان بـزر نەکـەین هـەوڵو مانـدو بون بکێشین.. دڵنیابە خوای گـەورەو ڕەسولی نـازدار خۆشـحاڵە بەهـەمو کـارێکی جـوانو بەحـەیاو بەئـەدەب.. بابـە ئـەدەب کـاری جـوان ئـەنجام بـدەینو پـەیمان تـازە بکەینـەوە لەسەر دینداریو خواپەرستی إنشاء الله.

# چاکە بکەو بیدە بەدەم ئاوەوە...

ئەو شەڕەی نێوان ئێران عیراق کە بەبێ هیچ ئامانجێ هەلگیرساو بەبێ هیچ ئومێدو ئامانجێ دوای هەشت ساڵ مەینەتی کۆتایی هات تەنها ئاناراميو خەمو خەفەتو دلگرانيو کاولکاری هێنایە بونەوە، مرۆڤەکان لەم سەری عێراق تا ئەو سەری وڵات شلەژان و نەگبەتی بەشیان بوو، بەڵام ڕوی گەشی مرۆڤایەتی لە سایەی (باوەڕ)ەوە زۆربەی جار پشکی شێری دەدایە مرۆڤەکان کە هەمو کات لە ویژدانی زیندودا دور لە ڕەگەز پەرستيو شکاندنی سنوری سیاسی کاری خۆی دەکردئاگری جەنگ نا ئارامی هەلگیرسان دێهاتەکانی سنوری کاول بونو عێراق هەمو دێهاتە سنورییەکانی داگرت بۆ ناوشارو کۆمەلگە زۆرەملێکان..

زۆر لە دێهاتی تر کە جێگەی مەترسی نەبوون مانەوە، لەو گوندانەش کە ئەم ڕوداوە واقعییەی تیا ڕویداوە گوندی (سیرەمێرگ)ی بناری ئەزمڕ بە دیوی چوارتادا بووە، کە کاك (حمە ڕیشە) بۆمان دەدوێ دەڵێت:

خزمێکمان لەو گوندە چەند ماڵیەدا دەژیا ناوی (کاکە حمە) بوو.

ئێوارە زستانێکی تەڕ و توش ڕوی لە ناوچەکەمان کرد بوو، مەڕو ماڵاتەکەم تاقەت کردو شەوگار هاتە پێش نزیك بانگی خەوتنان بۆوە لە دوری دێکەمانەوە تارمایی پیاوێك دەرکەوت لەناو بەفرەکەدا کەبەرەو من دەهات..پاش چەند خولەکێ هاتە بەردەستمو بەعەرەبی قسەی کرد لە کورتەی قسەکانیدا وا دیار بوو کە سەربازەو بە نیازە بگەڕێتەوە (رەبایەکە) کە لەسەر شاخی ئەزمڕ بوو، ئەم داماوە لە مۆڵەتی سەربازی هاتبۆوە (ئیڤاکە) لە خوار دێکەوە دایبەزاندبو.

وردە وردە بەفرو باو گەردەلول دەستی پێکرد لە ڕاهی خوادا هێنامە ماڵەوەو ئەو شەوە داڵدەم داو خواردنی باشمان دا پێ.. لە سەرماو ڕەقبونەوە ڕزگاری بوو بۆبەیانی دنیا

شەبەقی دابو.. نان‌و چایی خواردو دوای سوپاسی زۆرو بێپایان ویستی سەرکەوێت بۆ سەر ئەزمڕ لە ڕوکاری نسێوە بەڵام حەزم کرد پیاوەتیەکەم کامڵ بێت...

وڵاغێکی بەرزەم هێناو سوارم کرد .. کوڕە گەورەکەم بۆ شارەزایی ڕێگە لە گەڵیا بەڕێ کەوت، ئەم کارە زۆر سادەو ساکار بو بە نیسبەت ئێمەی گوندنشینەوە، بەڵام لە تەرازوی ئیلاهیدا سەنگی زۆربو شەڕ درێژەی کێشا ... هەمو ئەم بەرو بەری چەمی قەڵاچوڵان لە دورترین گوندەوە تا سەری ئەزمڕ بە (کۆمەڵگا نشینەوە) خاپور کران‌و خەڵکەکەی هاتنە کۆمەڵگەی بازیان و ئەسرو باریکەو شانەدەری‌و هەڵەبجەی تازەو کانی شەیتان‌و... زۆر لە خەڵکی خورەوشتیان گۆڕا هەندێکیشیان لەسەر زەمەنی خۆیان مانەوە کاکە حەمە هەندێ وڵاغ‌و مەڕو ماڵاتی خۆی‌و خەڵکی تر دەبات بۆ قەسابخانەکانی شاری موسڵ‌و دەیفرۆشێت بە سی هەزار دیناری سویسری‌و پارەکە دەخاتە باخەڵی‌و قایمی ئەکات‌و جوان ئەیشارێتەوە بەدڵی خۆشەوە ئەگەڕێتەوە لە زاڵگەی (کەرکوک - هەولێر) دایدەگرن‌و پاش پشکنین‌و لێوردبونەوە پارەکەی ئەدۆزنەوە، بەجل‌و بەرگی کوردییەوە زۆر ڕقیان لێی هەڵدەستێ‌و لە بیانو دەگەڕێن، پارەکەی لێدەستێنن‌و چینێکی باشی دەکوتن ئەڵێن: ئەو پارەیە بۆ (مخەریب) ئەبەی لەو بەر سوری هەتاوە ڕایانگرتم‌و کەلەپچەیان کردە دەستم‌و لە پشتەوە هەرکەسێکیان لە ئەندامانی سەیتەرەکە بەلاما ئەڕۆیشت شەقێکی تێهەڵئەدام، ئەم داماوە زۆر بێتاقەت نارەحەت ئەبێ... ماڵەکەی ڕۆشت.. هاکا سەریشی ڕۆشت، بەتەپاوتل خۆ نزیک ئەکاتەوە لە ژوری حەرەسەکان چەند قسەیەك ئەکات کە هەموی پاڕانەوە ئەبێ بەڵام گوێی لێناگرن‌و بێسود ئەبێت. ئالەم کاتەدا کوردێکی ئاوا بەو پارەیەوە بەردەست جەندرمەکانی بەعس بکەوێت، ئاشکرایە بە ئاسانی وازی لێناهێنن.

ناچار زۆر ئەپاڕێتەوە هاواری خوای گەورە ئەکات، دڵی غەریبی، غوربەت ئەیگرێ تەنها خوای گەورە ئاگادارە بەم نارەحەتیەیەکێك لە سەربازەکان دێتە دەرەوەو بەرەو لای ئەچێت لەبەردەمیا دا ئەنیشێ‌و ئەڵێ: کاکە تینوت نییە؟ گەرمات نییە؟

ئەمیش بە لاوازی ئەڵێ: جا دەسەڵاتم چییە!

سەربازەکە ئەڵێ: مژدەیەکت بەمێ هەر ئێستا خۆت ئامادەبکە!

وامزانی بۆ بەربون‌و گەڕانەوەیە.. بەڵام وتی:

خۆت ئامادەبکە بۆ سجن‌و هەینەی کەرکوك، کەوای وت بەتەواوی هیوا بڕاو بوم کە ئیتر شارو ماڵ‌و منداڵ‌و خزمان نابینمەوە سەربازەکە چوە ژورەوە.
منیش لەو سورە هەتاوەو لەو گەرمایەدا سەرم بۆ ئاسمان هەڵبڕی‌و تا توانیم لە پەروەردگار پاڕامەوە ... لالأمەوە کەبێت بە هانامەوە.. بەڵام لە رەحمەتی خوا نائومێد نەبوم، دوعام کرد دوعاو پاڕانەوە بە دڵ چەند سەعات گوزەری کرد وامەزانی ڕۆژگارن..
سەیارەیەکی (جێب قیادەی واز) بەلامدا ڕۆیشت‌و چەند سەیارەیەکی بەدواوە بوو، من تەماشام نەکردو ئەوانیش تەماشایان نەکردم..
لە پڕ جێب قیادەکە بەگێکی داناو پاشەو پاش گەڕایە دواوە لە ئاستی من ئەفسەرێکی پلەداری بالأ بەرزی قیافەرێك دابەزی بە پۆستاڵی سورو نەوت شجاعەوە چەند ئەستێرەیەك لەسەر شان.. کە ئەم دیمەنەم بینی لە دڵی خۆمدا وتم: حەمە تەواو مەرگ بووە میوانت .. ئەمە بارت ئەکات بۆ هەینەی کەرکوك..
حیمایەکانی بەو ناوەدا بلاوبونەوە بەرەو لای من هات، هەر هەنگاوێ لێدانی دڵم زیادی دەکرد دارەکەی دەستی خستە ژێر چەناگەم‌و سەری بەرز کردمەوەو چەند چرکەیەك تێیڕوانیم.. پشتی تێکردم‌و ڕۆیشتە ناو زوری زالگەکەوە بەدارەکەی دەستی هەمو سەربازەکانی داپاچی داوای کلیلی کەلەپچەکەی کرد..بە دەستی خۆی کەلەبچەکەی کردەوە، وتی:
ئەم پیاوەتان بۆ لەم گەرمایەدا ڕاگرتوە.. چ تاوانێکی کردووە.
وتیان: گەورەم ئەوە پارەی (مخریبی) پێیەو گرتومانە.
وتی: شتی وانیە کوا پارەکەی پارەکەیان دایە دەستی‌و پارەکەی دایەوە دەستم
تا ئەو کاتە هەر بە گاڵتەم ئەزانی دەستی گرتم‌و لەبەر تەنکیەکە دەستو دەم‌و چاوم شت‌و ئاوی ساردی دامێ‌و لەگەڵ خۆی سواری کردم
لە دڵی خۆما بە خۆم ئەوت یان بۆ هەینەی کەرکوك.. یان بۆ گەڕانەوە..
لە ڕێگە کابرای ئەفسەر وتی: نامناسی؟؟
وتم: ڕاستت ئەوێ نەبەخوا .وتی: باش بیربکەرەوە.. باش بیربکەرەوە چ خێرێکت کردووە! هەرچەندە بیرم کردەوە ئەو چاکەیەی زیاتر لە ١٠ساڵم بیرنەکەوتەوە.. چوزانم.. هەزار خراپەو چاکەم هەبو.. بەڵام لەڕەحمی خوا نائومێدنەبوم..ئەمە ئەو

سەربازە داماوەبوکەکانی خۆی پێش زیاتر لە دە ساڵ ئەم چاکەیەم لەگەڵ کردبو، لەمردن و ڕەق بونەوە ڕزگارم کردبوئەویش پلەدار بو بەلاّم من نامناسی، لەم ماوەی شەڕی ئێران، عێراقەدا پلەوپایەی بەرزبوبۆوەو مەدالیای ئازایەتی-(نوط الشجاعه)وەرگرتبو.. کەس دەستی نەئەهێنایە ڕێگەی ، خۆشی کەوتە دڵمەوە، دوای تۆزێك ڕۆشتن وتی: بۆ کوێ ئەچی؟ لەکوێ بوی؟ وتم: ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، لەموسڵ بوم. وتی:هیچ قسەی تیا مەکە.. ئەمشەو میوانی من ئەبی‌و بەیانی خۆم تا دەرگای ماڵەوە بەم جێبە ئەتگەیەنم، بەخۆشحاڵییەوە وتم: ماڵتان ئاوەدان بێت زۆر سوپاس بۆ خواو زۆر سوپاس بۆ بەڕێزت لەمردن ڕزگارت کردم زۆر هەوڵیدا.. ڕازی نەبوم.. ناچار گەیاندمیە (( نەقلیاتی کەرکوك))و سواری سەیارەی سلێمانی بوو.. حیمایەکانی خۆی لەگەڵ سەیارەکەمدا نارد تالەشاری کەرکوك دەرچوم..ئەمە وانەو پەندو ئامۆژگاریەکی گەورەیە کەکاکە حەمە کردبوی تەنها لەڕاهی خوادا.. پاش ئەو زەمەنە چاکەو پاداشتەکەی هاتەوە ڕێگەی..[9] کوردەواریش وتویانە(( چاکە بکەو بیدە بەدەم ئاوەوە...))

کاکە حەمە ئەڵێ: ئێستا لە گوندەکەی خۆمان لەدوای ڕاپەڕینەوە دەژیم.. ئەو دیمەنە جوانە بەبەرچاوما دێت‌و دەڕوات..لەهەمو شوێن‌و جێگەیەك لەناو هەمو گەل‌و نەتەوەیەکدا کەسی چاك‌و کەسی خراپ هەیە..

ئەتوانی بڕیار بدەی لەکامیان بیت.. ئاکامیش لەم چیرۆکەو بابەتەی تری ژیان فێرت دەکات.. ژیان زۆر شتیتری لەلایەو لەداهاتودا فێرمان ئەکات.. سەرکەوت‌و بن..

---

[9] سود وەرگیراوە لە کتێبی ژیانەوە/ نوسینی ئەندازیار عوسمان، بەرگی پێنجەم کەئەویش لە بەڕێزحاجی حبیب پێنجوێنی وەرگرتووە ..ئەویش لە کاك حمە ڕەشەی سایەقی بیستووە .

# ماڵی حەڵاڵ و نیەتی باش

کاك عەتا برادەرێکی دێرینمەو پەکترمان خۆش گەرەکە.. رۆژێکیان بابەتی پارەی حەلاڵو حەرام و ماندوو بوون و شەو نخوونی و کاری گەرما بە رۆژی هاوین هاتە ئاراوە..

هەر یەکێك لە ئێمە رووداوێکی گێڕایەوە ئەویش وتی: باوکم (شێخ ئەحمەد) زۆر دەمێك بوو دەمانزانی پارەی دانراوی هەیەو نەمانزانی لە کوێدا حەشاری داوە، لە لای کەسمان باسی ناکرد.. کە زۆرمان بۆ دەهێنا دەیوت: بەو پارەیە نیەتی کاری خێرم هەیە. باوکم پارەو پولی زۆر بە نارەحەت پەیدا دەکرد، بە ئارەقی ناوچەوانی خۆی دەژیا..، ئەو ساڵەی شەڕی عێراق – ئێران درێژەی هەبوو، سوپای ئێران بە تۆپی دوور هاوێژ شاری سلێمانی بۆردومان دەکرد، ئێمەش وەك هەمو خەڵکی سلێمانی و (شەهیدانی ئازادی و خانووە قوڕەکان) فەردەمان پڕکردبوو لە گڵو لەبەر پەنجەرەو دەرگادا هەڵمان چنی بوو ساخوایە ئەمە پارچەیەك تۆپ بەرمان نەکەوێت، لەم تۆپ بارانەدا زۆرێك لە دانیشتوانی ئەم گەڕەکانە (شەهیدو بریندارو کەم ئەندام) بوون، ئەوەی من قەت بیرم ناچێتەوە پیاوێك ناوی حاجی ساڵح بوو لە چوارتاوە (کچەکەی و کوڕەکەی) ناردبوو بۆ شار سا خوایە ئەمان لە بۆردوومانی چوارتاو دەورو بەری سەلامەت بن، بەڵام بێ ئاگا لە قەدەری ئیلاهی، لەکاتی تۆپ باراندا ئەم کچ و کوڕە خۆیان دەکەن بە کونە تەیارەیەکدا لەو بەر مزگەوتی هەنجیرەکەوەو تۆپێك دەدات بە بەردەم کونەتەیارەکەدا براکەی لە پێشەوە برینداربوو کچەکەش سەڵتەن شەهید بوو.. ئەمە زۆر هەژاندمی ئاخری بە نسیبی بوو ئەو مەرگەی کە لە دەستی رای دەکرد، ئەمە لەلایەك.. وەرە بزانن شێخ چی لە پارەکەی کرد.. پاش چەند مانگێك تۆپ باران نەمائینجا هەر ماڵ بوو مەکینەی دەگرت بۆ فڕێدانی ئەو گڵو خۆڵەی بەر پەنجەرەو دەرگاکانی..

ئێمەش ڕۆژێکیان لەگەڵ دایکم و خوشکەکەمدا دەستان کردە خاوێن کردنەوەی ناو ماڵەکەمان.. باوکم لە ماڵ نەبوو..
هەرچی پەڕۆو پاڵو گوێنی و کەرەسەی خراپ هەبوو لەبەر دەرگا دامانناماڵ خاوێن بۆوە.. کاتێك (مەکینەی خۆڵی بەلەدیّ) هات خستمانە ناو مەکینەکەوە لای نیوەڕۆ بوو باوکم هاتەوە ناو ماڵی بینی بە خاوێنی دەست خۆشی لێکردین.. ویستی نان بخوات.. سەرنجی دا لە توونی حەمامەکەو سەرسام بوو، هاواری کرد: دایکی عەتا! دایکی عەتا..! ئەوە کوا پەڕۆو پالّی ناو ئەو توونی حەمامە.. دایکم وتی: وەڵلا ئەمڕۆ ماڵمان پاك کردەوەو هەمو شتە پیسەکانمان فڕێدا.. باوکم هاواری کرد: ئەی هاوار.. ماڵ کاول بووم هەرچی پارەم هەبوو لەو توونی حەمامەدا حەشارم دابوو.. چۆن فڕێتان دا..!! داتان بە کێ‌و لە کوێ فڕێتان دا..دایکم وتی دامانە مەکینەی خۆڵەکە.. خێرا باوکم خۆی کۆکردەوەو وەك ڕەشەبا دەرپەڕی بۆ دەرەوە.. لە ڕێگا خواو ڕاستان بەو مەکینەی خۆڵی بەلەدیێە گەیشتبوو پرسیاری لێکردبوون: کاکە گیان ئەو خۆڵەی ئەم بەیانییەتان لە کوێ ڕشتووە.. ئەوانیش دەشتی قرگەیان پێ وتبوو، باوکم خێرا خۆی گەیاندبووە (خۆڵە عەمەلەکەی قرگە) زۆر گەڕابوو.. باش بوو ئەو ئاگرەی پێوەیان نابوو بۆ سووتانی کاغەزو شت نەگەیشتبووەوە توورەکە پارەکەی باوکم.. زۆر بەزەحمەت گوێنییەکانی دۆزیبوویەوە، لە ناو هەمویاندا ئەو گوێنییەی ناسی بووەوە کە پارەکەی تیادا شاردبووەوە.. بەڵێ پاش نوێژی عەسر لەو لاوە بە دڵی خۆش و بە پارەکەوە گەڕایەوە.. لە ئاکامدا وتمان: ئێمە یەك خێزانین بۆ دەبێت پارەت نهێنی بێت، پێکەنی و وتی: باشە لەمەولا با هەموتان بیزانن.. ئەو پارەیەم بە ئارەقی ناوچەوانم پەیدا کردووەو نێتی حەجم هەیە (إنشاءالله) ئێمەش وتمان: ماڵو پارەی حەلاڵ بۆ کاری حەلاڵ.

# پێغەمبەرﷺلە خەوی حاجی محمدی هەورامیدا

بەڕێزان هەمو کات مرۆڤەکان نەبێت نائومێد نەبن لەدەروازەی ڕەحمەتو بەرەکەتی خودای هەردوجیهانیان.. نارەحەتیو نائارامیو نائاسودەییو نائومێدی تەنگت پێهەڵنەچنێ هەردەم خۆت بەقوتابی (قورئانو پێغەمبەر) بزانە.. دڵنیابە.. چاك چاك بزانە سەرکەوتو ئەبیتو چۆك بەبەرامبەرەکەت دادەدەیت.. کاری تێدەکەیتو بەدەستی لەرزۆکی کارت تێناکات.. دڵنیابە خوای گەورە بەجوانی بەپاکی ڕووی تێبکە سەرکەوترین کەس دەبیت لەسەر زەویدا.. ئەمرۆش نەبێت بەیانی.. دوبەیانی.. بەئارامبە مانگێکیتر سەرکەوتن بۆکەسی خوڕەوشت جوانو بەحەیاو بەئەدەبو خۆڕاگرانە لەم زەمانو زەمینە فراوانە، چاك چاك بزانە.. گەر سەرکەوتو نەبوی بگەڕێرەوە بەکارەکانتا دەزانیت لە کوێدا کەمو کورتی هەیە.. باوەڕ بکە چاك دەبێتەوە.. سەرکەتو دەبیتو دەبیتە چراخانی شەوەزەنگی نا ئومێدیو بێهیوایان حاجی مەجیدی خاڵی مەلا عوسمان ساڵی ٢٠٠٤ سەردانێکی ئاوایی (کەسنەزانی) سەر شیوی سەقزی کوردستانی خۆرهەڵاتی – ئێران – کردبوو.

چەند جارێ سەردانی کردبون بەڵام ئەمجارەیان بەهیوایەکی خۆشەوە گەڕایەوە.. حەزم کرد ئەو ڕوداوە خۆشە کە کردییە دیاری گەشتەکەی منیش بیکەمە خۆشترین مژدە بۆ مرۆڤە پەیامدارەکان...

بەڕێزیان دوای حەسانەوە چوبونە سەر حەوزو ئاوی مزگەوتەکەو ئەو ئاو خۆشییەی بینیبوی سەرنجی ڕاکێشابوو لە مەلا عوسمانی خوشکەزای پرسی بو... ئەویش کورتەی ڕوداوەکەی بۆ بەیان کرد بوو کە بۆتان بەیان ئەکەم إنشاء الله.

خاڵە گیان ئەم حەوز ئاوەی تۆ لەسەری دانیشتوی بەرهەمی خێر و خۆشی و بەرەکەتی ئەو خەوە بو کە حاجی محەمەدی دانیشتوی گوندەکەمان بەرەسولی نازدارییەوە (ﷺ) بینی بو ئەم زاتە خواناسە زۆر موتەقییە زۆر خواپەرستو نورانیە بەتەمەن نزیك

بۆتەوە لە ۹۰ ساڵێك.. زۆر ڕاستگۆو خۆشەویستە لە ناو هەموانا.. ماوەیەك بو نوێژو جەماعەتی جومعەمان وەك پێویست نەئەکرد لەبەر کەم ئاویو وشکە ساڵی کە خۆی گێڕایەوە بۆ حەوت ساڵێك لەمەوبەر واتە ۱۹۹۷ وشکە سڵی عەجایەب بو پێغەمبەر چوبوە خەوی ئەم حاجی محەمەدەوە کە بە ڕەگەز هەورامیە وپرسی بوی بۆچی جومعەو جەماعەتیان ساردو سڕە حاجی محەمەد؟! وەك جاران نەماون؟ ئەویش عەرزی رەسولی ئەکرەمی کرد بو کە:

قوربان گیان ئاومان نەماوە لە ناو دێدا.. ئاوو ئاوەدانی زۆر گرنگە بۆ گوندەکەمانو بۆ خواپەرستی.. پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووبو:

حاجی محەمەد لە دووری دێکەتانەوە نزیکەی سەد مەترێك دەبێت دار بەڵاڵوکێ هەیە بە دوری دو هەنگاو لەو لائەو دارەوە مەترو نیوێك بەبێ زیادوکەم هەڵکەنن ئەگەنە تاشە بەردێ ئەو بەردە لابەرنو نیو مەترێکی تر زەوی هەڵکەنن دەگەنە ئاو ئاوێکی زۆر باش بەشی مزگەوتو ئاوایی دەکات..

بەیانی بەرویەکی خۆشەوە ئەمە دەگەیەنێ بە کوڕەکەیو کە ئەویش عەرزی مەلا عوسمانی بکات.. بەڵام کوڕەکەی دەنگ ناکاتو لە ناکامەکەی ئەترسێ کەوا نەبێت...

بۆ ڕۆژی دوای دوبارە هەمان خەو دەبینێتەوە...

بۆ بەیانی یەخەی کوڕەکەی ئەگرێ پێی ئەڵێ:

بۆ ڕاسپاردەکەت نەگەیاندم .. پێڵاوەکانی سەرپێ ئەکێشێو ئەگاتە لای مەلا عوسمان..

خەوەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە.. مەلا عوسمان ئەڵێ:

جاکوا ئەم خەوەت ڕاستبوایە.. حاجی محەمەد لەم وشکە ساڵییەدا ئاوەدانی بکەوتایەتە ناو دێوە..

بۆ ئەو ڕۆژە نزیکەی (۱۰)هەزار تمەن ئەبێت ئەیهێنێو کرێکارو پاچو بێڵ ئەبەنو لە ڕێگا خەوەکەی دوبارە ئەکاتەوە.. خەڵکەکە بە تامەزرۆییەوە بۆ پیرۆزی کارەکەو ناکامی کارەکە دەڕوانن.

ئەو ئاونیشانەی هەبو نزیکبونەوە ماوەی دو سەعاتێك بەهاوکاری چاڵەکەیان هەڵکەند گەیشتنە بەردێکی مەیلەو زەردی کاهی .. تا شە بەردەکەیان چوار دەورە دایەوەو دەریان هێنا، لە دوای ئەوە نیو مەترێك چاڵیان هەڵکەند...

لەگەڵ هەڵکەندنی هەر پارچە گڵێ خورپەو دڵە تەپە بە خەڵکی ئەگەیشتو خۆشیو کامەرانی لە دڵی حاجی محەمەدا گەشەی ئەکرد.. لە ناکاو بە دەم هاوارێکی گەورەوە حاجی محەمەد وتی: ﴿ اللهم صل على محمد وعلى آل محمد ﴾ ﷺ ئاو زیادی کرد.. زیادی کرد.. سەرکەوت بە پەلە کرێکارەکان هاتنە دەر لە چاڵەکە حاجی محەمەد بەلاچکی فەقیانەکەی ئاوێکی لیلاوی گرتو دەستی کردە خواردنەوەی خۆشیو هەرا کەوتە ناو دێکەوە..پاش ماوەیەك لە بۆریدا ئاومان ڕاکێشا بۆ ناو ئاواییو کردمانە دوو بەش بۆ (مزگەوتو بۆ ئاوایی) لەو نارەحەتیو وشکە ساڵیو بێبارانیەدا بڕوا بکەن دار مازوارو دار گوێزی ئەو کەژو کێوانە وشك بون.. ساڵەکەی زۆر نەهات بوو..

بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە ئاو ئاوەدانی خستە دڵو دەرونی خەڵکەوەو هەندێ کەسی هەرزە لە مزگەوت دوربون بەڵام بەم خەوەو بەم موعجیزە یە ئێستا لە خوای گەورە بە زیاد بێت بونەتە ئەهلی جومعەو جەماعەتو مزگەوتو گوندەکەمان ژیایەوە... ژیایەوە... سوپاس بۆ هەمو لایەك..

خوێنەری دڵپڕ لە نوری ئیلاهی .. بەپاکی لە پەیام نزیك بەرەوە چونکە خوای گەورە کاری گرانت لەسەر ئاسان ئەکات، مرۆڤەکان بە ئەنواری رەسول شاد ئەبنو کامەرانی دڵەکانیان ڕۆشن ئەکاتەوە... دە سەرنج بدە.. خوای گەورە.. پێغەمبەری گەورەمان چۆن ئاگادارە بەرەوشو کارو باری جوانمان.. وەك ڕۆژی روناك ڕاستیەکان ئاشکرابون.. دەتۆش مەترسەو خەمت نەبێ بە پاکی ڕو لە پەیامی پێغەمبەران بکە تا ئاسودە بژیو کامەران بیت بۆ بەهەشتی نەبڕاوە إنشاء الله.

# هەوڵێکی ژاکاو دژ بە کۆرپەلە

کورێکی لاو[10] ، کەم ئەزموون لە ژیان،خاوەن بڕوانامەی سادە، دوای چەند دانیشتنێکی سادەو سۆزدارانە، لەگەڵ کچێکی هاوکاری بوونە هاوسەری یەکتری و چوونە کۆشکی خێزانداریەوە لەگەڵ تێپەڕ بوونی رۆژگارەکان وردە وردە ئەزموونی ژیانیان وەردەگرت و بوونە خاوەنی کۆرپەیەکی جوانکیلە.. ئەم منداڵە رۆژێك لای دایکی کچە.. بەهەر حاڵ بوو پێیان گەیاندو توانی ئەم لەسەر قاچەکانی خۆی بووەستێنێت، کاتی وا هەبوو لە لای ماڵە دراوسێکانیان بەجێیان دەهێشت تا دەگەڕانەوە. بەم شێوەیە دەروونیان نا ئارام دەبوو، بەردەوام دڵیان لای ئەم (کورە) یان بوو.
پاش ماوەیەك دایکەو باوکە بڕیار دەدەن کە (مەنعی منداڵبوون بکەن و نەهێڵن ئەندامانی خێزانەکەیان زیاد بکات، هۆکەش بەخێو نەکردن و پەروەردە نەکردن بوو وەك پێویست).. تەمەنی مناڵ بووە پێنج ساڵانە دایك و باوك لە ناو ماڵی خۆیاندا بوونەتە خاوەنی سەیارەو تەلەفۆن و کەرەسەی ناو ماڵی پۆشتەو پەرداخ.
رۆژێکیان هاوسەری بە مێردەکەی دەبێژێ: هەست دەکەم سکم هەیە.. چی بکەین باشە؟!
بەیەکەوە خۆیان دەگەیەننە عەیادەی پزیشکی ئافرەتان، پزیشکیش وەك عادەتی کارەکەی و دڵنیابوون لە بارو دۆخەکە شیکار (فحص)ی بۆ دەنووسێت لە ژووری تەنیشت دکتۆر ئەنجامی دەدات و سکەکەی دەسەلمێنێت .
کە هەیەو نکوڵی لێ ناکرێت، ئافرەتەکە بەم هەواڵە زۆر دڵ تەنگ دەبێت و پاشان هەواڵەکەش بە مێردەکەی دەدات.

---

[10] (بە دەستکارییەوە لە کتێبی دین و ژین وەرگیراوە) .

مێردەکەی حەز بە بوونی منداڵ ناکات و هاوسەرەکەشی هەروەها، بڕیار دەدەن بچنەوە، پاشان بچنە لای دکتۆرەکەیان، دکتۆرێکی شارەزاترو داوای لێ بکەن بە هەر شێوەك بووە لەم سکە رزگاریان بکات، پاش چەند رۆژێك دەچنە لای پزیشکی ئافرەتان و داواکارییەکانی پێ رادەگەیەنن کە بە دەرمان یان شتی تر منداڵەکەیان لەباربەرێت، بەڵام ئەو رازی نابێت کە ئەو ئیشە بکات و دەرمانێك بدات بە ژنە بەو هۆیەوە سکەکەی لەبار بچێت.. بەڵام ئەوەندە بە ژنەکە دەڵێت: تۆ دەتوانیت بە هەڵگرتنی شتی قوورس یان بازدان لە شوێنی بەرزەوە یان سەرمەوقولات سکەکە لەباربەریت.

ژنەو پیاوەی غەمبار وا دەزانن کێوی پیرەمەگروون لەسەر شانیانە، دێنەوە ماڵەوەو کوڕە تاقانەکەیان لە ماڵە دراوسێیەکەیان دادەنێن و دەچن بۆ بناری شاخێك و جۆڵە وانییەك بۆ ئەوەی تا چی زووە ژنەکە بەسەر شاخەکەدا سەرکەوێت و هیلاك ببێت و لە هەندێ شوێنی بەرزەوە بازبدات بە مەبەستی لە ناو چوونی کۆرپەلەی ناو سکی، ئەمەی باسمان کرد بە کردەوە زۆر گران و نارەحەت بوو، بەڵام هیچ بیریان لە ئاکامەکەی نەکردەوە.. بیریان لە تاوان و پێشهاتە خراپەکان نەدەکردەوە..

ئەزمون لە ژیان ئەم وانە پڕ عیبرەتەی پێ نەبەخشیبوون، هەوڵیان دەدا فێربن، بەڵام بە کوێرانە.. بەڵێ پاش چەند سەعاتێك هاوسەرو مێردی چەواشە،ماندوو دەبن و ئازار دەکێشن. ئافرەت هەست بە ژانەسك دەکات و سواری سەیارە دەبن و دێنەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام ژیان وانەیەکی عیبرەتاوی پێ بەخشین کە هەرگیز لە بیری ئێمەو ئەوانیش نەچێتەوە.. کاتێك نزیك بوونەوە لە ماڵەوە..

قەرەباڵغییەکی زۆر لەدەورو بەری ماڵیان دەبینن، بە هەمو هەنگاوێك چەندین خەیاڵات شەپۆلەکانی هزری ژاکاویان دەبڕێو ئەوەی بیریان بۆی ناچێت مەرگی تاقانەی کوڕە ناوازەکەیانە، کوڕی تاقانەیان لەسەربانی ماڵی دراوسێکەیانەوە بەربۆتەوەو مێشکی سەری پرژاوەو لە جێدا وەفاتی کردووە، ژنەو پیاوە ئەم هەواڵە دەبیستن قەڵەمی ئەژنۆیان دەشکێو زەنگی بیرو هۆشی نەخۆشیان هۆش دێتەوە.. خوایە گیان چیمان بە خۆمان کرد..ئەی هاوار بە ماڵمان، کارەکە دەسپێرێ بە باوك و دایکی و دەڵێت: هەر ئێستا دێینەوە.. باوکی کوڕەکە دەڵێت: خەمی کفن و قەبرت نەبێت پەیدام کردووە.. سەرگەردان مەڕۆ..!!

کوڕەش دەڵێت: بابەگیان لەلایەکی ترەوە قوڕمان بۆ گیراوەتەوە ئێوە خەریکی بن و هەر ئێستا دێینەوە. دەچینەوە لای دکتۆرەکەو داوای لێدەکەن کە بەهەرشێوەیەك بێت نەهێڵێ ژنەکەی منالەکەی سکی لەبار بچێت، چونکە هەر ئەمڕۆکوڕە تاقانەکەیان مردووە، ئەگەر ئەم منداڵەش لە سکی دایکیدا بمرێت بێ منداڵ دەمێننەوە، ناچار هەزار دوعاو پاڕانەوە دەکەن بۆ لەناو نەچوونی سکەکەی .

تا خوای گەورە رەحمیان پێ بکات و وەکو ئەو تاقە کوڕەی لێومرگرتوونەتەوە، لەجیاتی ئەو ئەم کۆرپەلەی ناوسکی دایکەکەیان بۆ بمێنێت و سەلامەت بێت .

لەکۆتاییدا خوێنەری بەڕێز هەرگیز ناڕەحەت و بێتاقەت نەبیت کاتێك خێزانەکەتان سکی دەبێت و ناتوانن بەخێوی بکەن، چونکە منداڵی تریشتان هەیە، بەڵکو سوپاس گوزاری پەروەردگار بکەن، چونکە ئەگەر پێی ناشکوربن ئەوە دوور نییە وەکو ئەم بەسەرهاتەی باسمان کرد خوای گەورە منداڵەکەی تریشت لێومربگرێتەوەو پاشان بە خۆت بزانیت کە چ هەڵەیەکی گەورەت کردووە.

دووپاتی دەکەمەوە قەت نەکەن کفری نیعمەت بکەن ئەمان.. سەد ئامان.

برایەکی بەڕێز وتی: زۆر نارەحەت بووم کە منداڵێکمان هاتە بوون کە ئێمە حەزمان نادەکرد دروست ببێت.. هاوسەرەکەم هاندا کە بچێتە لای (ئافرەتێ) کە بۆ سك لە ناوبردن بە ناوبانگ بوو.. ئەویش رازی بوو، پارەم پێداو رۆیشت.. نیوەڕۆ هاتمەوە بۆنی خواردنی خۆش دەهات، چوومە ژوورەوەو پرسیم: ئافرەت چیت کرد..؟

هاوسەرەکەم وتی: وەڵڵاهی کە ویستم بچم بۆ لای ئافرەتەکە زۆر ئاسایی بوو بەلامەوە ئەو کارە ئەنجام بدەم، بەڵام کە سەیرم کرد چەند منداڵێك یاریان دەکردو پێدەکەنین و دڵ خۆشیان دەنواند، منیش لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئەم کۆرپەلەیەی سکم بێتە دی وەك ئەم منداڵانە دڵ خۆش دەبێت.. یاری دەکات و لە ژیاندا و هاوکارمان دەبێت.. لە پاش وەفاتیشمان دوعای خێرمان بۆ دەکات.. بۆیە گەڕامەوەو ئەو پارەیەشم دا بە مریشکێك و بۆ ئەم نیوەڕۆیە دەیخۆین، رزق و رۆزی لای خوای گەورەیە.. تا سەربدات رۆزیش دەدات.. (ولا تقتلوا أولادکم خشیة املاق نحن نرزقکم وایاکم ان قتلهم کان خطا کبیرا) الاسراء / ٣١

ئەو منداڵە هاتە بوون.. ئێستا لە قۆناغی سەرەتایی دەخوێنێت و زۆر لە منداڵەکانی ترمان زیرەكترو سەرکەوتوو ترو خۆشەویسترە لەلای خەڵکی..

بۆیە دەڵێم: لە شارێکی میسر زۆر هەوڵدرا کە منداڵ دروست نەبێت نزیکەی دەساڵ ئەم پرۆسەیە بەردەوام بوو، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.. پاشان ژنان دەستیان کردەوە بە منداڵ بوون بڕوا بکەن ژنانی ئەو شارە هەرچی منداڵیان دەبوو لە دووانە کەمتریان نەدەبوو.. خوای گەورە هەقی ئەو هەمو ساڵەی کردەوە.. لەبەرئەوە نەخشەی ئیلاهی زۆر جوانە دەستکاری مەکەن.

# دوای (٢٨) ساڵ دابڕان

دوای (٢٨) ساڵ غەریبی و دوور لە یەکتر ژیان ماڵی دنیاو خۆشییەکانی نەبوونەتە بەربەست، ئەو ساڵەی ئاوارەی کوردستان بووین لەگەڵ خێزان و هاوڕێو هاوسەنگەرانمدا لەگەڵ سەرکردەی شۆڕشی ئەیلول لانەواز بووین و هەریەکەو کەوتینە ناوچەو شارێك.. ئەمەی بۆتان دەگێڕمەوە لە کوردستانی باشوور.. لە ناوچەی بادینان لە کۆمەڵگەی (دیانا) بە باشی و بە واقیعی دێتەبەر سۆمای چاوەکانتان..

پیاوێکی بازرگانی سەرمایەداری کوردی سوریا، بە هۆی کارەکەیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە شاری تارانی پایتەختی ئێران سەرگەرمی کارو بازرگانی خۆی بوو، سەرمایەکە یەکجار زۆری هەبوو، لە هیچ کەم و کورتیان نەبوو، خاوەنی هاوسەرێکی نازدارو دڵناسك بوو..

رۆژانە کە دەگەڕایەوە ماڵ وای هەست دەکرد بەرەو یەکێ لە باخەکانی بەهەشت هەنگاو دەنێت، هاوسەرەکەشی بە هاتنەوەی مێردەکەی هەستی بەخۆشی دەکردو وا دەهاتە هزری کە خۆشەویسترین کەسی سەر زەوی هاتۆتەوەبزەمەنێك گوزەری کرد.. ئەم دوو خۆشەویست و هاوسەرە بۆیان دەرکەوت کە منداڵیان نابێت..

بۆ ئەم کارەش رێگەو شوێنی پزیشکیان گرتەبەر.. بێ هیوا بوون.. پاشان هۆکاری ئاینی ئەمەش سوودی نەبوو.. منالْیان نەبوو.. نەبوو.. ئارادەیەك بێ تاقەت بوون.

پیاوی بازرگان هاوڕێیەکی لە نەخۆشخانەی منالْبون هەبوو لە شاری تاران، بۆیە داوای لێ کرد یارمەتی بدات بە هەر نرخێك بێت کۆرپەیەکی بۆ پەیدا بکات.. بە مەرجێ لە رێگەی حەڵاڵەوە لە دایك بووبێت.

ئەم کارە بۆ پزیشکی ئەوێ زۆر گران بوو، چونکە لە دایك بوونی کۆرپەلەکە زۆر بە خێرایی مەدالیا (قرص)ێکی پتەو دەکرێتە ملی و هەمو ئەدرەسێکی ئەو ساوایەی لەسەر

دایاری کراوە، تا ئەو کەسە وەفات دەکات کاری پێدەکرێت و لە ناو ناچێت، هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کەس نەبوو کۆرپەی خۆی ببەخشێت..

ئایا دەبێت کابرای کوردی سوریای خاوەن بازرگانی زۆر لەم کارەیدا سەرکەوتوو بێت؟!

رۆژێکیان ئافرەتێکی کوردی کوردستانی عێراق، کە ژنی پێشمەرگەیەکی بادینانی دەبێت، بە پیشەی رۆژگاری لەگەڵ هاوسەری ژیانی کولەمەرگی و غەریبی بەسەر دەبەن.. ئەو رۆژە ژنەی بادینانی ژان دەیگرێ.. بە قەرزو قۆڵە هاوسەرەکەی دەگەیەنێتە نەخۆشخانە، پاش چەند کاتژمێرێك خوای گەورە بەسکێ دوو منداڵیان پێدەبەخشێ، دکتۆری نەخۆشخانە کە دەیانباتە ژووری (دۆسییەی کەسایەتی) هەمو کارێکیان بۆ ئەنجام دەدات، پاش هۆش خۆ هاتنەوە پزیشکەکە زۆر ساختە چییانە لە خێزانی بادینانییەکە دەگەیەنێ هاوسەرەکەت خوای گەورە کورێکی جوانکیلەی پێ بەخشیوە.. منالە ساواکەی تریان حەشار دەدات و تەلەفۆن بۆ کابرای سوریای دەکات، کە خێرا بگاتە نەخۆشخانە.. بەڵێ پاش چەند ساتێك منالەکان بە نهێنی لەیەکتر جیا دەکرێنەوە..

منداڵ لە لای ئەم خێزانە گەورە دەبێت و گەشە دەکات، منالەکەی تریش لای دایك و باوکی ئەسڵی گەورە دەبێت و گەشە دەکات..

ئەم نهێنییە تەنها خوای بەخشندەو کاکی دکتۆر دایك و باوکی سوریایی دەیزانن..

ئەم خێزانەی کوردی بادینان لە هەمو بیرو بۆ چوونیاندا هەر یەك کورەو هیچی تر..

رۆژگارەکان گوزەریان کردوو ناخۆشییەکان رەوینەوە، ماڵی بازرگانی سوریایی شاری تارانی بە جێهێشت و گەرایەوە وڵاتی خۆی، خاوەنی چەندەها دوکان و بازارو تەلارو بابەتی پارە راکێش بوو، کورە تاقانەکەشی بۆ هەمو جێگەو رێگەیەك هاورێی بوو، زۆری خۆش دەویست و سۆزی دایك و باوکیان پێ بەخشیبوو..، پاش چەند ساڵێك و لە ساڵی (٢٠٠٢)دا کورەی نازدار نازی دەشێوێت و باوکی بازرگانی وەفات دەکات، لە کوردستانی عێراقیش راپەرین دروست دەبێت و ئاوارەو پەرتەوازەکانی وڵاتانی دراوسێ دەگەرێنەوە سەر لانەو جێگەی خۆیان و لە کۆمەڵگەی (دیانە) دەگیرسێنەوە.

پاش وەفاتی باوکی، ئەم خزم و برایانەی پیاوی بازرگانی سوری (مامیان) تەماع بەری چاوی دەگرێت و بۆ بەرنەکەتنی یەك فرووش بۆ ئەو کورە، ماڵی بابی راستییەکەی لەلا دەدرکێنن.. ئای تەماحی دنیایی.. بۆ دەبێت مرۆڤەکان هێندە دیلت بن.. بۆ؟!

کوڕە زۆر نارەحەت دەبێت.. زۆر غەمبارو پەشێو.. بە گریان و هاوار هاوار دەچێتە لای دایکی.. کە پیر بووەو بەرەو کۆچی دوایی خۆی ئامادە کردووە، ئەمیش ناچار ڕاست و دروستی لەلا دەدرکێنێ و هەموو ڕاستییەکانی بۆ دەگێڕێتەوە، نهێنی ژێربەرە دێتە سەر بەرە، کوڕە زۆر گلەیی لە دایك و کەس و کاری دەکات، وەك شێتی لێدێت.. ئەی ئاکام چی دەبێت..؟!!

کوڕە دەڵێت: مادام ئێوە ئەم ناپاکی و خیانەتەتان کردووە تا چارم بەجێتان بهێڵێم..، بەڵام ڕێگەیەکم بۆ دابنێن، تا بگەمەوە دایك و باوك و برای ڕاستی خۆم و بیاندۆزمەوە.. مامی کوڕە شارەزا لە هەموو بوارێکدا نەخشەی تورکیای دەداتێ، پاشان عێراق و کوردستان، پاشان ناوچەی حاجی هۆمەران، بۆ پرسیارو راو دۆزینەوەی کەس و کاری.

پارەکی باش وەردەگرێ، نەفرەت لە هەموویان.. بەرەو کوردستان.. خۆت بگرەو هاتم..

قەدەری ئیلاهی وەها دەگونجێت کوڕە دێتە خاکی عێراق و لە ناوچەی حاجی هۆمەران، پرسیار لە خزم و کەس و کاری دەکات، ئەمەش دوای ماندووبوونێکی بێ وێنە دەگاتە (زالگە)یەك و ناچار دەبێت دابەزێ بۆ پرسیار.. نەشارەزا.. غەیب.

دوو کوڕی خاوەن پلە لە زالگەکە، کە ئەم کوڕە چاودەکەن دەچنە لای و دەڵێن: ماڵ خراپ تۆ دوو ڕۆژت ماوە بۆ تەواو بوونی مۆڵەتەکەت، پەلەت چی بوو لە گەڕانەوە..ئەوی تریان دەڵێت: چاوکە.. چاوکە چۆن خۆشی گۆڕیوە بۆ ئەوەی ئێمەش نەیناسینەوە، کوڕەش وەك لە سەربان بەری بەنەوە دەپرسێ: ئەرێ کاکە گیان! عەیب نەبێت لە کێ دەدوێن..

کوڕی نیگابانی زالگە دەڵێت: بۆ تۆ (د) گیان نیت؟!

ئەویش بە سەرسامییەوە دەڵێت: نە بابە ئەمن (B)م و خەڵکی سوریام و ئێستا بەم نەخشەیە هاتووم ماڵی خۆمان بدۆزمەوە، ناویان فلان و فیسارە، یەکێك لە پۆلیسەکان دەڵێت: ئەوەی تۆ لێوەی دەوێت بۆی دەگەڕێیت باوك و دایکی ئەو برادەرەی ئێمەیە کە لێرە دەوام دەکات و ناوی (د)ە، تۆش زۆر لەو دەچیت و دەڵێی سێوێکن و کراونەتە دووکەرت.

کوڕە غەریب دەبێژێ: ئەو پۆلیسەی ئێوە دەیڵێن چۆتە ئیجازە کەنگێ دێتەوە..پۆلیسەکانیش دەڵێن: ئەو برادەرەمان کە زۆر زۆر لە تۆ دەچێت، لە سەر جهازی

لاسلکییەو بە مۆڵەت گەڕاوەتەوە، ئەمڕۆ پێنج شەممەیە هیچ، هەینیش هیچ شەممە دێتەوە، ڕۆژگاریش درەنگە تۆ نابێت بڕۆیت، لە زاڵگەکانی تر دەگیرێیت، هەویەو کارو بارت پێنییە، ئەمشەو بمێنەرەوەو هەینی لە خزمەتتاین، ڕۆژی شەممە ئەو کوڕەش کە بە حسابی کۆن براتە دێتەوە... ناچار مل دەدات و هەمو بەسەرهات و نارەحەتی و خۆشی خۆی لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا بۆ باس دەکات.

ڕۆژی شەممە یەکلا بوونەوەی ڕاستییەکانە.. ڕۆژی شەمە ڕۆژی ناسینەوەیە، بەڵێ ئەو ڕۆژە هات و برای عێراقی گەڕایەوەو برای سوری خۆی پێناسان.. بەڵێ ئەم دوو برایە زۆر  سەرسام و دوو دڵ لە لایەك و خۆشی و شادی لە لایەکی تر.. دوو لاو.. دوو گەنج، ئەمان دووانەی لەیەکچوو بوون، دوای ئەم زەمەنە زۆرەو لە (١٩٧٥- ٢٠٠٣) یەکتریان ناسییەوەو بۆ زیاتر دڵنیا بوون، حەزیان کرد بچنەوە ماڵ.. گەڕانەوە ماڵی خۆیان و هەمو نهێنییەکانی خەستەخانەیان پیشانی یەکتر داو ئەم دایك وباوك و دوو برایە بەیەکتر شادبوونەوە دوای (٢٨) ساڵ لە دابڕان، تەماحی دنیا بوو بە هۆی بەیەکتر شادبوونەوەیان.. ئای لەو خۆشی و شادییە..

ئەم ڕووداوە لە بەڕێز (مامۆستا شێخ عەلی) وەرگیراوە ئەویش لە نزیکەوە لە کەناڵە ناوخۆییەکانی بادینان پەخش کراو ئەم دوو برایە بە بەڵگەی ویراسی و دەورو بەر بەیەکتر شادبوونەوە.

# هەڵوێستێکی دلێرانەی مەلا عەلی مەڵکەندی

پێویستە لەسەر هەمو لایەکمان کردەوەو چاکەی ئەو پیاوە چاکانەی پێش خۆمان لەیاد نەکەین کە دەربارەی مرۆڤ چاکەیان کردووە ڕێگەو جێگەی ڕاستیان پیشانی مرۆڤەکانو چواردەوری خۆیانداوە.

دڵنیابە ڕێزی ڕیبوان بگیرێ ئاینـدە بـە چاکەو بەرێزیەتەکایەوە ئەمـەی بەردەستت ئیمانداریو هیمەتو بەرزیو خاوەن هەیبەتو زیرەکیو دڵسۆزیو پیاوەتی خوالێخۆشبو (مامۆستا حاجی مەلا عەلی مەڵکەندی) دەردەخات.

بۆ ئەوەی مرۆڤەکانی سەدەی بیستو یەك بزانن مرۆڤەکانی سەدەی بیست چۆن هیمەت بەرز بون، بۆ تاکە دۆلارێ (ڕەوشتو ویژانو کەسایەتیان شەرەفیان) نەفرۆشتووە، ئەم پیاوە بکەبە نمونەی ژیانی خۆتو لەکارو کردەوەکانی ورد بـەرەوەو ئـارەقی شـەرمەزاری ناوچەوانت بسرە گەر هەڵەت کردوە لە رابردودا پاشان بڕیاربدە بـۆ داهـاتو کاربکـەیت و بگۆڕێیت ..سەرەتا پێمخۆشە بـزانین (مـەلا عـەلی) کێیـە؟ حـاجی مـەلا عـەلی مەڵکەنـدی کوڕی حاجی (عەبدوڵڵا محەمەد ئـەمین ئاغـا)یـە، بەسـێ پشت ئەچنەوە سـەر (سـوبحان ئاغـا)ی خـاوەنی سـەراوی سوبحان ئاغـا سـاڵی ١٨٥٨ز لـە شارە ڕازاوەگـەی سـولەیمانی لـە گەڕەکی مەڵکەنـدی هاتوەتە دنیاوە، خوێندنی لە حوجرەو مزگەوتەکانی ناو شـار لـەلای مامۆستایانی ئاینی بەسەربردووە فێربووە تا شاری (سنە) بۆ وەرگرتنی زانـستی شـەرعی چووەو مانـدو نـەبووە لـەو بوارەدا کاتێـك بـاوکی کۆچـی دوایـی ئـەکا خێزانێکـی زۆری بەسەردا ئەکەوێ، ئەم زاتە خواناسە بە بەرهەمی زەویو زارو چەند دوکانێك کە وەرسە دەبێت ئەم خێزانە دەبات بەڕێوە بەهێزی بازو ئیرادەی بەهێز خۆی سەرقاڵی کشتوکاڵو بازرگـانی دەکـات، کەچـاوی بـە نەخوێنـدەواری ڕۆڵـەکانی شـارەکەی دەکـەوێت قـۆڵی مەردانـەی لێهەڵـدەکاتو لـە مزگـەوتی مەڵکەنـدی بـەبێ موچـەو بـەبێ بەرامبـەر وانـە بەگـەنجو منـداڵان دەڵێتـەوە بـۆ شـارەزابونی پیـاوانی سەرسـەکۆی مزگـەوتو میحرابـی

مزگەوت ئەکەوێتە ئامۆژگاری ئـەوانیش‌و پێشنوێژیان بـۆ دەکـات بـەخۆڕایی‌و چـاوی لـە پاداشتی ئیلاهییە.

ئەم خواناسە (مەلا عەلی مەلکەندی): پیاوێکی ڕەوشت‌و خوو بـەرزو دڵ‌و دەرون خـۆش‌و باش‌و هێمن بووە، لە کۆڕو ئەنجومەنا قسەی ئەستەق‌و شیرین‌و کاریگەربووە.

مەلا عەلی عەسری‌و بەخشندە بووە، هەمیشە حـەزی بەچـاکەو سـەر بڵنـدی ئەتەوەکـەی ئەکرد، خاوەنی سەرگوزشتەی جوان جوان بو، لەسەردەمی عوسمانیەکاندا (ئیمام تابور)[11] بـووە ماوەیـەکیش قـازی (ئاغجەلـەر) بـو، کاتێـك دەور گـۆڕاو سـوپای بێگانـە بـە دیـن‌و ئەتەوەو خاك پای خستە وڵاتەوە (ئینگلیزەکان) وازی لە موچە خـۆری هێنـا، بـە عیلمـی زاهیرو باطنی خۆی موچەی بەریتانی لەلا حەرام بوو.

بۆ خۆ ژیاندن‌و دورکەوتنـەوە لـەم خراپەکارانـە کـە ڕۆژانـە لێـی ئـەبینین دوکـانێکی لـە دوکانەکانی خۆی لەبەردەرکی سەرا دانـا، کـە خـۆی خـەریك کـرد بـەکارێکی زۆر جـوان‌و شـیاو ئـەویش (مۆرهەڵکـەنی)بـو لەگەڵیـشیا سکاڵانوسـی (ئـەرزوحاڵ)ی دەنوسـی، خـۆی خـەریك کـردو ڕۆژانـە پیـاو چـاکان سـەردانیان دەکـردو لەوتـە بەنرخـەکانی سـودمەند دەبون‌و زۆر موتەوازیع بو.

بەدەر لە زمانی دایك زمانی (عەرەبی، فارسی، تـورکی) بـاش دەزانـی‌و کـاری پێـدەکردن، لەیادمان نەچێت ماوەیەکیش بە پـارێزەری لەگـەڵ (فەتاحەفـەنی شـەیدایی‌و مـەلا عـەلی مامە شێخە)دا هاوکار بوە.

مێجەرسۆن سیخوری بەریتانی‌و پاش شۆڕشی شێخی حەفید کـەبوە (محـافظ)ی سـلێمانی زۆر سەرسام بوو بەدو کـەس (تایـەر بـەگی جـاف‌و مـەلا عـەلی) ئـەم دوو زاتـەی زۆر لـەلا بەڕێز بون‌و بەزیرەك‌و چەسپاو ونەگۆڕ ناوی بردون.

ئەوەی من زۆر مەبەستمە بیرو باوەڕی پاك چۆن کار دەکات ئەمەیە:

---

[11] ئیمامی تابور ئەو مامۆستا ئاینییە بوو کەرابەرایەتی خەڵکی دەکرد بۆ شارەزابون لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە ناو لەشکرو سوپادا، واتە ئەو کەسانەی کە دەچونە خزمەتی سەربازییەوە شـارەزادەکران لـە هـەمو ئـاین لـەماوەی سـەربازیدا.. ئەمـە درێـژەی هـەبو تـا هـاتنی حـوکمی بـەعس لـە سـاڵی شەستەکاندا.. بەڵام دواتر لایان برد تا کەس شارەزایی نەبێ لە ئاییندا.

(مێجەرسۆن) حاکمی سیاسی بو زۆر دڵرەقو زۆردار بوو کاتێك بەناو بازاڕو شەقامەکاندا گوزەری دەکرد، ئەبوایە دانیشتوان لەبەری هەستانایەو ڕێبوارانیش ڕابوەستانایەو مل کەچ سلاویان بۆ بکردایە، ئەمە فەرمانێك بو دەریکردبو ئەم حاکمە ڕۆژێك بەبەر دوکانەکانی بەردەرکی سەرادا دێتە خوارێ هەمو دوکاندارەکان لەبەری هەڵدەستنو لارەملو بێ ئیرادە سلاوی لێدەکەن.

کاتێك دەگاتە ئاستی دوکانەکەی (مەلا عەلی) حسابی بۆ ناکاتو لەبەری هەڵناسێ (مێجەرسۆن)یش دێتە بەردەمی (مەلا عەلی)و دەڵێت:

ئەوە بۆچی ئەم خەڵکە لەبەرم هەڵساون بەلام تۆ لەبەرم هەڵناسی؟ خۆی تورە ئەکا، مەلا عەلیش زۆر بەبێ ئەهمەیەت سەیرێکی ئەکاتو ئەڵێ:

تۆ پیاوێکی نامۆو غەیرە دینی بە ئاینو بیروباوەڕی من دروستو ڕەوانیە لەبەر تۆ هەڵسم چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: " یاأیها الذین آمنوا لاتتخذوا الیهود والنصاری اولیاء لکم فمن یتخذهم فهو منهم".(مێجەرسۆن) تا ئەم سات‌ەش نەگەیشتبو بە کەسێك کە ڕووبەڕوی قسەی هەقو بوێرانە بکات زۆری پێناخۆش بو بەلام هیچ قسە ناکاتو ئەڕوات، ئەو ڕۆژە مەراقی دەبێت بە سیاسەتە تیژو گلاوەکەی خۆی بیرێکی تازە بروسکە ئاسا بە مێشکیا دێت..

بۆ ڕۆژی دوایی تورەکەیەك پڕ لە پارە ئەکاتو بەسەربازێکدا بۆی ئەنێرێ، (مەلا عەلی) کیسە پارەکە بەدەستی سەربازەکەوە دەبینێ سەرنجی دەدات بەلام زۆر باش لە پلانو فێڵی ئینگلیز تێگەیشتوە گلی ناداتەوەو بە توڕەیی دەڵێت: لە کوێوە هێناوتە بیبەرەوە بۆ ئەوێ پارەی غەیرە دین بە کەڵکی من نایەتو پێویستم بە پارە نییەو دڵم دەوڵەمەندەو قەناعەتم بە شانو باڵی خۆم هەیە.. ئەوەش بۆ من دەوڵەمەندییە.

بە ناچاری ئەگەڕێتەوەو ناکامی سەردانەکەو پارەکەی بۆ باسدەکات دوای ماوەیەك چەند ئیگلیزێکی تر دێتە لای (مێجەرسۆن) ئەویش باسی (مەلا عەلی)یان بۆ ئەکاتو ئەڵێ: مەلایەکی هۆشیارو وشیارو وریاو زیرەکە ئەنێرین بە شوێن (مەلا عەلی)داو پێیدەڵین: ئێوە بۆچی بە فەرمانڕەوایی و حوکمی ئێمە ڕازی نین؟ئێمە ڕێی (پاكو خاوێن)مان پیشانداناو ڕێوبانو شەقاممان بۆ زۆر کردون؟ مەلا عەلی لە وەلامدا دەڵێت:

پاكو خاوێنی لە دروشمی موسڵمانەو موسڵمان هەمیشە جلو بەرگو لەشی خاوێنەو لەشەو ورۆژێکا پێنج جار دەستنوێژ دەشوا، پاشان ڕێگاو بان تەخت کردنو دروستکردنی

کردەوەی موسڵمانەو ئاینی ئیسلام دەڵێ: هەرکەسێ بەردێ لەسەر ڕێگا ببنێ پێویستە لەسەری لای بەرێ نەوەکو یەکێکی لێبکەوێت، هەروەها دەستی پارمەت درێژ کردن و ئازوقە زۆر کردن پیشەی ئێمەیە، ئێوە وازمان لێبێنن و سواری سەرمان نەبن وڵاتی کوردستان ئەوەندە بەفەڕو بەرەکەتە بەشی زۆری جیهان بەخێو ئەکات.

ئینگلیزەکان ئەم وەڵامەیان لەلا جوان ئەبێت و ئافەرینی ئەکەن.

پاشان (مێجەرسۆن) دەڵێ: ئەگەر ئەو پارەیەت وەرئەگرت خۆم ئەمزانی چ بەڵایەکم بەسەر ئەهێنای... پاشان هەمویان لەبەری هەڵدەستن و بەڕێزەوە خوا حافیزەی لێدەکەن داخی گرانم ئەم پیاوە زانایە لە تەمەنی ۹۰ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد لەگردی جۆگا لاشەکەی بە خاك ئەسپێرن لە ۱۹ /ت۱ / ۱۹٤۸ دا کە ئەو زەوییە ملکی خۆی بو بەخشی .. کە بکرێتە گۆڕستانی گشتی[12] .

سود وەرگیراوە لە رۆژنامەی ژین ژ ۱٦۲۹ ساڵی ۱۹٦۱

[12] تێبینی/ ئەو کات ئەو گۆڕستانە قەراغ شار بو بەڵام ئێستا کەوتۆتە ناوجەرگەی شارەوە، جێگەی مردوو ناشتنی نەماوە زۆربەی زۆری گۆڕستانەکە کراوە بە بەشی وەزارەتی تەندروستی بۆ خەستەخانە.

# چکوسی ژنێک کارەساتێک دەقەومێنێت[13]

هەمو ماڵێك نهێنی خۆی هەیە ئەم رووداوە چیرۆکێکی راستەقینەیە[14] و خاوەنەکانی لە رێگەی واقیعە بەدژیەك چووەکانیەوە باسی لێوە دەکەن: ئەمە ئەزمونێکە هەمومان دەگرێتەوە وپێویستە سودی لێببینرێ بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانە ببڕین کە هەمو خۆمانی لێ دوورە پەرێز بگرین، خانمی خاوەن چیرۆکەکە دەڵێت:

پێش بەهاوسەر بوونم نەمدەزانی خۆشەویستی چیە، کاتێك شوومکرد مێردەکەم یەکەمو دواهەمین خۆشەویستم بوو کە بە بونی ئەو خۆشەویستیە بون و ژیانمی پڕکردبۆوە ئەو هەمو جیهانم بوو.. خۆشیو کامەرانیو ئازارم، خۆشم ویستو بەشێوەیەکی زۆر مەزن ئالودەی بوم ئەمەش بوە هۆی چکوسیکردنم لێیو زۆر دەترسام ئافرەتێکی تر لێمی زەوت بکات، بەقەشەنگترین پیاو دەمبینیو لەهەموشیان سەرنج ڕاکێشتر بوو لەلام.. هەمو پیاوانیش بەراود بکرێت لەگەڵ ئەودا ئەوا ئەوان لەچاو خۆشەویستەکەی مندا هیچ نین.. وام هەستدەکرد هەمو ژنانی جیهان حەزی پێدەکەنو چاوەڕوانی هەلێکن تاوەکو لێمی بفڕێنن.. نەمدەزانی چیبکەم باشە بۆ ئەوەی لە ململانێدان لەگەڵمدا هەربۆیە بەشێوەیەکی بێسنور چکوسیم لێدەکرد تەنانەت لە بێژەرەکانی تەلەفزیونیش کاتێك بەپەرۆشیەوە گوێ بیستی پەخشی هەواڵەکان دەبوو.. تەنانەت ژنانی سەر شەقامەکانیش هەستم دەکرد کە سەیری دەکەن بێزار دەبوم و بەدرێژای ئەو ساتانە لەدەرەوەی ماڵ پێکەوە بەسەرمان دەبرد غەمگینی باڵی بەسەرمدا دەکێشا: تەنانەت ژنە هاوکارەکانی وام لێهاتبوو وایبۆ دەچووم کە پلان دەگێرن و ئەو کارە بۆ ئەوە دەکەن کە ژن دەیکا لەپێناو رفاندن و ڕوخاندنی پیاوێکدا لە ژن و ماڵەکەی..دەمویست بەپێی توانا پارێزگاری لێبکەم، بەڵام ئەو وایلێهات بێزار دەبوو لێم و بەرەبەرە هەڵدەهات و لێم دوور دەکەوتەوە.. هەرگیز نەمتوانی تێی بگەیەنم بەوەی

---

[13] چکوسی . (غیرە)

[14] رۆژنامەی رێبازی ئازادی.

هەمو چکوسیەکانم ئاکامی خۆشەویستیم‌و ترسە لێی ئەمەش هەستێکی سروشتیە بەڵام لەم هەستەم تێنەگەیشت بەردەوام بوو لە دورکەوتنەوە لێم، دوای بەهاوسەربونمان بۆ ماوەی دوو ساڵ منداڵبوونم دواکەوت ئەمەش ئەومندەی تر بڕوای ئەوەی پێهێنام کە لەوانەیە مێردەکەم بیر لە ئافرەتێکی تر بکاتەوە تاکو بیخوازێت‌و منداڵی لێی هەبێت لەو کاتانەش کە سوێندی بۆ دەخواردم بەوەی کە گوێ بەم شتانە نادات‌و منداڵبونیش شتێکە بەدەست خواوەندی مەزنەو هەرگیز ئەو بەپەلە نیە بۆ ڕودانی ئەو کارە بەڵام هەر باوەڕم پێنەدەکرد.

## کێشمەکێشێکی ترسناك

هەر کەلە ماڵ دەرئەچوو لە ناخدا قوڵپم دەداو دەسوتام بیرۆکە شەیتانیەکانیش لە مێشکمدا بەیەکدا دەهاتن‌و وامبەخەیاڵدا دەهات کە دەچێت بۆلای ئافرەتێکی ترو لەبەردەمیدا دادەنیشێ‌و بەجوانیدا هەڵدەدات‌و هەمان قسەی شیرینی بۆ دەکات کەلەوەو بەر بۆ منی دەکرد ئەو بیرۆکە ئازاراویانە وایانلێکردم چیتر حەزی خواردنم نەمێنێت‌و ڕۆژبەڕۆژ لاوازی دەکردم‌و وام لێهاتبوو وەك سێبەری ئافرەت دەردەکەوتم نەك وەك ئافرەت ئەمەش ئەومندەی تر ئاڵۆزی کردم چونکە وام لێهاتبو وابزانم کەئەو من بەجوانی نابینێت یان لەوانەیە لەگەڵ خۆیدا گاڵتە بەجەستەشم بکات.. بەڵام ئازارو دوودڵی‌و خەمناکیەکەم دادەپۆشی‌و هەر کەدەهاتەوە ماڵەوە پرسیارو وەڵام دەستی پێدەکرد.. بۆکوێ چویت؟ کێ لەگەڵدا بوو؟ بۆ دواکەوتیت؟ هیچ ئافرەتێکت بینی وام لێهاتبوو حەزم نەدەکرد بەئەندامی شیاو دەربکەوێت‌و گوێم بەجل‌و بەرگەکانی نەئەدا بەبێ ئوتو دامدەناو شوشە بۆنەکانیم دەشکاند بەبەهانەی ئەوەی لەدەستم کەوتۆتە خوارەوە و بەبێ ئەوەی هەست بکات ڕێگەم پێنەئەدا کە بۆنی خۆی خۆش بکات بۆ ئەوەی بەشێوەیەك دەرنەکەوێت کەسەرنجی ژنان بۆخۆی کێش بکات‌و لێمی بدزن.

## روداوێکی نامۆیی

وەك عادەتی خۆم ڕۆژێك گیرفانەکانی گەڕام‌و لەگیرفانیدا کوتە وەرەقەیەکم بینی ناوی کچێکی لەسەر نوسرابوو.. هەرچی خوێن بوو لەجەستەمدا بەستی‌و بەخۆمم وت: ئەمە ئەو ئافرەتەی ترە لەژیانی مێردەکەمدا.. نوستبوو چومە لای‌و بەتوڕەییەوە لەخەوم

هەستان.. پارچە وەرەقەکەشم فڕێدا بەسەرو چاویدا وتم: ئەمە ئەو ئافرەتەیە کە من جێدەهێڵیت لە پێناویدا؟چاوی کردەوە ناوەکەی سەر پارچە وەرەقەکەی خوێندەوەو دەستیکرد بە قاقای پێکەنین و گەڕایەوە ناو جێگەکەی.. لەگەڵ ئەو شۆکە ستەمیاوییەدا بەو پەڕی ساردییەوە مامەڵە دەکات بە تووڕەییەوە قریشکاندم: هەستت نیە.. کەرامەتم بریندار ئەکەیت و پاشان دەگەڕێیتەوە بۆ ئەوەی خەوەکەت تەواو بکەیت و وەکو هیچ شتێك نەبوبێت بەتوڕەییەوە لە ناو پێخەفەکەی هاتەدەرێ .

وتی: بێزار بووم لێت بێزاربووم لە چکوسیە کوێرەکەت.. تۆ بەبەردەوام پاڵم پێوەدەنێیت لێت دوربکەومەوە.. هەرگیز بە ئەقڵت بیرناکەیتەوە.. وتم: کێشەکە مەگۆڕەو پێم بڵێ ئەم ناوە کێیە؟ بۆ تۆ چی دەگەیەنێت؟ بۆچی خستۆتە گیرفانت؟

وتی: ئەمە ناوی کچی یەکێکە لە کرێکارەکان لە کۆمپانیاکەمان ئەم کچە منداڵەو باوکی دەیەوێت بیخاتە قوتابخانەیەکی خێرخوازیەوەو داوایلێکردم بۆ ئەو مەبەستە هاوکاری بکەم ئێستا تێگەیشتیت؟؟

باوەڕم بەقسەکانی نەکردو بەردەوام بە دوایەوە بووم تاوەکو پەیوەندی بە باوکی منداڵەکەوە بکەم و ڕۆژێك قسەی لەگەڵ کرێکارەکە دەکردو ئەویش باسی کچەکەی خۆی بۆ دەکرد منیش لەتەنیشتیەوە وەستام و گوێم لە قسەکانیان گرت.. پاشان زانیم کە من زۆر هەڵە بووم و من ستەمم لێکردوە.

**دوور لە من**

وایلێهات لێم دوورکەوتەوە، زۆرجار نەدەهاتە ماڵەوە وە کاتێك پەیوەندیم پێوە دەکرد تەلەفونەکەی دادەخستەوەو هەلی لێکۆڵینەوەی نەدەدامێ، بەبەردەوامیش بەهانەی ئەوەی هەبوو کەسەریقاڵەو کاری کۆمپانیای زۆرە دوو دڵی لە سنگمدا زیادی کردو وا بەمێشکمدا دەهات کە لەگەڵ ئافرەتێکی تردا بێت وسکاڵای منی لەلا دەکات.. هەستم کرد ئەگەر بەپەلە هەنگاو نەنێم کار لەکار دەترازێت.. لەوانەیە ژن بهێنێت و بمخاتە ئەمری واقیعەوە، ئەو کاتە چۆن بەرگەی ئەو ڕاستیە دەگرم بەرگەی ئەوە ناگرم کەس لە ژیانیدا هەبێت و ناشتوانم داوای جیابونەوەی لێبکەم چونکە من زۆرم خۆشدەوێت و ئالودەی بووم و ناتوانم تەنها بە بیرکردنەوەش بیر لە دووری بکەمەوە وەسوەسەی شەیتان لەسەرمدا زیادیکرد بەتایبەتی کە گەشت و کۆچەکانی زیادیکردو مافی هاوسەرێتی منی پشت گوێ خستووە.. ئایا ئەوە ڕاستە تەنها ئەو ئەرکی کۆچ و سەفەری

کۆمپانیایە بخرێتە سەرشانی کەسێکی تر لەو زیاتر؟! منیش بەتەنیا لە ماڵەوە دادەنیشم‌و چاوەڕوانی زەنگی تەلەفونم.. ئەو زەنگە بەرەبەرە بەرەو نەمان چوو.. وامدەزانی کە ئەو بوونی منی لەیاد چووە.

**ڕووبەڕوو بوونەوە**

چاوەڕوان بووم تاوەکو لە سەفەرەکەی هاتەوە پێش ئەوەی بگاتە ماڵ من بۆم چۆڵکرد؟ هات‌و پرسیاری هۆکاری لێکردم منیش بە ڕوویدا هەڵشاخام وچی لە سنگمدا هەبوو هەڵمڕشت وە هەر لە بەهاوسەربونمانەوە یەکەمجارم بوو بەو شێوەیە ببینم.. لە شێوازی خۆی چووە دەرەوەو بەو شێوەیەی جاران نەهاتەوە بەرچاوم، ئەو خۆشەویستە هێمنە لە خۆبوردەی جارانم نەبوو وەکو ئاژەڵێکی ترسناك دەستیکرد بەنەڕاندن بەسەرمداو لەبەشی زۆری قسەکانی نەدەگەیشتم‌و ئەوەی تێی گەیشتم ئەوە بوو کە ئازاری زۆری بەدەست چکوسی منەوە چەشتوەو گەشتۆتە قۆناغێك توانای بەردەوام بوونی تیایدا نەماوە، بێزار بووە لە شێوازی مامەڵەکردنم لەگەڵی‌و بێزاربووە لە چاودێری‌و بەدواداچونی بەردەوام هەروەکو ئەو تاوانێکی مەزنی کردبێت‌و خرابێتە زیندانەوەو بەردەوام داوای لێدەکرێت بەرگری لە خۆی بکات.. بێزاربووە لە بونم لە ژیانیدا، چونکە بوومەتە کۆت لەملیداو خەریکە دەیخنکێنم وە بەهۆی منیشەوە هەمو ئافرەتێکی لەبەر چاو کەوتووەو ڕقی لە هەموشیانە ئەویش چی لە سنگیدا هەبوو هەڵیڕشت‌و پاشان بێدەنگ بوو.. هەستم بە ئاستی ئازارو برینەکانی کردو دانیشم بەوەدا نا کە من ئافرەتێکی ستەمکارم.. پەشێمان بووم لە هەمو هەڵوێستەکانم‌و ڕقم لە خۆم هەستا چونکە ئازاری مەزنترین‌و خۆشەویسترین بونەوەرمدا لە ژیانمدا ئەویش بەهۆی چکوسیە کوێرەکەم.. هەوڵم دا داوای لێبوردن بکەم بەڵام پێش ئەوەی دەم بکەمەوە تەلاقی دام‌و هەستاچووە دەرەوە. زۆر بە ئاسانی مێردەکەمم ونکرد، ئەویش بەهۆی ناهۆشیاری‌و بێ ئەقڵی خۆمەوە بوو..

پەند ،

١. غیابی ئیمانی لەلای کچەکە .
٢. باش پەروەردە نەبوون لە ماڵەباواندا .
٣. نەبوونی دانیشتنی سۆزداری لە نێوانیاندا .
٤. لێنەبووردەیی هاوسەر لە کاتی پەشیمانیدا .

# تـالآنی

لەچەند مانگی رابردوودا[15] پاش ئازادکردنی عێراق ، وەفدێکی بەغداو کومیتی هاتن بۆ بەغداو چاویان بە وتار خوێندێکی بەغدا کەوتبوو کەناوی (شێخ ئیبراهیم ئەحسان)ە شێخی ناوبراو رووداوێکی بۆ گێڕابونەوە ، کە نمونەی دوعا قبوڵی ستەم لێکراوەو وتبووی:

من خەڵکی بەسرەمو لەو شارە لە مزگەوتێکدا وتارخوێن بوم ، لە یادی لە دایکبونی حەزرەتدا لە نەوەدەکاندا هۆنراوەیەکی (وليد الاعظمي)م خوێندەوە کە دەڵێت (إسلامنا نور لن يهتدى إسلامنا نار لن يعتدي) وەهەروەها ئێمە بەغەیری پێغەمبەر ئیقتیدا بەکەس ناکەین.. پاش تەواو بونی یادەکە راپۆرتیان لەسەر نوسیمو گیرام لەلایەن رژێمەوە.. پاش ئازارو چەرمەسەرێیەکی زۆر رزگارم بوو پاشان ساڵی ١٩٩٤ گواستیانمەوە بۆ بەغداد، لەیەکەم وتارمدا باسی زوڵمو ستەمم کرد، یەکێ لە ئامادەبوان کەلەسەر کورسیەکی کەم ئەندامەکان دانیشتبوو تالەوتارەکەم بومەوە گریا.. پاش نوێژ کوڕەکەی نارد بۆلامو وتی: باوکم حەزدەکات سەردانێکی ماڵمان بکەیت منیش هەرچەند وتم: سەرقاڵمو کاتم نیە سودی نەبوو.. ئیتر ناچار چوم بۆ ماڵیانو پاش گفتوگۆو بەخێرهاتن ، بەکوڕەکەی وت:

ئەو چادرە لابەرە لەسەر ئەو ئوتومبێل لەگەراجەکەدا.. کەلایان برد سۆپەرێکی سپی مۆدێل ١٩٨٢ بو کەرەقەمی کومیتی پێوەبو زۆر جوان و کەشخە بو.. وتم: مەسەلەی ئەم سەیارەیە چیە؟ کابرای خاوەن ماڵ وتی: من لەساڵی ١٩٩٠ دا لیوابوم لەسوپای عێراقدا کاتێك کوێتمان داگیرکرد ، من پشکنینی بازگەکانم لەئەستۆ بوو لەنێوان عێراقو کومیتدا، رۆژێك ئەم ئوتومبێلەم بینی بەدەست لاوێکەوە بوو چەند ئافرەتێکیشی تیابوو،

---

[15] ئەم رووداوە لەرەمەزانی ساڵی ٢٠٠٣دا دکتۆر محمد عوجی لەبەرنامەکەی ( صور و خواطر )دا باسی کرد ، بروانە ، ژیانەوە/ ج٣ ل ١٢٨ .

حەزم لێکردوو بەپاسەوانەکانم وت: شەربەو شۆفێرە بفرۆشن ، ئەوانیش گێچەڵیان پێکردو بوو بەدەمە قالێیان وەمنیش چوم کوڕەکەم دایە بەرشەق و بۆکس و زۆرم لێدا تالەسەر شۆستەکە بورایەوە.. ژنەکان دابەزین بەگریان و زریکەوە منیش دەست ڕێژێکم کرد بەسەریاندا تابترسن ، ئینجا سەیارەکەمان لێسەندن و هێنامانەوە، پیرێژنێکیان دوعای لێکردم و وتی: یاخوا توشی ئیفلیجی ببیت و لەدنیاو قیامەتدا لەخۆت نەحەسێیتەوە..

خوا ئاگادارە پاش چەند ڕۆژێك توشی پشت ئێشە بوم دواتر قاچی چەپم سڕبوو، بەپەلە بردیانم بۆلای باشترین پزیشکی پسپۆڕی بەغدا، پاش پشکنین بڕیاریاندا نەشتەرگەری بڕبڕەی پشتم بۆبکەن.. نەشتەرگەریان بۆ کردم و سەرکەوتنی نەهێناو توشی ئیفلیجی بوم و لەوساوە لەسەر کورسی کەم ئەندامیم و ئەزانم ئاهی ئەو پیرێژنە گرتومی تۆبەم کردوەو دەمەوێ ئوتومبێلەکەشیان بۆ بگەڕێنمەوە ، ئیتر نازانم چۆن دەستم پێیان بگات و بیاندۆزمەوە.. جاکەتۆ وتارتدا زانیم شێوازت بەسراییەو دیارە خەڵکی بەسراش تێکەڵاویان هەیە لەگەڵ کوێتیەکاندا ، بەڵکو لەبەرخوا سۆراخێکم بۆبکەیت و سەیارەکەیان بۆ بگێڕمەوە وگەردنم ئازاد بکەن..

شێخ ئیبراهیم دەڵێت: منیش پێم وت: ئاخر کێ ئەوێرێت پەیوەندی بکات بە کوێتیەکانەوەو تەلەفۆنیان بۆ بکات ، دیارە حکومەت بەشتی وابزانێت سزای قورسی لەسەر ئەدات.. ئیتر هەمو هەینیەك کوڕەکەی دەناردە لام و دەیوت: باوکم دەڵێت بە قوربانە چی بۆکردوین؟ منیش دەموت: بە خوا هیچم بۆ نەکراوە، ئەمە ساڵێکی خایاند تا ساڵی ١٩٩٥دا بۆکارێکی خۆم سەردانێکی بەسرەم کردو کەویستم بگەڕێمەوە بۆ بەغدا چەند سەعاتێك لە نەقلیات چاوەڕێم کرد سەیارەیەکی بەغدا دەست نەکەوت..

برادەرێك کە منی ئاوا بینی وتی: یاشێخ فلان کەسی گەڕەکی خۆمان سەیارەی پێیەو دەچێت بۆ بەغدا بۆ لەگەڵ ئەو ناچی، منیش وتم: زۆر باشەو ئیتر ڕۆیشتین برادەرەکەمان دۆزیەوەو لەگەڵی سواربوم هەتا بەغدا، دیارە ڕێگەیەکی دوورو درێژەو کەوتینە گفتوگۆ برادەرەکە وتی : مامۆستا هەرچەندە ئەم سەیارەیە زۆر باش نیەو لایەق بەجەنابتان نیە چیبکەین خوا بیان گرێت سەیارەیەکی باشمان هەبوو ئەو زاڵمانە لێیان سەندین، منیش پێم وت: قەت ناشێ سەیارەکەت سۆپەرێکی سپی و مۆدێل ١٩٨٢ ژمارەی کوێت بێت، برادەرەکە هەر ئەبڵەق بوو وتی: یاشێخ دەڵێی کەراماتت هەیە؟

وتم: نا کەراماتم نیە وەرە بتبەم بۆ لای سەیارەکەتان.. ئیتر بردم بۆ ماڵی لیواکە لە بەغاو سەیارەکەی دایەوە .

وتی: بەڵکو تەلەفۆن بکەیت بۆنەنکت لە کوێت تاگەردنم ئازاد بکات کوڕەش وتی: کێ دەوێرێت لە عێراقەوە پەیوەندی بکات بەکوێتەوە..

لیواکە وتی: باشە پاسپۆرتت بۆ رێکدەخەم لەسەر حسابی من بچۆ بۆ عەممان و لەوێوە تەلەفۆن بکە.. پاش ماوەیەك چو بۆ عەممان و هەمو شتێکمان بۆ ئامادەکردو چو بۆعەممان و تەلەفۆنی کرد بۆ کوێت و بەنەنکی وت: نەنە خواکردی واسەیارەکەمان دەست کەوتۆتەوەو کابرای لیوا تۆشی ئیفلیجی بوەو داوای گەردن ئازادی دەکات، نەنکیشی ئەوەندەیتر دوعای لێکردو وتی: گەردنی ئازاد نەبێت و خوا لەوە خراپتری لێبکات.. کوڕەکە گەڕایەوە بەغا وتمان : هاچی بوو؟

وتی: بەخوا چی خەریك بوم لەگەڵیا گەردنی ئازاد نەکرد، منیش پێم وت: ئاخر کوڕی باش چۆن ئیشی وادەکرێت، ئەبوایە هەندێك فەزڵی عەفو کردن و لێخۆشبونت بۆ باسکردایەو ئینجا داوای گەردن ئازادیت لێبکردایە.. ناچار جارێکیتر لەسەر حسابی لیواکە چۆوە بۆ عەممان و ئینجا بەجۆرێکیتر قسەی لەگەڵ نەنکی کرد تا ڕازی بوو گەردنی ئازادبکات..

خوا ئاگادارە پاش دوو هەفتە کابرای لیوا بەرەو چاکی ڕۆیشت و لەسەر عەرەبانەکە هەستاو ئێستا بەگۆچان دێت بۆ مزگەوت بەپێی خۆی.

# کۆمەک بۆ ناوچەی شارەزوور

ئەگەر چی ئەم ڕوداوە لەم سەردەمەدا ڕویدا بەڵام هەوێنی برایەتیو خۆشەویستی سەدەی ڕابردو لەم سەدە نوێیەدا بەرهەمی‌دا.. هیوادارم سودمەند بێت بۆ هەموتان، ئەو بارانە زۆرەی ڕۆژی پێنجشەممە تا ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٢٠٠٦/٢/٢ بەردەوام بوو، ماڵە سادەو ساکارەکانی ناوچەی قەراخ شاری سلێمانیو شارەکانی تری خستە مەترسییەوە بە ڕێژەی (١٢٠)ملم وزیاتریش باران باری بەنداوی دوکانو دەربەندیخان بە ڕێژەی (٥,٥ – ٦)م ئاستی ناوەکەی زیادی کرد سوپاس بۆ خوای بەخشندەو ئەم بارانبارینە بەردەوام شارەکانی هەرێمی کوردستانو ناوەڕاستو هەندێك شاری خوارووی عێراقی گرتەوە.

کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ڕاستو دروستی بارودۆخەکەیان نمایش دەکرد وەك خۆی زۆر ناوچەو جێگا کەوتنە بەر مەترسی لافاوەوە.

لە ناوچە دوورو سنورییەکانو شارۆچکاندا زیانی گیانی تەنها یەك پیاو بوو لە دەفەری هەولێر بەڵام لەو ساتەوە کە باران درێژەی هەبوو زیانی ماڵی دروست بوو. خانوی هاوڵاتییەك کەوتە بەر هێرشی لافاو.. ڕۆژی سێشەممە (٢٠٠٦/٢/٨) باران بارین دووبارە بوەوە، ناوچەی (بازیان چەمچەماڵ سەیدسادق شانەیەری قەدەفەری عەواڵ قلیاسان ..... هتد) ماڵەکانیان دا ڕووخا لافاو چووە ماڵەکانیانەوە.

خەڵکی لە ناو قوڕو لیتەو هێرشی لافاودا کەوتنە جەنگینو دورکەوتنەوە لەو لافاوە ماڵو ئافرەتی بەتەمەن بە هۆی سەیارەوە لە ناوچەی مەترسیدار دوورکەوتنەوە کەم تا زۆر هێزی ئاسایشو بەرگری هاوکارییان کردن، ئەمەش بە زۆری لە ناوشارو قەراخ شار .. ئەوەی جێی باسەکەمە تۆمارکردنی مێژووی نوێو بەرخودانو هاوکارییە لە مێژووی شارەکەماندا، بە هانا هاتنی ئەو ماڵە لێقەوماوانە بوو کە کۆمەکیان بۆ کرا.

چەند کەسێك ڕۆژی (٢٠٠٦/٢/١٠) هاتنە (دەنگی یەکگرتوو – رادیوی سلێمانی) بە مەبەستی بانگەواز بۆ کردنیان تا ڕادەیەکی کەم یارمەتی بدرێن، بانگەواز کرا ئەوەی پێشبینی دەکرا تەنها یەك دوو پیکاپ شتومەك بێت بۆ ئەم چەند کەسە، بەڵام بەرێزان ئامارەکان و زیانەکان زۆر زیاتر بوون، چەند جارێك بانگەوازەکە دوپات کرایەوە ئاپۆرای خەڵکی شارو دڵگەرمی دانیشتوان لە ڕادەیەکی یەکجار زۆردابوو (تەلەفزیونی یەکگرتو) ڕیپۆرتاژی ئامادەکرد لەو دیمەنانە بەڵام یارمەتی و کۆمەك زۆر زیاتر بوو لەوەی پێشبینی دەکرا چوار ساید لە هەمو جۆرێك سەیارە کۆبونەوە بۆ گواستنەوەو گەیاندنی یارمەتی .. باران بەردەوام بوو فرمێسك و دڵۆپی باران ئاوێزان بوون ئاپۆرای ئەو خەڵکەی شار لە زیادبوندا بون، زۆر بێوێنە بوو ئەوەی کاری بۆ کرا جیاکردنەوەی بابەتەکان بوو.

١. وەرگرتنی پارەو دراوی نوێ و دۆلارو تمەن.
٢-وەرگرتنی ئاردو خۆراك و بابەتی خواردەمەنی.
٣-وەرگرتنی ڕاخەرو بەتانی و جل و بەرگی پێویستی مرۆڤ لەقاپ و قاچاخ.
٤-وەرگرتنی زۆپاو عەلادین لەهەمو شێوەیەك.
٥-وەرگرتنی سوتەمەنی (نەوت).

زۆر جێگەی سەرسامی بوو، بانگەوازێکی سادە.. جۆش و خرۆشێکی زۆر گەرم! ئەوەی دڵی نەرم و ڕۆحی زیندو بوو هەستی هۆشیارو هەناسەی بێدارو چاوی گەش کامەران بوو، هەستی جولاو شەپۆلی دەدا،هاوکاری بەردەوام بوو.. دەنگی یەکگرتوو بۆی دەرکەوت کەشار چەند تامەزرۆی یارمەتی و هاوکارین، چەندە گوێگروو یارمەتیدەر زۆرە.
هەرچی لەخەڵکی هەبوو دەهاتە ئەوناوەو هێزی نەبوو ئەو دیمەنە بەجێبهێڵێ هەر مرۆڤ بوو بوگوێرەی توانای دەست و باوەش و ئۆتۆمبێلی پڕبوو لەکەرەسەی هەمەجۆر بەزۆری (نوێ و دانسقەو باش) بوون.
ئەم کۆمەکە لەرزەیدا بەدڵی خەڵکی داراو بەتوان، ئای چ دیمەنێکی خۆش بوو تا ڕۆژی هەینی کاتژمێر(١٢) بەردەوام بوو.
چەند دیمەنێکی سەرنجراکێش دێنمە خزمەت بەرێزتان:
١- منداڵێکی تەمەن (٤) ساڵ بە دەستێکی دەغیلەکەی، بەدەستەکەی تری سەیارەیەکی بچوك، لێیان پرسی :

- ئەوە چییە بەدەستەوە؟

+ ئەمـە دەغیلەکەمـە بـۆ منـدالآنی شانەدەری، ئەمـەش خۆشەویـسترین لەعابەمـە بـۆ منداڵانی شانەدەری..لێی وەرگیرا.

٢- منداڵێك بە (٢٥٠) دیناری چاپی نوێ بەشداری کرد، پرسیان، کەم نییە؟وتی: ڕۆژانـە کەمە بۆ منداڵانی شارەزوور.

٣- بـوك و زاوایـەك بەسـەیارەی ئـاخر مۆدیـل لـەوێوە تێپـەڕین پیرۆزیـان بێـت، ئـەم قەرەباڵغی و گەرم و گوڕی خەڵکەیان بینی پرسییان: ئەمە چییە؟

یـەکێك لـەهاوکارانی کۆمـەك وتـی: کۆکردنـەوەی کۆمـەك بـۆ خـەڵکی لێقـەوماوی (سەیدسـادق و شـانەدەری)ئـەوانیش سـەیرێکی یـەکتریان کـردو جـوانترین یادگاریـان کەنەڵقەی پەنجەیان بو کردە دیاری.

٤- شـۆفێرێك وتـی: هەرچی یارمـەتی هەیە بـەبێ بەرامبـەر دەیگەیەنمـە ئـەوێ هـەمو دەستکەوتی ئەمڕۆشم بۆ ئەم کۆمەکە تەرخان کردووە.

٥- ئافرەتێکی بەتەمەن وتی: هەرچی لەماڵەکەمـدا بـوو لـەم ئۆتۆمبێلـە کرێیـەم نـاوە بـۆ لێقەوماوانی شارەزوور.

٦- چـەندین منـداڵ و گـەنجی خـوێن گـەرم بـەجل و بـەرگی خاوێنـەوە بوونـە بارکـاری شتومەکەکان بەشێوەی خۆبەخش بەبێ گوێدانە باران بـارین، ئـای لـەو دیمەنـە جوان و جوامێرانەیە!!

٧- چەنـدین شۆفێری خاوەن ئۆتۆمبێلی گەورەو بچوك بەشێوەی خۆبەخش ئامادە بـوون باربار بکەن،خوای گەورەش ناهومێدی نەکردن.

٨ - چەنـدین پیاوی بەتەمەن و ڕیش سپی بەشانی ماندویان کۆمەکیان هێنا بو بەلاچکی جامانەکەیان (ئارەق و فرمێسك و دڵۆپی بارانیان) لە ڕوخساریان دەسڕی.

ئەمـە کـەم وێنـە بـوو، کۆمـەکی خـەڵکی (هـەولێر و سـلێمانی)م بـیر کەوتـەوە ، کـە بـۆ لێقەوماوانی هەڵەبجەی شەهیدیان برد ساڵی (١٩٨٨).

کۆمـەك و یارمـەتی گونـد نـشینەکان و شارەکانی کوردسـتانی ئێـرانم بیرکەوتـەوە کـە بـۆ ئاوارە لیچقەوماوانی سلێمانی و هـەولێر کردیـان. کۆمەکەکـەیان زۆر بەیـەك دەچوون..

سوپاس بۆ خوای گەورە خەڵکی شارەزوو هێندە کەرەستـەو بابـەتیان بـۆ کۆکرایـەوە، کـە پێویستیان بە یارمەتی حکومەتی هەرێم نەما.

ئەو شەوە سەعات (٩ تا ٢)ی شەو کەرەسەکان لە شارۆچکەی سیدسادق جیاکرانەوە لەلایەن بەرپرسی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان (مامۆستا ئەرکان) و ئەنجومەنی گوندی شانەدەری (کاك ئەکرەم) لیژنەیەکی زۆر بەتوانا دانراو دەست کرا بەدابەش کردنی بەئەندامیەتی کاك (حارس عبدالقادر ، کاك ئەحمەد) بۆ تەرنەبوونی کەلوپەلەکان خێرخوازی خاوەن هەڵوێست (حاجی توفیق محمد قاینەجی) مەخزەنێکی گەورەی خۆی خستە خزمەتیان، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

خەڵکی زۆر بەگەرمیو جۆشو خرۆشەوە بەشدارییان کرد بەگوێرەی دوا ئاماری ڕۆژی هەینی کاتژمێر (٦)ی ئێوارە

- (٢٥) سەیارەی گەورەو بچوك.
- (٨٣) ملیۆن لەم پارە نوێیە = (٥٥٣,٣٠٠) دینار.
- (١١,٠٠٠) دۆلاری ئەمریکیو زۆر لەتمەن.

هاوکاریو کۆمەك هەر بەردەوام بوو ئەگەر چی ڕاگەیەنرا کە کۆمەك کۆکردنەوە ڕاگیراوە، جێگەی ڕێزو سوپاسە (مەڵبەندی کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان)یش دەستیان کردە کۆکردنەوەی کۆمەكو یارمەتی بۆ ناوچەی (شارەزووورو سیدسادق) و ڕێژەیەکی بەرچاویان ئامادە کرد.

بابەتەکان گەیشتنە دەست ئەو ماڵانەی سەرژمێری کرابوون بۆ کۆمەك.

گەیشتینە لای پیرێژنێکی بێکەسو نەدار، کەخاوەنی یەك زوورو یەك عەلادینو یەك کومبارو یەك بەرماڵ بوو لافاو هەمووی ڕاماڵیبوو.

چاوی کامێرا گەیشتە لای پیرێژن هەر دەگریا، لیژنەکە ووتیان : داپیرە گیان بۆ دەگری؟ لە جیاتی کومبارێك ئەوە دوو کومبار.. لە جیاتی عەلادینێ ئەو دوو زۆپای چاك، لە جیاتی بەرماڵێ ئەوە دوو بەرماڵ، لە جیاتی خۆراك ئەوە دوو ئەوەندە.. داپیرە هەر دەگریاو گریانی کەمی نەدەکرد، لەوەلامدا وتی . بۆ ماڵو زۆپاو کومبار ناگریم، بۆ بەرماڵو قوڕو لافاو ناگریم، بۆ ئەوە دەگریم، داکۆکی دەکەم کەسانێکی کەم ئەزموون خوێڕیو بەڕەڵا سوکایەتیان بە پێغەمبەرەکەم کردووە، ئەوە هۆکاری گریانەکەمە ! بۆیە خوای گەورە بەم کارەساتە بەسەری کردووینەتەوە، بۆ بێدەنگی جیهانی موسڵمانان دەگریم، گوناهە پێغەمبەری ئیسلام "درودی خوای لەسەر"سوکایەتی پێ بکرێت).لە

کۆتاییدا زۆر سوپاس‌و ماندوو نەبوون لە دەنگی یەکگرتوو – ڕادیۆی سلێمانی دەکەینبۆ ئەو کارە ناوازەو دەستپێشخەرییەی کردیان .

زۆر سوپاسی هەمو ئەو کەسە بەڕێزانە دەکەین کە هاتن بەدەم بانگەوازەکەوە.زۆر سوپاسی هەمو ئەو شۆفێرە خواناسانە دەکەین کەلە خۆبوردوانە کەرەستەو کۆمەکیەکانیان گەیاند.

سوپاسی هەمو خەلکی لێقەوماو، بۆ هەمو خولکی ماندوو بوو بۆ خەم خۆر.

خوای گەورە نمونەیان زۆر بکات، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

# ئەندێشەی نەوجەوانی

ئێستا بەتەمەن (٣٢) ساڵم تێپەڕاندووە، یادگارە ناخۆشەکان سەراب ئاسا دێنەوە هزری پڕ ئەندێشەم، زەنگی یادەوەریم شەپۆلی بەتینی چیا ئاسا دروست دەکات..
چەند ساتێك خامۆش.. مەست و حەیران.. لە ناخی تاساوما ئەژنۆکانم لە ئامێز دەگرم.. چاو لە دوور ترین جێگای دانیشتنم دەبڕم،
بە هیوام ئەو تەنگژە نالەبارە زوو کۆتایی بێت و بکەومەوە حاڵەتی ئاسایی، هەندێك جا بە یادگاری زۆر خۆشی رۆژگارەکانی تەمەنم خۆم لەگەڵ تاڵاوی گەردوونی بچووك سەرقاڵ دەکەم، تا ئەمەی خودایە بۆ ساتێکیش بێت بە کامەرانی بژیم.
زۆر جار بەو دیمەنە فلیم ئاسایە.. جەرگی هەڵقرچاوم دەکولێتەوەو دەمباتەوە بۆ ئەو ئێوارە خۆرئاواییە.. کە لەگەڵ کاکەم بەسواری (تراکتۆرەکە)مان لە گوندێکی دوورەوە بەرەو عەربەت دەگەڕاینەوە.. هەردووکمان شەکەتو ماندوو، ناخۆشترین یادگاریم تۆمار کرد.. بە بینینی ئەو هەمو رێگایە.. ئەو هەمو داربەڕوارو دەوەن و گردو چیایانە، بە چاو خشاندنێ بە هەمو گوندە بچووکانەدا یادگارو بەسەرهاتە ناخۆشەکە وەك یەکەم سات دێتەوە یادم.. لاوازی خۆم و بێکەسی و بێغیرەتی و هاوکاری.. مرۆڤ دۆست دەم هەژێنێت..
ئەمەی مەبەستمە بۆتانی باس بکەم بەسەرهات و چیرۆکێکی تاڵی منە کە ئێوەی خوێنەر لێی سوود مەند بن.. تا ئەوەی لە کۆتاییدا بڕیار بدەن لە دانیشتوانی کام لەم دوو گوندە بچن.. لە ئاکامدا بڕیار بدەن هاوکار بن یا دوورە پەرێز، ئەو ساڵە تەمەنم دوانزدە نەورۆزی تەواو کردبوو، بەڵام بە هەیکەل بچووك و لاوازو جەستە رەقەڵە بووم.. ئەمەش زیاتر بۆ دوو هۆکار دەگەڕایەوە.. یەکێکیان ویراسی بوو کە دایك و باوکم هەردووکیان بچووك بوون بە قیافەت، هۆکاری دووەم جووڵەو راکەڕاکی خۆم لەم گرد بۆ ئەو گرد.. لەم جێگە بۆ ئەو جێگە.. رۆژێ شوانی.. رۆژێ کشتوکاڵی.. رۆژێ یاری ناو

کۆلانی شارۆچکەکەمان زۆرجار لە هیلاکیدا پارووە نانەکەم بۆ تەواو نەدەکرا خەو دەیبردمەوە، ساڵ (١٩٨٤) بوو زۆربەی دێهاتەکان داگیرابوونە کۆمەڵگە زۆررە ملێکانی حکومەتی عێراقییەوە زۆر لەو گوندانەی دوور لە مەترسی بوون بوونە قەرەباڵغی و جێگەو رێگەی (عەسکەری فیرار) سوپای عێراق لەو ناوچانەدا بێتاقەت و کورو کاس بە حوکمی نەشارەزایی سەربازەکان کە دەتوانم بڵێم هەموی خەڵکی خوارووی عێراق بوون و لەو بارو دۆخە نالەبارەی شەڕی دراوسێ بێزار بوون.

من و برا گەورەکەم ئەو ئێوارەیە دوای ماندوو بوونێکی زۆر لە جووتکردن بڕیارماندا ناوچەی شاربازێڕ بەجێبهێڵین و بەرەو عەربەت بگەڕێینەوەر کە ماوەیەکی کەمبوو چووبووینە ئەو شارۆچکەیە.

هەورەکانی ئاسمان پەڵە پەڵە لە خۆری دەمکەلی ئێوارەدا سوور هەڵگەڕابوون، مێگەل و گاگەلی دێهاتەکان بە تێرو تەسەلی بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە..

چۆلەکەو باڵندەکانی ئاسمان خۆرنشینیان بەجێ دەهێشت و دەگەڕانەوە لانەکانیان، تاك وتەرا شەمشەمەکوێرە بە باڵە رەشە تەنکەکانیان ئاسمانی دوور لە خۆریان تەی دەکرد، من و کاکم زۆر خۆشحاڵ بووین، ماوەیەکی زۆر بوو نەگەڕابووینەوە..

بەدڵی خۆش و زەوقی گەنجانەوە تراکتۆرەکەی لێ دەخوڕی منیش لەسەر تراکتۆرەکە گۆرانی دەم کورە شوانەکانم دەوتەوە..

لە گوندی سیتەك پێچمان کردەوەو بە رێگەی دوکانیاندا خێرایی تراکتۆرەکەمان زۆر زیاد کرد بە مەبەستی زوو گەیشتنەوە ماڵ، جادەی رەشمار ئاسامان بە خێرایی رەشمار دەبڕی، یەك دوو پێچمان بڕی..

لە چاو تروکانێکدا گەماڵێکی گەورە بە مەبەستی پەڕینەوەلە جادەکە هاتە سەر رێگەکەمان، کاکەم هۆرنی بۆ لێدا.. گەماڵەکە سەری لێشێوا لە جیاتی ئەوەی لە سایدی ئێمە دوور بکەوێتەوە هاتە سایدی ئێمە.. کاکەم زۆر وریا بوو خۆی لێ لادا، بەلام شپرزە بوو هاتەوە بەر تراکتۆرەکە، ئینجا کاکەم سەری لێشێواو دەستی شکانەوە تا لە گەماڵەکە نەدات، ئێمە کەوتینە هەڵتەك هەڵتەك و لە چاوترووکانێکدا ترکتۆرەکە وەرگەڕا.. من لەسەر تراکتۆرەکە پەڕیم.. کاکەم کەوتە ژێر تراکتۆر.. گەماڵ بۆی دەرچوو.. ویستم هەنگاو بنێم بەرەو لای براکەم، بەلام هێزم نەبوو.. گەرمایی بەسەرمدا هاتە خوار دەستم لێدا خوێنە..

زۆر نارەحەت بووم.. بە شەلە شەل خۆم گەیانـدە لای براکەم.. براکەم لاشەی هەموی بـوو بـە ژێـر تراکتۆرەکـەوە، لـە دوو شـوێنی لاشـەیەوە خـوێن دەهات، هەوڵمـدا کـە رزگاری بکەم، بـەلام نـەمتوانی.. لـە تـاوا وەك پەروانـەی دەوری شـەم هەڵبـەزوو دابـەزم بـوو.. دەستم تێکەڵ دەبوو، لەم دیو تراکتۆرەکـەوە رام دەکـرد بـۆ ئـەو دیـو هیـچم بـۆ نەدەکرا.. رام دەکردەوە ئەودیو.. کاکم زۆر نارەحەت بوو، زۆر بەنارەحەت هەناسەی بـۆ دەدرا، ئـای کـە نـاخۆش بـوو.. رامکـردە سـەر جادەکـە، سـەیری ئـەم سـەرو ئـەو سـەری جادەکەم کرد یەك سەیارە دیار نەبوو، لە دڵی خۆمـدا وتم: سـەیارەی عەسـکەریش بێـت هەر یارمەتیمان دەدات، بەلام هیچ...

ناچار گەڕامەوە لای براکەم و وتم: کاکەگیان چی بکەم تا رزگارت بکەم؟ زۆر گریام...

هاوار هاوارم بـوو.. ئـاگرم تێبـەربوو بـوو، خوایـە گیـان فریامـان بکـەویت.. خوایـە گیـان هاوار..

کاکەم کە منی بەوشێوەیە بینی وتی: بە قوربانتبم من باشم، خەمت نەبێت.. خێرا بچۆ بۆ ئەو دێیەی نزیکمان لەم چەمەوە داگەڕێ دەگەیتـە چـەمێکی وشـکی بێـروون بـچۆرە ئەو بەرەوەئەوە گوندی (W)یە.. داوا لە خەڵکەکەی بکە با بێن بە هانامانەوە...

دنیا بە تەواوەتی تاریك داهاتبوو، کپ و خامۆش بەو ناونیشانەی کاکم وتی بـە دوو دڵـی و لە تاودا رام دەکرد.. نـاو بەنـاو ئـاوڕم دەدایـەوە.. بـۆ ئـەوەی بتـوانم گیـانی براکـەم لـە مردن رزگار بکەم.

بـەڵێ بـەرێزان.. بەسـەرهاتەکە زۆر نـاخۆش و جـەرگ بڕبـوو، لـە توانـای منـدا نـەبوو.. بەدەم گریان و هاوارو دوعاو پاڕانەوە رام دەکرد..

رێگەکە زۆر دوور بوو، بە تایبەتی بۆ منداڵێکی ماندووی نە شارەزا.. کـەنزیك بوومـەوە لە دێیەکە زۆر خۆشحاڵ بـووم.. روونـاکی گوندەکـە لـە چاوەکانمدا دەگەشایەوە، کاتێکم زانی سەگەلی ئاوایی بۆم هاتن، هاوارم کرد: ئەی هاوار.. فریام کەون.. ئەی هاوار، خـەڵکی دێ ئەی هاوار وەرن بە فریامەوە، ئەم سەگانەم لێ دوور بخەنەوە..

لە ماڵێك چەند کەسێك هاتنە دەرەوە منیان بەوشێوە بزرکاوی و نارەحەتییـە بینـی، بـە تورەیی پرسیان: ها.. ها.. کورە ئەوە چییە؟!

بە دەم گریان هەنیسك هەڵدانەوەو بە هەناسە برکێ وتم: فریامان کەون براکەم لەسەر جادەکە وەرگەڕاوەو کەوتۆتە ژێر مەکینەکەیەوە، ئێرەی پێوتووم.. غەریبین فریامان کەون.. تو خوا خێرتان دەگات.. گریام .. گریام..

یەکێك لە پیاوەکان وتی: کوڕە چکۆل خوا رۆژی کردۆتەوە ئێمە ئیش دەکەین و رادەکەین تا رۆژ ئاوابووە، هیلاك و ماندوو کێ دەگاتە سەر ئەو جادەیە..

پەلاماری دەست و قاچیانم دا.. بە قوربانتان بم دامان گەیوە فریامان بکەون تو خوا.. هەموویانم ماچ کرد، یەکێکیان وتی: تا ئێمە دەگەینە لای تەنها هیلاکیمان بۆ دەمێنێتەوە، کە زانیم قسەکردن لەگەڵ ئەم پانە پیاوانەدا بێ سوودە.. خەیاڵێکی خۆش هات بە بیرمداو لە خەیاڵی خۆمدا وتم: با بگەڕێمەوە ئێستا سەیارە لەوێوە گوزەریان کردووەو براکەمیان رزگار کردووە.

زۆر لە پیاوەکان تورە بووم و یەك دوو جوێنم پێدان و بە هەڵەداوان گەڕامەوە.. ئەمەی باسم کرد زیاد لە سەعاتێکی پێ چوو، زمانم بە مەلاشوومەوە نووسابوو.. دەمم بووبوو بە پەلاسی وشك، بەلام گوێم بە هیچ نەدەداو بە راکردن گەڕامەوە سەر جادەکە.. ئای کە ناخۆش بوو.. هیلاکی، ماندوو بوون.. کاکەم بینی وەك خۆی لەژێر تراکتۆرەکەدا دەینالاندا.. خوێنی لەبەر دەڕۆی.. کە هاوارم کرد: کاکە گیان! کاکە گیان! وا هاتمەوە، کاکەم زۆر بە سەرسامی و تامەزرۆییەوە وتی: بە قوربانت بم هاتیتەوە دەخێراکەن!!

بەگریانەوە هاوارم کرد: کاکەگیان کەسیان لەگەڵم نەهاتن، ئەو نا پیاوانە نەهاتن..دەستی کاکەم گرت و ئەویش تۆزێك هێزی دایە بەر خۆی کە رزگاری بێت، بەلام بێسوود بوو.. بەڵێ بێ سوود بوو.. بەبێ هیوایی دەستەکانم بەرداو سەیرێکی یەکترمان کرد، پرسیارێك و داواکارییەك لە رووخساریدا دەخوێنرایەوە، لە ناکامدا وتی: برا جوانەکەم.. ئەگەر دەتوانی بە راکردن بچۆ بۆ ئەو دێیەی سەروو تر، کە هەندێك لەو دێیەی تر دوور ترە، رووناکی ماڵەکانیان دیارە، بچۆ بزانە کەسیان نایەت لەگەڵتا..

ئەم جارەش بەویستی خۆم نەبوو گەڕامەوە سەریو بە هەمو هێزم ماچێکم لێ کردوو دەستەکانیم گوشی و خوا حافیزیم لێ کرد.. کاکە گیان خەمت نەبێت ئێستا دەڕۆم، ها کا هاتمەوە.. ئای کە هیلاك و شەکەت بووم، بۆ نەگبەتی ئێمەش یەك سەیارە بەلاماندا نەدەڕۆی، لە جادە قیرەکە چوومە خوارەوە بەرەو گوندی (ئاڵە سیاو) رامکرد، چۆن راکردنێ.. زۆر جار دەکەوتم.. سنگم دەدرا بە دارو بەرددا، بەلام گوێم پێ نەدەداو

هەڵدەستامەوەو رامدەکرد.. چۆن راکردنێ.. راکردنێ بۆ رزگار بوونی کەسێکی خۆشەویست لە مردن..

بەهەمان شێوەی گوندەکەی تر، سەگەلی ئاوایی بۆم هاتن.. خۆم کرد بە ماڵێکدا ماندوو، هیلاك، برسی، تینوو، بە هەناسە بڕکێو بەهەر حاڵێ بوو حاڵیم کردن، ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو زیاتر لە (١٠) پیاو کۆبوونەوە بە گوریس و داری درێژو تێلاو پاچ و خاکەنازەوە هاتن، هەر بە راکردن..

یەکێکیان وتی: بەم تاریکییە چۆن ئەم دێیەت دۆزیەوە؟ بەدەم گریانو هەناسە بڕکێوە وتم: زۆر دەمێکە وەرگەڕاوین.. چوومە گوندەکەی تریش، بەڵام نەهاتن بە دەممانەوە، قەرزارمان بن..

کوڕێکی گەنجیان وتی: ئەوان قەت هاوکاری کەس ناکەن.. زۆر خراپیان لێ دەرچووە، ئەوان سەرباقی خۆشەویستی بۆ دێکەیان کەڵەکە ترێ لەسەر مامۆستاکەیان دەکەن، ئێستا مەحاڵە بێن بە دەنگ تۆوە..

بە حاڵ گوێم لە قسەکانیان بوو بە هیلاکی و دوای چەندین هەنگاو لە راکردن گەیشتینە سەر جادەکە..

گەیشتینە سەر تراکتۆرەکەو هاوارم کرد: کاکە گیان! کاکە گیان! وا خەڵکم هێنا.. ئێستا رزگارت دەکەین..

هەمو پیاوەکان کە دیمەنەکەیان بینی بەو نارەحەتی و تاریکییە هەریەکەو لە لایەکەوە پەلاماریاندا.. منیش رامکردە سەر سەری براکەم، بەڵام برای چی..!! لاشەیەکی بێ گیان.. لاشەیەکی پساو لە ژێر مەکینەی قورسا.. پیاوەکان مەکینەکەیان راست کردەوەو لاشەی بێگیانی کاکمیان دەرهێنا.. زۆر گریام.. زۆر پاڕامەوە.. زۆر هەڵباڕیم بەو شەوەو بەو ناوەختە نەمزانی چی بکەم.. زۆرم جوێن بە دێکەی تردا.. سەری کاکەمم لە ئامێز گرت، بەڵام خوای گەورە چی کردبێ بە نسیب گەڕانەوەی نییە..، بەڵام پیاو عەیبە هێندەش بێغیرەت و سەرگەردان بێت..

بەڕێزان هەرکاتێك بەو جادەیەدا گوزەر بکەم ئەو یادگارییە تاڵە دێتەوە یادم، کە منی لاواز چ نارەحەتییەکم بەسەردا هات، هەمو جارێکیش لەو ئاستەو لەو قەراغ جادەیەدا دادەبەزم و سورەتی (فاتحە) بۆ رووحیانەتی پاکی کاکم دەخوێنم و زۆر سوپاسی ئاوایی (ئاڵە سیاو)یش دەکەم، کە چیان لە توانادابوو کۆمەکیان کردم و درێغییان نەکرد..

ئێستا چەند لە تواناتادا هەیە بە هەمو شێوەیەك کۆمەکی و هاوکاری خەڵکی دەوروو بەرت بکە.. مەرج نییە پارەو ماڵو دارایی دنیا، کە هێندەی پێوەی ماندوو دەبیت هەمو شتێك بێت، دڵنیابە دڵی خەڵك خۆش بکە، خوای گەورەش دڵت خۆش دەکات.

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ: (من لایرحم الناس لایرحمه الله).

# چاوەکان

چاو دەتوانێت هەرچی وزەی دڵە لە سەرنجێکدا کۆی بکاتەوە.. لەوانەیە چاو بتوانێت تاڵاوو مەینەتی ڕۆژگار لە سەرنجو تێڕوانینێکدا هەڵبگرێت لەوانەشە چاو بتوانێت قسە بکات، بێ ئەوەی دەنگە ژێکانو زمان بێتە گۆ لە سەرنجێکدا شتێك بڵێت زمان بەچەند کاژێرێك یان چەند ڕۆژێك دەیگێڕێتەوە.. مرۆڤ لە هەر شتێ ورد ببێتەوە لە چاودا هەمووی کورت دەکاتەوە.. هەر بۆیە چاوم خۆش دەوێو لە چاویش دەترسم.

فەیلەسوفو شاعیرەکان بایەخیان نەداوە بە هیچ شتێکی مرۆڤ بە ئەندازەی ئەو بایەخەی بەچاویان داوە.. چاوەکان لە دەریایەکی خامۆشی شاراوەی پڕ لە فرمێسكو خۆشی مەلە دەکەن، دەریایەك جار هەیە دەیبینینو جار هەیە نایبینین بەڵام لە پشتی چاوەوە وەستاوە .

بەهێزترین چاو وکاریگەرترینیان چاوی بێتاوانەکانە، چاوی منداڵو ستەم لێکراوەکانە، چونکە ئەوانە ناتوانن بەزمان هیچ وتەیەك دەربڕن بە ئەندازەی ئەوەی دەتوانن بە چاوەکانیان دەریبڕن چەندەم چاو خۆش ئەوێو چەندیش لێیدەترسم، چەندەم حەز لە ئاخاوتنی بێدەنگە ئەو ئاخاوتنەی لە نێوان پێڵوەکانی چاوەوە دەردەچن.

خاوەنی کاریگەرییەکی بەهێزە بۆ سەر دڵ، بەهێزترە لەوەی بە تواناترین شاعیرو بلیمەتترینیان لە وشەسازیدا هەیەتی.

لە شێوەو ڕەنگیاندا جیاوازن، لەساتەکانی هەڵچونو خۆشی زمانحاڵن چاو گەورەترین نیعمەتی خوای بەخشندەیە بەخشویەتی بە مرۆڤەکان تا چاکەو خراپەو نیعمەتەکانی تری پێببینن.. کەواتە چاو ئەسرین لە خۆشیو ناخۆشیدا دەڕژێنێت.

## ناوەرۆک

### بەرگی یەکەم



### بەرگی دووەم

بەرگی سێیەم